رۆمان

# هەڵاتن لە هەرێمی مردووەکان

ئارام حەمە




٢٠١٥




خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

ڕۆمان

- **هەڵاتن لە هەرێمی مردووەکان**
- نووسینی: ئارام حەمە
- نەخشەسازی ناوەوە: سەنگەر دلاوەر عەبدوڵڵا
- بەرگ: ئارام
- چاپی یەکەم: ٢٠١٥
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠
- چاپخانە: موکریانی(هەولێر)
- ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٩٨) ی ساڵی ٢٠١٥ پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨٨٢)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

((كاتێك تێناگەین ژیان چییە، چۆن دەبێت بزانین كامە مردنە،))

**"كۆنفۆشیوس"**

((ژیانی بێسوود، مەرگی پێشوەختە))

**"یوهان گۆتە"**

((سەركەوتن و دۆڕاندن بەشێكن لە ژیانی هەموو مرۆڤێك، جگە لە ژیانی ترسنۆكەكان، كە هەرگیز نەدەبەنەوە و نە دەدۆڕینن))

**"پاولۆ كۆیلۆ"**

پێشکەشە بە:

***شەهیدانی کیمیاباران و ئەنفال و ئەو گەنجە مروارى ئاسایانەى لە غوربەت مــردن و لــە دەریادا خنکان.***

****خێزان و خانەوادە و کوڕە ئازیزەکە، ئادان .***

## پێشەکیی نووسەر:

هەمیشە و لە هەموو کاتێك و دەمێکدا مێژوو دوو دەرگای کراوەی هەیە، دەرگای یەکەم سەربڵند و شکۆمەندە گەورەکان ئاوەدانی دەکەنەوە، دەرگای دووەم پنتێکی فرەوانە بۆ خۆفرۆش و خیانەتکاران، ئیدی خیانەتی گەورە بێت، یاخود بچووك گرنگ ئەوەیە دەرگای دووەمی مێژوو ئاوەدان دەکەنەوە، ئەو کاتەی مرۆڤ دەبێتە دڕندە و بازدەداتە دیوە تاریکەکانی ناخی خۆی، هەر ئەو دەمە هیچ بەهایەك بۆ جوانییەکان نامێنێتەوە، ئەو مرۆڤانەی خودا بە دەستەکانی خۆی خەلقی کرد و کردیە خەلیفە لەسەر ئەم هەسارەی سێهەمە و داوای ئاوەدانی لێکردن، هەر ئەوان بوون ناوجەرگی زەویان هەڵکەند و تۆی تاعوونیان چاند، ئەگەر بە مێژوودا رابگووزەرین ناشیرینییەکانی ئادەمیزاد گەلێك لە جوانییەکان فرەترن، مرۆڤ ئەو زیندەوەرەیە کە خۆی گەورەترین کێشەیە لەسەر ئەم هەسارەی سێهەمە، کاتێك مرۆڤە بێتاوانەکان بە دەستی مرۆڤ گەلی دڕندە و جەللاد دەکوژرێن نە رۆندك و نە گرییە و زاری و نە لاواندنەوە دادیان نادا.

ئەم رۆمانە بەرهەمی خەم و ئازارەکانی مێژووە برووسکەیەکە بە رابردوو و داهاتووی ئەم هێڵە زەمەنییەی کە بە دوو ئاڕاستەی ناکۆتادا رەت بووە، بەرهەمی ئازارەکانی ناخی کۆمەڵێك مرۆڤە کە بۆ هەمیشە رەنج دەدەن و ناگەنە ئاسوودەگی و بۆ هەمیشە لە هەموو سەردەمە جیاوازەکاندا دێن و دەچن، من وەك شێت و گەڕیدەیەك ئەم رۆمانەم نووسی کە بۆ ساتێکیش لەو ماوەیەی کە تێیدا نووسیومە ئاسوودەییم نەچەشتووە و وەك مرۆڤێکی تینوو هەمیشە لە سەرابی رووداو پنتە جیاوازەکانی ئەم دنیایە راماوم و کارم تێدا کردووە، بۆ یەکەمین جار لە زستانی ساڵی ٢٠٠٧ دەستم پێکرد و لە زستانی ٢٠١٢ تەواوم کرد، ئەگەرچی من وا هەست دەکەم کە ئەم رۆمانە هیچ کاتێك تەواو نابێت و بۆ هەمیشە دەرگاکانی کراوەیە و سەردەم بۆ خۆی خۆی تێدا دەنەخشێنێت و گەورەی دەکات، دواجار زامەکانی ئەم مێژووە تاڵەمان هێندە بەسۆیە کە بۆ ناکۆتا و بێپایان بەردەوامییان دەبێت، بۆنی سێو و بۆنی لمی بیابانەکان و چیرۆکی چاڵە گەورەکانی مەرگ، بۆنی

پۆستاڵ و جەستەی سووتاوی ئادەمییەکان، هەمیشە و هەردەم لەیاد ناچن، سـووتانی گونـدەکان و رووخاندنی شانەی هەنگ و کوێرکردنەوەی کانیاوەکان تاوانی گـەورەن و دێـن و دووبـارە دەبنـەوە، ئەو مرۆڤەی ئەمانە لەیاد بکات هیچ کات مرۆڤ نییە و خیانەتکار و کەسێکی بێفەڕە.

ڕەنگە کەسانێك هەبن لە دووڕا پێبکەنن و نەزانن زامەکانی ناو ئەم کتێبە لە کوێوە دێن و تا قووڵای چەند بە ناو ناخی ویژداندۆستاندا رۆدەچن، ئای لەو دەمەی خودا خـۆی بـۆ ئـەم نەعرەتـە گەورانەی گەلێك ئامادەیە، ئای لەو دەمەی خودا بۆ نەعرەتەو ئازای ناخی من تـووڕەو ئامادەیـە، خۆ ناوی کەسایەتییەکانی ئەم رۆمانە هێندە گرنگ نین، بەڵام کەسایەتییەکان بۆ خۆیـان گـرنگن و راستەقینەن، دواجار ناو موڵکی هیچ کەس و نووسەرێك نییە ناو شـتێکی واتاییـە و بـۆ هـەموو سەردەم و دەمەکان بەکاردێن، ئەو کاتەی ناو موڵکی ئەو نییـە مـوڵکی منـیش نییـە و بۆخـۆی هەیە، ناو وەك تیشك وەهایە و هەموو سەردەمەکان دەبڕێت بیٚ پسانەوە و ماندووبوون.

لەکۆتاییدا دەڵێم رەنگە دڕندەکان ئەمێستاکە لەناوماندا رابگووزەرن و بـێن و بچـن و زینـدوو بن، بۆیە هیچ کات لە وتنی راستی مەترسن ئەگەر هاتوو تاڵیش بێت.

# ١

## پایزی ٢٠٠٥

که هەواڵی مەرگی (کامەرانی وەنەوشە)م بیست، تەواو راچڵەکیم. من هەرگیز بڕوام نەدەکرد مردبێت، ئەو هێشتا لەنێو کۆڵانەکانی شاردا جێ پێی دیار بوون، هێشتا بۆنی بەرۆکی هەر لە هەوادا بوو، سەیر بوو بەڕاستی رووداوێکی سەیر بوو.

که مردن دێت هیچمان خاوەنی روح نین. هیچ کەس ناتوانێت بەر بەو هاوکێشە جادووییە بگرێت، دێت و یەخەمان دەگرێت. من نازانم ئەو بۆچی مرد و بەیەك جاری بەرەو ئاسمانان هەڵکشا، من بە زامداری، بە بیماری و بە گیانکەنشتەوە سەیری وێنەکانی ژوورەکەمم دەکرد، که لەنێو ئەلبوومەکانمدا هەروا بۆنخۆش مابوون و رووناکییان بە دڵ و ئەندێشەکانم دەبەخشی. زۆر سەیر بوو ئەو مردنە، ئێستاش لەبیرمە که دەیگوت: (رۆژێك دێت لەم وڵاتە رادەکەین ئێرە جەهەنەمە، جەهەنەم، بۆنی ئەهریمەنەکان لە هەموو کووچەکانی دێت، گوڵەکانی ئێرە رەشترن لەو کراسەی لەبەرتدایە).

لێمان ببووە خوو، هەموو رۆژانێکی یەکشەممە چاکەت و پانتۆڵی رەش و کراسی رەشمان لەبەر دەکرد و بۆینباخی رەشمان دەبەست، ئەوکاتەی سەراپا رەش لە رەشماڵی کۆچەرییەکان دەچووین، زۆر جاران دەمانبیست هاوڕێکانمان لە کۆلێژ دەیانگوت (قەلەڕەشەکان هاتن، واهاتن). هەرجارێك جلی رەشمان بپۆشیایە، ئاسمانیش رەش دەبوو، که سەرمان هەڵدەبڕی، لە هەورەکاندا روخسارێکی تەلیسماویمان دەبینی پێمان پێدەکەنی. هەرگیز لە نهێنیی ئەو دەموچاوە تێ نەدەگەیشتین کە ئاخۆ ئەهریمەنە، یان فریشتەیەکی خوداییی! دواجار هەموو روخسارەکان وێك دەچوون، هەموو خوێندکارەکان لە ئاسمان دەترسان، تەنیا ئێمە نەبێت دەوەستاین لە ژێریا، دەمانبینی خوێندکارانی کۆلێژ رایان دەکرد و دەچوونە ژێر چەترەکان، دەچوونە پۆلەکان، دەچوونە کافتریا و ژێر داڵان و درەختە سنۆبەرەکان، تەنیا ئێمە ئاسایی پیاسەی خۆمان تێك نەدەدا و هەنگاو بەرەوپێش دەڕۆیشتین، ئاسمان دای دەکردە باران و دڵۆپ دڵۆپ بارانی رەش، بارانی سوور بە قژماندا

شۆلاوگەی دەبەست، جلەکانمان رەشتر و رەشتر دەبوون، ئێمە هەر دەگەڕاین. هەموو مامۆستاکان بانگیان دەکردین( (شاپوور)، (کامەران) چی دەکەن! دەمرن! نەخۆش دەکەون! ئەوە باران نییە تێزابە! ئەوە غەزەبی خودایە دەبارێت! وەرن وەرن واز لە پیاسە بهێنن)، ئێمە دەڕۆیشتین و دەمانگوت (مامۆستا بارانە باران، لێی گەڕێ، ئازادیمان لێ زەوت مەکە، دەمانەوێت سەراپا بمانشواتەوە). تەنیا من و (کامەران) بەو بارانە دڵخۆش بووین، تەنیا بۆ ئێمەش دەبوو بە عەتر و یەك دڵۆپ لەو بارانە رەشە بۆگەنی بەردەدایە هەموو خەڵك، خۆشمان هۆی ئەوەمان نەدەزانی، تەنیا ئەوەندە نەبێ لەناو باراندا دەماندا لە شەقەی باڵ و دەفڕین بەسەر بینا بەرزەکاندا، دەفڕین بەناو گەڵای درەختەکاندا دەفڕین لە فڕیندا باڵەکانمان درێژ و درێژتر دەبوونەوە، دەفڕین و لە ئاسمانەوە دیمەنی شارمان دەبینی کە خەڵکی هەموو لە پەنجەرەکانەوە دەیانڕوانییە ئاسمان. دەمانبینی پەنجەیان درێژ دەکرد و دەیان گوت: سەیر کەن، سەیری ئەو دوو قەلەڕەشە بکەن چەند گەورەن. کە بیری ئەوکاتە دەکەمەوە، زۆر دەگریم. ئێستا مردنی (کامەرانی وەنەوشە) دەبێت گەیشتبێتە کوێ! من دەمویست باوەڕ بکەم نەم دەکرد، چونکە ئەو مرۆڤێك بوو خەیاڵی و نەمر. هەرگیز باوەڕم نەدەکرد رۆژێك دێت (کامەران) لە گۆڕستانەوە بانگم دەکات و لە بری شیعر و وتەی جوان، چڵێك ئەرخەوانم بۆ دەنێرێت، ئەرخەوانی چی! من نازانم گۆڕەکەشی لە کوێیە! رەنگە هەر گۆڕیشی نەبێت... رەنگە وەك مەسیح هەڵکشابێتەوە بۆ ئاسمان.

من و کامەرانی وەنەوشە زۆر حەزمان لەبەرگی رەش دەکرد، خشتەی خۆگۆڕینمان هەبوو. یەك شەممان رەشمان دەپۆشی، پێنج شەممان سەوز، وەك گەڵای دار سەوز بووین، وەك قەرسیلەکانی زەوی سەوز بووین، وەك بوولبول سەوز بووین، هەمیشە جێگای سەرنجی شار بووین. شاری دەشت ئەو شارەی لە دەشتا دروست کرابوو. شارێك پڕ لە ئەهریمەن، ئێمە بە رەسەن خەڵکی شارەکانی چیا بووین، بەڵام هەموو خەڵکی شاری دەشت ئێمەیان دەناسی، کە سەوز دەبووین، دەیانگوت واهاتن، سەیرکەن دوو مرۆڤە قەرسیلیەکە هاتن، ئێمە هێواش هێواش بە کۆڵانە قوڕەکاندا دەگەڕاین، پێمان بریسکەیان لێ دەتکا، شوێن پێمان هەمیشە رووناك بوون، وەك چۆن ئاوێنەیەك بەلاری تیشکی دەکەوێتە سەر، ئاوەها روونبوون، هەرکەس بەدوامانەدا بهاتایە دەیبینی هەتا چەندین رۆژ جێ پێکان دیار دەمان و مندالآن هەڵماتێنیان تێدا دەکردن. من دەمزانی هۆکارەکە من نیم و (کامەرانی وەنەوشە)یە خەڵکیش، دەیانگوت (ئەوە دوو کوڕە گەنجەکە لێرەوە رۆیشتوون، ئەوانەی بەیەك ریتم دەگەڕێن و مێشکیان بەهیچ شەکەت نابێت). ئێستا کە بیری ژیانی هەردووکمان دەکەمەوە دەگریم و فرمێسکەکانم لەسەر روومەتم شۆلاوگە دەبەستن و

رووناکیی گڵۆپی ژوورەکەم دەکەوێتە سەریان و وەك ملوانکەیەکی کریستاڵ بەدەر دەکەون. هەموو کات پێشم دەگوت: (کامەرانی وەنەوشە، ئەشق هەموومان دەکوژێت، گەڕان بەدوای حەقیقەتی گوڵدا ماندوومان دەکات).

هەمووان دەیانزانی ئێمە لەوان جیاوازین، دەستمان هەمیشە وەك یاقووت دەدرەوشایەوە. چاومدان تەڕ و پڕ ئاو بوو، ئەوەی منی لە (کامەران) جودا دەکردەوە، ئەو گوڵە وەنەوشەییە بوو کە بۆ هەمیشە دەیکرد بە گیرفانی جلەکانییەوە. زۆر سەیر حەزی لە گوڵی وەنەوشە بوو. ئینجانەکانی هەمیشە دەپاراست، زۆر جاران لە بەشی ناوخۆیی لە هاوڕێکانی تووڕە دەبوو، پێی دەگوتن (ئەم گوڵانە مڵکی منن، هەر خۆم، کەس بۆی نییە دەستییان بۆ ببات، ئەمانە لە بەهەشتەوە هاتوون و بە خوێنی دڵ ئاویان دەدەم).

گوڵەکانی وەك گلێنەی چاوی خۆی خۆش دەویست، زۆر جاران دەیگوت: (شاپوور سوبحان، ئەم گوڵانە بەیانیان ئارەقیان لێ دەتکێت، ئەگەر زوو هاتیت بۆ لام و گوڵەکانت بەتەڕی بینی، واهەست نەکەی ئەوە شەونمی دەم بەیان شتوونی). منیش دەمگوت: (بۆ؟ ئاوت داون، یان ئاوت پرژاندووە بەسەریاندا)؟ ئەو لە وەڵامدانەوەدا دەستی دەخستە گیرفانی و سەری دادەخست و وەك ئەوەی بەدوای دەنکە زەنگیانەدا بگەڕێت، وەك جلەکانی رەش هەڵدەگەڕا و دەیگوت: (نا من بەسەر گوڵەکاندا دەگریم، من رەنگی وەنەوشەیم زۆر خۆش دەوێت، گوڵەکانی تر مەستم ناکەن، گوڵەکانی تر درۆزنن، رەنگەکانیان رەنگی وەهمن، من گوڵەکانی ترم خۆش ناوێت شاپوور). ئەمەی دەگوت و دەستی لە گیرفانی دەردەهێنا و چاوە تەڕەکانی دەسڕی. پاشان دەیگوت: (شاپوور ئەی هاوڕێی عەزیزی من، ئەی ئەوەی لە ئاوەژووبوونەوەی وێنەکانم تێ دەگەی، من تەنیا دڵم بە تۆ دەکرێتەوە)... نەی دەگوت، بۆ واخەمبارە پاشان چەند وشەیەك لە لێوە ئاڵەکەیەوە دەترازان و لەگەڵ شنەی هەوایەکی شێداردا تێکەڵ دەبوون و بە دەنگییکی نەرم نەرم دەگەیشتنە گوێم: (شاپوور سوبحان تۆ سەیری تەلەفزیۆن و کۆڕ و کۆبوونەوەکانیان بکە، بزانە چەند ئینجانە و چەپکە گوڵ دانراون لە هەموو رەنگێك، بەڵام رەنگی وەنەوشەییەیان تێدا نییە، ئەوان لە (وەنەوشەیی) دەترسن. ئەزانی ئەو گوڵانە ئەو دەستە و ئینجانە گوڵانە خیانەتمان لێ دەکەن، چونکە گوێیان لە درۆی جۆراوجۆر دەبێ. درۆی سپی، درۆی رەش، درۆی نارنجی، درۆی سوور، بەڵام بۆمان ناگێڕنەوە) بەڕاستی وشەکانی سیحراوی بوون. ئەو هەمیشە دڵی بە وەنەوشەییەوە بوو. من نەم دەزانی بۆچی (وەنەوشەیی) چی دەگەیەنێت؟ نەم دەزانی کاتێك. زانیم بەهەشت لەجێ خۆی نەمابوو خودا لە هەمووان زیاتر دەگریا ئەودەمەی نهێنیی (وەنەوشە)م زانی،

فرمێسکی یاقووتی خودام دەبینی بە ئاسماندا دەهاتنە خوار، کاتێك دەکەوتنە ناو چاڵە ئاوەکانی شار، سەرتاپا زەوی شەقی دەبرد و دەبوو بە تۆز و دنیا زەردێکی کاڵی دەنواند رەنگی ئاو و رەنگی خاك دەبوونە زەرداو و دنیا زەردێکی کاڵی نەخۆشی دەنواند، بەڕاستی کارەسات بوو بریا نەمزانیبا (وەنەوشە) و رەنگی (وەنەوشەیی) چ بوون.

کارەساتەکان بەدوای یەکتردا دەهاتن، وەك ئەوەی تەزبیحێکت هەبێت و لەناوەڕاستی قەرەباڵغیی بازاڕدا بپێچرێتەوە و دەنك دەنك بەدوای یەکدا لە دەستت هەڵبێن، ئەوها کارەساتەکان دەهاتن، رۆژگارێکی شووم بوو. رەشەبا بوو، رەشەبای رەش. من ئێستاش لە رابردوویەکی تاڵدا دەژیم، ئەگەرچی پێش زەمەن کەوتووم، ئەگەرچی دوورم، بەڵام نزیکم لە رابردوو. من ئێستا لە دوورگەیەکم (وەنەوشەیی)، درەختەکان وەنەوشەیین، بیی سەر شەقامەکان، کچەکانی سەرجادە و شەقامەکان، ترافیك و ئۆتۆمبیلەکان، نەورەسەکان، ئاسمان هەموو وەنەوشەیین. خۆشم وەنەوشەیی دەپۆشم، دەخۆم و دەخۆمەوە، زۆر دوور دوورترم لە هەسارەی مەریخ، دوورم لە ئادەمیزادە دڕندەکان، لەوانەیماڵی خەڵکی بەتاڵان دەبەن، لەوانەی ناوگەڵیان شەهوەتی خیانەتی لێ دەتکێت، لەو مرۆڤانەی کاڵفامانە سۆزانییەکان لەخۆیان کۆ دەکەنەوە و داوای جووتبوون و سەرجێیان لێ دەکەن و گرانبایترین جۆری شەڕاب دەخۆنەوە، دوورم لەو سوڵتان و بەرپرسە حزبیانەی دەستییان بە خوێنی (وەنەوشە)کان سوورە.

من دەزانم ئێستا قاقا پێدەکەنن. دەنگییان دەبیستم، دەنگییان هەر ئەو دەنگانەیە کە هاوڕێکانمیان زیندەبەچاڵ کرد، هەر وێنەی ئەوانەن کە شەڕابی مەرگیان دەرخواردی خەڵك دەدا و پێدەکەنین، هەر ئەوانەن کە پڵنگەکانیان دەیانترساندین.

ئای خودایە چەند روونە لەبەرچاوم! چەند روونە! لەبیرمە هەر ئەو رۆژە (کامەرانی وەنەوشە) داوای لێ کردم ئەو وانەیە نەخوێنین، ئەو دەم لە کۆلێژی ئەندازیاری لە شاری دەشت دەمانخوێند، دیار بوو زۆر حەزین و خەمبار بوو، هەستم بە ئازارەکانی نەدەکرد. ئەو مرۆڤێك بوو سەرابی زۆر خەیاڵی، هەموو شتێکی نەدەگوت، بەڵام زۆر جاران خەندەیەکی تاریك، خەندەیەکی ئازاراوی بە روخسارییەوە دەنیشت، تا ئەو کاتەش کە کتێبە بەرگ وەنەوشەییەکەی دامێ و داوای لێ کردم نەی کەمەوە، نەم زانیبوو ئەو روخسارە بۆ وا خەمگینە؟ ئەو گوڵە وەنەوشەیانە بۆچی؟ ئەو بەرگە وەنەوشەییە بۆچی؟، بەڵام دوای چەند ساڵێك بەبیرمدا هات و لەناو جانتایەکی زۆر کۆندا لەنێو ئەرشیفەکەمدا کردمەوە.

پاشان بەخۆشحاڵییەوە داواکەیم قبووڵ کـرد، وەك وتم دیـار بـوو زۆر حـەزین بـوو. مـن پـێم دەگوت: (بمبوورە کوڕە وەنەوشەییەکە، وابزانم برینەکانتم کولاندەوە. من هەڵـە بـووم تکـا دەکـەم بمبوورە)، دیار بوو پێی ناخۆش بوو کە گوێی لە لێبووردن بێـت، سـەیرێکی دەکـردم و ناوچـەوانی چرچ دەکرد و چاوی دەنوقاند، ئیتر من دەمزانی دەڵێت: ئیدی واز بێنە لەو قسانە. ئـەو رۆژە یـەك شەممە بوو، هەردووکمان رەشپۆش بووین، رۆیشتین بە کۆلێـژدا، هێـواش هێـواش لەناوەنـدی ئـەو ڕاڕەوەدا کە ئەمبەروئەوبەری سنۆبەر بوو، پیاسەمان دەکرد، پێیـەکانمان دەبریسـکاندەوە، هـەموو هاو کۆلێژەکانمان ئێمەیان بەچاکی دەناسی، دەیانزانی ئێمە دوو مرۆڤین لـە تراویلکـە، دوو مـرۆڤین وەهمی، زۆر جاران لە بریسکەی پێیەکانمان دەترسان، دەسڵەمینەوە و سـام دایـدەگرتن. ئێمـە دوو هاوڕێ بووین، دوو برابووین، خەڵکی دەیان گوت دوو براکە، لە راستییدا برانە بووین، بەڵام هێنـدە تامەزرۆی یەکتری بووین رەنگی ئاومان گرتبوو. رەنگی یـەکمان گرتبـوو. زۆربـەی سـیفەتەکانمان دەچوونەوە سـەر یـەکتر. دەڕۆیشـتین و سـنەوبەرەکان دەهـەژان و سـەمایان دەکـرد. شـنەبایەکی ئارامییش یاریی بە پرچی درەخت و ئێمە دەکرد. هەردووکمان دەستمان لەنێو گیرفانەکانماندا بەنـد کردبوو. دەگەڕاین و باسی رابردوومـان دەکـرد. لەگـەڵ ئـەو پـەژارە زۆرەی (کامـەران)دا هێشـتا کوڕێکی قسە خۆش بوو. ئەو تا ئەو دەمە ئاشق نەبوو. کە باسی ئەشقیشـم بـۆ دەکـرد دەترسـا و دەیگوت: (ڕاستە قسەی تۆیە، رۆژێك دێت ئەشق هەمموومان دەکوژێت). ئەو کوڕێك بوو خـەیاڵ و خەونی تەفسیر دەکرد. ئەو (یوسف) بوو، زۆر زۆریش جوان بوو. لەوانە بوو کـە دڵێـك و سـەد دڵ ئاشقی دەبوو، بەڵام لەگەڵ کچاندا نە پیاسەی دەکرد نە رادەوەستا، نە دادەنیشت. تا ئەو دەمـەش هاوڕێی نەبوو جگە لە من و (بـەهرۆز چـاوڕەش) و (سـەهەند)، ئـەو کـوڕەی کـە ئاشـقی کچـە (گاورێك) بوو، پاشان خۆی کوشت و دڵی هەمموومانی بریندارکرد. ئەو کوڕە حەیرانبێـژەی ئـاوازی بە گوێی خەڵکی و ئاسماندا دەچرپاند و لەو زەمەنەی ئێمەی تێدا ژیـاین، لەناوچـوو. ئـەو کـوڕەی (کامەران)ی زۆر خۆش دەویست و هەمووجارێك بە مەنجەڵێك یاپراخەوە دەهاتە بەشی نـاوخۆیی و لەگەڵ من و (کامەران) تا درەنگانی شەو دەمایەوە و پاشان دەڕۆیشت.

ئێمـە هـەر پیاسـەمان دەکـرد. وادیـار بـوو زۆر لـە هاوپۆلـەکانمان لەوانـەی (ئەنـدازەی لیکالاکردنەوە)دا بوون، ئەو وانەیەی کە (کامـەرانی وەنەوشـە) تێیـدا بـەرزترین نمـرەی دەهێنـا، چونکە وانەیەك بوو توانای خەیاڵی ئەندازیاری دیاری دەکرد و ئەویش زۆر بەرزەخەیاڵ و خەیاڵتیـژ بوو، دەڕۆیشتین و پاسارییەکان بەسەر سنەوبەرەکانەوە دەیانجریوانـد. ئـەو رۆژە رۆژێکـی کـەمێك هەتاوی بوو، خۆر جار جار خـۆی نیشـان دەدایـن و جـار جـار خـۆی دەشـاردەوە، لـەناو هـەورە

سپییەکاندا کە وەك مەل و وەك نەورەس بەئاسماندا بلاو ببوونەوە. وا دیـاربوو ئـەو رۆژە جـودا لـە رۆژەکانی دی نامۆ بوو. هەموو رۆژانێکی یەکشەممە رووداوێکی نامۆ رووی دەدا، رووداوێك کە لـە زەینمدا هەر دەمێنێتەوە تا ئەو رۆژەی لوتم ئەیدا لەبەردی ئەلحەد، وا دیار بوو ئەو نـەی دەویسـت هەرگیز باسی نهێنییەکانی خۆیم بۆ بکات، من پێم دەگـوت: (کامـەرانی وەنەوشـە) ئـەی کـوڕە وەنەوشەییەکە چیتە؟ بۆ نهێنی لە برای خۆت دەشاریتەوە، من زیاتر لە هەموو کەسێك تۆم خـۆش دەوێت، تۆش بەهەمان شێوە منت خۆشت دەوێت ئیتر چی؟ ئەو لە وەلامدا بەئەسـپایی دەیگـوت: (شاپوور)، تو سەری خۆت واز لەو قسەیە بهێنە هیچ نییە، خۆم مرۆڤێکی پـاییزیم، هەمیشـە وا بووم، دایکم وتوویەتی تۆ هەر لە مندالییەوە پەژارەیەکی قوولێ لەناوچەوانتدا دیار بووە. هـەر ئـەو دەمەش مامانەکەم زۆر ترساوە. ئەو دەیگوت:، مامانەکە بۆی گێڕاومەتەوە، کە هـەموو چـراکان کوژاونەتەوە، لەگەڵ لەدایکبوونمدا دەیگـوت: ئاسمـان سـامالێ بـووە، بـەلام ئەسـتێرەکانیش دیـار نەبوون. ئـەو شـەوە زۆر ترسـناك بـووە (شـاپوور)! پاشـان قاقایـەکی لێ دا و گـوتی: (لەوانەیـە مامانەکەم هەر زراوی چووبێت کە ژوورەکە تاریك بووە، ئیتر واز بێنە من لـە ئەزەلـەوە خـەمگین بووم هیچ نییە براکەم، هیچ نییە).

من زۆر بە پەرۆشەوە گوێم بۆ دەگرت. ئەو زۆر زیرەك بوو. وشەکانی هێندە راسـت بـوون نـەم دەتوانی تەنیا ساتێکیش لێان خافلێ بم، تەفسیری (خەون) و خەیالی دەکرد، بەرنامەی رۆژانەی بـۆ دادەڕشتم. من وەك ئەو بەهرەی نووسینم نەبوو، بەلام ئـەو ئەگـەر بمایـە نووسـەرێکی بلیمـەت و ئەندازیارێکی داهێنەر دەبوو، بەلام مرد و هەلکشایەوە بـۆ ئاسمـان. چـیی بـۆ ئایینـدە دەگـوت، هەمووی راست دەردەچوون. هەرجارێك دەیگـوت: (ئـەمڕۆ بـاران دەبارێـت)، راسـت دەردەچـوو. هەندێك جار ئاسمان سامالێ بوو، هەتاو بوو، ئەو دەیگوت: دەبینم بـاران دەبارێـت، زۆر حـەزی لـە باران بوو. هەمیشە کە باران دەباری دەیگوت: (باران ئەمان شواتەوە لە گوناه).

ئێمە هـەر پیاسـەمان دەکـرد و دەڕۆیشـتین. مـن دەسـتم دەکـرد بەگیرفانمـدا و جگەرەیـەکم دەردەهێنا و دام دەگیرساند. بەهەناسەیەکی قوولەوە مژم دەدا. ئەو هەرگیز جگـەرەی نەدەکێشـا. بە دووکەلەکەشی پەست دەبوو. زۆر رقی لە دووکـەلێ بـوو. هەسـتی دەکـرد یـەکێك دەسـووتێت. دەیگوت: (ئەم دووکەلە شوومە لابدە (شاپوور) کەسـێك دەسـووتێت. لەترسـا مـنیش خێـرا دەم کوژاندەوە، نەوەك ئەو کەسە خۆم بم. دواجار دەیدایە قاقـای پێکـەنین و دەیگـوت: گالتـەم کـرد. منیش لە داخی جگەرەکە بەئەسپایی چەپۆکێکم دەدا بەشانیدا و دەمووت: زەرەری ئەو جگەرەیەت بۆ لێدام (کامەران) گیان.

ئێمە زۆر تەبا بووین تـا ئـەم کاتـەش کـە مـن ئـەم کتێبـە بـەرگ وەنەوشـەیە دەستنووسـە دەخوێنمەوە هیچ کاتێك دڵمان لـە یـەکتر زوویـر نـەبووە، هەمیشـە پێکـەوە بـووین، ئەگەرچـی ژوورەکانمان لە یەکتر جودا بوو لە بەشی ناوخۆیی، بەڵام هەر لە هەمان باڵەخانەدا بووین، تەنانـەت نانخواردنیشمان بەیەکەوە بوو، بۆ خـەوتن نـەبێت کـە دەگەڕامـەوە ژوورەکـەی خـۆم. ئـەو خـۆی دەیگوت: حەز دەکەم بەتەنیا بخەوم.

ژوورەکەی (کامەرانی وەنەوشە) باڵکۆنێکی بچکۆلانەی هەبوو کە دەیڕوانـی بەسـەر بـازاڕدا. لەو باڵکۆنەدا دوو ئینجانە گوڵی وەنەوشەی دانابوو. جێگایەکی باشی بۆ دابـین کردبـوون. وەك وتم ئەو لەوەتەی فامی کردبۆوە، ئاشقی گوڵە وەنەوشە بوو، نەم دەزانی بۆ؟ هەتا ئەوکاتەی کە کتێبـە دەستنووسە وەنەوشەیەکەم خوێندەوە، لەکاتی چاودێری کردنی گوڵەکانیدا ئێـواران لـەو باڵکۆنـەوە سەیری دیمەنی قەرەباڵغی بازاڕ و زەردەی ئێوارانمان دەکرد و دەمانبینی کـە چـۆن خـۆر ماڵئـاوایی دەکات و خۆی بۆ گەڕیانی دووهەمی ئامادە دەکاتەوە، وەك چۆن سـەربازێك شـانەی تفەنگەکـەی بـەتاڵ دەبێـت و سـەر دادەنـەوێنێت لـەناو سـەنگەرەکەیدا بـۆ دووبـارە پڕکردنـەوەی و خـۆ ئامادەکردنەوەی بۆ جەولەی دووهەمی شەڕ، ئەوها خۆریش لەودیو قـووڵایی چـیاکانەوە لـەودیوو ئۆقیانووسە دوورەکانەوە خۆی کۆدەکردەوە بۆ سبەی، ئێمە هەر لـە تێڕامانـدا بـووین (کامـەرانی وەنەوشە) هەردوو دەستی دەخستە سەر محاجەرەی باڵکۆنەکەو بڕێك خۆی دەنوشتاندەوەو دەیگـوت: (شاپوور) (دنیا سەیرە تۆ تەماشاکە ئەم حەشاماتە، ئەم هەموو خەڵکە، هـەموو بـەدوای بـژێوی ژیاندا وێڵن ژیانێکی بێ مانا و دووبارە، ئێمە هەمیشە رەنج دەدەین مێرولە ئاسـا، بـەڵام مرۆڤـە داوێن پیسەکان دەیخۆن، ئەوانەی جامی ئوتومبێلەکانیان رەشە، من زۆر جـار بـیر دەکەمـەوە لـە ژیان، بەڕاستی خودا ئێمەی لەسەر شانۆی خۆی داناوە و کۆمەڵێك کارەکتەرین، هەریەکە دەورێـك دەگێڕین، لە دواییدا، دەدۆڕین یان دەبەینەوە)، هەر بەردەوام بـووین لـە سـەیرکردنی دیمـەنی ئـەو منداڵە گوڵەبەڕۆژە فرۆش و بۆیاخچیانەی، هاواریان دەکرد (: وەستا وەرە لۆت بۆیاخ بکـەم ئـەمن شاز دەزانم بۆیاخت لۆ بکەم، کچـانی شـارمان دەبینـی نـاوە نـاوە دەهـاتن و دەچـوونە دووکـانی شامپۆفرۆشەکان بەر لە کڕینی شامپۆکان سەرەکەیان هەڵدەپچڕی و بۆنێکیـان دەکـرد و بەچـرپە و ئاماژەکانیاندا دیاربوو دەیان گوت بەچەندیە وەسـتا و دەیـان کـڕی. لەوسـەری شـەقامەکە (مـام عەزیزی کریستاڵمان) دەبینی بە خۆی و مێزە شووشە بچووکەکەیەوە لەسەر شۆستەکە دەوەسـتا و هەر سەیری ئەم لاو ئەو لای دەکرد و کڕیاری بەلای خۆیدا رادەکێشا و هـاواری دەکـرد دەیگـوت:

(وەرن جوانترین و نایابترین جۆری زیوی ئیتالیتان بـدەمێ! زیوێـك لەگـەڵ خـوێنی مرۆڤـدا قسـە دەکات!) بەردەوام هوتافی دەکێشا و جار جارەش دەستییکی بۆ چاوی دەبرد و دەیخوراند.

ئێمـە هـەر تەماشـای دیمـەنی بازاڕمـان دەکـرد و وردە وردە سـەرنجی ئەمبـەر و ئەوبـەری بازاڕەکەمان دەدا و لە دوورەوە دەمانبینی (هەندرێنی کمالیات) دەستی بڵند دەکـرد و سـڵاوی لێ دەکـردین، ئێمـەش زۆر بەگـەرمی و دەسـت لەسـەر سـنگ وەڵامـان دەداوە. چـەند مانگێـك بوو(هەندرێن)مان دەناسی، هەرچیمان بوویستبا دەچووینە لای ئەو دەمانکڕی، لە (عەتر و کـرێم و جێڵ و کلێنکس و شامپۆ و بۆنی ژوورو...زۆر شتی تر) بـەردەوام دەیگـوت: هاوڕێیـان (مـن زۆر کەیفم بە ئەنگۆ دێت، ئەمە براینە برا هەرچیتان ویست وەرنە کنە مـن، بـە بـەلاش دەتانـدەمێ، ئەنگۆ جودان لەو شارەیدا. ) بە سپاسەوە دەمانگوت: (هەندرێن) گیـان سـپاس خـۆت مرۆڤێکـی بەڕێزیت، گەورەیی خۆتە هاوڕێی ئازیزی ئێمەیت، لە پاداشـتدا زۆر جـار بانگێشـتمان دەکـرد بـۆ کۆلێژ و کاتێکی زۆر خۆشمان دەبردە سەر).

ئەو رۆژە یەك شەممە بوو ئێمە ئەو وانەیە نەچـووینە ژوور و بـەردەوام پیاسـەمان دەکـرد، زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە جگەرەکەم فڕێ دا. دەیگوت: (شاپوور) براکەم! برا گەورەکەم! جگـەرە بـۆ تەندروستیت باش نییە دەزانم، من و تۆ هەردووکمان رۆژێك دەمرین، پێشت نـاخۆش نـەبێت کـە دەڵێم برا گەورەکەم). بەڕاستی، مرۆڤێکـی بەخشـندە بـوو زۆربـەی کـات کتێبـی دەخوێنـدەوە و تێبینییەکانی دەنووسی و رادەما و لە زیهنیدا زۆرانبازیی لەگەڵ پاڵەوانەکان دەکرد و دەینووسـی. کە شەوان دەچووم بۆ ژوورەکەی بۆنی گوڵە وەنەوشـەیەکان لـە دەرگـای باڵکۆنەکـەوە بـە هـەوای شێداری شەودا نەرم نەرم دەیاندا بەدەموچاومدا. دیمەنی ئەو گڵۆپە سەوزەش ژوورەکەی کردبوو بـە ژووری نووسەرە گەورەکان و دەمبینی لەسەر مێزەکەی دانیشتووە و خەریکی شیعر نووسـینە. زۆر هۆگری گۆرانییەکانی (داریوش) بوو. دەیگوت: (حەرامە پاش (داریـوش) گـوێ لـە گـۆرانیی تـر بگرین. (شاپوور) منیش زۆر حەزم لە دەنگی (داریوش) بوو، ئەو گۆرانیبێژە فارسیە شۆڕشـگێڕەی لە مەنفا دەژی و هەمیشە بیری وڵاتەکەی دەکات و لە ئاسۆ رادەمێنێت، ئەو ئێمـەی کردبـوو بـە (دەروویشی) خۆی و بەدەنگی کاس و سەرسام دەبووین و لەگەڵ وشە و مۆسـیقا سـیحراوییەکانیدا ئاوێتە دەبووین و تێکەڵی نۆتەکانی دەبووین و دەتواینەوە.

پاش پیاسەکردنێکی زۆر و بێوچان دەستم خستە سەر شانی و پێم وت: (کامـەرانی وەنەوشـە) ئەی گوڵە وەنەوشەیەکە با بچین دابنیشین. دەستییکم برد بۆ گوڵەکەی سەرسـنگی و سـەرم نزیـك کردەوە و بۆنم کرد. بەراستی بۆنێك بوو بەهەشتی، لە ژیانمدا بۆنی وام هەست پێ نـەکردبوو. هـەر

ئەو بۆنەش بوو کە زنجیرەی چیرۆکەکەمانی دروست کرد و بەرەو دنیا جیاوازەکان بلاوی کردینەوە. لەگەڵ بۆنکردنیدا بەئەسپایی ڕێڕەوی خۆمان بەلاڕێیەکدا وەرگێڕا و وردە وردە سەرکەوتین. بەرەو باخچەیەکی بچکۆلە کە دەکەوتە بەشی سەرەوەی کۆلێژو دەستە دەستە هاو کۆلێژەکانی خۆمان دەبینی یەك یەك و دوو دوو، کۆمەڵ کۆمەڵ هەندێکیان وەستا بوون، هەندێکیان پیاسەیان دەکرد و هەندێکیان لەسەر وانەکانیان دایەلۆگیان بوو. ڕۆیشتین و جار جارە سلاومان دەکرد و سلاومان لێ دەکرا. هەندێك چاو وەك چاوی هەڵۆ چۆن لەبەرزاییەکی زۆرەوە لەئاسمان نێچیرەکانی خۆی بەدی دەکات و باڵەکانی دەکاتەوە و وەك هەورە برووسکە لووری زەوی دەبێ و نێچیری داماویش لەترسا رادەکات و باز دەدات تا دواجار هەناسەی سوار دەبێت و خۆی تەسلیمی دەنووکی تیژی هەڵۆکە دەکات، ئەوها بەوشێوەیە سەیریان دەکردین و لە دڵەوە لەداخانمان خۆیان دەخواردەوە. هەندێکی تر لە ژێر لێوەوە دەیان کردە غەڵبە غەڵب و دەیانچرپاند و دەیانگوت: سەیرکەن، سەیری ئەم دوو قەلەڕەشە بکەن نازانم بۆ ڕەشپۆشن؟ خۆزگە بمان زانیایە بۆچی؟، من و (کامەرانی وەنەوشە) بەبێ ئەوەی خۆمان تێك بدەین، بەلایاندا تێدەپەڕین و هیچمان نەدەکرد. زۆرمان نەمابوو بگەینە باخچەکە لەویادا لەگەڵ (بەهرۆز چاوڕەش)دا دەوەستاین و ئەم لاو لای یەکترمان ماچ دەکرد. (بەهرۆز) کوڕێکی چاوڕەش بوو. چاوی گەورە بوون، چواردەورەی چاوی وەك خەڵووز وابوو. برژانگەکانی وەك تاڵی فڵچە درێژ و ڕەش بوون، ئەو لەبەشێکی تری هەمان کۆلێژ بوو، لەسەرەتای پڕکردنەوەی فۆرمی دەستپێکردنی خوێندنەوەدا بوو بە هاوڕێمان و زۆر جار پێکەوە لەگەڵی دادەنیشتین. (بەهرۆز شوکری) بە چاوە ڕەشە گەورەکانییەوە سەیری من و (کامەرانی) دەکرد و لێی دەپرسین و دەیگوت: (چۆنن هاوڕێیان! وەڵاهی بیرتانم دەکرد، ئەوە بۆ دیار نین! بەناشکوری نالێم، هەموومان سەرقاڵین. خوێندن یەخەی گرتووین، ئەبێت بخوێنین. کەسانێك هەن چاویان لە شان و باهۆی ئێمەیە.) زۆر بەکەمی چاوەکانی دەترووکاند. دەیدا بەشانی مندا و سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی دەکرد و چاوە بازەکانی بۆ کیژە جوانەکانی کۆلێژ دەگێڕا و دەیویست بەوچاوە پڕ سیحرانەی نێچرێکی ناسك لە داو بخات و ڕاوی بکات. ئێمە لەو دەمەدا خواحافیزیمان لە (بەهرۆز چاوڕەش) دەکرد و (کامەران) پێی دەگوت (چاوڕەش چاوت جوان بگێڕە بەناو گوڵەکاندا دواتر لە حەقیقەتی ئەوان تێ دەگەی)، ئەو قاقایەکی لێ دەداو دەیگوت: (هەروا دەکەم براکانم خەمتان نەبێت) دەستییکی بەرز دەکردەوە و خواحافیزی لێ دەکردین. بەڕاستی سەختە من ئەم وشانە بۆ پێنووسەکەم دەگێڕمەوە و خەریکم تەماشای وێنەکان و (کتێبە وەنەوشەییەکەی) (کامەران) دەکەم من ئێستا هاوڕێی پێنووسێکی ڕەشم لەگەڵ چەند بەندە کاغەزێك و پانزە شانزە

کاغەزم ڕەش کردۆتەوە و جار جار چەند تنۆکێك ڕۆندك لە چاوەکانم دەکەونــە خــوار و مەرەکــەبی سەر پەڕە کاغەزەکە دەشێوێنن. منیش خێرا بە دەســرەکاغەزییەك خــەریکم دەیــان ســڕم، خــەوم نایەت بەدەم ئازاری ڕوح و جەستەو دڵمەوە وادرەنگە من هەر دەنووسم ناسرەوم و یادگاری ڕۆژانــی زوو وەبیر خۆم و هاوڕێ دێرینەکەم (پێنووس) دێنمەوە ئەو زمانی نییە قسە بکات تەنیا بەڕاست و چەپ و سەر و خواردا سەما دەکات. لەسەر پەڕە کاغەزەکان خــاڵ دەکێشــێت، هێــڵ دەکێشــێت، دەنووسێ (پ) دەنووسێ (و) دەنووسێ (ن)، نازانم دەنووسێت... دەنووسێت... شەو تاریك دادێــت ئەو هەر دەنووسێت. ئای (کامەرانی وەنەوشە)! ئەو بوو منــی کــرد بــە هــاوڕێی پێنــووس، بۆیــە دەنووسم.

لەو کاتەدا دەگەیشتینە باخچەکە، باخچەیەکی بچکۆلە پــڕ لــەگوڵ و درەختــی ســەوز، بــەڵام (کامەرانی وەنەوشە) دڵی بە ڕەنگی وەنەوشەییەکان دەکرایەوە. هەر لەویادا ڕووناکی خــۆر گــەڵا و چیمەنە سەوزەکانی ترووسکەدار کردبوو، بەراستی دیمەنیکی جوان بوو، ئەو دیمەنە بەشــێکی زۆری ئەم چیرۆکەی دروست کرد، لە سووچێکی باخچەکەوە کە چــەند کورســییە دارینەیــەك دانرابــوون. ڕۆژانە خوێندکارەکان وێنەیان تێدا دەگرت. چەند خوێندکارێك دانیشتبوون، نــازانم چ هێزێــك بــوو پاڵی بە ئێمەوە نا تا بەرەو ئەو باخچەیە بــڕۆین! هێزێــك کــە دەســتی خــودا لــە پشــتیەوە بــوو. هەستمان دەکرد ڕێگاکەمان ئاڕاستەی خــۆی بــەرەو ئــەو باخچــەیە گۆڕیبــوو. هــەر لــەو کاتــەدا (کامەرانی وەنەوشە) وتی (دەزانیت دیمەنی ئەو کورسییانە جوانن؟، بەڵام من ڕقــم لــە کورســییش دەبێتەوە. تۆ نازانیت چەند شەڕ کراوە لەسەر کورسی لە دنیادا، هەتا لە وڵاتی خۆشمانــدا کورســی پێشینەیەکی ناشرینی هەیە، کورسی شەش قاچی هەیــە، کورســی یــەك قاچــی هەیــە، ئەوەنییــە دەنگ هەیە، دەڵێن دیکتاتۆرەکە دەرووخێنن، دوایی شەڕ لەسەر کورسییەکەی هەڵ ئەگیرســێتەوە! بزانە وا دەبێت یان نا)؟ وەك لەسەر باڵی نەورەسەکان بەرز بەرز بفڕین و لەئاسمانەوە هــاواری خــودا بکەین، لە ناخی خۆماندا هاوارمان لە ڕوحی خۆمان دەکرد، بەئاگابە ئەی ڕوحی چــاك، دنیــا لــە لێواری گۆڕاندایە، ئێوەیش بەرەو دنیا بکرێنەوە، زۆر حەزمان لــەوە بــوو کــە دوای بەدەســتهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریوس بڕۆین بۆ دەرەوە، بۆ تەواوکردنی ماستەر و دکتۆرا، بــەڵام ئەمانــە هــەموو خەونبوون. خەونێکی تیۆری، خەونێك لەئاو ڕوونتر و لە بۆشایی ئاسمان بۆشتر. خــەونێك بــوو وەك خەونی بن دەوارێکی کونکون! بەڕاستی خــەون (مەیــدانی حــەزە کپکراوەکــانی هەســتی دەرەوەی مرۆڤە). وەك دکتۆر عەلی وەردی دەڵێت: (ئەوەی بەڕۆژ دەیبینیت بــۆت ناکرێــت، بەشــەو لــەنێو خەونێکی ڕەنگ پەمەیدا بەئاسانی وەدەستی دێنیت. (کامەرانی وەنەوشە) باسی خەونەکانی خۆی

بۆ دەکردم کە دەیگوت: خەون وێنەدانەوەی واقیعێکی کوژراوە، هەمیشە باسی (قەلەڕەشەکەی بۆ دەکردم).

دواتر لەم سەری باخچەکەوە سەیری ئەوسەرمان دەکرد و دەمانبینی ئەوە چوار کچ، لەسەر کورسییەکان دانیشتوون و راوێژ دەکەن لەسەر وانەکان و کتێبەکانی دەستییان ئەم دیو و ئەودیوو دەکەن و زەردەخەنە دەبارێنن و نقورچك لە یەکتر دەگرن و دەستبازی دەکەن و دەتریقێنەوە و قژی یەك رادەکێشن. چوار کچ لە رەنگی فریشتە، چوار کچ جوان و ناسك وەك پەڕەی گوڵ، خوێنشیرین سەرنجڕاکێش، ئەوان ئەو چوار کچە بوون کە لەناو شاری دەشتدا بەناوبانگ بوون، لەناو کۆلێژدا کوڕان حەیرانیان دەگوت و گۆرانیان بەبالاَیاندا دەچڕی. هەریەکە و بەرگێکی ناسکی لەبەردا بوو. هێندە تەرپۆش بوون، نازیان لێ دەباری. عەتریان لێ دەباری. بۆنی عەتریان رۆژە رێیەك دەڕۆیشت و دنیای کاس دەکرد، تەنانەت پەپوولەکانیش بەدەوریاندا سەمایان دەکرد و گۆرانیان دەگوت. پەپوولەکان لەسەر پرچیان دەنیشتنەوە، بە سنگیانەوە دەنیشتنەوە، بەراستی پەپوولەکان حەرامزادە و بەئالۆوش بوون. بۆنی گۆی مەمکی ئەو چوار کچەیان دەکرد. وەك ئەوەی زۆر ئاسوودەبن، پەپوولەکانیان نەدەتۆران و گەمەیان لەگەڵ دەکردن. ئەوانیش بەدەوری خۆیاندا دەسرەکانیان بادەدا. هەر چواریان سەرو دەستەسرێان پێ بوو. دەستەسرەکان پەمەیی بوون. ئەوان بەوە ناسرابوون کە پێیان دەگوترا گرووپی دەستەسر بەدەستەکان، یان (گرووپی دەستەسرِ پەمەیەکان) و ناوی تر. ئێمە تا ئەوکاتە ناویانمان نەدەزانی. پاش ئەوەی ئاهەنگێکی گەورە ساز درا، ناوەکانیانمان زانی و یەکترمان ناسی. ئێمەی رەشپۆش هەر لە باخچەکەدا تەماشای ئەو چوار کچە جوانەمان دەکرد و لە جوانییەکەیان تێر نەدەبووین. چوار کچ بوون لە رەگەزی پەرییەکان. لەنێوانیاندا یەکێکیان لەهەمووان جوانتر بوو. کات دەڕۆیشت و ئێمە هەر سەیرمان دەکرد. درەختەکان دەجوولاَن و گەلاَکان خشەیان دەهات و ئێمە هەر دەوەستاین و تەماشامان دەکرد. خۆر خۆی لە پەڵە هەورێکی سپییدا دەشاردەوە و زەوی رەنگی تێر دەبوو. چۆلەکەکان لەناو لقی دارەکانەوە گۆرانیان دەگوت و لەگەڵ خشەی گەلاَکاندا تێکەڵ دەبوو. کچەکان هەر یارییان دەکرد و پێ دەکەنین. بەراستی پێکەنینێکی سەیر بوو، پڕبوو لە گۆرانی، پڕبوو لە مۆسیقا، پڕبوو لە گریان، پڕبوو لە بەزەیی، پڕبوو لە پەشیمانی. وەك ئەوەی پەشیمان بن لەوەی کە کچن. وادیار بوو دەترسن لە ژیان. پێکەنینەکانیان پڕبوو لە نەغمەی جودایی. پڕبوو لە ئاوازی تەنیایی و توانەوە لەناو شووشە شەڕابێکدا، وەك کلۆ بەفرێك سوورِ دەبوونەوە، یەکەم نیگای (کامەرانی وەنەوشە) ئەو کاتە دەستی پێ کرد کە پەڕە کاغەزێك لەنێو کتێبەکەی (دلاَرام)ەوە با بردی و بای شووم بە

ئاسماندا وەك كۆلارە دەیفراند و دواتر لەوسەری باخچەکە لەبەردەم پێی (کامەرانی وەنەوشە)دا دەکەوت. (کامەران)یش بە ئەسپایی دادەنەوییەوە و پەڕەکەی هەڵدەگرتەوە و بە منی گوت: (شاپووری خەزان) ئەو نازناوەبوو ئەو بە دیاری لەمنی نا. با بۆی ببەینەوە. منیش بەسەر ئاماژەم دەکرد، بەڵێ و پێکەوە دەڕۆیشتین، هێواش هێواش دەچووینە بەردەمیان و سلاوێکمان لێ دەکردن و (کامەرانی وەنەوشە) دەیگوت: (خانمەکەم، ئەم پەڕەیە لەنێو کتێبەکەی تۆوە با هێنای و لەبەردەم ئێمە کەوت، ئەوا منیش بۆم هێناویتەوە، رەنگە زۆر بەلاتەوە گرنگ بێت). لەو کاتەدا (دڵارام میهرداد) سەری هەڵدەبڕی و بەچاوە هەنگوینەکانی تێر دەیڕوانییە (کامەرانی وەنەوشە) و، دەیگوت: (سپاس)! چ سپاسێك! هەستبزوێن، دەنگییك شووشەی دەزرینگاندەوە، ئاو دەوەستا، باڵندەکان بە ئاسمانەوە لە باڵە فڕەدەکەوتن و گوێیان لێ دەگرت، ئەو کە دەیگوت: سپاس و (کامەران) چاوی پڕ دەبوو لە دڵۆپە رۆندك و وەك دەریا تەڕ دەردەکەوت. لێوەکانی هێندە ئاڵ دیار بوون، (کامەران) پێیان مەست دەبوو. بەڕاستی وێنەیەکی جوان بوو ئەو دەمەی کە (کامەرانی وەنەوشە) پەڕە کاغەزەکەی دەدایە دەست (دڵارام میهرداد)، ئێمە نەماندەزانی ناویان چییە، هەر چواریان تەماشای یەکیان دەکرد و تەماشای ئێمەیان دەکرد و بزەی شەرمیان دەباراند. ئێمەش نەماندەویست زیاتر بووەستین، نەبادا خەڵکانێکی دواکەوتوو قسەوقسەڵۆکمان وەدوو بخەن. ئەوان دەترسان چونکە وەستان و پێکەوەبوونی کچ و کوڕ تاڕادەیەکی زۆر لەو شارەدا نەنگی بوو، من بە (کامەرانی وەنەوشە)م دەگوت (کوڕە بابڕۆین) (دڵارام میهرداد) هەرسەیری (کامەرانی وەنەوشە)ی دەکرد و سەیری گوڵە وەنەوشەییەکەی یەخەی چاکەتەکەی دەکرد، ئەوە ئەو دەمە بوو ئێمەی گەیاندە ئەم رۆژە دەبوو ئەو پەڕەیە بەدەم باوە بهاتایەو بکەوتاتە بن پێی (کامەرانی وەنەوشە)، دەبوو هێزێکی دەرەکی پاڵ بە ئێمەوە بنێت بۆ ئەو باخچە بچکۆلەیە بمان بات دەبوو (کامەرانی وەنەوشە) گوڵێکی وەنەوشەیی لە یەخەی بدات، دەبوو جلی رەش لەیەك شەمماندا بپۆشین.

چیرۆکەکە واتەواو دەبوو، ئەم هەموو شتە دەبوو بن زۆر شتی تر بن و ماون، من وا بیر دەکەمەوە و دەیان نووسم، بامێنن بۆ مێژوو.

شەوێك چووم بۆ لای (کامەرانی وەنەوشە) لە ژوورەکەی خۆی خەریکی خوێندنەوەی قەسیدەی (قەلەڕەش)ی (ئێدگار ئالان پۆ) بوو. دەیگوت: (بەراستی ئەم قەلەڕەشە هاتۆتە خەونم (شاپووری خەزان). من بەرەو ژیانێکی تر دەڕۆم. خۆشم ناتوانم ئەم خەونە بهێنمە دی. زۆر خەوی خەڵکم تەفسیر کردوە، بەڵام نازانم ئەم قەلەڕەشە چییە؟ (شاپووری خەزان) مـن بەرەو قـوولایی ئاسمان دەڕۆم. من دەگەڕێنەوە بۆ (ئاسمان). من کاری زۆر گرنگم هەیە لەوێندەرێ دەبێت بیانکەم)، منیش دەمگوت: (کامەران) مەترسە خەون هیچ نییە، تەنیا هەندێك حاڵەتی دەروونییە بەسەر مرۆڤدا دێت. مەترسە (وەنەوشە) گیان)، ئەو دەیگوت: (بەڕاستی (ئالان پۆ) ڕەشبینە. دەیگوت: (کۆمەڵێك نووسەر هەبوون ڕەشبین بوون و هەندێکیان خۆیان کوشتووە، یان بە مەینەتی و شێتی و بۆهیمیەوە تلاونەتەوە و لەناوچوون وەك (سادق هیدایەت) و (ڤێرجینیا ولف) و (ئارتۆر رامبۆ) و (کافکا) و (ڕۆبەرت والزەر) و زۆری دیکەش.

ئەمانە چێژیان لە مردن وەرگرتووە. ئەوە (رامبۆ) سەفەری بیابانی دەکرد و چێژی لە لم وەردەگرت. سەیرە زۆر کەس ژیانی خۆش دەوێت زۆر کەسیش رقی لەژیانە و حەز لە مەرگ دەکات. رۆژانە دەیان کارەسات دەبینین). دەیگوت: (کارەسات بەڕێوەیە (شاپوور)! کارەساتی خوێناوی. ئەم وڵاتە نوقم لە خوێندا دەبێت دڵنیابە. بە دواکەوتووترین وڵات ناو دەردەکەین). منیش دەمگوت: (ڕەشبین مەبە، خەم مەخۆ، هیچ شتێکی وانابێت، سەلامەت دەبین). من دەمزانی ئەو راست دەکات، ئەو تەفسیری خەیاڵات و خەوی دەکرد، راستگۆ بوو. ئەو (یوسف)ێکی نوێ بوو، بەڵام دڵخۆشیی خۆم دەدایەوە کە وانییە.

بەڕاستی کە دەمبینی (کامەرانی وەنەوشە) زۆر بە وردی بۆم دەدوێت، لەناخەوە زۆر دەترسام، دەمزانی سبەی شەڕ دەبێتەوە دەمزانی سەرلەبەری ژیان هەڵدەوەشێتەوە، دەمزانی کۆترەکان چیدی بەم ئاسمانەدا نافڕن و ڕێی خۆیان بەرەو باکوور دەگۆڕن. نەورەسەکان چیدی بەسەر دەریادا نافڕن، روو لە بیابان دەکەن و دەست دەکەن بە لم کۆکردنەوە و هێلانەکانیانی پێ دروست دەکەن. (کامەرانی وەنەوشە) فێری زۆر شتی کردم، مامۆستایەکی بلیمەتی (من) و هاوڕێکانم بوو، ئەوەی ئەو فێری کردم هەرگیز هیچ وتاربێژێکی مزگەوت هیچ سەرکردەیەکی سیاسی فێرم ناکەن، ئەو سیاسیانەی لە دوای راپەڕین و دوای شەڕی ناوخۆ و ئاشتبوونەوەیان جگە لە کۆکردنەوەی پارە و خشڵ و زێڕ و دزی فێری هیچ وانەیەك نەبوون. فێری ئەوەی کردم رقم لە هەموویان بێتەوە. ئەو دەیگوت: (شاپوور) ئەم مەسئولانە نامەی دکتۆرای دزیکردنیان هەیە، پسپۆڕن لە تالانی موڵك و سامانی من و تۆ. ئەوان خوێنی دایکم و باوکم دەخۆن). من هەرچەند دەمویست بزانم نهێنیی ئەو

وشانە چین! تا ئەم دەمە نەمزانی بەڕاستی رابەرمان بوو، مامۆستامان بوو، زۆربەی ڕێپێوانەکان ئەو سەرمەشق بوو، ئەو هوتافانی دەکێشا. زۆر جار مامۆستاکانمان دەیان گوت، لە هەموو خۆپێشاندانێکدا تۆ لە پێشەوەیت (کامەران)، ئەو دەیگوت: (ئەرکی سەرشانمە کە لە حەقی خۆم بێدەنگ نەبم).

لەو کاتەدا پەرداخێکی ئاوی پڕ دەکرد و دەیدایە دەستی من و دەم خواردەوە. ئەو هەر لەسەر مەینەتییەکانی ژیان دەدوا. بەڕاستی ئەو گەلێك خەمی لەناخدا درووینە دەکرد و تۆوی خەمی نوێی دەچاند. باسی ئەوەی دەکرد کە ژیان بەرەو کۆتایی دەچێت. باسی خەباتی ئازادیخوازانەی ژنانی دەکرد و دەیگوت: (ژن ئەو دروستکراوە مەزنەیە وا سروشت بە مرۆڤایەتیی بەخشیووە، ژیان بەبێ هەناسەی ژن میوەیەکی گەنیوە). ژن بەشێکی سەرەکیی وجوودە. دەبێت ستایش بکرێت، دەبێت کڕنووشی بۆ ببەین. من هەر بەتەنیا ستایشیان دەکەم. ناتوانم لە نزیکەوە نە لەگەڵیاندا زۆر قسە بکەم نە ستایشیان بکەم. چونکە دەترسم. ترس لە ئەزەڵەوە لەگەڵم گەورە دەبێت، من لەم ژیانەدا دەترسم... نازانم بۆ دەترسم)!؟

من لەسەر کورسییەکەم هەڵدەسام و دەچوومە سەر قەرەوێڵەکە و بە ریمۆت کۆنترۆڵەکە گۆرانییەکەی (داریوش)م کز دەکرد و لێم دەپرسی: (بۆ کەسێکت خۆش نەویستووە، واتە مەبەستم کچێکە، بۆ لێیان دەترسیت؟ ئەو دەیگوت: (من نازانم هۆکارێکی ناوەکییە زۆر جار لەناو خۆمدا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەگەڕێم چنگم ناکەوێت. من دژی ئەو بۆچوونەشم کە ئافرەت تاوانبار دەکات بە دەرکردنی (ئادەم) لە بەهەشت و ناردنە خوارەوەی بۆ سەر زەوی. ئەوە (حەوا) نەبوو وا (ئادەم)ـی فریو دا و رووەکێکی دەرخوارد دا، بەڵکو (خودا) خۆی لە بەهەشت دەریان دەکات، تا لەسەر شانۆی زەوی لەسەرەوە تەماشای کوشتار و شەڕ و داستانەکانی مرۆڤکوشتن بکات و تاقیان بکاتەوە).

زیاتر لێی نزیك دەبوومەوە و پێم دەگوت: (برام باسی قیامەت و (ئادەم) و (حەوا) مەکە، دەزانم لێی تێ دەگەم. (ژن) زۆر زیاتر لە پیاو ڕەگەزێکی سەرەکیی ئەم گەردوونەیە. ژن پارسەنگی ژیانە). پاشان درێژەی بە خوێندنەوەی (قەسیدەی قەلەڕەش) دەدا و بۆ منی تەفسیر دەکردەوە. دەستی دەخستە سەر کورسییەکەی خۆی و دەیگوت: (شاپووری خەزان)! لەسەر (ئەم کورسییە) شەڕی گەورە گەورە کراوە، شەڕی گەورەتریش بەڕێوەیە، کوشتاری زۆر دەکرێت، بەڵام من هەمووی نابینم.

ئەو ئیلهامی بۆ هاتبوو دەیزانی بەگەنجی دەمرێت، بەمنداڵییش بەدایکی وتبوو ژیاننامەی خۆی بەخەڵووز دەنووسێتەوە، دەستکاریی قەدەرەکانیشی دەکرد، ئەستێرەناسێکی هەڵکەوتە بوو، ئەستێرەکانی لەیەکدی نزیک دەکردەوە و ڤینۆسی دەکردە ملوانکە. ساحیر نەبوو، بەڵام ئەفسانەیەکی نوێ بوو بۆ ژیان. ئەو زۆر گەورە بوو، پەیامەکەی زوو گەیشتە دەستی من. (کتێبی وەنەوشەیی) سەرچاوەی نوێی ژیان بوو. یاساکان لەوەوە دەردەچوون، راستییەکان تەنیا لەودا بوون. زۆرینەی باسەکان بەدەست و خەتی خۆی نووسرابوون، بەقەڵەمی گرافیك و خاڵبەندێکی زۆر جوانی بۆ کرابوو. یاساکانی دەرەوەی ئەو کتێبە مایەپووچ بوون. حەزی لە سنووری دەرەوەی زەوی بوو. ئەو بەرەو مارس و بلۆتۆ دەڕۆیشت. دواجار بەرەو عەرشی خودا دەڕۆیشت و لەوێ لە دەرگای خودای دەدا. شەو درەنگی دەکرد و ئێمە هەر گفتوگۆمان دەکرد، وەك دوو هاوڕێ وەك دوو برا خەڵك ئیرەییان پێ دەبردین. کول نەدەبووین. لە شمشێرەکەی دەستی (هیکتۆری) یۆنانی دەچووین، هەر تیژ دەبووینەوە، هەموو خەڵکی دەخەوتن ئێمە هەر بێدار بووین و شەڕمان لەگەڵ تاریکی و شەودا دەکرد ئەستێرەکان خۆیان دەشاردەوە و رۆژ لەدەم کە لەوە چاوبازی لەگەڵ دەکردین ئێمە هەر گفتوگۆمان دەکرد. چۆلەکەکانی بەیانی دەهاتنە باڵکۆنەکە و بە بۆنی گوڵە وەنەوشەیەکان مەست و سەرخۆش دەبوون و دەیانجریواند. ئێمە هەر قسەمان دەکرد. خەڵك لە خەون هەڵدەستان و دەموچاویان دەشووشت و دەکەوتنە رێ بۆ کارەکانیان، ئێمە بە هەوادا دەفڕین و دەچووینە وانەکانەوە بەر لە هەمووان ئامادە دەبووین و لەسەر کورسییەکان دادەنیشتین. هاوڕێکانیانمان سڵاویان دەکرد و لە جێگای خۆیان دادەنیشتن. مامۆستا دەهات و دەستی دەکرد بە وانەوتنەوە. ئێمە باسی ژیانمان بۆ دەکرد. ئەو باسی هێڵە تەریبەکانی بۆ دەکردین. ئێمە باسی هێڵە دوورەکانمان بۆ دەکرد. کات دەڕۆیشت و مامۆستا وانەکەی تەواو دەکرد و دەڕۆیشتین. ئێمە بە قادرمەکاندا بە ئاوازی ئەسپە سەرخۆشەکان رێمان دەکرد و دەهاتینە گۆڕەپانەکان و پیاسەمان دەکرد. هەستمان بە برسێتی دەکرد و بەرەو کافتریا هەنگاوەکانمان خێراتر دەکرد و دەڕۆیشتین. زەردەخەنە تەماویەکەی (کامەرانی وەنەوشە) سەرنجی منی رادەکێشا و بە ئەندازەی بیرکردنەوەدا رۆدەچووم تا دەگەیشتینە بەردەم دەرگای کافتریاو هەوایەکی بۆنخۆش من و (کامەرانی) کاس دەکرد. بۆنێك سەراپای ژیانی

دەگۆڕی. لەناوەوە دەهات و (کامەرانی وەنەوشە) بەمنی دەگوت: (بۆن بکە بۆن، زۆر سەیرە ئەم بۆنە! بۆنی ئاسمانە چی دەکات لەسەر زەوی تۆ بڵێیت بۆنی دایکم بێت، یان حۆریەك هاتبێتە خوار...)

بۆنی بەهەشت دەهات. بۆنی ریحانەیەکی پڕتوکاو لەناو لەپی دەستدا دەهات! بۆنێکی زۆر خۆش دەهاتە بەر لوتمان! نەماندەزانی بەسەر درەختەکانی بەهەشتدا هەنگاو دەنێین، یاخود لەناو جۆگە شەڕابە بۆنخۆشەکانی فیردەوسدا قاچمان تا قوولە پێ هەڵکردوە و هەنگاو بەسەر بەردە یاقووتی و ئەڵماسیەکاندا دەنێین. گرنگ ئەوە بوو بۆنێك دەهات، بەڵام نەماندەزانی بۆنی بەهەشتە، یان بۆنی سەر زەوییە...

# ٢

## ئازاری ٢٠٠٤

ساڵی ٢٠٠٤ بوو. ڕۆژێکی هەتاوی بەهار بوو. وەرزی زەردەخەنەی چرۆی درەختەکان و هەڵاڵە و کەنێرە و نێرگزەکان و هاژەی کانیاوەکانی چیا بوو. کاتی خوێندنی قومریـەکان بـوو لەسـەر دار تەل و چڵی گوێ سەپانەکان و چوارچـێوەی باخـەکان. زەوی بـۆنی عـەترێکی تـەڕی شـێداری لـێ دەهات کە دەمەوبەیانیان زەوی بە دزیی هەموو دنیاوە لە خۆی دەدات. بەیانی بـوو بـەرەو هـۆڵی وانەکان دەڕۆیشتین. هەموو ماندوو بووین. وەك ئەوەی سێ شـەوو سـێ ڕۆژ سـەمامان کردبێـت، شەکەت و ماندوو دیار بووین. بە ترس و لەرزەوە پەڕە پەڕە مەلزەمە و کتێبەکانمان هەڵدەدایـەوە و لەسەر پێناسە و هێڵە دیاریکراوەکاندا دەوەستاین و وچانێکی راوچیانەمان دەدا و دەستمان دەکـرد بە راڤەکردن و خوێندنەوەی دەجار دووبارە و سێبارە. وەك ئەوەی لەسەر پردی سیرات راوەسـتابین و بترسین لەوەی بکەوینە خوارەوە. وەك ئەوەی ئایەتەلکورسی بخوێنین ورتـەورتمان دەهـات، ڕەنگمـان زەرد هەڵگەڕابوو، لە راستییدا من و (کامەرانی وەنەوشە) شەو پێکـەوە دەرسمـان ڕەوان کردبـوو، چونکە دەمانزانی بۆ بەیانی تاقیکردنەوەی مامۆستا (فەرەج سەبعاوی)ـمان هەیە. ئەو مامۆسـتا عەرەبەی و حەوت ساڵ بوو لە کوردستان دەژیا و خێزانەکەشی کورد بوو، بـەڵام بـۆ یـەك جـاریش چییە بە کوردی نەدوا، دەیگوت: کوردی نازانم. هەمیشە بە دوو زمانی تێکەڵ وانەی بۆمـان راڤـە دەکرد (عەرەبی و ئینگلیزی)، کە خۆشی زۆر مامۆستایەکی زیرەك نەبوو. هەمیشـە گاڵتـەی بـە کوردسـتان و مامۆسـتا کوردەکـان و زمانەکـەشمان دەهـات و لـە ئاسـتی زانسـتی فێرخـوازە کوردەکانیش رازی نەبوو.

شەو تا نزیکی بەرەبەیان خوێندمان. لەگەڵ دەنگی بڵندگۆی مزگەوتەکان دەستمان لە خوێندن هەڵگرت. بە (کامەرانی وەنەوشەم) گوت: (برا با پشـوویەك بـدەین ژیـان ئـەوە ناهێنێـت، دەزانم پرسیارەکانی (فەرەج سەبعاوی) زۆر گران نابن، (کامەرانی وەنەوشە) دەیگوت: (شاپووری خـەزان) براکەم ڕەنگە وابێت، بەڵام تۆ پشوو بدە، من جـارێ پـارتێکم مـاوە و دەمـەوێت نمرەیـەکی بـاش

وەرگرم بۆیە جاریٚ ناخەوم). بەدەستە بچکۆلەکانی کتێبەکەی لەسەر کۆشی دادەنا. وەك مەلایەك چۆن قورئان دەخوێنێت، ئاوا دەستی دەکرد بە خوێندنەوەی دێڕەکان و ورتە ورتێکی نەرمی بۆ دەکرد، کە ختووکەی گوێچکەیان دەدام. جار جار سەیرێکی منی دەکرد و زەردەخەنەیەکی دەکرد و دەیگوت: (هاورێ گیان با خۆمان ماندوو کەین، بۆ ئەوەی بەدەستی خۆمان رزگارمان ببێت لەم ولاٌتە لەم کاولە گۆڕستانە).

من لە ژێر لێوەوە بە ئەسپایی دەمگوت: (من دەنووم چی دەبێت با ببێت) و خۆم درێژ دەکرد و کاسکێتیکی رەشم دەخستە سەر دەموچاوم و وردە وردە رۆژ دەبووە و (کامەرانی وەنەوشە) هاواری دەکرد (شاپوور)! هەستە برا کاتژمێر حەوتە، دەبێت خۆمان ئامادە بکەین. ژمێرەری ئەلیکترۆنیت لە بیر نەچێت، بیرتە ئەو جارەی کە پێت نەبوو چیت لیٚ هات تا دەستت کەوت و لە برادەرێکت وەرگرت)! بەدەم خەوەوە رادەپەڕیم و دەمگوت: (وەلاٌ راست دەکەی، خەونم بینی وام زانی لە تاقیکردنەوەدام)، سەیرم دەکرد (کامەران) گوڵەکانی ئاو دەدا، ئەو پازدە خولەك بوو بەخەبەر بوو هەموو شتەکانی خۆی ئامادە کردبوو، بیرمە ئەو رۆژە گوتی: (شاپووری خەزان) (دڵم باش نایهێنێت، هەست دەکەم شتێکی خراپ روو دەدات، ئەمڕۆ قەلەڕەشەکە دێتەوە پێش چاوم)، من پەلەپەل تاقمی ئەندازەییەکەم کۆ دەکردەوە و بەم دیو و بەو دیوی خۆمدا بەدوای (پرگاڵەکەمدا) دەگەڕام.

هەڵدەستامە سەرپیٚ و خۆم دەکێشایەوە و باوێشکم دەدا و بەرەو دەستشۆڕەکە دەڕۆیشتم، پاش دە پازدە خولەك ئامادە دەبووین و بە قادرمەکانی بەشی ناوخۆییدا شۆڕ دەبووینەوە خوار. لەسەر شەقامە چڵکنەکە دەوەستاین و دەستمان لە تاکسییەك رادەگرت، وادیار بوو لەگەڵ ئەو رێك نەدەکەوتین، پاشان ئەومان ئیزن دەدا و چاوەڕێی تاکسیەکی ترمان دەکرد. بە زۆر من لە پێشەوە سوار دەبووم و (کامەرانی وەنەوشە) دەچووە دواوە. ئەو هەمیشە حەزی لیٚ بوو لە کورسییەکانی دواوە دانیشێت. بە جادە و شەقامە هەڵکەندراوەکانی (دەشتە شاردا) دەڕۆیشتین و شۆفێرەکە بە ئەسپایی ترۆمبێلەکەی باژوو دەدا، نەبادا دەبلەکانی لە تاسە و چاڵ و چۆڵێنەکاندا خراپ ببێت، پاش بیست خولەك دەگەیشتینە بەردەمزانکۆ.

(کامەرانی وەنەوشە) زووتر پێی وتبووم کە گۆڕانێکی چاوەڕواننەکراو روو دەدات، دەمزانی کە ئەمڕۆ گوڵەکان سەر بۆ زەوی شۆڕ دەکەنەوە و دەگرین. لە هۆڵی تاقیکردنەوەدا کورسییەکەی ئەو چۆڵ بوو. پێنج خولەك بەسەر دابەشکردنی پرسیارەکاندا تێدەپەری، (ئەو) هەر دیار نەبوو، دەخولەك دەڕۆیشت دیار نەبوو، پانزە خولەك، بیست خولەك، کاتژمێرێك، تاقیکردنەوە تەواو

دەبوو پرسیارەکان کۆ دەکرایەوە، ئێمە دەهاتینــە دەرەوە. بەڕاڕەوەکــەدا دەڕۆیشــتین. گوێمــان لــە غەڵبە غەڵبی خوێندکارەکان دەبوو. مامۆستاکان مات و مەلوول دەوەستان. درەختەکان لقەکانیان شۆڕ کردبۆوە، مات بوون. زەوی ئارەقی کردبوو. ئەو لە دەمەو بەیانەوە گریـابوو، چـونکە هێشـتا تەڕ بوو، پاساریییەکان خۆیان لە رەژوو هەڵکێشابوو، رەشپۆش بوون. رۆژێکی بــەهاری بــوو، بــەڵام هەموو شتێك سڕ و مات و تازیەبار بوو، (کامەرانی وەنەوشە) هەر زوو بە منــی وتبــوو، هەســتم کردووە شتێك دەقەومێ، هەر زوو زانیبووی گۆڕانێکی وەها دەبێت، کارەساتێك دێــت. دەمــانزانی ددانێکمان دەکەوێت و ناو دەممان کەلێنی تێدەکەوێت. دەمانزانی هەتیو دەکەوین. دەمانزانی ئیدی تامی خواردنی دۆڵمە و کفتە و بریانی ناکەین. دەمانزانی ئیدی بێ ناز دەبین و ســەیران و گــەڕانمان کەم دەبێتەوە. وەك ئەوەی گەردەلوولێکی ساردی رەش بەرەو روومــان بێــت و هــەموو دنیــا لــوول بدات و هەرچی نهێنیــی ســەرزەمینە دوورەکانــە وەدەرخــات. هەرچــی درۆی زلــزلی ســەرکردە و تێکۆشەرەکانە هەڵکەنێت، ئەوها ئەو گەردەلوولە هەرچی خەنــدە هــەبوو هــەمووی لەگــەڵ خــۆی پێچایەوە و بردی بەرەو نادیار، زیاتر رەشپۆشی کردین. وای لێ کردین خشــتەی ژیانمــان بگــۆڕین. وای لێ کردین رۆژانی هەینی بە جلکە رەشەکانمانەوە لەگەڵ دوو چەپك ریحانە و گوڵی وەنەوشــەیی رووبکەینە گۆڕستان روو بکەینە سەرزەمینی مردووەکان و وچــانێك لەگەڵیانــدا بــدەین و ئایــەتی دڵنەوایی و گریان تێکەڵ بکەین و بە ئاوازی خەمگین بگــرین و فرمێســکی مرواریئاســا بڕێــژین. کارەسات بوو کە پارچەیەك لە روحمان بەرەو ئاسمان کشایەوە. ئەو گۆڕانە چاوەڕواننەکراوە هــاتنی مەرگ بوو بە خۆی و تابووتێکی کریستاڵیەوە، هاتبوو بە میوانی دڵەکانمان، هــاتبوو ســەودایەکی رەشمان لەگەڵ بکات ئەو مەرگە نەعلەتیــە (ســەهەند)ی بــردوو، لــەبری (ســەهەند) پاداشــتەکەی سەفەری هەینیان و ئاشنابوونمان بوو بە ریحانەفرۆشــەکانی ســەر رێگــای گۆڕســتان. هەســتم کــرد ئــارەقێکی ســارد ســەراپای جەســتەمی تــەڕ کردبــوو، رەنگــم زەرد هەڵگــەڕابوو. تەماشــایەکی (کامەرانی وەنەوشە)م کــرد، ئــەویش وەك خــۆم حەپەســابوو. وتم: کامــەران (شــتێکی زۆر ســەیر قەوماوە، پەلەکە با بڕۆینە ناو ئەو کۆمەڵــە. ئــەها مامۆســتا (عــەدنان) و مامۆســتا (کــاوە) و (زەینــەب) و (فریشــتە) و (ســەردار) و ئــەوان کــۆ بوونەتــەوە). پێشــتر بــەر لــە دەســتپێکردنی تاقیکردنەوەکە، ئەو کورسییەکەی بە لەزگەیــەکی بچــووك نــاوی (ســەهەند بــایز محەمــەد)ی لــێ نووسرابوو چۆڵ بوو.، بەلامانەوە دیاردەیەکی سەیر بوو نەهاتنی (سەهەند). هــەتا دوای چــارەکێك ئاسایی نەبوو، یەکێك بــوو لــەو دیــاردە ناسروشــتیانەی کــە دەکرێــت بچــیتە ریــزی رۆژگــیران و سوورانەوەی زەوی بە پێچەوانەوە. بەپەلە لێیان چووینە پێش، مامۆستا (عەدنان) رووی وەرگێــڕا و

بە دیوی ئێمەدا و پاشان هەموو خوێندکاران سەیری ئێمەیان دەکرد، بە تاسەوە وەك چۆن سەیری فیلمێکی سەرنجڕاکێش دەکەیت و تێری لێ ناخۆیت، چونکە دەیانزانی کە هاوڕێیەتی ئێمە پتر لە هەمووان بوو، دەیانزانی کە من و (کامەرانی وەنەوشە) زۆر ڕێزمان لە (سەهەند بایز) دەگرت و زۆر هاوڕێی بووین. لەناو زانکۆدا زۆر دەیان بینین پێکەوە لەکاتی وانەکاندا لە پێش تاقیکردنەوەکاندا لە ئاهەنگ و گەشتەکاندا، ئێمە پێکەوە وێنەمان دەگرت. پێکەوە نانمان دەخوارد، بۆیە بە ماتەمینەوە مامۆستا (عەدنان) و مامۆستا (کاوە) وتیان: (نەتان زانیوە! بەداخەوە(سەهەند) مردووە. لێمان روون نییە بۆچی!، بەڵام ئەوەندەی لێمان مەعلوومە و تەلەفونمان لەگەڵ یەکێکی خێزانەکەیاندا کرد، دەڵێن مردووە، ئیدی نازانین چۆن مردووە) ئەوەیان گوت و بە کەساسییەکەوە داوای یارمەتیان لێ کردین و دەگەڕانەوە بەرەو بەشەکانی خۆیان ئێمەش، لەگەڵ کۆمەڵێك برادەر دەستمان کرد بەگریان و، دەمبینی (کامەرانی وەنەوشە) لەسەر چۆك دەکەوت و چنگی لە گژوگیای تەڕی ئەو بەیانییە دەگرت و دەیقرتاند و دەستەکانی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و وردە گیا و گڵ و زیخی بەسەری خۆیدا دەدا و منیش هەوڵم دەدا دەستی بگرم، بەڵام خۆم پێ ڕانەدەگیرا و بە دەنگییکی تەڕی برینداربە کۆمەڵ دەگریاین. لەو دەنگەدەنگەدا زیاتر هاوڕێیان لە گشت لایەکی کۆلێژەوە لێمان کۆ دەبوونەوە. ئەوانەی زۆر (سەهەند)یان دەناسی، بە کۆرس بە ئیقاعێکی حەزین بە سەمفۆنیای مەرگ دەگریان و دەنگی گریان و غەڵبە غەڵب دەگەیشتە بەرزایی ئاسمان و بەناو شاری (دەشت)دا بڵاو دەبووەوە. هەستم دەکرد هەر خۆمان نەبووین دەگریاین، بەڵکو مەلەکوتەکانی ئاسمانیش هەموو بە چوار دەورماندا ریزیان بەستبوو، دەگریان بە گریانێکی هێمن.

هەر لەو کاتەدا بڕیارمان دا بە کۆمەڵ بڕۆین بۆ ماڵی (سەهەند) بە شێوەیەکی زۆر نامۆ و دڵتەنگ سێ سێ و چوار چوار لە زانکۆ هاتینە دەر تا دەڕۆیشتیشین بەرەو دەرگای دەرەوەی کۆلێژ ژمارەمان زیادی دەکرد. (سەهەند) کوڕێکی خۆشەویست بوو، کوڕێك بوو یەك پارچە نوور بوو. ئەو زۆر کوڕێکی جوان بوو هێمن بوو. دەنگخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوڵەمەند بوو، بەڵام زۆر کوڕێکی سادەبوو لە رەفتاری دا هەرگیز لە دەوڵەمەندە چاوچنۆکەکان نەدەچوو.

ئەوانەی شەو و ڕۆژ خەریکی سەفتەکردنی پارەن و خەویان لێ ناکەوێت لە ترسی ماڵ و سامانەکانیان. بایز ئاغای باوکی سەهەند، یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی ئەو شارە و بازرگانێکی لێزان و بەکار بوو، بەڵام مرۆڤێکی خوێندەوار نەبوو. تەنیا دەیزانی چۆن پارە کۆ بکاتەوە. مامەڵە بازرگانییەکانی بۆ دەربچێنێت، زۆری لە خۆشگووزەرانییەکان خستبوویە بەردەمی کوڕە

گەورەکەی، کە سەهەند بوو. سەهەند ئاواتەکانی گەلێك جیاواز بوون لـە هـی بـاوکی. هەمیشـە حەزی دەکرد ببێتە ئەندازیارێکی شارەزا و بلیمەت. هەرگیز بە پارەی نەدەنازی، حەزیشی نەدەکرد کە خەڵکی بزانێت کوڕی (بایز ئاغا)یە، بەڵام باوکی ئوتۆمبیلێکی جـوانی نـاوازەی بـۆ کڕیبـوو. (سەهەند)یش لەو شارەدا زیاتر دڵی بە من و (کامەرانی وەنەوشە) دەکرایەوە، زۆر شەوان بە خـۆی و کتێبەکانییەوە دەهات بۆ بەشی ناوخۆیی و تا درەنـگ پێکـەوە وانـەمان دەخوێنـد و قسـەمان دەکرد، زۆر جار باسی (ئاروین)ی دەکرد. ئەو کچە مەسیحەی لە کۆلێژی (ئەدەبیات) دەیخوێنـد، بەڵام زیاتر لەگەڵ (کامەرانی وەنەوشە) باسی دەکرد، چونکە (کامەران) کوڕێکی زیرەك و لێهـاتوو بوو دەیزانی چۆن دەرگاکان بکاتەوە کلیلی زۆرێك لە دەرگا سـەختەکانی بـیری مـرۆڤ لـەلای ئـەو هەبوو.

شەوێك کە چووم بۆ ژوورەکەی (کامەرانی وەنەوشە)، بینـیم وا (سـەهەند) لـەوێ دانیشتبوو، کە بینم ویستم بگەڕێمەوە و وتم: هاوڕێیان سڵاوتان لێ بێت، (سـەهەند) گیان بـەخێر بێیـت، ئـەوە بـۆ وا بـە کتـوپڕ دێیـت و بـە مـن ناڵێیـت لێـرەم؟ زۆر بەشەرمەوە دەستی کرد بە پێکەنین و دەستی خستە سەرشانی (کامەران) و وتی: بڕوا بکە تۆم لەیاد بوو، بەڵام سەرەتا هاتمە ئێرە و دواتر دەهاتم بۆلای تۆ دڵ لە دڵ نەدەی ئێوە هاوڕێی بەڕێزن لۆ من بە خودای گەلێکم خـۆش دەوێـن. مـن دەمویسـت بـڕۆم نەوەك ئەوان کارێکی تایبـەتیان هـەبێت، بـەڵام دەمبینـی (سـەهەندی بـایز ئاغـا). هەڵدەستا و دەستی دەگرتم و لە تەنیشت خۆی دای دەنیشـاندم، دواتـر حـەزم دەکـرد بزانم هۆکاری ئەم هاتنە کتوپڕەی چییە.

وەك شەپۆلی لافاو چـۆن لـە بـارانی زسـتانێکی سـەخت تێـر ئـاو دەبێـت و شـەپۆل لەگـەڵ شەپۆلێکی تردا شەڕ دەکات و بە هورژووم بەرەو شوێنە چۆڵە بێ ئاوەکان مل دەنێـت، ئـەوها لـە ڕۆشتنماندا ژمارەمان زیادی دەکرد. ئەمە لەبەر ئەوە نەبوو کە (سەهەند) کوڕی (بایز ئاغا) بـوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی (سەهەند) کوڕێك بوو خاوەنی دەنگە ژێیـەکی هەسـتبزوێن بـوو. بـە راسـتی دەنگی خۆش بوو ئێستاش دەنگی گۆرانییـەکانی لـە گوێچـکەکانمدا دەزرینگێتـەوە ئـەو کـە لـە ئاهەنگەکانی کۆلێژ و گەشتەکاندا گۆرانی دەگوت ئێمە دەچووینە دنیایەکی خەیاڵی دنیایـەك دوور لە شەڕ و ناخۆشی دنیایەك پڕ لە گەمەی منداڵی و پڕ لە ئەشقی نـارنجی هێنـدە دەنگـی حـەزین بوو. زۆرمان چاوەکانمان پڕ دەبوون لە فرمێسك دەمبینی کە (سەهەند) گۆرانیی دەگوت چـاوەکانی (کامەرانی وەنەوشە) پڕ دەبوون لە فرمێسکی یاقووتی، بـە ڕوومەتـە گەشـەکەیدا هێـدی هێـدی

دەهاتنە خوار و، کاتێك رووی وەردەگێڕا بەلای چەپدا، هەندێك فرمێسك دەکەوتنە سەر گوڵە وەنەوشەییەکەی سەر سنگی و رەنگێکی سەیری دەنواند. رەنگێك لەو رەنگانەی خودا کە چاوی ئاسایی مرۆڤ نایان بینێت، ئەو رەنگانەی لە بەهەشتدا لە شەراب دەتکێن، لە هەنگوین دەتکێن، (سەهەند) هەر گۆرانیی دەگوت گۆرانیی سەیر. سەیر بەو کۆمەڵگایەی ئێمەی تێدا دەژیاین، کە (سەهەند) گۆرانیی دەگوت: دەمبینی (ئاسمان مینا) دەستە چکۆلەکانی دەخستە ژێر چەناگەی غەمبار دەبوو، رەنگی دەگۆڕا زۆر جار حەزی دەکرد لەو بەرگەی تێی دایە دەربچێت و بچێتە بەرگێکی ترەوە، بەڵام دواجار نەیدەتوانی چونکە دەترسا.

(سەهەندی بایز ئاغا) شیعری زۆر جوانی دەکرد بە گۆرانی. هەر لەو کاتەدا دەیتوانی ئاوازی جۆراوجۆری بۆ دابنێت، بەو دەنگە غەمبارەی خۆی لە رۆژی ئاهەنگەکەدا ئەمەی دەگوت بەبیرم دێت کە گۆرانی هونەرمەند (کازم ساهر)ی دەگوت و گۆرانی دیکەی دەگوت ئەم کۆپلە شیعرەی (کامەرانی وەنەوشە)ی دەکرد بە گۆرانی :

ئادەمیزاد گەلێك زۆرن وەك گەڵای دار
وەك تنۆکەکانی باران....
لەیەك ناگەن دەسەیر کەن
چۆن شەڕ دەکەن... لێرەو لەوێ
گەلێك زۆرن... بەچەندین زمان دەدوێن و چەند ئایینن
لەیەك ناگەن
یەك دەکوژن... زۆر حەز دەکەن
لەناو خوێندا مەلە بکەن
خۆشەویستی بەردی دەستی منداڵانە
توری دەدەن بۆ باڵی ئەو نەورەسانە

هەر گۆرانی دەگوت و (کامەرانی وەنەوشە) چاوەکانی دەسڕی، هونەرمەندێکی بچکۆلە بوو، بەڵام لە ناخدا کەسێکی مەردو ئارامبەخش بوو بەڕاستی ئێستا کە بیر لە رابردوو دەکەمەوە چاوەکانم پڕن لە گریان، گریانێکی بە کوڵ حەزدەکەم چی رابردوو هەیە بینووسم تا کۆتا، ئەوەی رابردووی خۆی بنووسێتەوە کەسێکی دۆڕاوە، خۆم هەست دەکەم دۆڕاوم هەست دەکەم چیتر دوورم لە ژیان ئەو ژیانەی (کامەران و سەهەند) دەیانویست جودایە لەگەڵ ئەم شێوە ژیانەی ئێستای من، جودایە لەم کۆمەڵگایە ئەگەرچی من گەلێك دوورم، چەندین ئۆقیانووس دوورم لەو دیارەی

کە ئەم درامایانەی تێدا نمایش کران، ئـەو ڕووداو و بەسـەرهاتانەی لـەو چـەند سـاڵەی ڕابـردوودا ڕوویان دا، هەرگیز لە زەینی مندا ناسڕێنەوە. بەردەوام لە دەرگاکانی بیرچوونەوەم دەدەن.

وەك وتم لە وڵاتێکدا دەژیاین، ڕووداو و کارەساتەکان وەك پچڕانی تـەزبیحێکی قـەزوان دەنـك دەنك، ڕووداو، ڕووداو بەدووی یەکدا دەهاتن. ئێستاش کە لەم باڵکۆنە نەعلەتیەوە سەیری دیمـەنی دەرەوە دەکەم، کۆڵانە ڕووناکەکانی ئەم شارە جێ پێکانی (کامەرانی وەنەوشـە)م بـەبیر دێنێتـەوە. دەنگی مۆسیقای نێو گۆڕەپانەکان گۆرانییەکانی (سـەهەند)م بـیر دێنێتـەوە. ئـەی نەڕەنـەڕەکانی (فەرەج سەبعاوی) بۆ ناڵێنن! ئەوانیش لە مێشکمدا دێن و تێکەڵاو بەم ساتە پڕنەهامەتییەم دەبـن، بەڕاستی نەمانتوانی سەرکەوین بەو قەڵایەدا کە لەناو کۆمەڵگاکەمدا دروست بـووە نـەمانتوانی بناغەکەشی برووخێنین، تەنانەت بلۆکێك چییە بۆمـان دەرنـەهات. ئـەو قـەڵا زەردە پیسـەی کـە شانازیی پێوە دەکەین ، وەتەنی چی بووە مۆڵگەی شەڕ و جەنگ. (کامەرانی وەنەوشە) دەیگـوت: (ئێرە دەبێتە گۆڕەپانی جەنگ، خوێن لەسەر شەقامەکان دەکەوێت، مرۆڤـەکان بەشـوێن دەسـت و قاچی خۆیاندا دەگەڕێن کە لە گیرفـانی یـەکێکی تـردا دەیدۆزنـەوە) ئـەوەتا منـیش پـەڕە پـەڕە یادگارییە کۆنەکان وەك چۆن ڕەشەبای لە ناکاوی پایزان بە هاژە هاژ دێت و هەرچی گـەڵای زەردی بن دارەکانە لەگەڵ خۆی تا دوور بەرزی دەکاتـەوە و گێـژیان دەدات، ئـەوها یادگارییـە تاڵـەکانی ڕابردوو بە بادا دەدەم وەك خەزان بەخشێکی پیری ماندوو درووینەی پووش و پـاوانی دنیـا دەکـەم، من لەو دەمەی کە نازناوی خەزانم لێ نرا، وەك ئەوەی چارەنووسم وەك ڕەشـەبا بێـت، دنیـا لـەژێر پێمدا ڕەخسا بۆ گەڕان بەسەر هەموو عەرد و زەمین و دۆڵە جیاوازەکاندا.

بیری ئەو حەشامەتە زۆرە دەکەم، کە چوارچوار و پێنج پێنج سواری تاکسی و ئوتۆمبیلـەکانی بەردەم کۆلێژ دەبووین و دەڕۆیشتین بە ڕەووتی مەرگ بەرەو ماڵی (سەهەندی بایز ئاغـا). مـن لـە پەنجەرەی تاکسیەکەوە سەیری دیمەنی سەر جادەکانم دەکرد. هەموو مـات بـوون. سـەیری ئاسمـانم دەکرد چەند پەڵە هەورێکی ڕەش داگیرساوی قەترانیم دەبینی، کە لە هەوری ئەو ڕۆژە نەدەچـوون و نامۆ بوون. هەستم دەکرد لە دۆزەخەوە هاتبن وام دەزانی دەواری دەوارنشینەکانی وڵاتێکـی دوورەو بای لەناکاو هەڵی گرتووە بۆ ئێرەی تاو داون، تەماشـای چـاوەکانی کامـەرانم دەکـرد، دەریائاسـا شەپۆلیان دەدا.

لەو دەمەدا دەگەیشتینە کۆڵانێکی قەرەباڵغ، ئوتۆمبێل و حەشـاماتێکی گـەورە وەسـتابوون، دەیان ڕوانی بە دەوروبەری خۆیاندا. پیاوی پشتێن زلی تەزبیح بەدەستم دەبینی، دەستەکانیان وردە وردە بە دەنکە تەزبیحەکانەوە دەجووڵاند، وەك ئەوەی زکری خوا بکەن، بـەڵام هـەرگیز لـە زکـری

خودایا نەبوون، بەڵکو باسی شتی لاوەکییان دەکرد. هەندێکیان جار ناجار بزەیەکیان دەهاتێ و هەندێکی تریان مات و غەمبار دەبینران. گوێما لە شین و ناڵە و زەنازەنایەکی لە ئەندازە بەدەر دەبوو، کە دەنگییان دەگەیشتە عەرشی عەزیم و قریشکە قریشکی ژنان و کچانی گەڕەك و خزمانی (سەهەند) لە دوو گەڕەك ئەودیوو ماڵی (بایز)ەوە دەبیسترا، ئێمە بەرە بەرە دەگەیشتینە بەردەمی ماڵەکەیان، بەڵام لەبەر قەرەباڵغی هەندێك دوورتر لە جێگایەکی تەنگەبەردا لە نزیك دوو ئوتۆمبێلی ئاخر مۆدێلدا دەوەستاین و بە پەژارەیەکی زۆرەوە لە ئوتۆمبێل دادەبەزین و هەنگاو هەنگاو دەچووینە ناو قەرەباڵغیەکەوە. لەناو ئاپۆڕای خەڵکیدا چەندین کەسمان دەبینی کە بەچەکەکانیانەوە چوار دەوری ئوتۆمبێلەکانیان گرتبوو، هەموو جلی سەربازییان لەبەردابوو. بێری سەوز و سووریان لەسەر کردبوو وەك هەڵۆی چاوباز بەڕاست و چەپدا دەیان روانی. دەستییان لەسەر پەلە پیتکەی تفەنگەکان بوو، وەك ئەوەی لەسەرپێ بن بۆ شەڕ و راپەڕینی خەڵکی هێور بکەنەوە بەزەبری گوللەکانیان، هەریەکەو لەسەر سووچێك ئەم بەرو ئەوبەری کۆڵانەکانیان گرتبوو ئێمە هەر نزیك دەبووینەوە پاسەوانەکان رێگەیان لێ دەگرتین نەیان دەهێشت لەوە زیاتر بچینە پێشەوە دەتگوت رۆژی مەحشەرە. لە روحی خۆمان بێزار بووین. لەلایەك مەرگی لەناکاوی (سەهەند)، لەلایەکی دی رێگەنەدانمان تا بچینە پێشەوە، چوار دەوری ماڵەکە بە زەمقێکی زەرد گیرابوو، پۆلیس و ئاسایش هەر پاڵیان بە خەڵکیەوە دەنا، لە راستییدا ئێمە بە هیچ شێوەیەك ساتەوەختەکانی مەرگی (سەهەند)مان نەدەدی تەنیا لەناو خامە سپییەکەیدا بینیمان کاتێك خستیانە نێو گۆڕەکەی.

لیژنەی لێکۆڵینەوە و بە دواداچوونی تاوان، بە دوای شێواز و هۆکارەکانی خۆکوشتنەکەدا دەگەڕان. بۆیە کەس نەیدەتوانی زیاتر نزیك بێتەوە لە ماڵی (سەهەند). هەر لەو کاتەدا لەناو تابووتێکی رەنگ برۆنزیدا بردیان بەرەو مزگەوتەکەی نزیك ماڵی خۆیان لەسەر شان بردیان. خەڵك و خوای دراوسێ هەنگاوهەنگاو تابووتەکەیان لەشان بەر نەدەداو دەیان گەیاندە مزگەوتەکە و ئێمەش بە ئەسپایی و بە خەمێکی قووڵی دڵپڕ و کێنەوە بە دوایان دەکەوتین، گوێم لە دەنگییکی نێر دەبوو دەنگییکی گڕی ترسناك کە نامۆ نەبوو لەبەر گوێم دەیگوت: (ڕێگە مەدە بەو گەنجانە با زیاتر نزیك نەبنەوە، کارەکە زۆر ترسناکە وابزانم ئەوانە هاوڕێی ئەو بوون لە زانکۆ دڵنیام شتێك لەو بارەیەوە دەزانن، دوایی لێکۆڵینەوە دەکەین). تا سەرە داوێکمان دەست بکەوێت.

# ٣

بەڕاستی بۆنێکی سەیر بوو لە ئاسمانــەوە دەهاتــە خــوار و بــە نــاو دەمارەکـانی مێشـکماندا تێدەپەڕی و لەناو کاسەی سەرماندا چەکەرەی دەکرد و وێنەی دەداوە و خـەیالاتی دەبردینــەوە بــۆ فیردەوس. هەستم دەکرد بۆنی پەپوولەکانی بەهار دێـت بـۆنی زەوی تـەڕ بـۆنی ئەرخـەوان، بـۆنی ریحانەی پۆرتوکاو بۆنی شەرابی بەهەشت دێت بۆنی بنباخەڵی حۆرییەکانی خودا دێـت، مـن هـەر لەناو خەیاڵدا نقوم دەبووم و بەلای چەپدا سەیری (کامەرانی وەنەوشەم) دەکـرد سـەیری گوڵەکـەی سەرسنگیم دەکرد و دەم گوت (کامەرانی وەنەوشـە)، بـۆنی گوڵەکـەی سەرسـنگی تۆیـە یـاخود بۆنێکی خودایە) ئەو لە وەڵامدا زەردەخەنەیەکی دەکرد و (دەیگوت:، نازانم بۆنی داهـاتووە! بـۆنی کۆتایی ئاسمانەکانە، ئەم بۆنە من بەرەو ئەو دنیا دەبات بەرەو خودا راییم دەکـات، دەمباتـەوە بـۆ ناو قووڵایی دەریا، تەرم دەکات زۆر زۆر).

هەنگاو هەنگاو ئێمە نزیك دەبووینەوە و لە دەرگا گەورەکەی یانەکـەو دەگەیشـتینە سەرەتای یانەکەو دەنگی مۆسیقا و گۆرانی لەگـەڵ هـاژە هـاژ و ژاوەژاوی فێرخوازانـدا دەهاتنە بەر گوێیان و وامان هەست دەکرد لە ژێر تاقگەیەکدا هەنگاو دەنێین. لە دووررا لەسەر مێزێك لە نزیکی پەنجەرەکان (سەهەندی بایز ئاغا) بە تەنیا دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشا. دووکەڵی جگەرەکەی وای کردبوو بە ئاستەم دەمانبینی. چێژی لـە تـەنیایی و دوورەپەرێزی وەردەگرت. لەبەر خۆیەوە ورتەورتی دەهات. وابزانم گـۆرانیی دەگـوت! لـە لایەکی تـر سـەیرمان دەکـرد چـوار کـچ لەسـەر مێزێکـی سـپی دانیشـتبوون قاوەیـان دەخواردەوە. دوانیان روویـان لـە دەرگاکـە کردبـوو، دوانەکـەی تریـان بـە پێچـەوانەوە دانیشتبوون جلەکانیان ویك دەچوون، دەستەسرەکانیان بادەدا زەردەخەنەیان دەکـر لێـوە ئاڵەکانیان دەبزواند و ورتەورتیان دەهات. وام هەست دەکرد باسی ئێمـەیان دەکـرد، لـە ناکاودا دوانەکەی تریان بەلای راستدا ئاوڕیان بـۆلای دەرگاکـە دەدایـەوە. ئـەوەیان کـە دەسرەکەی دەسووڕاند (دڵارام میهرداد) بوو، دوانەکەی دیکەش کە پشتیان لە دەرگاکـە بوو (شابانوو) و (گوڵبانوو) بوون. ئەو جووتە خووشکە جمکەی کە هەمیشە وەك یەکیان

دەپۆشی و دەتگوت سێوێکت لەنێوەڕاستەوە لەت کـردووە. ئەگـەر کەسـێك زۆر زیـرەك نەبووایە سەیری خاڵەکەی لای لێوی (گوڵبانوو)ی نەکردبا نەیدەزانی لێکی نەدەکردنەوە. تا ئەو دەمەی ئاهەنگەکە دەستی پێکرد ئێمە یـەکترمان نەناسـیبوو، بـەڵام شـێوەمان وادیار بوو کە هاوڕێین بە ناو مێزەکاندا بە هێمنـی دەڕۆیشـتین و جـار جـار سـەیرێکی کچەکانمان دەکرد، (کامەرانی وەنەوشـە) دەسـتییکی بـۆ گوڵەکـەی سەرسـنگی بـردوو سەیرێکی (دڵارام میهـرداد)ی کـرد (دڵارام) بزەیـەکی کـرد و سـەری دانەوانـد، ئێمـە گەیشتینە سەر مێزەکەی (سەهەند بایز) و لەبەرمان هەستاو تەوقەی لەگەڵ کردین، من لە تەنیشیتی دانیشتم و (سەهەند بایز)یش کورسییەکی لە مێزێکی تەنیشتی خواست و بەرامبەری کچەکان دانیشتین. پاشان هەردووکمان کەوتینە قسە کردن لەگەڵ (سەهەند) و ئەحواڵمان پرسی. (کامەرانی وەنەوشە) دەیگوت: (سەهەند بایز)ی برام ئەوە چیتە هەست دەکەم کەمێك رەنگت پەڕیوە خۆ هیچ نەبووە؟ بۆ وا خەمبار دیاریت؟) (سەهەند بایز) بە زۆر زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوی و دەستی دا بەشـانی (کامـەرانی وەنەوشـە) دا و وتی: (نا براکەم وەنەوشە گیان هیچم نییە، کەمێك سـەرم ژان دەکـات) بـۆنێکی گوڵـە وەنەوشەییەکەی کرد و وتی: (ئەڵڵا) بەڕاستی بۆنێکی خۆشە)! (کامەران) (وتی برام ئەو بۆنە هەمووی هیی گوڵەکەی من نییە، تەماشای ئەولایە بکـە ئـەوە بـۆنی ئـەو چـوار کچەیەیە، نازانی ئەو چوار کچە بۆنیان لە بۆنی مرۆڤی سەرزەمین ناچێت)؟! (سـەهەند) دایە قاقای پێکەنین و وتی: (بەڕاستی سەیرە من دەمێکە لێرە دانیشـتووم هەسـتم بـەو بۆنە نەکردووە). دانیشتنەکەمان خۆش بوو لەو کاتەدا ناسروشتی (کامەرانی وەنەوشـە) هەڵدەستا و دەچوو سێ چای دەهێنا و جار جار سـەیرێکی کچـەکانی دەکـرد ئـەوانیش شەرمیان دەکرد و هەموو بـە گـوێیی یەکدیانـدا دەچـرپاند و (دڵارام میهـرداد)یش بـە دەستەسرە پەمەیەکەی ناوچەوانی دەسڕی، کە تۆزێك ئارەقەی کردبوو. ئارەقەیـەك وەك ئاوی زەمزەم جوان و هەستبزوێن بوو، مۆسیقا و گۆرانییە رۆمانسیەکانیش ئەوەندەی تر کەشی یانەکەیان خۆش کردبوو. (مەندانـە)ش جـار جـار دەیچـرپاند بـە گـوێیی (دڵارام میهرداد)دا، هەستێکی سەیر بوو هەرگیز (کامەرانی وەنەوشە)م بەو شـێوەیە نـەدیبوو. ئەو زۆر جودا لە خۆڕسکی خۆی کە حـەزی نـەدەکرد زۆر لـە جنسـی مێینـەکان نزیـك بێتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی ناسروشتی گۆڕا، ئـەو رۆژە هەسـتی دەکـرد. بەسـەر ئـاودا هەنگاو دەنێت لەکاتی رۆیشتنیدا هەنگاوەکانی هێواش دەکردەوە و بزەیەکی دەهـاتێ و

سەرێکی دەجوولاند بەڕاستی جلە ڕەشەکانی لەگەڵ پرچە ڕەشەکەیدا بریقەیان دەدایەوە و ڕەنگی پێستی سپی دەموچاوی بە کوڕێکی بە ویقار و دەچوو و چوست و چالاك دەهاتنە بەر چاوان.

چوار کچەکە هەر قاوەیان دەخواردەوە. قومی بچووك بچووکیان لە کووپەکان دەدا و پێدەکەنین، پێکەنینێك هێشتا کە ختووکەی پەردەی گوێم دەدات. (سەهەند بایز) دەیگوت: (سەیرکە چەند جوان پێدەکەنن، بەڕاستی زۆر پاکن لە نەورەس دەچن، لە پەپوولەی سەر گوڵاڵەسوورەی دەشتەکانی باکوور دەچن). شاعیرانە قسەی دەکرد ئەو لە نیگایدا ئاشق و سۆزدار دیار بوو.

(کامەرانی وەنەوشە) بۆنێکی گوڵە وەنەوشەییەکەی دەکرد و هەستم دەکرد هەندێك جار خەمێکی قووڵ دای دەگرێت و ڕەنگێکی گەنمی لەسەر ناوچەوانی دروست دەبێت و دەترسێت وەك ئەوەی چارەنووسی خۆی بزانێت و ئیزرائیل بانگی بکات رادەچەڵکیەوە، دەیگوت: (ها (شاپووری خەزان) لەگەڵ منت بوو؟)، من دەمگوت: (کامەران) پێبکەنە بۆ ژیان با بۆت پێ بکەنێت)! لە وەڵامدا هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیگوت: (من کوڕێکم تەڕتر لە باران، تەڕتر لە دڵۆپەکانی باران. جنسێکم لە نەهەنگەکانی دەریا و لە سەدەفەکاندا دەخەوم). کتوپڕ وشەی سەیرسەیری بۆ دەهات! وەك ئەوەی پەیامێکی لە ئاسمانەوە بۆ بێت وشەی سیحراویی خۆی دەگوت و ئارەقەیەکی ساردی دەردەدا و چاوی دەبڕییە (دلارام میهرداد) و دەیگوت: (وا هەست دەکەم ئەو کچەم خۆش دەوێت! وێنەیەك لەو کچە لە روحما هەبووە لە مێژە لەناو سەدەفەکانی دڵمدا نووستووە). (سەهەند بایز) مژێکی توندی لە جگەرەکەی دەدا و تا بنەوەی دەسووتا و دووکەڵەکەی لە کونە لووتە بچکۆلەکانییەوە دەهێنایە دەرەوە و جگەرەکەی لەناو تەپڵەکەکەدا دەوڵی و بە هێمنی پێدەکەنی و دەیگوت: (هەریەکە و ئالوودەی دەردێکە، منیش هێزێکی ئەفسووناوی پاڵم دەدات بەرەو نادیار، بە خودای نازانم لە کێندەر خۆم دەبینمەوە، من لە دوی شتێکم ڕەنگە شێتی بێت).

لەناکاو خاوەنی یانەکە گۆرانییەکەی دەگۆڕی و دەیخستە سەر کەناڵە ئاسمانییەکان و بە دوای هەواڵدا دەگەڕا و لەسەر کەناڵێکی ئاسمانی عەرەبی دەیوەستاند و باس باسی شەڕو شۆڕ و لێدانی وڵات بوو دەستی دەخستە ژێر چەناگەی و بە تاسەوە گوێی بۆ دەگرت. هەواڵەکان باسیان لەسەرهەڵدانی شەڕێکی خوێناوی دەکرد لە ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست و دەنگۆی رووخانی دیکتاتۆر دەهاتە بەر گوێمان. باسەکەمان دەپچڕاند و ئێمەش ناچار دەبووین و گوێمان بۆ دەگرت، کچەکانیش دەترسان و سەیریان دەکرد و دەستییان بە دەمیانەوە دەگرت، دەمزانی کە (ئەیەڕۆ)یان دەکرد (کامەرانی وەنەوشە) پێدەکەنی و دەیگوت: (شاپوور پێم نەوتی کە شەڕێك بەڕێوەیە و ئەم وڵاتە سوور دەبێت)، منیش سەیری ئەوم دەکرد و دەمگوت: (کامەرانی وەنەوشە جارێ بەس مقۆمقۆیە خۆ هێشتا هیچ نەبووە).

ئێستا کە سەعات دووی شەوە شەوێکی هاوینە لە باڵکۆنی شوقەکەمەوە سەیری گڵۆپەکانی شار دەکەم، سەیری کتێبە وەنەوشەییەکەی (کامەران) دەکەم، لەنێوان لاپەڕەیەکدا گوڵێکی وەنەوشەیی پان بۆتەووە و چەند دڵۆپێك فرمێسکی من تەڕیان کردووە تەماشای ئیمزایەکی خڕی (کامەران) دەکەم فرمێسکەکانم تنۆك تنۆك بە چاومدا دێنە خوارەوە ئەو رۆژگارانەم دێنەوە یاد کە ئەم رۆژەیان بەدی هێنا ئەو رۆژە تاڵانەی سەرۆکەکان دروستیان کرد و راوەدوویان نایین، چارەنووسیان لە یەکدی جودا کردینەوە و منیان گەیاندە ئەم کیشوەرە دوورە، کە جگە لە خۆم هەست ناکەم کەسێکی تێدا بێت خەمبار بێت. کیشوەرێکی کریستاڵیە لەم باڵکۆنەوە هەموو شتێك لەبەرچاوم دەبریسکێتەوە جگە لە خۆم کە رەش دەبم و لەناو رەژووی خەمەکانمدا دەتوێمەوە. شەوێکی سەیرە، تەنانەت ئەستێرەکانی ئاسمانیش لە یەکدی کۆ بوونەتەوە و تۆپەڵەی سپی و بریقەدار دەنوێنن. دەجریوێنن و دەگرین بەسەر یادگارییە تاڵەکانی رابردوودا. ئێستا من ئەم چیرۆکە بۆ خۆم و ریکۆردەرێکی چکۆلە دەگێڕمەوە نەبادا بفەوتێت، نەبادا ئەم بەڵگانە لەناو چن با هەبن بۆ مێژوو، با سبەی دەرهێنەرەکانی سینەما سوودی لێ وەرگرن بۆ فلیمە تراژیدیاکان.

تا ئەو دەمە من بریندار بووم دەگەڕامەوە ژوورەکەم و بتلێك شەڕابی سوورم دەهێناو هێواش هێواش رۆم دەکردە ناو پەرداخێك و هەڵم دەچۆڕاند و چاوەکانم دادەخست و هەستم دەکرد تاڵاوی شەڕابەکە و تاڵاوی خەمەکانی رابردوو ئاوێتەی یەکدی دەبوون و بە گەروومدا دەچوونە خوارەوە بیری وەعدەکانی دەسەڵاتدارانم دەکەوتەوە ئەوانەی دەیان گوت گەر هات و لە هەڵبژاردندا سەرکەوتین بینای گەورە گەورەی ستوونی دروست دەکەین و دەیدەینە گەنجان تا ژیانیان خۆش بکەن پارك و مەلەوانگە و یاریگای نێو دەوڵەتی دروست دەکەین و وڵاتەکەمان دەبووژێنینەوە، و

دەمدایـە پڕمـەی گریـان و وتـەکانی (کامـەرانی وەنەوشـە)م دەهاتـەوە یـاد کـە دەیگوت:(شاپوور) درۆیە ئەم دەسەلاتە گەندەڵە هەمووومان راوەدوی دەریا دەنێت و بۆ خۆشی خێر و بێری ولات دەخوات)، راستی دەگوت هەر ئەوان بوون چاوی کانییەکانیان کوێر دەکردەوە و زەوییەکانیان لەسەر مێزی یانەکانی شەوان بە قوومار دەدۆڕاند هەر ئەوان بوون لە پێلاوی لاستیکەوە گەیشتنە پێلاوی کریستاڵ و قاتی ئاوریشم.

خاوەنی یانەکە بەدەست ئاماژەی بۆ هێمنیی یانەکە دەکرد و دەمی دادەچەقاند و دەترسا و گوێی دەگرت. ئێمەش هەر ورتە ورتمان لێ دەهات و لەناو خۆماندا دەگەڕاین بە شوێن قسەی گونجاودا. (دلارام میهرداد) دەستییکی بە پرچیدا دەهێنا و سەیرێکی (کامەرانی وەنەوشە)ی دەکرد و رووی وەردەگێڕا بـۆ (مەندانـە) و پاشـان (شـابانوو) (گوڵبانوو) دەیان چرپاند و سەیری ئێمەیان دەکرد.

ئەوان لەو کچانە بوون کە هەرگیز حەزیان نەدەکرد لـە رەگـەزی نێرینـەکان نزیـك ببنەوە.

(دلارام) کچی یەکێك لە ئاغاکانی دەڤەری سەروو بوو لە یـەکێك لـە خانـەوادە و خێڵەکیەکان و لە یاساکانی ژیانی ئەواندا زۆر شت یاساغ بوو، بەلام سەیر لەوەدا بـوو کـە چـۆن گەیشـتبووە ئـەو ئاسـتەی لـە ئەنـدازەدا بخوێنێـت و ببێتـە یـەکێك لـە ئەندازیارەکانی ولات. ئەمە دیاردەیەکی ناوازە بوو لەم چیرۆکەدا، لە دوایدا هەموویتان بۆ دەگێڕمەوە بە ئەمانەتەوە.

(سەهەند بایز) هەستی بە بێ تاقەتیەکی زۆر دەکـرد و ناسروشـتی هەڵسـوکەوتی دەکرد وەك ئەوەی چارەنووس یاخود سیستەمی ژیانی گۆڕانی بەسـەردا هاتبێـت، بـە توندی دەستی دەخستە ناو پرچییەوە و دەیولێییەوە و پرچی تێك و مەکان دەدا.

(کامەرانی وەنەوشە) هاواری دەکرد و دەیگوت: (سەهەند کاکە گیان ئەوە چـیتە؟ بۆ وایت؟ چی بووە؟، دەترسم خەم بۆ کاولکاری ولات بخۆیت براکـەم خـەم مـەخۆ ئـەم ولاتە لە مێژە وێرانەیە، لە مێژە بایاقوش لەسـەر گوێسـەبانەکانی دەخوێنێـت) مـن هەولم دەدا هەردووکیان هێور بکەمەوە و چرکە چرکە ژمارەی قوتابیان لەناو یانەکەدا زیادی دەکرد و هەموو بە تاسەوە سەیری هەواڵەکانیان دەکرد. هێشتا بۆنی بەهەشـت لەناو مێشکمدا پەنگی خوارد بوو هەستم دەکرد بۆنێکی تـری ئـادەمیزادی دەهـات. بۆنێك بوو لە بۆنی حەقیقەتێکی خوێناوی دەچوو، ئەو دەم هەستم دەکرد کە وتەکانی

(کامەرانی وەنەوشە) زۆر راست ڕێڕەوی خۆیان وەردەگرت. هەستم دەکرد حەقیقەتی شتەکان لە بەهەشت دا هەیە و، لەوێوە دێت دەمزانی لە رەنگی مۆری ئاسماندا لە پەمەیی و پرتەقالّی بۆنی ئێوارانداا خوێن سەراپای دێڕەکانی کتێبەکان دەشۆڕێتەوە و هاوکێشەکان ئاوە ژوو دەکاتەوە. ئاوایە لەناو هەر رەنگێکدا رەنگێکی بریقەدار لەناو هەر پەڵەیەکی خوێندا خاڵێکی رەش لەناو هەر هەسارەیەکدا نهێنییەك هەیە، کە مرۆڤ پەی پیّ نابات. لەناو هەر دەریایەکدا کەشتییەکی شکاوی نقومبوو هەیە، کە لەنێوان چارۆکەکانیدا ماسییەکان یاری دەکەن و بە دوای حەقیقەتی نقومبوونەکەیدا دەرەویشانە دەگەڕێن. هەمیشە لەناو گەرووی هەر نەهەنگێکدا فانۆسێکی زیوین هەیە بۆ رووناکایی. لە ناکاو رادەچڵەکیم و (سەهەندی بایز ئاغا) دەیدا بە شانمدا و دەی گوت: (شاپوور) ئەوە چیتە بۆ نێو چاوانت تەڕ بووە؟ گەرماتە منیش دەمگوت: (نا، بابا زۆرم گەرمایەو سەیری (کامەرانی وەنەوشەم) دەکرد و دەمگوت: برادەرینە با بڕۆینە دەرەوە پێم وایە کاتی وانە هاتووە). هەموو هەڵدەساین و بە نێو کورسییە سپییە ریزکراوەکاندا. یەك بەدوای یەکدا دەڕۆیشتین و من دەکەوتمە دواوە (کامەرانی وەنەوشە) جارجار سەری بەلای چوار کچەکەدا دەسووڕاند و منیش لەگەڵیدا سەریرم دەکرد. وەك بڵێیت کامەران ماڵئاوایی لیّ بکات، زەردەخەنەیەکی دەکرد و ئەویش بزەیەکی دەکرد و ددانە سپییە وردەکانی بەدەر دەکەوتن و تاڵێکی قژەکەی دەهاتە سەر دەموچاوی و لای دەداو رووی دەکردەوە (مەندانە) و شەرم دای دەگرت.

(سەهەندی بایز ئاغا) زۆر بە خەمباری بانگی دەکردم و دەیگوت: (شاپوور سوبحان) هەمیشە لە سەرهەڵدانی شەڕدا پاشماوەیەك بەجیّ دەمێنێت، کە کاریگەرییەکەی هەتا دەمێکی گەلێك دوور نابڕێتەوە و ئاسەواری ئێسك و پروسکی وردوخاشبوو لەگەڵ پەڵەی گەورە و بچووکی خوێندا بە دیوار و گۆڕەپانەکانەوە بۆ زەمانێك دەمێنێتەوە و کاڵ نابنەوە. ئەگەر بێت و هەموو رۆژێك کەناسەکانی شارەوانیش رووکاری جادەکان بشۆڕن)، بەڕاستی شەڕ ئەو ئەژدیها ئاگراوییەیە کە بە ئاسمانی هەر دەڤەرێکدا بسووڕێتەوە یەك پارچە خانوو و درەخت و پارك و مزگەوت و باڵەخانە گەورەکان دەکات بە قەرەبرووت و خەڵووزبارانێکی جەهەنمی باڵ بەسەر ژینگەکەدا دەکێشێت، شەڕ ئەو ئامێرە توندڕەوەیە کە مرۆڤەکان لە دژی یەکتر بەکاری دەهێنن و خوێن

دەڕێژن، لە سووری ڕەنگی خوێندا تێر تێر مەست دەبن و کاسەکانیان پڕ دەکەن و دەخۆنەوە چی دەخۆنەوە؟، خوێنێکی سوورِ سوورِ.

بە پێنج خولەك بەر لەدەست پێ کردنی وانەکەمان هەرسێکمان بۆ ساتێك لە ژێر درەختێکی سەرودا رادەوەستاین و (سەهەدی بایز ئاغا) بە پەنجە شمشاڵیەکانی توێککی درەختەکەی دەکراند و رووی دەکردە (کامەرانی وەنەوشە) پاش هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ دەیگوت: (لە ناخی هەر درەختێکدا رازێکی شاراوە هەیە بە لادانی توێکڵی هەر درەختێك جۆرێك لە شیلە دەرژێت ئەوە ژان و گریانی ئازارەکانییەتی دوای ورژانی گوێ لە ئادەمیزاد دەگرێت و دەگری) (سەهەندی بایز ئاغا) هەندێ جار وشەی زۆر دژواری بەکار دەهێنا کە بە ئاستەم لێ تێ دەگەیشتم دیار بوو زۆر لەژێر دێرەکانی (کامەران)دا دەژیا هەمیشە وتووێژی سەیر سەیریان لەمەڕ ژیان دەکرد و بە درەخت و میووە و ئاو بارانیان دەشوبهاند.

دواتر (سەهەند بایز) دەستی بە کلێنسێك دەسڕی و ئاماژەی دەکرد بڕۆین. هەرسێکمان هەنگاو هەنگاو بەرەو وانەی مامۆستا (کاوە) بەڕێ دەکەوتین. لە ڕۆیشتنماندا ئاسمان بە سەرماندا دەشکایەوە و بەو رۆژە ئەستێرە دەکەوتە باوەشمان و گیرفانەکانمان پڕ دەبوون لە بریسکەی ئەستێرەکانی ئاسمان و دەستمان دەخستە نێو گیرفانەکانمان ئاوی بریقەدار بە پەنجەکانمانەوە دەنووسان لەناو قووڵایی هەر گیرفانێکدا بە ئەندازەی رووناکی خۆر تیشك دەهاتەدەر و خەڵك لە ئێمەیان دەڕوانی و دەیان گوت: (سەیرکەن سەیری ئەو هەموو رووناکی و بریسکەیە بکەن کە لەو گەنجانە دەڕژێن) بە قادرمەکاندا سەر دەکەوتین و خۆمان لە نهێنیی گیرفانەکانمان حاڵی نەدەبووین دواتر لەسەر کورسییەکانمان دادەنیشتین.

## ٤

### گەشتێك بۆ قووڵایی ئاسمان

(مەحموود شەلەنگ) یان بڵێین (مخۆل شەلەنگ) ئەو ناوەی کە پێی ناسرابوو، بوو بە سەروەری بۆ داهاتوو ئەو ئەو چرایەی داگیرساند کە نەدەبوو خامۆش ببێت، ئەو پیاوەی لە خەونیدا ئەم دیمەنانەی دیبوو و وا من (شاپووری خەزان) دەیگێڕمەوە.

دوورگەیەك لە دوورەوە لەسەر پەڵە هەورێکی سپی زۆر کاڵ لەناو تەمێکی تەنکدا خۆی دەنواند. ژێر هەورەکە بۆشاییەکی بێ ژمار بوو. هیچ نەدەبینرا جگە لە درەوشانەوەی ئەستێرە و پەرچبوونەوەی رووناکی بە گوورزەی باریك و سپی جار جار دەستی گرتبوو بە چاوییەوە. هەستی دەکرد بیلبیلەی چاوەکانی بەرگەی ئەو گوورزە رووناکییە سەیرانە ناکات.

وەك یەکێك بەرەو ناوجەرگەی رووناکی رایبکێشێت، بەبێ ئاگایی بەرەو چەقی بەهەشت دەڕۆیشت. سەرشێواو لە چواردەوری خۆی دەیڕوانی. هێزێك لە نادیارەوە پەڵکێشی دەکرد و بەسەر هەورەکاندا هەنگاوی دەنا. پەروانەی سپی و پەپوولەی سپی بە کۆمەڵ بە ژێر باڵ و ناو لەشیدا تێدەپەڕین. تۆقیو و حەپەساو هەر دەیڕوانی. دەفڕی و لە شەقەی باڵی دەدا بەناو هەورەکاندا دەڕۆیشت و بۆنی عەنبەر و مێخەك و ڕێحانە و شەڕاب و درەختی تەڕ و شێدار بەناو لووتیدا بەرەو روحی رۆ دەچوون. جار جار لەخۆی دەپرسی (چی بەهەشت من لە بەهەشت؟) خۆی لە خۆی تێ نەگەیشتبوو بۆچی لەوێ بووە؟، بەڵام لەوێ بووە، بە کۆڵانی کریستاڵی و شووشەیدا ڕەت دەبوو. شۆستەی یاقووتین. ئاسمان بریتی بوو لە کۆمەڵە تۆپێکی دەرەوشاوە لە گڵۆپی ئاسایی نەچووبوون، لە وردە خۆری پەرش و بڵاو چووبوون، هەستی بە سێبەری خۆی نەکردبوو.

(مخۆل شەلەنگ) ی تاساو زۆر شتی سەیری دیبوو ئەو وتبووی، لە باڵکۆنی شووشەی کۆشکەکانەوە روحلەبەری زۆر جوان ئافرەتی سپیپۆش و کە لەگەت و خەندەران دەبینران، کەمان و تاریان لێ دەدا، مۆسیقایەکی زۆر ناوازە هاتبووە بەر گوێی، حەپەساو هەنگاوی دەنا، بەڵام لە کاتی هەنگاوناندا چەندین مەتر لە زەوییەکە بڵند دەبووەوە و پەنجەی بەر ژێی کەمانەکانیان

دەکەوت، پێ دەکەنین و هیچ وشەیەکیان نەدەدرکاندا، لە دوورەوەڕا تارمایی چوار هێڵی شینی کاڵی لەسەر عەردەکانی ئەو دوورگەیە بینیبوو. کە نزیك دەبووەوە چوار رووبار بوون. هەر رووبارێك پاسەوانێکی هەبوو بە ئاماژە کاسەیەکی زیوییان بۆ پڕ دەکرد و فەرموویان لێ دەکرد و هیچ وشەیەکیان نەدەدرکاند. رووباری یەکەم هەنگوین بوو، رووباری دووەم شەراب. شەرابێکی رەنگ کاڵی وەنەوشەیی. رووباری سێیەم شیرێکی سپی، سپی تر لە رووناکی ئەو مەملەکەتە. رووباری چوارەم ئاوێکی روون، روون تر لە دڵۆپە فرمێسکەکانی چاوی فریشتەیەك. یەکسەر تێ گەیشتبوو کە ئێرە بەهەشتە تا ئەو دەمە دڵنیا نەببوو لەوەی کە لە بەهەشتە.

زۆر جاران مرۆڤ لە واقیعی وجوودی خۆی دڵنیا نییەو بەردەوام لە پرسیارکردندایە خۆشی توانای ئاخاوتنی نەبوو. پاسەوانەکان زۆر نوورانی ببوون. لە پەنجەکانیان دەنکۆڵە مرواری تکابووە خوارەوە. بێ سێ و دوو دەفرەکانی لێ وەرگرتبوون و چەند قوومێکی نۆشیبوو، بە راستی خواردنەوەیەکی سەیر بوو، هەستی بە ئاسوودەیی ناو هەناوی کردبوو، دەمارەکانی جەستەی بووژاندبۆوە.

وەك لە دەستنووسەکاندا بەرچاوم کەوت و پاش خوێندنەوەی ئەو کتێبە دەستنووسە (وەنەوشەییە)، (مخول شەلەنگ) باپیری (کامەرانی وەنەوشە) و باوکی (وەنەوشە)ی دایك، باسی ئەو سەفەرە تەلیسماوییەو سیحراوییەی خۆی دەکات بە دووروودرێژی کاتێك لە خەوندا سەفەرێکی درێژ بە بۆشایی ئاسماندا دەکات و دەرگاکانی ئاسمان بە رووی دا دەکرێنەوە ئەو دەرگا داخراوانەی تەنیا بەرووی پێغەمبەرەکاندا کرابوونەوە. لەو سەفەرەدا مەلایکەتەکان پێکڕا پێشوازی لێدەکەن و سلاوی لێ دەکەن وەك خۆی باسی دەکات لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ دا پاش ئەوەی ٨ ساڵ بەسەر زەماوەندەکەیاندا لەگەڵ (دولبەری داود غولام) تێدەپەڕێت، منداڵیان نابێت. هەموو کاتێك بە حەسرەتەوە داوا لە خوداوەندی دلۆڤان دەکەن کە منداڵییکیان پێ ببەخشێت و لە وەجاخکوێری و تەنیایی رزگاریان بکات. هەڵبەتە ئەو دەمە ئەوەی خودا منداڵی نەدایەتێ گۆشەگیر و داماو دەبوو. هەربۆیە نەنگی بوو، ئەگەرچی (مخول شەلەنگ) کابرایەکی زۆر دیندار و لە خواترس بووە و قورئانخوێنێکی کارامە و دەنگخۆش بووە لە گوندەکەیاندا لەناوچەکانی (شاربازێر)، بەلام لەبەر خۆشەویستیی هاوسەرەکەی (دولبەر داود غولام) چەندین مەزارگەی ناوچەکانی کوردستان دەگەڕێن و هەر جێگەیەك لە دەمی خەڵکەوە بیبستن موبارەکە و کاریگەریی باشی هەیە، بۆی دەچن و چەندین تەلیسم و نوشتە و سروتی ئایینی ئەنجام دەدەن، بەلام هیچ کام لەوانە ئاکارێکی باشی نابێت و ناچار دەست بە ئەژنۆ چاوەڕوانی قەدەری خۆیان دەکەن.

ئێوارەیەك پاش گەڕانەوەی (مخۆل شەلەنگ) لە مزگەوت بە دەستی دەستنوێژەوە دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و لە خودای مەزن دەپارێتەوە و بە هەر چوار دەوری خۆی دا خۆی دەلەرزێنێت و جوولەجوولێکی نائاسایی بەخۆی دەخات هەرووەك چۆن بە (شەلەنگ) بەناوبانگ بووە، بەڵام دروست لەو دەستنووسانەوە روون نییە، کە بۆچی نازناوی (شەلەنگ)یان بەسەردا بڕیووە، بەڵام من وا هەست دەکەم بەو پێیەی کابرایەکی زۆر دیندار بووە و بەردەوام لە هەموو جۆرەکانی سرووتە ئایینییەکاندا دەوری کاریگەری هەبووە و لەنجە و لاری بەخۆی خستووە و زیکری کردووە و حاڵی لێهاتووە ئەو نازناوەی وەرگرتووە، بەڵام من زۆر لەوە دڵنیا نەبووم.

هەر لەو کاتەدا (دولبەری داود غولام) کە ئافرەتێکی میهرەبانی دڵناسك و جوان و سەرنجڕاکیش بووە، جامێکی مسی پڕ لە ئاوی مەرکانەکەی سەر حەسارەکەی ماڵیان دێنێتە ژوورەوە و کە بەو شێوەیە (مخۆل) دەبینێت، جامە ئاوەکە دادەنێت بۆ (مخۆل) و پاشان (مەحموود شەلەنگ) چەند قومێك ئاو دەخواتەوە. (دولبەر)یش چەند قومێك، دواتر هەردووکیان دەست دەکەن بە گریان و دەستەکانیان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان و لە خودا دەپاڕێنەوە کە منداڵیان بداتێ.

بە ئیرادەی خودا دوای خواردنەوەی ئاوەکە هەست دەکەن خەوێکی قورس زاڵ دەبێت بەسەریاندا و خەویان لێ دەکەوێت. هەر لەوشەوەدا (مخۆل شەلەنگ) لە خەونێکی دوورو درێژدا دەرگاکانی ئاسمانی بەڕوودا دەکرێتەوە و سەفەری بەهەشت دەکات و دوای خواردنەوەی (ئاو و شەراب و شیر و هەنگوین) ئاسوودەیی باڵی بەسەردا دەکێشێت. ئەمەش چەند پارە گرفێکە لە نووسینەکانی خۆی کە لە دووتوێی ئەو کتێبە وەنەوشەییدا وجوودیان هەیە و منیش ئەو کتێبە بۆ هەمیشە لەناو ئەرشیفەکانی خۆمدا دەپارێزم.، بەڵام لەکاتی نووسینەوەیاندا هەندێك دەسکاریم کردووە تا لە رووی زمانەوانییەوە بگونجێت.

(قەسەم بەیەك رەنگی خودا، قەسەم بە کەلامی خوا قەت قەت ئەو خۆشییەی لەو خەونەدا بینیم لە حەیاتمدا دووبارە نابێتەوە و بەڕاستی سەیر بوو من بە چاوی خۆم هەموو مەملەکەتەکانی بە هەشتم بینی. بە چەندین کوچە و خیابانی گەورەگەورەی ئەلماسیدا رەت بووم. هەستم دەکرد لە حدوودێکی ئەفسانەییدا هەنگاو دەنێم شەقاو شەقاو دەڕۆیشتم و تەماشای ئاسمانی بەهەشتم دەکرد. چەند تۆپێکی رۆشنم دەبینی کە بە مەبەستی رووناکی و دەوری لەمپاو چرایان دەبینی، بەڵام سەیر لەوەدا بوو رووناکییەکەیان زۆر سەیر بوو لە رووناکی ئەم عەردە نەدەچوون. زەمینێکم بینی سنووری دیار نەبوو جگە لە چەند پەڵە هەورێکی پەمەیی کاڵ کە لە دووری دوورەوە سنوورێکی خەیاڵییان کێشابوو لە هەر کووچەیەکدا ساباتێکی لە گەڵا دروست کراو هەبوو کە لە

ژێریا فریشتەی جل سپی تەمبووریان دەژەنی، بەڵام هیچیان قسەیان نەدەکرد جگە لە هاژەی ئاوی تاڤگە و رووبارەکـان و دەنگـی مۆسـیقای فریشـتەکان و دەنگـی باڵنـدەی گـەورەی سـپی هـیچ دەنگییکی تر نەدەبیسترا بە راستی تامی ئەو شەڕابە نەشئەیەکی بـیٚ وێنـەی دابـوومیٚ. هەسـتم دەکرد باڵم هەیە و دەفڕم. لە راستیدا لە قودرەتمدا بوو بفڕم. هەروەختیٚ دەمویست بفـڕم تـەکانێکم بە خۆم دەدا و دەفڕیم).

بـەم شـێوەیە درێـژە بـە پارەگرافـەکانی دەدات و باسـی سەرسـووڕمانی خـۆی دەکـات بـەو مەخلوقاتە سەیرانەی لەو سەرزەمین و کیشوەرە دەژین کە پێی دەوترێت بەهەشت.

دیارە وەك لەو کتێبە دەستنووسە بەرگ (وەنەوشە)ییەدا بینم ئاماژە بەوە دەکات کـەوا (مخـۆل شەلەنگ) لـە مزگەوتـدا و لـە حوجرەکـانی ئـەو ناوچـەیەدا وانـەی دینیـی خوێنـدووە و فێـری خوێندەواری بـووە لەسـەر دەسـتی چـەندین زانـا و مامۆسـتای ئـایینی ئـەو کاتـەدا، هـەروەها شارەزاییەکی باشی هەبووە. لە قەسیدەکانی (حافزی شیرازی)و چەندین شـاعیری ئـەو سـەردەمە، هەروەها سەری لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی دەرچووە و ئاشنایی لەگەڵ شـاعیرانی ناوچـەکانی (سلێمانی) هەبووە.

زۆربەی قەسیدەکانی (نالی و سالم و مەحوی و مەولەوی و بێخود)ی خوێندۆتەوە و کاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر گۆڕینی ژیانی و خوێندەوارێکی باشـی ناوچـەکەی خۆیـان بـووە، هـەر ئـەو شیعرانەش بوونەتە هەوێنی ئەوەی کە بیر لەوە بکاتەوە شتێك لە دوای خۆی بـەجیٚ بهێڵێـت، کـە نەوەکانی دوای خۆی وەك بەڵگەی مێژووی باپیریان سوودی لێوەربگرن و ناوی بنێن (بەڵگە نامـەی مخۆل شەلەنگ).

بۆیە لەو کاتەوە لە بیری خۆیدایە و هەر رووداوێکی سەیر و ناوازە لـە ژیانیانـدا روودەدا، ئـەو لەناو ئەو کتێبـەدا جێگـای بـۆ دەکاتـەوە و لـە یادەوەریـدا هـەڵی دەگرێـت، هـەر ئـەم کتێبـە (وەنەوشەییە) بووە هەوێن و سەرچاوەیەکی کرنگ کە من سـوودی زۆرم لـیٚ بینـی بـۆ نووسـین و کۆکردنەوەی ئەم چیرۆکە، کە باس لـە رووداوەکـانی ژیـانی (کامـەرانی وەنەوشـە)و هـەموو ئـەو رووداوانە دەکات کە خزمەتیان بە رەوتی چیرۆکەکە کردووە.

لەبەر حەزی زۆری (مخۆل شەلەنگ) لـە رەنگـی وەنەوشـەیی و کاریگـەریی زۆری ئـەو رەنگـە لەسەر ژیانی بۆیە بەرگی کتێبەکەی بە رەنگی مۆر دروست کرد و دواتر بووە (کتێبی وەنەوشەیی) کە بەڵگەنامەیەکی بە نرخی خانەوادەی (شەلەنگ)ـە و یەکێکە لە کتێبـە دانسـقە و ناوازەکـانی مێژووی ئەو کاتەی ناوچەکە.

لەنێو ئەو کتێبەدا زۆرێك لــە روودا و ریکــۆردی مێــژووی کوردســتان و هــۆزە کوردییــەکان و چەندین شتی گرنگ بوونیان هەیە. دیارە (محۆل شەلەنگ) ئەگەرچی کابرایەکی مێژوونووس نەبووە و هەوڵی ئەوەی نەداوە (کتێب)ێکی مێژووی بنووسێت هەرووەك لە نووســینەکانیدا دیــارە زۆر بــە شێوەیەکی سادە رووداوەکان دەگێڕێتەوە بەر لە خۆی و دوای خۆی واتە خۆی لە خاڵێکی ناوەندیــدا داناوە و هەتا چاوی بڕی کردوە لــە رابــردوو روانیویــەتی و بــۆ ئێمــەی نووســیوەتەوە. بــا ئێســتا بگەڕێنەوە بۆ ئەو شەوەی کە (محۆل شەلەنگ) خەونی لێ دەکــەوێت و ســەفەرەکەی بــەرەو ئاســمــان دەست پێ دەکات، وەك لە نووسینەکانیدا هاتووە و ئەو دەمەی خوێندمەوە بە راســتی راچــڵەکیم، نەمدەزانی ژیانی (کامەرانی وەنەوشە) بەو شێوەیە هاتووە نەم دەزانــی کــە لەبــەر ئەوەیــە هێنــدە گــــوڵی وەنەوشـــەیی خــۆش دەوێــت و ئەشــقبازیی لەگــەڵ دەکــات، (کامـــەرانی وەنەوشـــە) خۆشەویستییەکەی لە رادەبەدەری بۆ گوڵی (وەنەوشەیی) هەبوو بە شێوەیەك کە لە ژیانیدا رەنگــی دابۆوە و هەمیشە گوڵێکی وەنەوشەیی بە گیرفانی چاکەت و کراسەکانییەوە گیر دەکرد، گوڵێك لــە گوڵی ئاسایی ئەم سەر زەمینــە نەدەچــوو وشــك نــەدەبوو بــەردەوام تــەڕوو ئــاودار دەیــان نووانــد رەنگەکانیان لە رەنگی ئاسایی سەر ئەم گۆی زەویــە نەدەچــوون هــەر ئــەو دەمــە هەســتم دەکــرد پەیوەندیان بە وجوودی مرۆڤایەتییەوە هەیەو لە دنیایەکی ترەوە هاتوون.

(محۆل شەلەنگ) درێژە بە سەفەرەکەی دەدات و دەگێڕێتــەوە (منــیش وەك باڵندەیــەکی ســپی وابووم تەکانم دەدا و دەفڕیم، کۆمەڵێك خەڵکی تر فریشــتەی تــر بــەرگی ســەوزیان لەبــەردا بــوو، جلوبەرگ و قوماشی ئاوریشمی کە لە دوو بەش پێك هاتبوون بەشێك لە ژێرەوە هەموو عــەورەتی داپۆشیبوون، بەشێکی تر لەسەروو ئەو قوماشانەی لە ئاخیردا بیرم کەوتەوە کە ئەمە ئەو (لیباســە سوندوسە)یە کە لە قورئاندا لە سووڕەتی (ئەشکەوت)ــدا ئاماژەی پێدراوە.

هێندە بریقەدار و ناسك و جوان بوو، چاوەکانم لە رەنگەکانیان تێر نەدەبوو، بەهەر لایەکــدا دەم روانی عالەمێکی خەیاڵی بوو. وەك هێزێك پاڵم پێوە بنێت بەرەو ساحەیەکی سەوز شــەقاوم دەنــا، بە راستی هێندە سەرسام بووم، نەخشتی جیاواز جیاوازم بینی، کە بــە کۆمــەڵ دروســت کرابــوون، گوڵی مۆر وەنەوشەیی شین زەرد سووڕ پەمەیی پرتەقاڵی چەندین رەنگی تر کــە لەســەر زەوی لــەو شێوە نەخش و رەنگانە بەدی ناکرێن، بە کەلامی خوا ئەوەندە حــەماس گرتبــوومی بــەپرتاو خــۆم هەڵدایە نێو باخچەکەو بۆنی گوڵەکانم دەکر مێشکم لە ئاسوودەیی پڕ دەبوو روحــم هێنــدە ســووك دەبوو هەستم بەوە نەدەکرد کە من لە چی پێگەیەکی ئەم گەردوونەدام هــەر لــەو دەمــەدا رەنگــی گوڵە وەنەوشەییەکان سەرنجی زۆریان راکێشام، ماچی پــەڕەی گوڵــەکانم دەکــرد و چــەند چــەپکێك

گولّم بە دەستەکانم بژار دەکرد و وردە وردە دوور دەکەوتمەوە، گولّەکان بۆم پیّ دەکەنین، دواتــر پــۆل پۆل حۆری بەمپەڕ و ئەو پەڕی رووبارەوەکانــەوە پرچــیان شــانە دەکــرد، دەنگــی دلّۆپــە ئاوەکــانی پەنجەکانیان لەناو ئاوەکەدا هاژەیــەکی ئەفســووناویی دروســت دەکــرد. هــەموویان نیّــو چــەوانیان خالّیّکی سووری پیّوە بوو لە دەستووری هیندییەکان دەچوو. هەنــدیّك ســەمایان دەکــرد، هەنــدیّك مۆسیقایان لیّــدەدا هەنــدیّك یارییــان دەکــرد، هەنــدیّك میوەیــان دەخــوارد، هەنــدیّك بالّنــدەیان هەلّدەفڕاند لەناو روحمدا هەستم بە تینوێتی و برسێتی و ماندوویی نەدەکرد. هەستم بە فــەرەحێکی لە رادەبەدەر دەکرد لەناو روحمدا کە هەرگیز بەو شیّوەیە نەبووم، پاشــان وەك هیّزیّــك رامکیّشــیّت رۆیشتم بەرەو دەرگایەکی زیوی گەورە لەو کاتەدا هەولّم دەدا پالّ بە دەرگاکەوە بنیّم لەگەلّ ترازانی دەرگاکە و دروستبوونی هیّلّیّکی باریکی ســتوونیی بــۆش لــەنیّوان هــەردوو لای راســت و چــەپی دەرگاکەدا رووناکییەکی زۆر کەوتە سەرچاوەکانم. بە کەلامی خوا بە کەلامی خوا، دەنگــی وشــەی (ئەللّا) هاتە بەرگوێم. کتوپڕ هیّزیّك بەرەو دواوە رایکیّشــام و بــە خیّراییــەکی لــە رادەبــەدەر لــە ئاسمانەکان کەوتمە خوارەوە. کتوپڕ راچلّەکیم و بە خەبەر هاتم دیتم خەونم بینیووە و دەنگی مــەلای گوند هاتە بەر گوێم. بانگی بەیانی دەدا کە بەلای راستمدا روانیم، (دولبەر)یش لە خەون راچلّەکی و شایەتمانی دەهیّنا، کە سەیری دەستم کرد گولّیّك لەنیّوان پەنجەکانمدا بوو (دولبەر) بەهامان شیّوە گولّیّکی وەنەوشەیی ئەفسووناویی بە دەستتەوە بوو).

## ٥

### (دوو هێڵ کە هەرگیز بە یەکدی ناگەن)

من و (کامەرانی وەنەوشە) یان (کامەرانی وەنەوشەی) کە هەردوو ناوەکەمان پێ دەوت، لە تەنیشت یەکدییەوە دانیشتبوون، (سەهەندی بایز ئاغا) کە لەبەردەمماندا لە تەنیشت (زەینەب سەیفەدین)ـەوە دانیشتبوو. (زەینەب) هەر تەماشای گیرفانەکانی ئێمەی دەکرد کە بە گوورزە تیشکی زەرد و سپییی لێ دەهاتنە دەرێ.

(ئاسمان خۆشناو مینا) کچێکی سپییکەڵەی چاو و برۆ رەش بوو، لێوی گۆشتن بوون، کە بەبێ (سووراو) هەمیشە سوور وەك خوێن دەیان نواند. پرچێکی لوولی درێژ و کەمەرێکی باریك و باڵایەکی مام ناوەنجی، هەمیشە پرچی دەخستە پشت گوێچکە بچکۆلەکانییەوە، کچێکی دەنگ ناسك بوو، هەمیشە کە داوای یارمەتیی لە (سەهەند بایز) دەکرد، هەندێك کات وانەی زیادی بۆ بەیان بکات لە چرپەی دەنگی وەخت بوو شوشەکان هارِە بکەنە خوار. لە هەمە جۆر جلوبەرگی جوانی سەردەمی لەبەر دەکرد، ئەو کچی مامۆستایەکی بەناوبانگ بوو، بەڵام کەمێك لە وانەکاندا لاواز بوو، لەبەر ئەوەی (کامەران) و (سەهەند) دوو لە زیرەکترین خوێندکارەکانی کۆلێژ بوون، بەردەوام داوای ئەوەی دەکرد کە وانەی پێبڵێت، بەڵام (کامەرانی وەنەوشە) لەو پیاوانە بوو، کە زۆر حەزی لە جنسی مێینە نەبوو، ناچار (سەهەند بایز) وانەی پێدەووت (ئاسمان مینا) بەردەوام لە نزیك (سەهەند بایز) دادەنیشت، لەو دەمەدا دەستی دەبرد بۆ گیرفانی سەهەند تا بزانێت نهێنیی ئەو رووناکییە چییە دواتر دەستی دەبوو بەیەك پارچە لە رووناکی. (سەهەند بایز) ئاوڕی دەدایەوە و خەمێکی قووڵ لە چاوەکانییەوە سەرچاوەیان دەگرت. پاش نزیکەی چوار خولەك هەموو خوێندکاران کۆدەبوونەوە، لە پاش هەموویان بە سەرێکی سپی و ماشو برنجیەوە مامۆستا (کاوە میرخاس) دەهاتە پۆل و رۆژ باشی دەکرد و چاویلکەکەی دەکردە چاوی و پەڕە پەڕە کتێبەکەی دەستی هەڵدەدایەوە و بە دوای مادەی ئەو رۆژەدا دەگەڕا.

بەردەوام پەڕەکانی هەڵدەدایەوە، (کامەرانی وەنەوشە) دەستی دەخستە ژێر چەناگەیی و بەلای راستدا لە پەنجەرەکەوە لە دیمەنی ئەو درەختە سەروەی دەڕوانی، کە لە پانتاییەکی فراواندا بە تەنیا بە ئاسماندا هەڵچووبوو. هەر لەو کاتەدا منیش تەوژمی هەستم بڕیبووە سەر (کامەرانی

وەنەوشە)و لەنێو رەنگی ئاڵی گوڵەکەی سەرسنگی دا بزر ببووم، پەڕیبوومە دنیاییەکی جاوید، دنیایەك شتەکان مانایەکی تریان هەبوو هەستم دەکرد بە دوای گرێ کوێرەی حەقیقەتدا دەگەڕێم، دەمزانی کە گەڕان بە نێو دنیای خەیاڵدا بە دوای حەقیقەتدا ئاکامێکی زیندووتری هەیە لەوەی کە مرۆڤ لە دنیای بەرچاو و راستییدا بە دوای حەقیقەتدا بگەڕێت. بەڕاستی حەقیقەت و دنیای ئاسایی وەك ئەو دوو هێڵە تەریبە بوون کە مامۆستا (کاوە میرخاس) لەسەر بۆردەکە بە دوو ماجیکی جودا کێشابوونی. هێڵێك پچڕ پچڕ و سووڕ هێڵێکی ئاسایی درێژی شین هەرچەند درێژت بکردنایەتەوە لە هیچ خاڵێکدا بەیەك نەدەگەیشن. هێڵە پچڕ پچڕە سوورەکە حەقیقەت بوو. هێڵە شینە درێژەکەش دنیا بوو. لە دنیادا لە هیچ پنتێکی ئەم جیهانە ئاماژەیەك بەدی ناکرێت بەرگێك بۆ حەقیقەت بچنێت.

من هەر لە (کامەرانی وەنەوشە)م دەڕوانی چاوە تەڕە بریقەدارەکانی رووەو رووناکیی دەرەوە بەرەو ئاسۆ درێژ کردبۆوە، هەستم بەوە دەکرد کە مامۆستا (کاوە میرخاس) بە دەستی چەپی ئاماژەی بۆ (کامەران) دەکرد و بە پارەگرافێکی پەخشانئاسا دەیکوت: (ها (کامەران)ی گوڵ بەیەخە، لە دالغەی چ دایت؟ ئەتۆ لەم دنیای یاخود بازدت داوەتە ئەودیو؟ هێڵە نەبینراوەکانی وجوود، هەست دەکەم چاوەکانت تەڕن بە دڵۆپە فرمێسکی حەقیقەتێك لەم ئان و زەمەنەدا وجوودی نییەو باشترە لە بیر وانەکەدا بیت دەنا رەنگە بە یەکجاری خۆت فڕێ بدەیتە ئەو دنیایە، ئەو کاتە نەجات بوونت زەحمەت دەبێت و دەبێت هەمیشە بە دووی هێڵەکاندا غاربدەیت و ناگەیتە ئەنجامێکی باش، بەڕاستی پێم سەیرە کوڕێکی زیرەکی وەك ئەتۆ بەژداریمان ناکات و وانەکەمان دەوڵەمەند ناکات، تۆ هەمیشە لە پێشەنگی خوێندکارە زیرەکەکانی ئەم بەش و کولێژە بوویت و بەردەوام داهێنانی زۆر جوانت هەبووە، ئەتۆ گەر لە زانستدا قووڵ بیتەوە، لە داهاتوودا دیزاینەرێکی بە توانات لێ دەردەچێت. ) دەمودەست کامەران خەیاڵاتی دەپچڕاند و ئاوڕی بۆ مامۆستا (کاوە میرخاس) دەدایەوە و دەیگوت: (مامۆستا ببوورە)، کەمێك پرچی بە دوادا دەخست و خۆی قیت دەکردەوە و ئاوڕێکی بە هەردوولای خۆیدا دەدایەوە و بەردەوام دەبوو، دەیگوت: (مامۆستا حەقیقەتی هێڵەکانی تۆ لەوەدایە کە لەم دنیایەدا هەرگیز یەك ناگرنەوە، بەڵام من چاودێری ئەوانم دەکرد لە دنیایەکی دیکە دەمبینین، بە ناو یەکدا تێدەپەڕین و لە خاڵێکی رۆشنی چەشنی ئۆریجناڵی دا دیار دەکەوتن و لە بری سێ تەوەرە چوار تەوەرەیان دەنواند، ئەو تەوەرانەش ژیان بە شێوەیەکی دیکە وێنە دەکەن کە جودایە لەو ژیانەی، لەسەر ئەم زەمینە پیادە دەکرێت، ژیان هاوکێشەیەکی ناکارەیە لەسەرزەمین، بەڵام لە دنیای چوار تەوەرەیدا

مانایەکی دیکەیان هەیە کە پڕن لە بۆنی گوڵ و چریکەی مەلەکوت و هاژەی تاڤگەی هەنگوین و شەڕاب و باخچەی بۆنداری خەیاڵ خوڵقێن، من بەشێکی گەورەی ژیانم تەرخان کردووە بۆ ڕۆچوون لەناو فەنتازیا و خەیاڵدا و بەردەوام خەریکی چنینی تابلۆگەلێکی خەیاڵییم، کە زانست دەبەوە بۆ شێوەیەکی دیکە هەمیشە لە پەنجەرەوە ڕوانین، مرۆڤ فێری ئەوە دەکەن کە لە ئاسۆوە تیشکۆی بیری مرۆڤ لە خاڵێکدا یەك دەبڕن، کە حەقیقەت و دنیایەکی تر دروستی کردوون. )

بە ڕاستی مامۆستا (کاوە) تاقەتی لە وانەکە نەدەما و لەگەڵ (کامەرانی وەنەوشە) دەبووە دایەلۆگیان لەمەڕ خاڵ و لاین و تەریب و شتی وەها کە هەموو خوێندکارەکان حەپەساو و دەست لەسەر دەم لەوانیان دەڕوانی. هەندێکیان لە خەمی ئەوەدا بوون، کە وانەکەیان بە خۆڕایی بڕوات و تەواوی نەکەن، هەندێکی تر بە زەردەخەنەو شەوقەوە گوێیان بۆ دایەلۆگەکان دەگرت و بێ دەنگ ڕادەمان، منیش بەبێ ئەوەی یەك وشە چییە بیلێم بەردەوام لە دەمی ئەوانم دەڕوانی و تێدەکۆشام لە وشەکان باشتر حاڵی ببم.

مامۆستا (کاوە میرخاس) دەیگوت: (کامەران) وشەکانت گەلێك جوانن)، دەستی دەخستە نێو هەردوو گیرفانی و ماجیکەکەی لادەدا و بەردەوام دەبوو و دەیگوت: (کامەران) بەڕاستی ئەتۆ هەوڵ دەدەیت زانست و ئەدەب لە یەك خاڵی دیکەدا گرێ بدەیتەوە، ئەمە هەوڵێکی تازە و ناوازەیە ئەتۆ ئەگەر لەسەر ئەدەبیش بەردەوام بیت، ڕەنگە بتوانیت هاوکێشە و یاسای وا دروست بکەی کە دروست کەری قەسیدە و ڕۆمان و چیرۆك بن، گەڕانەوە بۆ ئاسۆ و کۆکردنەوەی تیشکی بیرکردنەوەت لە خاڵێکی زانستی دا دنیایەکی ڕۆشن تر لەم دنیایە دروست دەکات، بەڵام ڕەنگە دروستکردنی خەیاڵییکی لەو چەشنە پێویستی بە توانایەکی ڕوحی گەورە هەبێت، کە هەموو مرۆڤێك نەتوانێت لە خۆیدا دروست بکات. بە ڕاستی لە شارێکی وەهادا کە پڕە لە ژاوە ژاوی ئوتۆمبێلی نوێی سەردەم و کارگەی ژینگە سووتێن و باڵەخانەی بەرزی دەوڵەمەندە نارۆشنبیرەکان و بەرپرسە حزبیە سمێڵ زلەکان خەیاڵ و تیشکۆی مرۆڤی بەهرەمەندی وەك ئەتۆ دەکوژن و ناهێڵن ئاسۆ بە ڕوونی ببینیت، بۆیە دنیایەکی تایبەتت دەوێت کە بگەڕێتەوە بۆ نێوی، دوور بێت لە تەنی ئەندازەیی دەست کردی مرۆڤ).

مامۆستا (کاوە میرخاس)ـیش هەر وەك (کامەرانی وەنەوشە) بە حیوارەکانیدا وادیار بوو، کە لە ئاخاوتندا زۆر بە توانایە و بەردەوام سەری لە خوێندنەوەی کتێبی بەکەڵکدا گەرم کردووە. جار جار چاویلکەکەی بە دەستی دەجووڵاند و ڕووی دەکردە تەواوی خوێندکارەکان و قسەی دەکرد و دەیگوت: (خوێندکارە ئازیزەکان! هەریەکە لە ئێوە ئەگەر لە حەقیقەتی مرۆڤ بڕوانێت کە ئیشی

چییە لەسەر ئەم زەمینە؟و بوواری کارکردنی بدۆزیتەوە و خۆی بۆ خزمەتی مرۆڤ تەرخان بکات. مرۆڤ بە واتای مرۆڤ بۆ مرۆڤ نەك بۆ خوی، ئەوا دەتوانێت کاری جوان بکات و شاکارە وێنەیەکی جوان بخولقێنێت، لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە بەردەوام لەگەڵ (کامەرانی وەنەوشە)دا دەخافێن ئەدی بۆ کەس لە ئێوە بەژداریمان ناکات؟ کەسێك هەیە قسەی هەبێت و بیەوێت بیکات؟ )

(سەهەند) بە شەرمەوە دەستی بەرز دەکردەوە، هێشتا ئاسەواری پرژانی تیشك لە گیرفانەکانیدا دیار بوو، سەیرێکی (کامەران)ی دەکرد و دەیگوت: (مامۆستا گیان، ئێمە پێویستە وانەیەکی تایبەتمان هەبێت باسی ئەو شتانە بکات کە لەم دنیایەدا ناکرێن و پێچەوانەی یاساکانن، بەڵام لە دونیایەکی دیکەدا حەرام نین و یاسای تایبەتیان هەیە و بەرجەستە دەبن و ئازار چەشتنیان نییە بۆ گەیشتنیان بە پێگەی خۆیان. ) لەو کاتەدا دەمبینی (یاسەمین سەلمان) بە دەستی پرچی لادەدا و تەماشای (سەردار بێخەو)ی دەکرد و چرپەیەکی لێوە دەهات و (ئاسمانی مینا) دەستە بچکۆلەکانی لەژێر چەناگەی چەسپ دەکرد و، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، کە (سەهەند بایز) لە قسە کردنی بەردەوام بێت، هەستم دەکرد بە قسەکانی (سەهەند بایز) زۆر سەرسام دەبوو، نیگای چاو و ئاماژەی نائاسای لە روخساری (ئاسمانی مینا)دا لە کاتی قسەکردنی (سەهەند)دا نائاسایی بوو.

(سەهەند بایز) ئەگەرچی کوڕی کابرایەکی نەخوێندەواری ئاغازادە بوو، بەڵام گەنجێکی زۆر رۆشنبیر بوو هەمیشە لەگەڵ من و (کامەرانی وەنەوشە) و (بەهرۆز چاوڕەش) گفتوگۆی سەیرمان دەکرد، بەردەوام لە بازنەی نێوانماندا کتێبێك دەسووڕایەوە سەرەتا. (کامەرانی وەنەوشە) وەك مامۆستایەکی بە ئەمەك کتێبێکی دەخستە نێو بازنەکە خۆی بە چەند رۆژێك تەواوی دەکرد و دەیخوێندەوە دواتر دەیدا بە من پاشان (سەهەند بایز)، زۆر جار بازنەکەمان گەورە و گەورەتر دەبوو (ئاسمان مینا) و (سەردار بێخەو) و (نیلۆفەر حوسنی) و چەندین هاو کۆلێژ و هاو پۆلی تر بەژداریان لەگەڵدا دەکردین، دواتر لە بەشەکانی تردا باسی ئەو بازنەیەتان بۆ دەکەم رۆژێك بازنەکەیان شێواندین و تاڵاویان پیێ نۆشین.

(سەهەند بایز) درێژەی بە قسەکانی دەدا و دەیگوت: (مامۆستا هەموو مرۆڤێك تەوەرەیەکی بیرکردنەوەی بە خۆی هەیەو بەردەوام لەنێوەندی ئەو تەوەرەیدا چەندین پرسیاری وەڵام نەدراوە دەسووڕێنەوە سەبارەت بە ژیان و رەنگ و ئاو مۆسیقا و باران و گۆرانی و زۆر شتی دیکە. ئەگەر باسی هارمۆنییەتی هێڵەکانت بۆ بکەم، چۆن وەك مۆسیقا لەسەر وەیڤی تەژێ و تەژێ تەواو شەپۆلەکان رێچکەی خۆیان درێژە دەدەن، دەبێت بگەڕێینەوە سەر گۆرانی کە بۆچی مرۆڤ لە

ئاستی دەنگی خۆشدا رادەچڵەکێت و لە ئاستی دەنگی نا قـۆڵای وەك دەنگـی جـەللادیك، یـان گوێدرێژێك، یان پیاوکوژێکی خوێنمژدا پیح دەکەیت و دەخوازیت گوێچکەکانت بئاخنیـت. دیـارە بەر لە دروستبوونی مرۆڤ، پێوەرێك لەسەر شریتی هەستی مرۆڤ چەسپ و ریکۆرد کـراوە، ئـەویش هونەری بەراوردکردن و پێوەرداریيـە ئەگـەر پێـوەرداریی مـن و (تـۆ)و (کامـەران) و (ئاسمـان) و (یاسەمین) و (سەردار) و... کیێ و کیێ هەتا نا کۆتا نەبێت بـەرز و نزمـی و هـارمۆنی لـە ژیانـدا نەدەبوو، چونکە ئەگەر هەموو وەك یەك بیربکەنەوە ئەوا بیرکردنەوەکان شـەپۆل دروسـت ناکـەن و دەبنەوە بەو هێڵەی کە تۆ لەسەر سەبوورەکە وێنەت کردووە.

بە بڕوای من هێڵی راست لەم گەردوونەدا وجوودی نییە. هـەموو خـوارو خێچـن هەڵکشـان و داکشانیان تێدایە، لەسەرزەمین نەحەقیقەت هەیە نە عەدالەت، ئەوەش ئێمە بـە دووی کـەوتووین سەرابێکی چڕە و هەمیشە بە شێوەیەك خۆی دەنوێنیێ. وانەکەی تۆ ئەمڕۆ لەسەر ئـەو دوو هێڵـەو سیێ تەوەرەیە، بەڵام بە گوتەی (کامەران) لە دنیایەکی دیکەدا ئەو دوو هێڵـەی کـە لـەم دنیايـەی ئێمەدا یەك ناگرن، لەو دنیایەی (کامەران) دروستی کـردووە و ئێمـەی بـۆ ئـەو دنیايـە پـەلکێش کردووە، یـەك دەگـرن و، چـوار تـەوەرە وێنەدانـەویان بـۆ دەکـات). مامۆسـتا (کاوەمیرخـاس)، سەرسووڕماو لەم دوو مامۆستا گەنجە دەڕوانێت و هەست دەکات لەیەك سەرچاوە و لە یەك کانیـاو ئاویان خواردۆتەوە، ئەویش بریتییە لە (بازنەی سووڕانەوەی کتێب) کە مامۆستا (کاوە میرخـاس) هیچ زانیارییەکی نییـە لەسـەر دنیـای ئـەوان، بـەڵام ئێمـە هەریەکـە هێزێکـی ئـەو بازنەیـەین خولگەیەکی خەیاڵی لە خولگەکانی گەردوون بە نێوانمانـدا تێدەپـەڕێت و لـەم پـەڕ بـۆ ئـەو پـەڕ وشەگەلی حەقیقەتی دنیا دەگوێزینەوە. خەونمان گەورە و گەورەترکردنی ئەو بازنەیەیـە. مامۆسـتا (کاوە) دەپرسێت (ئەدی لەم دایەلۆگەی ئەمڕۆدا لە رەگەزی تەواو کەری ئـادەمیزاد، لـە رەگـەزی کچان کەسێك نییە قسەی هەبێت؟ ) هەر لەو تاوەدا (ئاسمان مینا) دەستی بڵند دەکرد و دەیـووت (مامۆستا گیان) (دیارە خۆی بۆ خۆی گویێ گرتن لـەم بەرێزانـە هونـەرە، بـەڵام گـرنگ ئەوەيـە، پێکنەری دووەمی من ئەو بێت، ئەو شتێکە من تەواو دەکات. من بەبیێ ئەو ناتوانم دنیـا ببیـنم، لە نووری کۆتای ئەو هێڵەوە ژیان دەست پیێ دەکاتەوە) ئەو دەمە مـن تـیێ گەیشـتم کـە (ئاسمـان مینا) ئەو کچەی زۆربەی جاران بەرگی شینی دەپۆشی و ناونیشـانی ئاسمـان بـوو. هـەر بۆیـە بـە (ئاسمانی شین) مەشهوور بوو. لە پەیوەندی ئەڤینداری لەگـەڵ (سـەهەندی بـایز ئاغـا) دەگـەڕێت زانیم، کە مەبەستی لە (ئەو) هەر (سەهەند بایز) بوو. بە راستی لەو ساڵانەدا لـە دوو هـەزارەکان بەرەو سەر مۆدێلی ئەوە بوو. هەر کەسێك لەگەڵ رەنگێك خۆی ئاشنا بکات و ببێـت بـە بەشـێك

لەو رەنگە و ئەشقبازیی لەگەڵ بکات، ئێمە زیاتر رەنگی (ڕەش، سپی، سەوز)مان لەبەر دەکرد جگە لە کامەران، کە هەمیشە رەنگی وەنەوشەیی لەگەڵ رەنگەکانی تر ئاوێتە دەکرد. ئەویش بە دانانی گوڵێکی وەنەوشەیی لەسەر سنگی چاکەتەکانی ئەو جۆرەها چاکەتی هەبوو. هەموو چاکەتەکانی جێگای ئەو گوڵەیان هەبوو هەتا لە هاوینان و وەرزە گەرمەکانیشدا یەخەی کراسەکانی بەو گوڵە دەڕازاندەوە، یان دەیکرد بە گیرفانەکەیدا یاخود بە کونی یەکێك لە قۆپچە بەرزەکانی بەشی سەرەوەی دەنووساند، وەك وتم رۆژ رۆژی ئەوە بوو کە هەرکەس خوبگرێت بە رەنگێکەوە، (ئاسمان) بۆ ئەوەی وەك ناکۆتا خۆی نیشان بدات و بڵێت من دەریا و ئاسمانم رەنگی شینی ئاسمانی هەڵبژاردبوو.

سەرەتایی یەکترناسینمان ئەو رۆژە بوو کە فۆرمی هاتنمان لە کۆلێژ پڕ کردەوە. ئەو فۆرمەی بناغەی ناسینی تۆیە روونتر (پڕۆ فایلی) ئێمە بوو، کە دەستمان دەکرد بە خوێندن، بۆ یەکەم ساڵ و نازناوی (قاز)مان بەسەردا دەسەپا. ئەوەش نازناوێکی باو پێکەنیناوی کولتووری ئێمە بوو. ئەو دەمەی داوای پێنوسێك لە (سەهەند) دەکات کە بە دوو هەنگاو لەولا من و کامەرانەوە فۆرمی پڕ دەکردەوە. بیرمە ئەو کاتە بە (سەهەند)ی گوت: (بەڕێز رووخسەت هەیە ئەو قەڵەمەم بدەیتێ). چاوە جوانە تەڕەکانی بڕیبووە (سەهەند بایز)، کە هێشتا ئێمەش لەگەڵ (سەهەند) یەکترمان نەناسیبوو، سەهەند ئاخیر وشەی لەسەر فۆرمەکە پڕ کردەوە و ئیمزایەکی کرد و وتی: (فەرمووو خانمی بەڕێز)، چاوم لێ بوو (ئاسمان) بزەیەکی کرد و پێنووسەکەی وەرگرت و دەستی کرد بە (پڕۆفایل) پڕکردنەوە و، پاشان ئێمەش کارەکانمان کرد و، (ئاسمان مینا) پێنووسەکەی دایەوە بە (سەهەند بایز)، بەڵام چاوی لەسەرچاوی (سەهەند بایز ئاغا) نەدەتۆراند بە راستی دیمەنێکی زۆر جوان بوو کاتێك (سەهەند) ویستی پێنووسەکە وەربگرێت، بەڵام لە دەستی ترازا و کەوتە سەر زەوی دەمودەست (ئاسمان) و (سەهەند) پێکەوە دانەوینەوە بۆ پێنووسەکە و دووبارە چاویان بڕییە سەرچاوی یەکدی، هەردووکیان گەلێك جوان و دانسقە بوون، (ئاسمان) زووتر (پێنووسەکەی) دایەوە دەست (سەهەند) و وتی: (من ناوم (ئاسمان)ـە. هەنووکە وەرگیراوم لەم کۆلێژە خەڵکی ئێرەم، وادیارە تۆش بە زمانتا دیارە خەڵکی ئێرەیت؟) لە وەڵامدا (سەهەند بایز) وتی: (بەڵێ من خەڵکی ئێرەم، بە ئەسڵ خەڵکی ئێرەم، ناوم (سەهەند)ە، خۆشحاڵم بە ناسینت. ئەوەی من بتوانم بە چاوان بۆتی دەکەم). لەبەر ئەوەی ئێمەش خەریکی فۆرمەکان بووین. من گوێم لە هەموو قسەکانیان بوو هەر ئەو کاتەش ناوەکانیانم زانی. من زۆر کەسێکی گوێسووك بووم. هەمیشە هەموو شتێکم زۆر ئاسان دەبیست و دەزانی، دیار بوو من و (کامەرانی وەنەوشە) هەردووکمان لە شارێکی ترەوە

هاتووین، لە گەراجی پاسەکان لەو کاتەی جانتاکانمان بارکردبوو، شانمان وەشانی یەکتر کەوتبوو و یەکترمان ناسیبوو. بە درێژای ڕێگای نێوان ئەو دوو شارە لە تەنیشت یەکدی دانیشتبووین و قسەی زۆرمان کردبوو هەر لەو کاتەوە پەیمانمان دابوو هاورێ بین و پێکەوە درێژە بە خوێندن بدەین و بە هەموو توانایەکمانەوە یارمەتی یەکتر بدەین ئەودەمەی پەیمانمان بەیەك دا دراوێکی کاغەزمان کرد بە دوو پارچەوە و هەریەکەو پارچەیەکمان بۆ یادگاری هەڵگرت. وەك پەیمانێك ئەویش لەلایەن (کامەرانی وەنەوشە)وە بوو. پەیمانمانیشمان دا کە بێ یەك هیچ شتێك نەکەین. (ئاسمان مینا) درێژەی بە قسەکانی دا، بەر لەوەی مامۆستا (کاوە میرخاس) بیەوێت قسە بکات، وتی: (دوو هێڵ هەمیشە لە تەنیشت یەکدیەوە تێدەپەڕن، بەڵام یەکێکیان گەرمە، ئەوی دی سارد. ئەگەر لەم دنیایەشدا بە یەکدی بگەن ئەوا تەنگژە و کێشە دروست دەکەن، چونکە دوو هێڵی دژ بەیەکن، ئەگەر یەکێك لەو دوو هێڵە (من) بم، دەبێت ئەو هێڵەی دیکە کێ بێت؟ ئایا مەرجە ئەو هێڵەی دیکە (ئەو)بێت من حەز ناکەم ئەو بێت، چونکە هەرگیز بەیەکدی ناگەین! ئەگەر (ئەو) حەزنەکات بە من بگات، رەنگە یەکێك لەو دوو هێڵە ئاسەواری نەمێنێت. وەك ئەو تەختە سڕەی بەرێزت یەکێکیان رووکاری دیار نامێنێت، ئەوا ئەوەی دی بۆ خۆی دەمێنێتەوە و رەنگە ئەوەی تریش نەمێنێت یاخود بێ ئەوەی تر لە خۆیەوە بپووکێتەوە. کەواتە (حەقیقەت) و (دنیا) دژی یەکترن و بێ یەکتریش هەڵ ناکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دەبێت، دنیایەکی دیکە دروست بکەین، کە ئەم دوو زاراوەیە بەیەکەوە گرێ بدەین و لە خاڵێکدا بە یەکیان بگەیەنین. ئەو دنیایەش تەنیا لای (کامەرانی وەنەوشە) هەیە) مامۆستا (کاوە میرخاس) کەیفخۆش بوو بەوە کیژێك دەبینێت قسەی هەیە و سڵ لەوە ناکاتەوە کە کچە و قسەی جوانی هەیە و هەرگیز لەوە ناترسێت کە حەقیقەت چییە بیڵێت. دیارە سەرسامە بەوەی (کامەرانی وەنەوشە) هاورێی وەهای هەیە و دنیای بۆ کردوونەتە شتێکی دیکە و هەوڵی داوە (حەقیقەت) و (دنیا) بۆ ئەوان زۆر ئاسان بکاتەوە و وایان لێ بکات ژیان بە شێوەیەکی دیکە هەست پێ بکەن و ئاوێتە کردنی ئەو دوو زاراوەیە لە دنیای (کامەران)دا، بزەیەکی جوانی بە (مامۆستا میرخاس) بەخشیبوو، وای لێکرد لەپڕ قاقایەك لێ بدات و بڵێت (ئادەی قوتابیە ئازیزەکان، چەپڵە). لەپڕ هاڕەی چەپڵە لە پۆلەکەدا، دەستی پێکرد، لەو دەمەدا چاوم بڕیە سەر (ئاسمان مینا)، لە جێگەی خۆی دانیشتەوە و تەریق دەبووەوە و لە هەمان کاتدا رەنگی کەمێك ئاڵ دەینواند و کەیف خۆش بوو بەوەی وتەکانی گەیشتوونەتە (سەهەند بایز) لە دڵی خۆیدا وای هەست دەکرد کە (سەهەند بایز) ئەو کەسەیە ژیانی بۆ رۆشن دەکاتەوە، وەك چۆن هەردوو دەستەکانی بۆ کردە گڵۆپی شیری و

لە پەنجەکانییەوە رووناکی دەچۆڕانە خوارەوە، کاتێك مامۆستا کاوە چاویلکەکەی لە چاویدا جووت کرد و کەمێك لەسەر لوتی چاویلکەکەی جوولاند، تەماشای کاتژمێرەکەی دەستی کرد و گوتی: (کات تەواو بوو، هیوادارم سوودتان لەم وانەیە وەرگرتبێت ئەوەش بزانن (ئەندازیار) بەبێ خەیاڵ و فەلسەفە سەرکەوتوو نابێت و داهێنانی بۆ ناکرێت، سەرکەووتوو بن). کتێبەکان و ماجیك و شتەکانی گرت بە دەستییەوە و رۆیشتە دەرەوە بە دوایدا دوو دوو سێ سێ، هەموو چوونە دەرەوە. (کامەرانی وەنەوشە) و (سەهەند بایز) تەماشای یەکتریان دەکرد و لە جێگای خۆیان هەڵنەدەستان، (ئاسمان مینا) سەیرێکی ئێمەی کرد و رۆیشتە دەرەوە. لەگەڵ چوونە دەرەوەی(ئاسمان) دەمودەست چوومە لای سەهەند و پێم وت (سەهەندی، برام من وا هەست دەکەم (ئاسمان) حەز بەوە دەکات لە تۆ نزیك بێتەوە بەڕاستی، ئەو شەیدای هەموو سیفەتەکانت بووە تۆ ئاگادار نەبوویت کە لەکاتی قسەکردنتا چۆن تەماشای دەکردیت، بەشەوقەوە لە چاوە تەڕەکانتی دەڕوانی ئەو دەروویشانە بە قسەکانت مەست ببوو. ئەو دەمەی تۆ قسەی جوانت دەکرد ئەو هۆن هۆن دەگریا) دەستییکی بە دەموچاو و ریشە قەڵەمیەکەیدا هێنا و وتی: (برام (شاپووری خەزان) هەستم بەوە کردووە. من لەو رۆژەوە هەستم پێ کرد کە بەر لە چەند مانگێك لەمەو بەر لە کاتی پڕکردنەوەی (پڕۆفایلی کەسێتی) دا داوای پێنووسەکەی لێ کردم و لە دەستمان کەوتە خوار و تەماشای چاوەکانی کردم زانیم، کە ئەو کچە، بە من سەرسام بووە.، بەڵام من نازانم) (کامەرانی وەنەوشە) تیانووسەکانی دا بەیەکدا و وتی (دەی براینە با بڕۆین سەرو (چای) بخۆین بە خودا سەرم ژان دەکات، تێڕامان لە (کاوە میرخاس) دەمارەکانی سەرمان دەهەژێنێت) قسەکانم قووت دایەوە دەمویست هەندێ پرسیاری دیکە لە (سەهەند بایز) بکەم، بەڵام نەم کرد و لە پۆل بەدەر کەوتین بەرەو گۆڕەپان و حەوشەی کۆلێژ، لە دوورەوە چوار کچەکەم بینی لە حەوشەکەدا پیاسەیان دەکرد، بە ناز و عیشوەوە بە دەم یەکەوە پێ دەکەنین و خەندەران خەندەران لە دیمەنی باخچە و گوڵ و درەختەکانیان دەڕوانی. (کامەرانی وەنەوشە) تفێکی قووت دا و سەیرێکی منی کرد و وتی: (شاپوور) (بۆ خۆیانن، تەماشا بکە).

# ٦

## (قەلەڕەشەکە قسە دەکات)

**بەدەست و خەتی (کامەرانی وەنەوشە) نووسرابوو**

ئاسمانێکی تاریك، بەڵام لە هەندێ جێگادا کەمێك روونتر بەسەر سەرمەوە بوو. هەورەکان وادیار نەبوون کە زۆر بڵند بن. رەنگی دنیا شێوە تاریك و شێوە روونـاك دەینواند. بە هەر چوار دەوری خۆمدا دەمڕوانی هیچ ئاسەوارێکم نەدەبینی جـار جـار ئاسمان برووسکەیەکی دەدا وەك مەلایکەتی شەڕ بە گوورزێکی گەورە بە هەموو هێزی خۆی لە دەفرێکی گەورەیدەدا دەنگییکی نەعرەتەکێشم لە ئاسمان بـەرگوێ دەکـەوت. رەنگـی برووسـکە و چـەخماخەکانی ئاسمـان لەسـەر رووکـاری شووشـەی وردوخـاش و داروپـەردووی کـەوت و بریقـەیان دەدایـەوە و ئاسمـان فلاشـی دەدا. بـە بـڕوای خـۆم مەلایکەتێك وێنەی زەویی دەگرت لە کاتی هەپرونهەپرونبوون و کاولبوونیدا. من وڕو کاس و حەپەساو دەمم داچەقاندبوو یەك بە دنیـا هـاوارم دەکـرد و دەمگـوت: (ئێـرە کوێیە؟) کەسێك ئاسەوارێکی مرۆڤایەتی نەبوو بۆم بسەلمێنێت کە ئەمە سەرزەمینە بە راستی سەرزەمینێکی سەیر بوو. وام هەست دەکرد لەسەر هەسارەیەکی ترم. هەنگاوم دەناو تەکانم بە خۆم دەدا هەر دەگەڕام ئاسەوارێکم نەدەدۆزیەوە جگە لە پارچە کانزای بریقەداری شووشەئاسا نەبێت. پاش چەند هەنگاوێك لە رۆیشتن چڵە دارێکـی رەنـگ رەشی بڵندم دەبینی، کە هیچ گەڵایەکی پێوە نەبوو، رەش و ناشرین و وشکهەڵاتوو لە شێوەدا لە پیرەمێردێکی تاساوی سیحربازی جنۆکەئاسا دەچوو، درەختێکی ترسناك بوو لەسەر گردێك کە هەروا چەند مەترێك بەرز بوو. لە ئاستی من تاریکی ئاسمان و هەور وایان کردبوو چڵەکانی سەرەوەی بەباشی نـەبینم. وام هەسـت دەکـرد درەختێکـی زۆر درێژە و لە ئاسمان چەقیوە و من تەنیا بەشێکی کەمی دەبینم ناچار بووم هەر لێی نزیك دەبوومەوە زۆریش دەترسام هەستم دەکرد گیانم وەك شەقشەقە دەلەرزی، کـە سـەیری

جەستەی خۆم دەکرد جلێکی سەیرم لەبەردا بوو. لە جلوبەرگی جەنگاوەرە کۆنەکانی سەردەمی رۆمانییەکان دەچوو، کە لە فیلمدا بینیبوومن بریتی بوو لە تەنوورەیەك تاسەر ئەژنۆم سەرم قورس بوو، کە دەستم دا لەسەرم کڵاوێکی کانزایی زەرد کە بەشی سەرەوەی لە فڵچەیەکی گەورە دەچوو لەسەرمدا بوو، سەر سنگم بە زرێپۆشیکی ئاسنین داپۆشرا بوو. باسکم بەزرێپۆش داپۆشرا بوو. بەردەوام تەماشای دەوروبەری خۆم دەکرد و تەماشای خۆم دەکرد، جووتێك پاپووجی چەرمیم لەپێدا بوو. ئاسەواری خوێن بە پێیەکانمەوە بوو، بە راستی وەك ئەوە بوو کە لە زانای گەورەی فیزیا (ئەنشتاین)یان پرسیبوو، کەی جەنگی جیهانیی سێیەم دەست پێ دەکات؟ ئەویش وتبووی: (نازانم کەی ئەو جەنگە دەست پێ دەکات، بەڵام جەنگی جیهانی چوارەم کاتێك دەست پێ دەکات، مرۆڤەکان بە شیر و رم و تیر و کەوان شەڕ دەکەن). وام دەزانی من پاشماوەی جەنگێکم کە جگە لەمن کەسێکی تر بە زیندوویی نەماوە. وام دەزانی پێنج سەد ساڵ بەسەر ژیانماندا تێپەڕیوە، کاتێکی سەیر بوو، زەمینێکی ئەفسووناوی بوو، من بەبێ چەك بەبێ شیر و رم و تیر و کەوان بەو یالّەدا سەردەکەوتم. هەستم بەوە کرد، کە شتێك لەسەر یەکێك لە چلّەکان دیارە لە پارچە قووماشێکی رەش دەچوو رەش رەش لە قەتران دەچوو، کە نزیك بوومەوە و لە درەختەکەم روانی، قەلەڕەشێکی قەترانی بوو چاوەکانی دەبریسکانەوە و تیّی دەڕوانیم. هەر کە ئاسمان فلاّش دەدا، سێبەرێکی گەورەی زەبەلاح ئاسایی لەسەر زەوی دروست دەکرد. زۆر دەترسام کە دەستم دا لە درەختە وشکهەڵاتووەکە، هەستم کرد دەستەکانم سارد دەبوو. کە تەماشای لەپی دەستەکانم کرد شلەیەکی سووری رەشباو بە دەستەکانمەوە بوو زانیم، ئەمە خوێنە وەك چۆن بنێشتە تاڵ بە دارەبەندا دێتە خوارەوە، ئەوەها خوێن چۆڕاوگەی بەستبوو بە دارەکەدا دەهاتە خوارەوە. وەك چۆن مۆم دەتوێتەوە و بنکەکەی قەڵەو دەکات و ئەستوور دەبێت ئەوەها درەختەکە بە خوێنی مەیو هەندێك ئەستوور ببوو. قەلەڕەشەکە بە بەرزیەوە تەماشای دەکردم، هاوارم کرد (من کێم؟ ) قەلەڕەشەکە قیڕاندی و وتی: (تۆ ئەویت، هەر خۆتیت بە تەنیا هەر تۆ ئەویت، کەس ناتوانێت تۆ بێت). لە ترسا خۆم بە زەوییەوە نووساند و تەماشای ئەوم دەکرد. لە خۆم پرسی چی؟ قەلەڕەش قسە دەکات؟ هاوارم کرد وتم (ئەی هاوار ئەم خەراباتە چییە ئەم ئاسەوارە وێرانەیە کوێیە؟ قەلەڕەش لەم سەر عەردە قسە دەکات؟ ئەی مرۆڤەکانی ئێرە لە کوێن؟ بۆ کەس لێرە نییە؟ ئێرە کوێیە دۆزەخە یان

سەرزەمینی شتە ونبووەکانە؟ بۆ هەموو شتێك لێرە ونە؟ بۆ هیچ ئاوەدانییەك لێرە نییە ئەی بۆ من لێرەم وا خەریکە لە ترسا دەمرم من لەم تاریکستانەدا چی بکەم ئەی بۆ لە مرۆڤی سەردەمی رۆمانییەکان دەچم؟ ) قەلەڕەشەکە دووباڵی هەڵتەکاند و بە دەنگییکی گڕ قیڕانی و لەسەر فۆنەتیکی مرۆڤ وتی: (تۆ هەر بەتەنیا دەبیت، تەنیا تۆ کەسی ترنا، ئێرە سەرزەمینی شتە ونبووەکانە، ژیان لەم سەرزەمینەدا ونبووە، کەشتییەکان باڵەخانەکان، مرۆڤ و شارستانییەتەکان هەموو لە جەنگی چەکە گەورەکاندا لەناوچوون باخەکان رێگا و پردەکان دەریاچەکان هەموو لەم سەرزەمینەدا رۆچوون و ئەم عەردە قوتی دان. تەنیا ئەم درەختە مایەوە من مامۆستای تۆم، وانەی ژیانت فێر دەکەم مرۆڤ زۆر دڕندەن. ئەوان بوونە هۆی مردنی هەموو گیانەوەرەکانی تر، هەرچی یەك هەبوو دژی یەکتر تاقییان کردەوە، لە پێناوی هیچدا لەسەرخۆی شەڕ پەروەردە بوون. دڕندەن و شایەنی هیچ نین. تۆ تاکە مرۆڤێکیت کە لەم سەرزەمینە ماویت. تەنیا نێرینەیەکیت و تەنیاش دەژیت و رەگەزی مێ نییە تا لەگەڵی زاوزێ بکەیت هەر بۆ ئەوەی زیاد نەکەن دەبێت رەنج بدەیت و ئەم سەرزەمینە تەی بکەیت و ئاوەدانی بکەیتەوە تۆ تاکە نەوەی (ئادەم) یت لەم عەردە دەبێ رەنج بدەی و ژیان دروست بکەیت تا بزانیت تواناکانی تۆ تا چ رادەیەك بەرچاون. تۆ دەبێت رووبار لێ بدەیت، سەرەتا لە خوێن پاشان خۆی دەکاتەوە بە ئاو. لێرە لانکەی ژیان بنیات بنێ و بە هەموو سەرزەمیندا بڵاوی بکەوە چیتر خۆریش نابێت لەم هەسارەیە هەمووتان رووناکی بەم شێوەیە دەبینیت: (فلاش، فلاش) دەبێت رابێت بەم شێوە ژیانە. لەم درەختە پیرە وشکەوە درەختی دیکە بڕووێنە لەم خوێنە مەیووە کانیاو لێ بدە، دەبێت رەنج بدەیت، هەمیشە دەبێت کار بکەیت تۆ دەبێت لە سفرەوە دەست پێ بکەیتەوە، ژیان لە تۆوە دەست پێ دەکاتەوە...) ئەم وشە سەیرانە لە دەنگییکی قیڕەئاساوە بەر گوێ دەکەوت. جار جار فلاش لە ئاسمانەوە دەهاتە سەر سەرم و سێبەری قەلەڕەشەکە دەکەوێتە بەرپێم گەورە دەینواند، حەپەساو بووم یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا (لەسەرزەمینی شتە ونبووەکان) بم بەبێ هیچ ئاسەوارێکی مرۆڤ بەبێ هیچ شوێنەوار و شارستانییەك سەرزەمینێکی وێران بەبێ هیچ ژیانەوەیەك، شتێکی موعجیزەئاسا بوو. (قەلەڕەش قسە بکات) درێژەی بە قسەکانی داو قیڕاندنی وتی: (مرۆڤەکان شەڕیان کرد و یەکتریان کوشت تاعوونیان لەسەر ئەم زەوییە بڵاو کردەوە، هەموو شتێکیان سووتاند

تەڕ و وشك زیندوو مردوو گوڵ و دار باخچە و باڵەخانەکان و ژن و منداڵ و پیر و گەنج هەموو سووتان چەکی زۆر قورس لەم شەڕانەدا بەکار هات لە پێناوی هیچدا لە مانای ئاشتییان نەدەزانی، هەموویان فەوتان لە شەڕی خۆیاندا هەموویان مردن و بە زەویـدا رۆچوون بەبێ هیچ ئاسەوارێك. تۆ تەنیا مایتەوە و نەمردیت، چونکە تۆ لەگـەڵ ئـەو شەڕەدا نەبوویت و بڕوات بە ژیانێکی تر هەبوو لەودیوو خاڵە ناکۆتاکانی حەقیقەت تۆ تاکە کەسێك بوویت ئیشت لەو دنیایەدا دەکرد و خاڵ بەندیت تێدا دەکرد. تۆ جودایت لەوان نیت، هیچ نەوەیەکێشت نابێت، بەڵام دنیایەکت دەبێت تەنیا تـۆ خـاوەنی ئـەو دنیایە بیت نە کەسی تر). (دەم پرسی من کێم؟) دەیگوت: (تۆ رەگەزێکی تری ژیانت بە شێوەیەکی نوێ جودا لە ژیانی پـێش خـۆت، تـۆ بەرهـەمی ژیـانێکی خنکاویـت، ژیانێك تۆز و غوباری ناعەدالەتی و کوشتن و خوێن بە سەریدا زاڵ بوو. تۆ دەبێت بـە تەنیا هەنگاو بنێیت و ئەم زەمینە ببینیت، ئەگەر لە تواناتا نـەبوو کارەکـان ئـەنجام بدەی تەنیا تر دەبیت و ئەم درەختەش نامێنێت ببتە هاوڕێت بۆیە دەبێت لـەم دارەوە تۆوی گوڵەکان بچینیت، سەرزەمینێکی دیکە هەیە ئەگەر چنگێك لەم خوێنە مەیووەی تێدا فڕێ بدەیت ئەوا گـوڵی رازاوەی تێـدا دەڕوویـت بۆیـە دەبێـت ئـەو سـەرزەمینە بدۆزیتەوە من هیچ ئاماژەیەکت نادەمێ تا ئەو شوێنە بدۆزیتەوە دەبێت بە تەنیا بـۆ خۆت ئەو شوێنە بدۆزیتەوە، قیڕ، قیڕ، قیڕ).

نەم دەزانی چی بکەم دەگریام، بەڵام فرمێسکم نـەبوو، دەمـوت: (نـاتوانم بـە تـەنیا نـاتوانم) دەیگوت: (دەزانم دەتوانیت من دەزانم دەتوانیت، دەتوانیت).

هیچ ئاسەوارێکی رووناکایی دیار نەبوو چرایەك، گڵۆپێك، ماڵێـك، باڵەخانەیـەك، زەوییـەکی کاکی بە کاکی و رووتەن و وشك و خاپوور بوو جگـە لـەو درەختـە سـەیرە لـەو بەرزاییـەدا هـیچ شوێنێکی دیکە نەبوو وڕ و حەپەساو دەمڕوانی قەلەڕەش دەیگـوت: (دەسـت پـێ بکـە لـەمڕۆوە دەست پێ بکە) منیش بێ دەنگ بەو چارەنووسە رازی بووم. ئەویش دەیگـوت: (دێمـەوە بـۆ لات کاتێکی تر زەمانێکی تر دێمەوە).

نەم دەزانی دەست بە چی بکەم قسەکانی کۆمـەڵێك شـیفرە و کـۆدی ئەفسـانەیی بوون من لە سیحری وشەکانی تێ نەدەگەیشتم، بەڵام ناچار بووم بەو قـەدەرەم رازی بم و ملی ناچاری نەوی بکەم و ئەو بارە بخەمە سەر شـانم بـارێکی قـورس، ئـاخر ئـەوە ئەرکێکی قورسە سەرزەمینێك، کە سنوورەکانی دیار نەبن، سەرزەمینێکی تاریك بـە

تەنیا تەی بکەی و هەموو پارچە خاڵێك تاقی بکەیتەوە تا(سەرزەمینی شتە ونبووەکان) بدۆزیتەوە، ئەو زەمینەی خوێنی مەیو تێیدا چەکەرە دەکات و گوڵی رەش و مۆر و سووریان لێ بەرهەم دێت. دۆزینەوەی ئەو سەرزەمینە کارێکی وەها ساکار و ئاسان نەبوو. رەنجدانێکی نەبڕاوەی دەویست. دەستم دەبرد بۆ کڵاوە فلچەئاساکەم لەسەرم دام دەگرت و فڕێم دەدایە سەر زەوی. بە هەموو لایەکدا چاوم دەگێڕا، هیچ ئاسەوارێکی قەلەڕەشەکەشم نەدەبینییەوە. بە راستی تەنیا بووم تەنیایەکی کوشندە و تۆقێنەر. ئاخر ترسناك و سیحراوییە لەسەرزەمینێك بژیت ئاسەواری ژیانی تێدا نەبێت و خاڵی بێت لە هەموو ئاماژەیەکی ژیان دواجار ژیان لەوێ بریتی بوو لە چیرۆك گەلێکی دێرین کە کەسێك نەبوو هیچ لەربارەی بزانێت دەبوو لەسەرەتاوە بۆ خۆت سەر گوزشتەی ژیانێکت بۆ خۆت بگێڕایەتەوە. تەنیایی لەو سەرزەمینەدا خەیاڵی مرۆڤی دەپرووکاند. تەنیا تاریکی و پەڵە هەوری رەش و رەساسی هەبوو. جار جار فلاش ئاسمان و ئەو دەنگە نەعرەتەدارە ئەوەندەی تر ژیانیان دەکردەوە هیچ. ناچار بووم کارەکانم راپەڕێنم. کڵاوەکەم لەسەرزەمین هەڵگرتەوە و بە چنگەڕنێ لە قەراغ و رۆخی درەختە سیحراوییەکە دەستم کرد بە کۆکردنەوەی خوێنی مەیو، کە هەر لەو باخەوانە پیرە دەچووم بەردەوام دارەبەنەکان چاودێری دەکات و بە تەشوێیەکی تیژ قەدەکان بریندار دەکات و بە قوڕ کۆچەڵەی قوڕینەیان بۆ دروست دەکات، کۆچەڵە قوڕینەی خاوێن وەك هەویر بە قەدی درەختەکانییەوە دەنێت و پاش ماوەیەك چاودێری دێتەوە و کۆچەڵە پڕ بنێشتە تاڵەکان کۆ دەکاتەوە و لە گۆزە و سەتڵی دەنێت و دەیان فرۆشێت منیش بە وێنەی ئەو بە چنگ درەختەکەم دەکڕاند و کڵاوەکەم پڕ دەکرد لە خوێنی مەیو و هەڵدەستام و دەستم دەکرد بە گەڕان گەڕانێکی بێبڕانەوە.

# ٧

## خولیای دروستکردنی کۆشکێك بگاتە شینایی
## ئاسمان کۆتایی ساڵی ١٩٨٣

پایزێکی ئاڵتوونی بوو کاتێك لەسەر کورسییەکی داری ئەستووری پتەو لە بن یەکێك لە دار هەرمێکاندا دانیشتبوو. ئەوکاتە گەڵاکان هێدی هێدی بە نەسیمی لە ناکاو خڕە خڕە دەکەوتنە خوار و بەو زەوییە بە پیتەدا بڵاو دەبوونەوە. ئەودەمە (میهرداد کاکەوەیس) بیری لەوە دەکردەوە، ئەگەر ئەو سکەی خێزانەکەی (مەستی سوارۆ ئاغا) کچ بێت یان کوڕ، دەبێت بەهەر شێوەیەك بێت بیخاتە بەر خوێندن و بیکاتە ئەندازیارێکی بلیمەتی تەلارسازی، تا ئەو خەیاڵەی بۆ خۆی لە زەمانێکی دێرینەوە لە مێشکیدا بووە بیهێنێتە دی. ئەو خۆی نەیتوانیبوو بخوێنێت سەردەمی ئەوان تەنیا خەریکی راو شکار و سەروکاری بوون لەگەڵ بنەماڵەی ئاغاکاندا و باو باپیرانی سەردەمانێك ژیا بوون، کە لە گوندەکانی ئەو دەڤەرەی کوردستان دەسڕۆیشتوو و فەرمانڕەوا بوون و باوەڕیان بەوە نەبووە کە قەڵەم و کتێب بەردێکیان بۆ بخاتە سەر بەرد، فریادڕەسێك بێت دڵخۆشییان بۆ بهێنێت. لە راستییدا ئەوان فەرمانڕەوا بوون و هیچ کات پێویستیان بە خوێندن نەبووە و لە هیچ شتێکی بە نرخیان کەم نەبوو. هەرچیان ویستبێت کاسەلێس و دەمتەڕیان هەبووە و بۆیانی جێبەجێ کردوون. خەڵکانێکی زەلیل و نەداریش بە زەبری قامچی و تفەنگ لەژێر دەستییاندا پووکاونەتەوە. تفەنگ ئەو ئامێرە نەگلیسەی لە مێژووی ئێمەدا بەردەوام لە دژی خەڵك و خۆمان بەکارمان هێناوە و زۆر بێگوناه لە رەحمی گوللەکانی قوتار نەبوون و نێچیری سەرەکییشیان رەگەزی مێینە بووە، کە هەمیشە کوژراون و زیندەبەچاڵ کراون. ژن ئەو کائینە پاکیزەیەی سروشت بە مرۆڤایەتیی بەخشیوە، بەردەوام لەم کۆمەڵگاو کولتوورەی خۆرهەڵاتی ئێمەدا بە کاڵاو مرۆڤی ناکامڵ و ئابڕوبەر ئەژمار کراون.

بە هەرحاڵ لە بەشەکانی دیکەی ئـەم کتێبـەدا کـە بڕیـارم دا تێکـڕای ڕووداو و چـیرۆکەکانی هەموو سەردەمەکانی پەیوەست بە هێڵی ڕووداوی سەرەکییی خۆمـانی تێـدا تۆمـار بکـەم، ئـەم خولیایەم پاش ئەوە هات کە سۆراخی کۆمەڵێك شتی گرنگم کرد لە تاراوگەو بە دوادا چوونم کـرد، ئەوەش وای لێ کردم کە بیری خۆم تیژ بکەمەوە و فلاشباکێك بکەمەوە بـە هـەموو ڕووداوەکـانی ڕابردووی خۆمدا و هاوڕێ ئازیزەکانم و هەموو چیرۆکەکان ئاوێتـەی یەکـدی بکـەم و بیـان خەمـە خزمەتی ڕووداوی سەرەکی، چونکە هەموو پەیوەست بوون پێکەوە.

(میهرداد کاکەوەیس) هەر تەماشایی ورگی (مەستی) دەکرد، کە هێدی هێـدی دادەنەوییـەوە و بە گسك گەڵا زەردەکانی ڕادەدا و لە سووچێکدا کۆمەڵی دەکرد ئەو دەمە (مەستی) ئـافرەتێکی زۆر جوانی گوندەکـەی خۆیـان بـوو لەبـەر سـەرۆکاری مـاڵی (میهـرداد) لەگـەڵ مـاڵی بـاوکی (مەستی)دا لە گوندەکـەدا و خزمایـەتیی نێوانیـان (میهـرداد) چـووبووە داخـوازی (مەسـتی) و خێزانیان دروست کردبوو، لەگەڵ دروستکردنی خێزانیشدا هەندێك لە دەسەڵاتەکان بـەر (میهـرداد کاکەوەیس) کەوتبوو بەو هۆیەوە کۆمەڵێکی زۆر باخ و باخاتی کشتوکاڵی بەرکەوتبوو، کە ڕەنجبەر و سەپانی زۆر کارەکانیان بۆ بەئەنجام دەگەیانـد، پـاش ئـەوە لـە کۆتاییـەکانی سـاڵی ١٩٨٣ـــدا (مەستی) دەگاتە ڕێو شوێنی خۆی، سکەکەی دەگاتە ڕۆژی خۆی، بەر لەوە (میهرداد) حـەزی لـە خوێندن نەکردبوو، بەڵام لە پڕێکدا دوای ئەوەی سەردانی شاری کردبوو، دیمەنی تـەلارێك سـەرنجی ڕاکێشا بوو، کە ئەندازیارێکی فارس نەخشەو نیگاری کێشابوو، کاڵەکی بە ئەژنۆ شـکاندبوو، کـە چ عەقڵێك توانیویەتی ئەو پایە و بنمیچ و پەنجەرە و زەخرەفە و نەخش و نیگارانە بکێشـێت. وای هەست کرد بوو مرۆڤی ئاسایی هەرگیز ناتوانێت ئەم جۆرە کارانە بکات ئەگەر خوێنـدنی ئەنـدازە تەواو نەکات ئەو (تەلارە) کرمێکی وا دەخاتە مێشکی کە بڕیار دەدات لە یەکێك لە باخچـەکانی خۆیدا تەلارێکی لەو شێوەیە دروست بکات و کەرەستە و کرێکاری شارەزای لـە هـەر سووچـێکی دنیاوە بۆ بهێنێت، بڕیاریش دەدات دەبێت ئەندازیارەکە ئەولادی خۆی بێت و دواتر شـانازیی پێـوە بکات. بۆیە بەر لە چەند ساڵێك پێش ئـەوەی ژن بهێنێـت ئـەم کرمـە لـە مێشـکیدا هاتوچـۆی کردبوو، بەڵام بەهۆی زۆری ئیش و کاری بەڕێوەبردنی کاروباری ئاغاکانی ئەو دەڤـەرە نـەیتوانیبوو بە تەواوی و بە ئارەزووی خۆی بیر لەو حەزەی بکاتەوە.

هەر کە ژن دەهێنێت و پاش ئەوەی نیشانەکانی بەرزبوونەوەی ورگـی خێزانەکـەی بـەدی دەکات شاگەشکە دەبێت و بڕیار و بیرۆکەکە دووبارە لە مێشکیدا زینـدوو دەبێتـەوە و حـەز دەکات کە نـەوەی داهـاتووی بەهـەر هۆیـەك بێـت بخاتـە بەرخوێنـدن و بیگەیەنێتـە پلـەی

ئەندازیاری و شەو رۆژ لە بیری ئەوەدا دەبێت و خێزانەکەی و سکەکەی بە خێو دەکات، بەلایەوە گرنگ نییە ئەو سکە چییە بەلایەوە گرنگە کە خەونەکەی بهێنێتە دی ئەو لەو کاتەوەی ئەو خەیاڵە لە مێشکیدا چەکەرەی کردبوو بەهەموو شتێکی پیرۆز و باوەڕی خۆی وەعدی دابوو، کە دەبێت دروست کەری ئەو کۆشکە لە نەوەو تۆرەمەی خاوێنی خۆی بێت، رۆژ بە رۆژ گۆرانیی بە باڵای خێزانەکیدا دەڵێت و خزمەتکار و کەنیزەکی شایستە بۆ خێزانەکەی دەگرێت و ناهێڵێت ماندووبوون بچێژێت، بەڵام (مەستی) ئافرەتێکی بە ئیرادە و ئازا و گورج دەبێت، بەردەوام کارە تایبەتییەکانی خۆی رادەپەڕێنێت. هەر بۆیەش بە وەرزی پایز زۆر سەرسام دەبێت و حەز بەوە دەکات گەڵا وەریوەکانی ناو باخچەکە کۆ بکاتەوە و کۆمەڵیان بکات دواتر بە دەزوو و داو بیان چنێت و تەنافی ئاڵتوونیان لێ دروست بکات.

(مەستی) خۆی حەزی بەوە نەکردبوو، کە خزمەتکارەکانی ئیشی تایبەتی بۆ بکەن حەزی لە دیمەنی گەڵاکان بوو لە رەنگی گەڵاکاندا خۆی ون کردبوو ئێوارەیەکی پایزی رەنگ ئاڵتوونی لەو دەمەی خۆر لەدەم کەلی چیاوە دەنیشێت و دیمەنی ئێوارە پرتەقاڵی دەنوێنێت (مەستی) ژان دەیگرێت و پەلەپەل (میهرداد کاکەوەیس) یەکێك لە پیاوەکانی دەنێرێت و مامانی گوندەکە بانگ دەکات، پاش کاتژمێریك لە هاتنی مامانەکە و کردنی کارەکانی (میهرداد) هەر هاتوچۆیەتی ماخۆلان ماخۆلان دێت و دەچێت، بێ پەروا و بێ حەواس چاوەڕوانی بینینی نەوەکەی خۆی دەکات. پاش ئیستێك دەنگی گریانێکی ناسکی منداڵییك دەگاتە بەر گوێی، دەمودەست مامانەکە بانگ دەکات: (گەورەم میهرداد) مژدەم بدەرێ منداڵییکی جوان و سپی و فریشتەئاساتان بوو).

(میهرداد) بێ ئەوەی باسی ئەو پرسیارە زەقە سواوە بکات کە باوکان بەردەوام لێی دەپرسن (کوڕە یان کچ؟) لەو پرسیارە ناقۆلایانە ناکات و دەڵێت: (دایەگیان تۆ خەڵاتێکی تایبەتت لە منەوە بە دەست هێنا، لە خودا داوا دەکەم ئەو کۆرپەیەم بە مرازی خۆی بگات و خواستەکانی من بەجێ بهێنێت و خەونەکەم بێتە دی). مامانەکە دەڵێت: (منداڵەکەت کچە لەو بڕوایەدا نیم ئەو خەونەی تۆ هەتە بەو بێتە دی). دیارە مامانەکە لە توانای ئافرەتانەی خۆیەوە بۆ مەسەلەکانی روانیبوو. لە راستییدا لەسەر حەق بووە، چونکە ژنانی ئەو سەردەمە زۆر زیاد لە پێویست چەوساوە بوون. (میهرداد) دەڵێت: (دایە گیان بەشی خودایە، کوڕ بێت یان کچ گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە من ئێستا باوکم).

مامانەکە کارەکانی خۆی دەکات و منداڵەکە دەداتە دەست (میهرداد) و ئەویش بە پەرۆشەوە لە ئامێزی گەرمی دەنێت و پاش چەند شەوێك مەلای مزگەوت و هەندێك لە ئاغا و بەگ زادەکانی ناوچەکە بانگێشت دەکرێن بۆ ماڵی (میهرداد کاکەوەیس) و مامۆستای ئایینی بانگ دەدات بە گوێی کچەکەدا.

ڕۆژێك دوای لەدایکبوونی کچەکەی لە باخەکەدا پیاسە کردبوو و بیری لەوە کردبۆوە، کە چ ناوێك لە کیژەکەی بنێت بیر دەکاتەوە و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: (من ماوەی چەند ساڵێکە مێشکم زۆر جەنجاڵە و ئێستا پاش کردنەوەی دەرگای خەونەکانم مێشك و دڵم هێدی و ئارام بۆتەوە و هەست دەکەم خەونەکەم دێتە دی. دڵم خەبەری داوە کەواتە ئێستا دڵم ئارامە و وا باشە ناوی کچەکەم بنێم (دڵارام). ئەوەش پاش ئەوە دێت کە ماوەیەکی زۆر لە بیرکردنەوەدا دەبێت دواتر هەر لەسەر زمانی ساکاری دەکات و دەیکات بە (دڵارام).

مامۆستا بانگ دەدات بە گوێ کیژەکەیداو ناوی دەنێت، (دڵارام) و (میهرداد) دەبێتە خاوەنی کیژێکی جوانی سەرنجڕاکێشی چاو ئاسکی وەك (دڵارام).

ژیان لەگەڵ هاتنە دنیای کچەکەیاندا قەشەنگ و ئاڵتر و نازك تر دەبێت و لەناو باخەکاندا هەمیشە ئاوێزانی یەك دەبن و ژیانێکی زێڕین دەژین لەناو میوەکاندا هاوینان تریێ دەڕنن و لە شیرین ترین شەربەتی دنیا دەخۆنەوە، بەهاران جوانترین گەڵاو گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەکەنە دۆست و یاوەری خۆیان. زستان لە ڕەنگی دڵۆپەکانی باراندا دەتوێنەوە و لەگەڵ بەفردا سەمای شێتانە دەکەن پایزان گەڵاکان کۆ دەکەنەوە و دەیکەنە ملوانکەی ئاڵتوونی و سەرزەمینێکی ئاڵتوونی و سووڕ دروست دەکەن، لەگەڵ پاساری و کۆترەکانی ئاسمان سەردەمێکی نەمر دەخولقێنن. وردە وردە (میهرداد کاکەوەیس) لە ژیانی سەرکێشی و کۆبوونەوەی ئاغا و بەگزادەکان دوور دەکەوێتەوە و مرۆڤێکی تری لێ دروست دەبێت، کە خۆی بۆ (مەستی سوارۆ ئاغا) و (دڵارام) تەرخان دەکات. هەوڵ دەدات ژیانی کچەکەی خۆش بکات و جیاواز لەو ژیانەی ئەوان بژی بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ سروشت و لە کانیاوەکانەوە فێری ئاواز و ڕیتمێکی تر بێت لە ژیان. دەگەڕێتەوە بۆ چیاو لە ئەشکەوتەکاندا گۆرانیی ژیانێکی نوێ دەچڕێت لە ڕیتمی ڕاکردنی کەرویشکەکان فێری ئەوە دەبێت کە مرۆڤ دەبێت لە ترس و هەرەسهێنانی بنیادی خۆی بە شوێن مرۆڤی دیکەدا ڕا بکات و لەناو خۆیدا بتوێنێتەوە لە فڕینی باڵندەکان رادەمێنێت، لە دیمەنی کانیاوەکان لە تارماییی شەو و لە خۆرئاوابوون لە دەم چیا هەڵەموت و ئەستەمەکانەوە لە دەنگی

کە لەشێر و زەڕەی کەر و بۆڕەی مانگـا و ژیـانێکی دێهـاتی رادەمێنێـت، بـە رۆژ بـە تـەنیا بـۆ راوشکار بە چیا ئاسیەکاندا سەر دەکەوێت و بەڵام هیچ راو ناکات و بە گریانەوە دەگەڕێتەوە.

لە دوای لەدایکبوونی (دڵارام)، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دەگەڕێتەوە بۆ ژیان و سروشـت و لە سۆز و عاتیفەدا خۆی غەرق و نوقم دەکـات و دەبێتـە خـاوەن دڵێکـی ناسـکی شووشەئاسـا و دەستبازی لەگەڵ پەپوولەکاندا دەکات و لە نـەخش و نیگاریـان رادەمێنێـت. رۆژ بـە رۆژ لەگـەڵ (مەستی سوارۆ)دا کچەکەیان بە جوانترین شێوە بەخێو دەکـەن و دایـەنێکی بـۆ دەگـرن و لەگـەڵ ئەوەشدا (مەستی) بەردەوام چاودێری دەکات و بە جوانترین شێوەی ژیانی دێهاتی بە خێوی دەکـەن رۆژێك دوای ئەوەی (میهرداد) لە چیا دەگەڕێتەوە بە سوار ئەسپییکی رەشـی ناوچـاوان سـپییەوە غار دەدات و سمکۆڵانی ئەسپەکەی لە دوای خۆیەوە تەپوو تۆز بەجێ دەهێڵێت لە بناری چیاوە بـە ئاڕاستەی باخەکەی کە بە گردێکی بەرزەوە دروست کـراوە، بـەرەو خانووەکـەی غـار دەدات لـەو کاتەی کە لە ئەسپەکەی دادەبـەزێت و رەشـووەکەی بـە دارێکـەوە دەپێچـێت گـوێی لـە گریـانی (مەستی) دەبێت لەگەڵ دایەنەکەی (دڵارام)دا بە کوڵ دەگرین و، دەپاڕێنەوە لە حەیبەتا بـە پرتـاو خۆی دەکات بە ژووردا و تەماشا دەکات، دایەنەکەی (دڵارام) و (مەستی سوارۆ) پێکـەوە بەسـەر (دڵارام)دا دەگرین (دڵارام) رەنگی زەرد بـووە و هەناسـە نـادات و بـە وێنـەی مـردوو دەبینرێـت ئەوانیش بێ دەسەڵاتانە بەسەریدا دەگرین و شین و رۆ رۆیانە و فرمێسك لـە چـاوەکانیان بـە خـوڕ دێتە خوار (میهرداد کاکەوەیس) بە جۆکدا دەکەوێت و (دڵارام) دەکاتە باوەشی و ئـەویش دەسـت بە گریان دەکات و هاواری دەگاتە عەرشی عەزیم و سەری بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و بە دڵتـەنگی و فرمێسکەوە لە ماڵ دێتە دەر و بە کوێرە رێگایەکدا خۆی و (مەستی)ـی خێزانی و دایەنەکـەیان بەسەر دەکەون بەرەو چـیایەك، کـە لـەو نـاو بـەرد و بێشـەڵانەدا لـەنێوان دارسـتانێکی چـیایدا خانوویەکی دارین دروست کرابوو. لەو خانووەدا (حەکیم)ـێك دەژیا. پیاوێکی نـوورانی سـەروڕیش سپییی چاوگەش برۆکانی لەگەڵ ریش و سمێڵی و پرچیدا وەك بەفری سپی وەهابوون. حـەکیم نـاوی (زەردەشتی رووناکی) بوو. لەو ناو چیا و بێشەڵانەدا دەژیا. سەروکاری لەگەڵ هـەموو جـۆرە گـوڵ وگیا و گەڵایەکدا هەبوو. قوتوە شووشەی پڕ لە گەڵا و گوڵ و دەرمانی گیایی وشك کـراوی هـەبوو کە لەسەر رەفەکان هەڵی چنیبوون مێز و کورسـییەکی داریـنی هـەبوو. ئـەو تەمـەنی وەك سـەد ساڵەیەك دەبوو تا هەنووکە پیاوێکی بە گـوڕ بـوو. دار عاسـایەکی هـەبوو لـە مادەیـەکی سـپی بلوورین دروست کرابوو. پیاوێکی رەبەن بوو هەردەمێك دەچوویتە لای سەبیلێکی گـڕ دەداو لـەناو دووکەڵی تووتندا خـۆی غـەرق دەکـرد، لەبـەری هەڵدەسـا و چـەند هـەنگاوێك دەهاتـە پـێش و

گۆچانەکەی دەگرت بە دەستی چەپییەوە و، دەیگوت: (فەرمووو فەرمووو (میهرداد) بەخێر هاتی). ئەو حەزی لەو ژیانە بوو لە منداڵییەوە لە چیاکاندا گەورە ببوو. حەزی لە بەفری سپی دەکرد و پێش ئەوەی دنیا خۆری ئاوا بێت، ئەو بە چیاکاندا دەچووە سەر لووتکەی چیاکەو لە رووناکیی دەڕوانی و ئاوێزانی رووناکی دەبوو. (میهرداد کاکەوەیس) بەردەوام سەردانی (زەردەشتی رووناکیی) کردبوو ئەوان لە مێژبوو ئاشنای یەك بوون و سەدان جار یەکتریان بینیبوو ماوەی چەندین ساڵ بوو هاوڕێ بوون لە مەڕ ژیانی ئەو سەردەمەو دەردوو نەخۆشی و پەتا کوشندەکان راوێژی زۆریان کردبوو ئەو دەرمانی زۆر لە نەخۆشەکانی ئەو ناوچەیەی کردبوو دەرمانەکانی ئەو کاریگەری زۆر باشیان هەبوو نەخۆشی زۆری لە مردن رزگار کردبوو، لەو دەمەوەی توانای راوشکار لە مێشکیدا گەورە ببوو لەو دەمەوەی توانیبووی تفەنگی بڕنەو بتەقێنێت و روو بکاتە چیا عاسیە سەختەکان ژووره دارینەکەی (زەردەشتی حەکیمی) دۆزیبوویەوە کە دووکەڵی زۆپا دارەکەی لە دوورەوە بینیبوو چوو بووە ژوورەکەی کاتێکیش تەمەنی نزیکەی بیست ساڵ ببوو پاش ئەوەی کەڵەکێویەکی بریندار کردبوو چوو بووە سەری و قۆچی لێ دابوو زامداری کردبوو لە چیاوە خستبوویە خوارەوە بە برینداری خۆی گەیاندبوو ماڵی حەکیم و کەڵە کیویەکەش بە برینداری هەڵاتبوو لە دەست (میهرداد)، حەکیم بە دەرمانە ئەفسووناوییەکانی تیماری برینەکەی کردبوو ئیدی لەو دەمەوە (میهرداد) باوەڕ بە حەکیمایەتی (زەردەشت) دەهێنێت و بۆ هەموو دەردێك پشت بە دەواکانی ئەو دەبەستێت، (حەکیم) نهێنی ژیانی خۆی بۆ (میهرداد) بەیان کردبوو، ئەوان (٢) هاوڕێ بوون لە دوو تەمەنی جیاوازدا هەموو کات (زەردەشتی رووناکی) بە (میهردادی) وتبوو (میهرداد من ژیانم یەك پارچە رووناکییە، من حەز بە رووناکی دەکەم و رەنگی سپی لە چاوەکانم دێتە دەر لەم چیایانەوە بە هەموو دنیا رادەگەیەنم کە بەفرو رووناکی لە منەوە سەرچاوەی گرتووە و من حەکیمم لەوێنەم نییە لە هەموو دنیادا) (میهرداد کاکەوەیس) خەمی بۆ (حەکیم) خوارد بوو خواردنی بۆ بردبوو بەردەوام بەوی گوتبوو وەرە بۆ گوندەکەمان من خۆشترین خانووت دەدەمێ و لەوێ بژی و خانەیەکیشت بۆ دەکەمەوە بە ناوی (خانەی حەکیم بۆ چارەسەری دەردە بێ دەرمانەکان)، بەڵام ئەو داوەکەی (میهرداد)ی رەت کردبۆیەوە و بەو شێوە ژیانەی خۆی رازی ببوو لەناو چیا و سروشت و دەست کردنی خوداوەندا و حەزی لە ئەندازەی دەستی مرۆڤەکان نەبوو ئەو بە ژیانی خۆی زۆر رازی ببوو حەزی بەوە نەدەکرد کەس ژیانی لێ تێك بدات.

بەردەوام بە دوای ژیاندا گەڕابوو رووەکێك کە مرۆڤ لە مردن رزگار بکات (رووەکی نەمری) وەك چۆن لە ئەفسانە کۆنەکانی سۆمەرییەکاندا هاتووە کە پادشایەك بە

دوای رووەکی نەمری دا گەڕاوە و بەڵام بە دەستی نەهێناوە ئەویش هەموو بەیانییەك تاریکی و روونی لەو کاتەدا کە تاریکیماڵئاوایی لە رووناکی دەکات یان بڵێین رووناکی زاڵ دەبێت بەسەر تاریکی داو چۆکی پێ دادەدات لەو کاتەدا کە ئەو بە پیرۆزی زانیبوو بە دوای رووەکەکەدا گەڕابوو ژیانێکی زۆر ناوازە ژیا بوو خۆی ئەم ژیانەی خۆی بۆ (میهرداد) باس کردبوو بە پیاوێکی مەزن خۆی شوبهاند بوو لە سەرۆکەکانی دنیا توورە بوو زۆر لێیان توورەبوو لە دیدی ئەودا ژیانی مرۆڤەکان لەسەر زەوی شتێکی بێ مانا بوو، ئەو بیرکردنەوەیەکی تری هەبوو بۆ ژیان دواتر بە تێر و تەسەلی باسی حیکمەتەکانی حەکیم دەکەم کە چۆن مرۆڤەکانی لەناو چاڵەکانی مەرگ دەرهێناو رێنمایی کردن بەرەو ژیانەوە.

لێرەوە با بگەڕێمەوە بۆ ئەو جێگایەی کە (میهرداد) و (مەستی) و دایەنەکەی (دلآرام) بە چیاکەدا سەرکەوتن (میهرداد) بە گریانەوە بە چیاکەدا سەردەکەوت ئەو دەگریان لەبەر ئەوەی نەوەیەکی لەدەست دەچێت و خەونێکی دێرینی دەچێتە چاڵەوە خەونێك سەردەمێکە بۆی دەژی (مەستی) و دایەنەکە هەر دەگریان لە خۆیان دەدا نزیکەی سەعاتێك بە چیادا سەرکەوتن و چەندین هەورازیان بڕی بە چەندین رێگای نائاسایی و سەختدا سەرکەوتن و لە رۆیشتنندا دارو درەختەکان و گیاندارانی دارستان لەگەڵیان دەگریان، پێکڕا هەموو سروشت دەگریا و لە دووررا چاویان بە خانووەکە کەوت هەتا ئەو دەمە نە (مەستی) و (دایەنەکە) نەیانزانی بوو خانوویەك لەم چیایەدا دروست کراوە بە درێژایی رێگاش لە (میهرداد) یان نەپرسی بوو کە بەرەو کوێ مل دەنێن؟ نەیان پرسی بوو بۆ بەم چیایەدا سەردەکەون؟ خۆیان دابووە دەست قەدەر و بەدوای فریادڕەسێکدا گەڕابوون، هەر کە نزیك بوونەوە لە خانووەکە حەکیم بە خۆی و گۆچانەکەوە هێدی هێدی هاتەدەر لە دەنگی گریانی ئەوان راپەڕی بوو زانیبووی کەسێك بەرەو لای ئەو دێت هەرکە حەکیمیان بینی (مەستی) و (دایەنەکە) بە لایانەوە سەیر بوو مرۆڤێك هەیە لەم گەردوونەدا بەم شێوەیە و بەم جلە سپی و ریش و پرچە درێژە سپییەوە بەم شێوەیە دەژی، بەڵام (میهرداد) ئەم دیمەنەی بەلاوە سەیر نەبوو، چونکە ئەوان دوو هاوڕێی دێرین بوون، میهرداد بە گریانەوە وتی (ئەی حەکیمی کەون ئەی ئەوەی لە شووشە دەرمانەکانتدا ژیان هەیە... کچەکەم ئەو کچەی تەنیا لەم دنیایەدا بۆ ئەو دەژیم... هەناسەی نەماوە و مردووە، نازانم وا هەست دەکەم مردبێت، دەبێت زیندوو بێتەوە ئەو تەنیا خەونی منە هەموو ژیانم لەگەڵ ئەو دەمرێت ئەگەر ئەو بمرێت کۆتایی

من و خەونەکانمە من هیوای زۆرم هەیە کە لە چاوی (دلارام)دا دەیبینم زەمین و ئاسمان خودای کەون من چی بکەم تکایە حەکیم... حەکیمی رووناکی ئەی ئەوەی لە رووناکییدا دەتوێتەوە... تاکە رووناکییەك لە دلمدا چرایەك لە روحی خۆت لە دلمدا دابگیرسێنە، تکایە حەکیم... تکایە) (حەکیم)دەلێت (ئارام بن... بە هەولو قوەتی رووناکی... من فو بە دەمی کیژەکەدا دەکەم دەرمانێکی ژیانی بۆ دروست دەکەم رووەکی نەمری بێت و رووناکی لە چاوەکانیدا دروست دەکەمەوە... ئەوەی من دەیکەم ئەگەرچی سیحر نییە، بەلام لە تەمەنی خۆم کەم دەکاتەوە... تواناکانم لاواز دەکات... بەلێ کەمێك لاوازم دەکات، بەلام لەبەر تۆ ئاغای (میهرداد) ئەم کارە دەکەم)

(مەستی) بەدەم هەنسکەوە (دەلێت تکایە زوو کارەکەم بۆ بە ئەنجام بگەیەنە دەرمانەکەت دروست بکە... هەناسەم سوار بووە و خەریکم دەمرم) (حەکیم) منداڵەکە لە (میهرداد) وەردەگرێت و لەسەر مێزێکی دار پاڵی دەخات و لەناو کاسەیەکی داردا چەند جۆرێك لە گیا تێکەڵ دەکات هەریەکەیان لە شووشەیەك دەردەهێنن نزیکەی حەوت جۆر گیا تێکەڵ دەکات و بە چەکوشێکی دار ورد ورد دەیان کوتێت تا دەیان کات بە تۆز پاشان لەناو شووشەیەك جۆرێك لە ئاوی زەرد دەکاتە جامێك و گیا کوتراوەکەی تێکەڵ دەکات و جوان جوان بە کەوچکێك تێکی دەدات دوو کەوچك دەکاتە ناو دەمی (دلارام) و دەست دەهێنێت بە سنگی (دلارام) داو چەند وشەیەکی سەیر لە لێوەکانییەوە دەلێتەوە و هیچ کام لەوان لێی حاڵی نابن و نازانن ئەم تەلیسمانە چین ئەو دەیان خوێنێت پاشان مووروویەکی رەش لەناو ئاگردانەکە دادەنێت و چاوەڕێ دەکات تا سوورِ سوورِ دەبێتەوە مووروویەکی شووشەی رەش کە بە تەواوی گەرم دەبێت بە میقاشێکی بچکۆلە هەڵی دەگرێت و بە ئەسپایی دەیچسکێنێت بە ناوچەوانی (دلارام)دا لە جێگایەك کە دەکەوێتە سەروو هەردوو بۆریەکانی نزیك لە سەرەتای پرچی، منداڵ دەمودەست دەکۆکێت و دەداتە پرمەی گریان و چاو دەکاتەوە، بەلام ئاسەوارێکی رەش بە نێوچەوانییەوە لە شێوەی نیشانەدا بەدەر دەکەوێت، (دلارام) دەگەڕێتەوە بۆ ژیان دوای مردن دەگەڕێتەوە، دروست نازانم کە ئەو مردبوو، یاخود بووراوە بووە بەهەرهۆیەك بێت شیفای دێت لەو کاتەدا (میهرداد) شاگەشکە دەبێت و لە خۆشییدا بە کوڵ دەداتە پرمەی گریان و باوەش بە کچەکەیدا دەکات و تێر تێر لە ئامێزی دەگرێت و ماچی دەکات (مەستی سوارۆ) لە خۆشییدا لە هۆش خۆی دەچێت و پاش پرژاندنی ئاو بە دەموچاویدا دێتەوە هۆش خۆی ئنجا دەداتەوە گریان و منداڵەکەی دەکاتە باوەش میهرداد نازانێت چۆن سپاسی (حەکیم) بکات و بێ دەنگ لە ماڵەکەی (حەکیم) دێنە دەر زۆر

جار مرۆڤ کە چاکە لەگەڵ مرۆڤ دەکات چاکە خواز و ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ کراوە هەردووکیان بێدەنگ دەبن ئەو بێدەنگییە مانای ئەوەیە کە دێڕێـك، کتێبێـك، هـیچ نووسـراو، وتەیـەك نییـە دەلالەتی لێ بکات، ئەوە بۆ خۆی زمانێکی سەیری دەوێت کە لەسـەر زەوی وجـوودی نییـە ئـەو بێدەنگییە ژیان بە شێوەیەکی تر دەردەخات، وادەکات کە ژیان لەم شێوەیەی ئێسـتای پـەنهان تـر بێت.

هەتا دوور دەکەونەوە بـەردەوام (دلارام) دەگـری دیـارە ئـەو ئـازارەی وای لێـدەکات بگـری و بقیژێنێت ئازاری شوێنی سووتاوییەکەی نێوچەوانێتی کە هێندەی دەنکە مێوژێکی بچـووك دیـارە بە ناوچەوانییەوە.

بەو دۆڵ و بێشەڵان و دار و دەوەنەدا بە تولـە رێیـەکی بچـووك کـە تـەنیا جێگـای مرۆڤێـك دەبێتەوە پێیدا بڕوات یەك لە دوای یەك دێنـە خـوارەوە خۆشـییەکی زۆر سـەیر باڵیـان بەسـەردا دەکێشێت. هەر دوای ئەوەی (میهرداد) و (مەستی) و دایەنەکـە کـە نـاوی نادیـارە بـەرەو چـیا سەرکەوتبوون یەکێك لە پاسەوانەکانی (میهرداد) یەکێك لە چەك بەدەستەکانی دەمودەست قـاوی ئەوەی دابوو کەوا (میهردا کاکەوەیس) بـەرەو چـیا رۆیشـتووە، ئـەو لای وا ببـوو کـەوا (دلارام) مردووە و ئەوان بەرەو شار دەڕۆن بۆ چارەسەر، بەڵام لە راستییدا (میهرداد) ئەوەندە پەشۆکابوو لە یادی چوو بوو کە بەسواری ئەسپ بڕوات، دواتر بیری کردبۆوە کەوا رێگاکە سەختەو رەنگە ئەسـپ بە باشی نەتوانی بەو چیایەدا سەر بکەوێت وەك وتم چەك بەدەستەکەی (میهرداد) خەڵکی ئـاوایی ئاگادار کردبۆوە و هەموویان هاتبوونە بـەردەم مـاڵی (میهـرداد) و پـەنگیان خواردبـۆوە، مـاڵی (میهرداد) لەناوەڕاستی ئاواییەکەدا نەببوو بڕێك لە دووری ئاوایی لەسەر گردێـك لـەناو باخێکـدا دروست کرابوو کاتی خۆی بە گەلە کۆمەکی خانووەکە لە لایەن وەستایەکەوە دروست کرابوو، بەڵام خۆشترین خانووی گوندەکە ببوو، هەر ئـەوەش وای کردبـوو لـە خـەیاڵی خۆیـدا لـەناو باخەکـەدا زەوییەك بۆ (کۆشکە خەیاڵییەکەی) دیاری بکات کاتێك (میهـرداد) و ئـەوان نزیـك دەبنـەوە لـە خەڵکی ئاوایی هەموو بەرەو پـیری دەڕۆن و کاتێـك دەبیـنن کـە (دلارام) تاقانەکـەی (میهـرداد) دەگری لە خۆشییا هەموو تێکڕا گۆرانی و هەلهەلە دەچڕن و بە چەپڵە رێزان سەما دەکەن هەنـدێك لە ریش سپییەکان کڕنووش شکور بۆ خودا دەبەن و دوعا دەکـەن ئـاخر گرانـە، کچـێك بـە هـۆی دەردێکەوە بمرێت و بە دەرمان و تەلیسمەکانی (حەکیمێك) ژیان بڕاوەتەوە ناو گیـانی ئـەوە تـەنیا حەزرەتی (مەسیح) توانیویەتی بیکات، خۆشییەکی گەلێك سەیر رووەدەکاتـە گونـد و بڕیـار دەدەن حەوت شەو و حەوت رۆژ شایی بکەن و ئاهەنگ بگێڕن دەهـۆڵ چـی و زوڕنـا ژەنـی ئێجگـار زۆر

لەناوچەکەدا کۆدەکاتەوە و شەو و ڕۆژ ئاهەنگ گێـڕان بـەردەوام دەبێـت ئـاژەڵی زۆر دەکـرێن بـە قوربانی و مێوژوو هەنگوین و شیرینی و گۆشت بە ناوچەکەدا دەبەشرێتەوە و لە هەموو لایەکـەوە ئاغاکان سەردانی (میهرداد کاکەوەیس) دەکەن و پیرۆزبایی لێدەکەن بەوەی ژیـان گەڕاوەتـەوە بـۆ کیژەکەی لەوانەیە (دڵارام) مردوو بـووە، بـەڵام دوای ئـەوەی (حـەکیم) ئەفسـوونەکانی بەسـەردا دەخوێنێت و دەرمانی دەداتێ و مووروویـەك بـە ناوچـەوانی دادەنـێ ژیـانی بـۆ دەگەڕێتـەوە بـە حەولوقوەتی خودا، دیارە لە ژانێکـی قووڵـدا ژیـان هەیـە، دەبێـت هـەمووومان ئـەوە بـزانین کـە (میهرداد کاکەوەیس) لە ئاهەنگەکەدا لەسەر بەرزایی حەسارەکەوە هاواری کردووە و بـە خـەڵکی گوتووە (خەڵکینە ئەوە بزانن کە لـە ژانێکـی قووڵـەوە ژیـان هەیـە، ژیـان لـە ژانێکـی قووڵـەوە دەگەڕێتەوە ئەوەی ژان دروستی دەکات هیچ موعجیزەیەك ناتوانێت بیکات).

ئەوەی من لە قسەکانی ئەو دەگەم ئەوەیـە، کـە مـرۆڤ دەبێـت هەمیشـە ڕەنـج بـدات و لـە ڕەنجدانیدا خوێناو بتکێت و ئازاری هەبێت. پاشان ژیان هەیە ژیان دەبێت، ژنێکی دووگیان بەر لـە منداڵبوونی ژانی هەیە، بەرهـەمی ژانـی ئـەو منداڵییکـە زۆر جـاران منداڵەکـە دەژی و ژنەکـە دەمرێت. ئەوە ژانی گەیشتۆتە لووتکە و ژیانیش دەگاتە لووتکە زۆر جاران منداڵەکـە دەمرێـت و ژنەکە دەژی. ئەو کاتە ژان نەگەیشتۆتە لووتکە بۆیـە ژیـان نییـە، بـەڵام مـردن بـۆ خـۆی ژیانـە ژیانێکی جیاواز تر ژیانێك لەسەرزەمینێکی دیکە سەرزەمینێك کە شتەکان مانای دیکەیان هەیـە ئاوازی دەنگی گریانی گیانەوەرێك دەبێتە نۆتەی مۆسیقا و خۆرسك لەسەر پەڕەکان دەنووسرێتەوە.

بەو شێوەیە ژیان بەردەوام دەبێـت و (دڵارام) وردە وردە گـەورە دەبێـت.، بـەڵام ئاسـەوارێکی شێوە خاڵێکی وەك مووروو لەسەر ناوچـەوانی دەمێنێتـەوە. ڕەشـێکی کـاڵ دەنوێنێـت و لەگـەڵ گەورەبوونیدا دەمێنێتەوە و هەرگیز نابڕێتەوە. جارێك (میهرداد) سەردانی (زەردەشـتی ڕوونـاکی) دەکات و پێی دەڵێت: (حەکیم ئەی فـوژەنی ڕوونـاکی و ژیـان ئێسـتاش تێناگـەم ئـەو خاڵـە بـۆ ناسڕێتەوە وا چەند ساڵێك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپـەڕیوە، مەبەسـت لـەو مـوورووە چـی بـوو؟ ) (حەکیم) زەردەخەنەیەك لەسەر ڕووی دەردەکەوێت و دەڵێت: (میهرداد) کوڕی خۆم ئـەو مـوورووە ڕوحی بووغز و کینەی لە دڵی کچەکەتدا کوشتووە و ڕوحێکی وای لە ناخیدا دروست کـردووە کـە بەرگەی کارەساتەکانی دنیـا دەگرێـت و وای لێـدەکات کـە زاڵ و بلیمـەت بێـت و مێشـکی بـە شێوەیەکی ئازاد بەکار بهێنێت ئەگەر تۆ ئەو ئازادییەی لێ بسێنیتەوە ئەوا ئەو خاڵەی ناوچـەوانی تۆخ ترو تۆخ تر دەبێتەوە و ئەگەر دەروونی ئـازار بچـێژێت بـە هـەمان شـێوە ئـەو خاڵـە ڕەشـتر دەبینرێت، تازە ئەو خاڵە بە ڕوحیەوە بەستراوە. لەگەڵ گۆڕانی هەستەکانیدا ڕەنگی خاڵەکـەش بـە

شێوەی ڕەنگی هەستەکانی لێدێت، ئەو خاڵە روحی ئەوی بەهێز کردووە و گەیاندوویەتیە لووتکەی زیرەکی. ئەو ڕەنگە ئاواتەکانت بێنێتە دیّ، دەستی بگرە و مەهێڵە کەس ئازاری بدات ئێستا ئەو لە جنسی پەریەکانە روحی ئەو روحێکی دیکەیە روحێکە لە بەهەشتەوە هاتووە و لە وێنەی (دلآرام)دا کار دەکات. ئاگاداری بکە، ئەو فریشتەیە، فریشتەیەکی خودا.) قسەکانی (حەکیم)، میهرداد رادەچڵەکێنن و وەك نەعرەتەی هەور هاوار دەکات و دەڵێت: (ئەی هاوار من لەم شتە تێناگەم، فریشتەیەك کچی منە، ئەوە جێگای باوەڕ نییە من بڕوا ناکەم، چۆن دەکرێت فریشتەیەکی بەهەشت، حوکم بکات بەسەر خەونەکانمدا ئایا ئەو کچی منە؟ دەتوانێت ئەو کارەم بۆ بکات؟ )، حەکیم قاقایەك لیّ دەدات و دەڵێت (دەبوو شانازی بکەی بەڵیّ ئەو کیژی تۆیە و لە نوتفەی تۆیە، بەڵام روحی ئەو رووناکییە و لە سنوورەکانی گەردوونەوە هاتووە، ئەو نوێنەرێکی دیکەی فیردەوسە و رۆژێك بۆ هاوشێوەی خۆی دەگەڕێت لەسەر زەوی تەنیا یەك نەوەی دیکە هەیە، لە نەوەی بەهەشت بێت، ئەویش کورێکە خەڵکی سەرزەمینێکی دیکەیە، بەڵام، هاو زمانی خۆیەتی، ئەمەش معجیزەیە لەسەر یەك سەرزەمین دوو دیاردەی ناوازە روو دەدەن ئەویش ئێستا هەیەو نەوەی بەهەشتە و بەشێك لە روحی ئەو لە بەهەشتەوە هاتووە جەستەی سەرزەمینە و روحی بەهەشتییە روحی رووناکییە، هەردووکیان هاوبیری یەکن رۆژێك دادێت یەك دەبینن و بە تێپەڕبوونی زەمەن دەبنە ئاشقی یەکدی). (میهرداد) دەڵێت: (چۆن حەکیم چۆن؟ تۆ چۆن ئەم نهێنییانە دەزانیت؟ تۆ عیلمی غەیب دەزانیت ئەمە چۆن روو دەدات؟ ) حەکیم دەڵێت: (من هەندێك نووسراوی سەر شوێنە تابۆکانی گەردوونم خوێندۆتەوە، ئەی نابینیت منم سوڵتانی رووناکی لەگەڵ بارینی تیشکەکانی سپییدە زانیارییەکان بەسەرما دەبارێن و هەموو شتێك دەزانم، لەوە زیاتر ناتوانم هیچت پیّ بڵێم، ناتوانم ئەم چیرۆکەی کیژەکەت بۆ تەواو بکەم، ئیتر ناتوانم ناتوانم (میهرداد) ئیدی بەسە ناتوانم، ناتوانم) بە پرتاو، (میهرداد) لە کوخەکەی (زەردەشت) دێتە دەریّ و بەناو دۆڵەکەدا دێتە خوار و بەردوو زیخ و دڕك و داڵ لەژێر پێیەکانیدا نقوم دەبن، دێتەوە و بەشێوەیەکی ناسروشتی جیاواز لە جاران کیژەی بەخێو دەکات و لەگەڵ خۆی بەناو باخەکان و بەناو گوڵەکاندا دەیگێڕێت و ئەو لە تەمەنی سیّ ساڵیدا دەبێت کە دەست بۆ گوڵەکان رادەکێشێت و لەناو هەموو ڕەنگەکاندا لەناو سەدان ڕەنگی گوڵ و گیا و خەرتەلە و شەقایق و یاسەمین و گوڵەباخ و لاولاو و شێخ عەباسدا دەست بۆ ڕەنگی گوڵە وەنەوشەییەکان دەبات و دەیان پسێنێت و چەپکیان دەکات و لەناو پەنجەکانیدا هەڵیان دەگرێت. بەردەوام (میهرداد) گوڵی ڕەنگاوڕەنگی دەداتە دەست فڕێیان دەدات و خو بەڕەنگی مۆر و وەنەوشەییەوە دەگرێت، هەمیشە حەز بەو

گوڵانە دەکات و بە دەستە بچکۆلەکانی دەیان گرێت و زۆر جار دەیان ژاکێنێت، بـەڵام حـەزیان لێ دەکات و لەگەڵ لێکردنەوەیاندا دەتریقێتەوە و قاقا دەکێشێت و دەسـتی بـاوکی دەگرێـت و یـاری لەگەڵ دەکات و بەناو گوڵەکاندا رادەکات و خۆی لە باوکی دەشـارێتەوە حـەزی ئـەو لـەگوڵ و لـە رەنگی وەنەوشەیی دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی ٣ ساڵی. ئەو کاتـەی بـە رەنگـی وەنەوشـەیی مەسـت دەبێت و گوڵی وەنەوشەیی کۆمەڵ دەکات خاڵەکەی سەر ناوچەوانی رەنگـی وەنەوشـەیی دەگرێـت بەئاسانی دەتوانرێت هەستی پێبکرێت.

لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧ـدا ئەو کاتەی بـە هـۆی تانـك و شـۆفڵ و زرێپۆشـەکانی رژێمـەوە تێکڕای گوندەکانی کوردستان کاول و وێران کران و هەمووی لەگەڵ زەوی تەخت کران و خەڵکەکەی هەمووی راگوێزرانە ئۆردوگا زۆرە ملێکان، (دلارام میهرداد) چوار ساڵان بوو. رۆژێکی گـەرم بـوو بەیانی زوو بـوو، بـەڵام گـەردوون گـەرم دەینوانـد شـۆفڵ و بلـدۆزەر و ژمارەیـەکی زۆر جـاش و مستەشار و سەربازی رژێم گوندەکەی (میهرداد)و تێکڕای خانووەکانیان خاپوور کـرد و هـەموویان لەگەڵ زەوی تەخت کرد. (دلارام) و (مەستی) دەگریان، هیچ کەس دەسـەڵاتی نـەبوو. دێهاتـەکان مۆڵگەی پێشمەرگە بوون نانخواردن و پشوودانیان هەر لەوێندەر بوو، بۆ تێکدانی ئـەو مۆڵگانـە و سڕینەوەی ئاسەواری کوردایەتی بە بڕیاری سەرۆك، تاکە گوندێك لە کوردسـتان نەمایـە و هـەموو وێران کران بە تایبەت ئەو گوندانەی کە دەکەوتنە ناوچەکانی باکوور و ناوچە شاخاوی و ئاسیەکان. ئەوە بڕیاری سەرۆك بوو. زوو جێبەجێ کراو بێ رەحمانە خانووەکان، هێلانەی مریشك و عەلەشیش و گەوڕی ئاژەڵان و لانەی سەگ و مزگەوتی ئیسلام و قوتابخانە و دیوەخان و باخ و باخات هـەموو رووخێنران زۆر خەڵك هەر فریای ئەوە نەکەوتن کەلوپەل و کالاکانیان رزگار بکەن و بـوون بـە ژێـر دار و بەرد و بلۆك و خشتەوە ئاژەڵ و کۆتر و مریشـك و شـانەی هەنگـەکان لەلایـەن جاشـە خـۆ فرۆشەکانەوە بە تالان بران و خەڵکەکەش راگوێزرانـە ئۆردوگـا زۆرە ملێکـان (میهـرداد) (دلارام) دەکاتە باوەش و دەستی (مەستی) دەگرێت. ئەوەندەی پارەی هەیە لە گیرفانیـدا قـایمی دەکـات و لەگەڵ خەڵك دەنێردرێنە ئۆردوگا. لە دوورەوە (میهرداد کاکەوەیس) ئاوڕێك بۆ سووتانی گوندەکـە دەداتەوە و چەند فرمێسکێك لە چاوەکانی دێتە خوار و سەرنجی دیمـەنی دووکـەڵی خـانوو مـاڵ و مزگەوتە سووتاوەکە دەدات و بیری ئەو کاتەی دەکەوێتەوە کە سەردەمانێك خۆی موختار و ئاغای ئەو ناوچەیە بوو، دواتر تەماشایەکی قووڵ بۆ چیا دەکات و بیر لەوە دەکاتەوە کە داخـۆ (حـەکیمی رووناکی) دەبێت لە کوێ بێت؟ ئایا ئیتر گفتوگـۆ لەگـەڵ کـێ بکـات؟ ئایـا بـەرەو کـوێ سـەفەر دەکات؟ لەگەڵ ئاوابوونی رووناکییدا ئەویش ئاوا دەبێت و سەفەر دەکات بۆ سەرزەمینی روونـاکی؟

یان لەو چیایە بە تەنیا ئاسەواری دەمێنێتەوە و درندەکان دەیخۆن؟ یاخود دەبێتە رابەری پێشمەرگەکان و فێری وانەکانی رووناکییان دەکات؟ ... ئەمانە و چەندین گومان و گریمانەی زۆری لا گەڵاڵە دەبێت و لە مێشکیدا تاوتویان دەکات و بە زیلە عەسکەریەکان دەگوێزرێنەوە و لە رۆشتنیاندا سەیری پێدەشت و قەد پاڵە پیرۆزەکان دەکات و بەردەوام دەگری. لەگەڵ گریانی ئەودا هەموو خەڵك دەگرین قروسکە قروسکی سەگە بێ لانەکان و رووخانی کۆڵانەکان بەسەر تولە سەگەکاندا عەرشی خودا دەهێنێتە لەرزە و هیچ دەروونێك تەحەمولی ئەو دیمەنە ناکات. ژنان شین دەگێرن و شەپۆڕ دەکەن و لە خودا دەپاڕێنەوە و دوعا دەکەن. دواتر هەموویان رەوانەی ئۆردوگایەك دەکرێن بەناوی (ئۆردوگای کونە پەپووەکان)، بە زۆر دەبێت ئەو ناوە پەسەند بکەن و شورایەکیان بۆ دەکێشن و پێیان دەڵێن (دەبێت لێرە بژین، ئێرە نزیکە لە خۆمان و دوورە لە تێکدەرەکانی بەناو پێشمەرگە، ئێوە نانی ئەوان دەدەن بە هۆی ئێوەوە نەبێت، ئەوانیش ناژین).

گوڵەکان و باخەکانی (دڵارام میهرداد) هەموو فەوتان، خەونەکەی (میهرداد کاکەوەیس)یش چووە گۆڕەوە و ناوچەکانی لێ قەدەغە و حەرام کرا.

هەرچۆنێك بێت بە هۆی خزمێکی خۆیەوە کە لەناو سوپادا دەستی دەڕۆیشت خۆی و خێزانەکەی لەو ئۆردوگایە قوتاریان دەبێت و روو دەکەنە شار ئەو شارەی کە پێیدەوترێت شاری مێژوو لەوێ لە یەکێك لە گەڕەکە کۆن و دێرینەکان خانوویەك دەکرێت و وردە وردە خۆی پێکەوە دەنێتەوە، ئەوە سەرەتای ئاشنابوونی (دڵارام میهرداد) و خانەوادەکەی دەبێت بە شار، وشە و تێکستی شار لێرەوە بە چیرۆکەکەمان ئاشنا دەبێت لێرەوە یەکێك لە پێکهێنەرەکانی چیرۆکەکەمان دەست پێ دەکات. شار ئاماژەیەکی نوێی رووداوەکان دەبێت هەر لەم شارەوە سەرەتای چیرۆکەکەمان دەستی پێ کرد و زۆرانبازییەکانی مرۆڤ و مێژوو، رووداو و خەیاڵ و عاتیفە و ئەشق هەر لێرەوە سەرچاوە دەگرن. گۆرانی و گوڵ و باران و عەتر و ماسی و ئاسمان و خودا لێرەوە دەست پێ دەکەن. ئێرە خاڵی سفری ئێمەیە (شار) کۆد و شیفرەیەکی دیکەی رووداوەکان و کلیلی زەمان و کلیلی ئاسمان و بە هەشت لەناو خشتە قوڕینەکانی ئێرەدا شاردراوەنەتەوە بۆی دەگەڕێن و لەناو هەر سەردەمێکی ئەم سەرابستانەدا بێت دەبێت بیدۆزینەوە... دەگەڕێین بە دوایدا دەگەڕێین.

# ٨

## (هەموو شتێك دروست دەكەم، جگە لە كورسی)

## سەرەتای ساڵی ١٩٥٦

كۆكردنەوەی ئەم زانیاری و چیرۆكانە شەكەت و ماندووی كـردم. ئەگەرچـی گـەلێك چـیرۆك و رووداوەكان لە دوو توێی (كتێبە وەنەوشەییەكە)دا بوون، زۆربەی رووداوەكان بەشـێوەی یادگـاری و لەبەرواری دیاری كراودا نووسرابوون لە شێوەدا زۆر لە دەفتەری یادەوەرییـەكان دەچـوو، بـەڵام بـە زمانێكی ئەدەبی نەنووسرابوون من توانیم دوای كـەمێك هەوڵـدان دیزاینـی رووداوەكـان بكـەم و رێكیان بخەم و هـەموویان كـۆ بكەمـەوە و بیـان خەمـە دوو تـوێی بەرگێكـەوە، تەنانـەت ئـەو رووداوانەش كە كەمێك سەروكاریان لەگەڵ رەوتی چیرۆكەكەماندا هەیە... (كامـەرانی وەنەوشـە) بە شێوەیەكی هێڵی راست هەموویانی یەك لە دوای یەك دانابوو، بەڵام من هاتم دەستكاریم كـردن و كۆمكردنەوە، لێرەوە دەگریم و دەڵێم (كامەران) گیـان ئـەی كـوڕە وەنەوشـەییەكەی ئـاگر ئـەی نەوەی نوور و روناكی لێم ببوورە من دەبوو زوو ئـەو بریسـكانەی نـاو چـاوەكانت و ئـەو گـوورزە تیشكانەی ناو گیرفانەكانت و جێ پێكانت بخوێنمەوە، بەڵام ئەو دەمە تێ نەدەگەیشتم، تكایە لـێم ببوورە كە دەستكاری رووداوەكانی نێو كتێبەكەتانم كرد، دەزانم ئەوە حەرامـە و ئامانەتـە لـەلام، بەڵام لام گرنگ بوو، كە كۆیان بكەمەوە و بە جیهـان بڵـێم كـە تـۆ كەسـێك بوویـت جیـاواز لـە مرۆڤەكانی دیكە، بە نیازم... پرۆژەیەك بكەم كە خزمەت بە روحت بكات) لـە كۆكردنـەوەی ئـەم كتێبەدا مەبەستم ئەوە بوو لەگەڵ دەرهێنەرێكی ئەوروپیـدا پـرۆژەی (فیلم)ـێك گەڵاڵـە بكـەم و ئەوەی لە دوو تـوێی ئـەو (كتێبـە وەنەوشـەیی)یە و هـەموو ئـەو چـیرۆكانەی بـە دەوری ئـەودا دەسووڕێنەوە بكەین بە فیلم. من ئەوەم دەویست، دەمویست بـە بـەژداری ئەكتـەری كـورد و بـە تەكنیكی ئەوروپایی (فیلم)ێك لەسەر ژیانی (كامەرانی وەنەوشە) چاك بكەم دیـار بـوو بیرۆكەكـە هی خۆم بوو ئەگەرچی من سینەما ساز نەبووم، بەڵام ئاشقی فیلم و هۆلیێود بووم ئەوە خەونم بوو، دەبوو ئەو كارە بكەم لە بەشەكانی ئاییندەدا باسی ئەوە دەكەم.

به هەرحاڵ با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٦ کە شوێنی سەرهەڵدانی ئەم بەشەی چیرۆکەکەمان شاری (سێوان)ی رۆژهەڵاتی مەمللەکەت بوو، شارێکی جوانی کوردستان، ئەو شارەی هەمیشە سەوز دەڕوانێت و کەوتووەتە یەکێك لە دەشتە بە پیت و گەورە ناودارەکانی کوردستان، شارێکی خنجیلانە و رەسەنی کوردان و لانکەی سەرهەڵدانی شاعیران و ناوداران و نووسەرانی کورد وەك (گۆران)و(ئەحمەد موختار بەگی جاف) و چەندانی دیکە ئەم شارە زۆرێك لە شاعیر و بلیمەتی پێگەیاندووە و پێشکەشی گەلی کوردی کردووە. باخەکانی چواردەوری شار جوانییەکی قەشەنگ و ناوازەیان بەخشیبوو، گمەی کۆترەکان و ورشەی باڵەکانیان و جریووەی پاسارییەکان و شەقایقی سەر چیا و قەت پاڵەکان وێنەیەکی سروشتی جوانیان لە دەفتەری خودادا کێشا بوو، بەو پێیەی زانیارییەکانم دەستکەوتووە ئا بەم شێوەیە بۆتان رێك دەخەم.

لە یەکێك لە بازاڕەکانی ناو شارەکەدا هاواری دەکرد و دەی وت (براینە من هەموو کەرەستەیەکتان لەدار بۆ دروست دەکەم... جگە لە کورسی، بڕواتان هەبێت بە حەیاتی لەسەر کورسی دانەنیشتووم و داشنانیشم و قەت نایەڵم کەس لە خێزانەکەم لەسەر کورسی دابنیشن تا من لە ژیانابم هەر لەسەر ئەرز دادەنیشین... تۆ پێم بڵێ چیت دەوێت تابووت یان کانتۆر؟ )دەمە قاڵەی بوو لەگەڵ یەکێك لە کڕیارەکانیدا، کابراش پێی وتبوو: وەستا (سەرحەد)، (باسی کورسی و شتی وامەکە... دار و دیوار گوێی هەیە) هەر لەو کاتەدا سیخوڕێك گوێی لەم قسەوباسەی کڕیارەکە و وەستا (سەرحەد) ببوو، دەمودەست هەواڵی گەیاند بوو بە دەزگاکانی حکومەت و لەسەر ئەو وتانەی راپێچی زیندان کرا بوو لێدانێکی باشی خواردبوو، بەڵام خەڵك و خوای ناسیاوی ناوبازاڕ و دووکاندارەکانی دراوسێی وەستا (سەرحەد) هەموویان چووبوون بۆ دەزگای پۆلیس و گەواهیی ناڕاستی ئەو کێشەیان دابوو. دواتر وەستا (سەرحەدی دارتاش) بەرەڵا کرابوو و لەو رۆژەوە بڕیاری دابوو زیاتر لە جاران رقی لە کورسی و قاچەکانی بێت. بڕیاری دابوو گەر بۆی بکرێت قاچی هەموو کورسییەکانی مەمللەکەت بشکێنێت. هیوایەتێکی سەیری هەبووە، وەستا (سەرحەد) لە تەمەنی (٣٥)ساڵیدا دەبێت کە ئەو رووداوەی بەسەر دێت پیاوێکی ئازاو نەتەوەپەرست و مەرد بووە و وەستایەکی زیرەك و هونەرمەند بووە توانیویەتی لەو سەردەمەی خۆیدا ناوبانگێکی باش پەیدا بکات و ئامێری زۆر سەیر و کەرەستەی ناوازە لە دار دروست بکات تەنانەت وەك پەیکەرتاش ئیشی لەسەر داریش کردووە. زۆر تابلۆ و پەیکەری دروست کردووە وەك لە بەڵگەکاندا دەستم کەوتووە. لە ماوەیەکی کەمدا ناوبانگی بە ناوچەکەدا بڵاو دەبێتەوە و لە زۆر جێگای وڵاتەوە سەردانی دەکەن و کارە هونەرییەکانی دەکڕن و پارەیەکی باش پاشەکەوت

دەکات و هەوڵ دەدات قەبارەی کارەکانی زیاتر فراوان بکات و دەزگا و ئـامێری زیـاتر دەکڕێـت و لەناو فرۆشگاکەیدا جێیان دەکاتەوە. ئەو باوکی دوو کیژۆڵەیە، کە لە تەمــەنی دە ســاڵان و دوازدە ساڵاندا دەبن و خاتوو (ڕیحانە بارام)ی خێزانی سکی پڕ دەبێت و لەناوەڕاستی سـاڵی ١٩٥٦ دا لــە شەوێکی گەرمی هاویندا خودا لە دوای دوو کچ کــوڕێکی جــوان و خوێنشــیرنیان پێدەبەخشــێت و خانەوادەکەیان دڵخۆش دەکات. (سەرحەدی دارتاش) زیاتر خۆی لــە کارەکانیــدا قــاڵ دەکاتــەوە و خــەیاڵی فــراوان دەکــات و کاردەکــات لەگــەڵ چــەند دانەیــەك لــە شــاگردەکانی تەختــە و داری ئامادەکراویان لە (ئێــران)ەوە بــۆ دێــت. زۆر جــاریش خــۆی لــە دارســتانەکانی دەوروبــەری شــار کەرەستەی ئیشەکانی پەیدا دەکات و دار چنارەکانی ئەو ناوچەیە دەبڕێت و دەیانکا بــە پەنجــەرە و دەرگا و مێزو تەپلەکی ماڵان و زەخرەفەی رەنگاوڕەنگ و چەندین شتی تــر دروســت دەکــات. لــە هەمان کاتدا زۆرجار کاری ورد دەکات ئەویش دروســتکردنی مــرۆڤ و ئــاژەڵی کێــوی و شــتی زۆر سەیر و سەمەرە لەخۆ دەگرێت بە بۆیەی جۆراو جۆر رەنگیان دەکات و لە پێشــانگای تایبــەت بــە دووکانەکەیدا ریزیان دەکات و کڕیاران سەردانی دەکــەن. کڕیارەکــان بــە نیگایــەکی ســیحراوییەوە سەیری کەرەستە و شتە سەیرە دروست کراوەکان دەکەن، لەنێوان هەموو دروست کراو هەڵکۆڵدراوە دارینەکاندا نهێنییەکی قووڵ بەدی دەکرێت و هەموو کەس هەست بەو نهێنییانە دەکەن زۆر کــات پەیکەر و داتاشراوەکان وا دەردەکەون کە قسە بکەن و دەنگی نا سروشتیان لێدەربچــێت ناوبــانگی (سەرحەد) بە گشت ناوچەکەدا بڵاو دەبێتەوە زۆر کڕیار لە تاران و ئێران و ئەفغان و هیندســتانەوە سەردانی دەکەن و بە نهێنی ئەو کارانەی سەرسام دەبن و بە نرخــی گــران کارەکــانی دەکــڕن و بــۆ وڵاتی خۆیانی دەبەنەوە. لەوێش بە نرخی گران و لە مەزادخانەکانــدا دەیفرۆشــن و لــە پێشــانگا و باڵەخانە و کۆشکە سەیرەکانیاندا دای دەنێن یەکێك لە هەرە کــارە جوانــەکانی (ســەرحەد) بریتــی بوو لە ئافرەتێکی جوان، کە (سێو)ێك بە دەستییەوەیە و دەستی بــەرز کردووەتــەوە تــاکو ئاســتی چاوەکانی ئافرەتەکە نموونەی ئافرەتی کارامەی کورد بووە بە شێوەیەکی هێنــدە هونــەری دروســتی کردووە تەنانەت چرچ و لۆچی کراسە کوردییەکەی هێند بــە وردی دروســت کردبــوو، وات هەســت دەکرد ئەو پەیکەرە قسە دەکات لە نیگای چاوەکانیدا نهێنییــەکی قــووڵ هــەڵگیرابوو، خــەمێکی قووڵی ژنانە کە باسی سەردەمێکی داهاتووی نیشان دەدا لەناو بریقەی چاوەکانییەوە ســەردەمێکی دیکەت دەبینی سەردەمێك کە هەرگیز لە یادەوەریدا ناسڕێتەوە و بــۆ هەمیشــە لــەناو دوو تــوێی کتێب و پەراوەکاندا هەڵدەگیرێت ئافرەتێکی نازەنین بە جلی رەسەنی کوردییەوە ســەیری ســێوەکەی دەستی دەکات و چاوەکانی بریقەی زەمانێکی تریان تێدایە. بەو کــارەی (ســەرحەد) ناوبــانگی لــە

تەواوی ولاّتدا پەیدا کرد و لە زۆر پەیمانگا و دامودەزگـای هونـەری وئـەکادیمیایی ئـەو سـەردەمە بانگێشتکراو چەند کارێکی زۆر ناوازەی لە پێشانگا گەورەکانی ولاّتـدا بـەژداریی کـرد و چـەندین خەلاّتی گەورەی بردەوە، (سەرحەد)ێکی پیشەسـاز بـۆ هونەرمەنـدێکی مـەزن گـۆڕا ئـەو تـەنیا کارسازێك بوو هەولّی دەدا کاری جـوان بکـات و بـژێوی ژیـانی خـۆی بگۆڕێـت و پیشـەکەی بـە زیندووی بمێنێتەوە و پەرەی پێ بدرێت، لە پرێکدا ناوبانگی گەورەی بۆ خـۆی پچـڕی و بڕیـاری دا ئیدی کاری هونەری زیاتر بکات، بـەلاّم گـەلێك رقـی لـە کورسـی بـوو هـەولّی دەدا هـەموویان بسووتێنێت پلەی هونەری زۆری بۆ هات یەکێك لەوانە راهێنانی پەیکەر تاشەکانی پایتـەخت بـوو کەفێریان بکات لە روحی پیرۆزی درەخت شت گەلی زیندوو دروست بکەن، بەلاّم ئەو رەتی کـردەوە پارەی زۆری لەلایەن بەرپرسانی ولاّتەوە بۆ دەهات، تا کاری تایبەتیان بۆ بکات، بەلاّم ئەو بیانووی جۆراوجۆری دەهێنایەوە و دەیگوت: (ببوورن بەرێزان، من خەیالاّتم بـەرەو مـردن دەڕوات و توانـام نییە کاری زیندوو بکەم، کاری زیندوو پێویستی بە کەسی زیندوو هەیـە، خـۆ مـن سـەردەمێکی دووره مردووم، بەلاّم شارەکەمم خۆش دەوێت! شاری (سێوان) بەهەشتییکە بۆ من، ئەم شـارەم لـە دەستی ئەو خانمەدایە کە ناوی کوردستانە و هەموو ئومێدم پاراستنی ئەو سێوەیە).

ئەو لەنێوان شەپۆلی خەیالّ و واقیعدا بزر ببوو. هونەرمەندێکی مەزنی سـەردەمی خـۆی بوو یەکێك لە کارە هەرە مەزنەکانی ئەو ئافرەتە بوو کە سێوێکی بەدەستتەوەیە نـاوی نـابوو (سێوی حەوا) بازرگانێك لە پایتەختەوە هاتبوو بە پارەیەکی خەیالّی لێی کڕیبوو، کە منیش نازانم بە چەند کڕیویەتی، بەلاّم ئەوەندە دەزانم. فرۆشتبووی لەبەر ئەوەی ئـەو بازرگانـە زۆری هەولّ و کۆشش دابوو تا ئەو پەیکەرە بکڕێت لە دار گوێزی ساخ دروست کرابوو، بە رەنگێکی وەنەوشەیی رەنگی کردبوو، رەنگەکانی لـە هیندسـتانەوە بـۆ هـاتبوو لەلایـەن ئـەو هـاوڕێ کڕیارانەی هەمیشە لە رێگای هونەرمەندێکی ئێرانییەوە سەردانیان دەکرد، بەڕاستی ئەو وەك (مایکلّ ئەنجیلۆ) چۆن وتبووی (من دەمەوێت ئەو مرۆڤانە ئازاد بکەم کە لەناو ئەو بەردانەدا زیندانن)، ئەویش بە هەمان رێچکەی ئـەودا روحـی گـەلێك زینـدەوەر و مرۆڤـی لـەناو دار گوێزەکان دەرهێنا بوو.، کاتێك پێویستی بە پارە ببوو، ناچار پەیکەرەکەی فرۆشتبوو، بـەلاّم بەکامێرایەکی رەش و سپی ئەو سەردەمە یەك وێنەی پەیکەرەکەی گرتبوو. وێنەکەش دواتـر لەنێوان پەڕەکانی ئـەم کتێبـەدا کـە مـن نەشـئەی لێـوەردەگرم بـاس کرابـوو، بازرگانەکـە پەیکەرەکەی بردبۆوە بۆ پایتەخت، بەلاّم (سەرحەد) خەمی زۆری بـۆ پەیکەرەکـە خواردبـوو. وای لێهاتبوو پاش ماوەیەك توانای هیچ کارێکی نەمابوو. وەك بلّێـی سەرچـاوەی ئیلـهامی

(سەرحەد) ئەو پەیکەرە بووە و تواناکانی لەگەڵ پەیکەرەکەدا یاخود لە ناخی (سێوەکەدا) سەفەریان کردبوو. پاش دوو مانگ لە فرۆشتنی پەیکەرەکە نەیتوانی بوو هیچ کارێکی دیکە بکات. چەندین درەختی دارگوێزی هەڵکۆڵیبوو، بەڵام ئاسەواری هیچ مرۆڤێکی دیکەی نەدۆزیبۆیەوە. دواتر بە تەور هەموویانی شکاندبوو. زۆریش بەسەر قاڵبەکانیدا گریابوو. قاڵبی ئیشەکانی نیوە ناچڵ بەجێ هێشتبوو، نەیتوانیبوو تەواویان بکات. زۆری هەوڵ دابوو، هەمان (ئافرەتی سێو بەدەست) مەبەست (سێوی حەوا) دروست بکاتەوە، بەڵام نەیتوانیبوو. ناچار سەرەنجام بڕیاری دابوو بە ناونیشان بە دوای بازرگانەکەدا بگەڕێت رۆژێك (سەرحەد) سەفەر دەکات بۆ پایتەخت و بە دوی بازرگانەکەدا دەگەڕێت و بڕیار دەدات دوو قات پارە بداتەوە بە بازرگانەکە و پەیکەرەکە بکرێتەوە. لە پایتەخت بە دوای بازرگان (حەسەن سەعدوون)ـدا دەگەڕێت و دوای گەڕانێکی زۆر بازرگانەکە دەدۆزێتەوە و لە کۆشکەکەی خۆیدا پێشوازیەکی گەرمی لێدەکات و دەڵێت: (مایەی شانازییە هونەرمەندێکی گەورە و پەیکەرتاشێکی مەزن و رزگارکەری مرۆڤەکانی نێو دار گوێزەکان لەلامان میوانە و ئێمە چەندی لە دەستمان بێ لە خزمەتی داین، گەورەمان دەکات). لە وەڵامدا (سەرحەد) بە چاوی پڕ ئەسرینەوە دەڵێت: (جەنابی (حەسەن سەعدوون) ئەی بازرگانی بە ئەمەك تکایە رزگارم بکە لەم تەنگژە دەروونییە من لە دوای فرۆشتنی پەیکەری (سێوی حەوا) تواناکانم سست بوون و هونەرەکەم بەرەو مردن دەڕوات. تکایە رزگارم بکە و پەیکەرەکەم بۆ بگێڕەوە دووقات پارەکەت دەدەمەوە، روحی هونەرەکەم لەو کارەدایە و لە دوای ئەوەوە من ناتوانم هیچ هەڵکۆڵێك بکەم و زۆرم هەوڵ دا و سەرنەکەوتم. بە عەرەبییەکی شکاو و بە ئاماژە هەموو رووداوەکانی بۆ (حەسەن سەعدوون) گێڕایەوە. ئەویش ئەوەندەی دیکە بێ ئومێدی کرد و بە تێڕامانێکی سەیرەوە پاش هەڵکێشانی چەند هەناسەیەکی قووڵ وتبووی: (ئەی هونەرمەندی مەزن، ئێمە پێویستە ژیان نامەی خۆمان بنووسینەوە، ئەگەر وابکەین ئەوا هەریەکەمان تاڵاوێکی لە رادەبەر لە ژیانماندا هەیە و هەوێنی چیرۆك گەلی ناخۆشن بە داخەوە پێت دەڵێم، کە مانگێك لەمەوبەر لە پێشانگایەکی گەورەی نێو دەوڵەتیدا کە خۆم بەکاری بازرگانی سەردانی ئەوێم کرد و لەگەڵ خۆم پەیکەرەکەی تۆم برد بوو، لەو پێشانگا گەورەیەدا بەژداریم کرد، لە وڵاتی (میسر) لەلایەن هونەرمەندێکی (ئیتاڵی)یەوە کڕایەوە و پارەیەکی زۆر زۆر خەیاڵی پێدام و بە سپاسەوە لەگەڵ خۆی بردییەوە بۆ ئیتاڵیا و هیچی تری لە بارەوە نازانم بۆیە داوای لێبووردن دەکەم و تازە هەرچی بکەیت مەحاڵە ئەو پەیکەرە بدۆزیتەوە بۆیە لە

بیری بکە و هەوڵ بدە دووبارە دروستی بکەرەوە. هەریەکە لە ئێمە پێویستە لە هەموو قۆناغێکی ژیانیدا دووبارە ژیانی خۆی بەرجەستە بکاتەوە.) (سەرحەد) بە چۆکدا دەکەوێت خۆڵی باخەکەی ماڵی (حەسەن سەعدوون) بەسەری خۆیدا دەکات و هاوار دەکات (مــن ئیتر مردم و هونەرمەند نیم من یەکسانم بە هیچ، تازە ناتوانم دووبارە ئەو کارە بکەمەوە، ئەوە مەحاڵە و ناتوانم، ئەی هاوار چی بکەم؟) لە راستییدا وایە و مرۆڤ گەر لە ژیاندا داهێنانی کرد، تەنیا یەك جار ئەو توانا رەهایەی بۆ دەخولقێت و تەنیا ئەو جارە راستییە و ئیدی جارەکانی تر هەموو بەتاڵن، مرۆڤ یەك جار دەگاتە لووتکە و ئەگەر توانیی دانابەزێت و لەوێ دەمێنێتەوە. ئەگەر توانای نەبوو دەکەوێتە خوار و دووبارە ئەو هێزەی نییە بەو سەختیەدا سەر بکەوێت و دەبێت تا ئاخر زەمان هەر چنگەڕنێ بکات و ناگاتە خاڵی هەڵکەوتن. مرۆڤ بە تایبەت هونەرمەند پێویستی بە ئیلهامبەخش هەیە، ئیدی هەریەکە لە ئێمە ئیلهامەکانمان شتێکە. دیار بووە لەو دەمەوەی (سەرحەد) لە هونەردا خۆی دۆزیبووەتەوە، تاکە ئیلهامی (سێوی حەوا) بووە لەگەڵ نەمانی ئەودا هونەری ئەو سەفەری کردووە. پاشان بە نائومێدی دەگەڕێتەوە و چەندین شەو رۆژ دەگری. وەك لە بەڵگەکاندا هاتووە فرمێسکی چاوی هەڵچۆڕاوە و خوێن لە چاوەکانی دێنە خوار و چاوەکانی کوێر دەبن، لەو رۆژەوە کە کوێر دەبێت ئیتر رووناکی دنیای لێدەبڕێت و لە تاریکییدا درێژە بە سەفەر کردن دەدات بە دوای (سێوی حەوادا)و نایدۆزێتەوە.

وردە وردە کوڕەکەی گەورە دەبێت ئەو کوڕەی لە شەوێکی هاوینی ساڵی ١٩٥٦دا لەدایك بوو. دەستی باوکی دەگرێت و جار جار دەیبات بۆ ناو باخچە دار چنار و گوێزەکانی ئاقاری شار. ئەو دەمە تەمەنی (جیهانگیر) تەنیا حەوت ساڵ دەبێت. (سەرحەد)ی باوك (جیهانگیر) هان دەدات درێژە بە هونەری دارتاشی بدات و ئەوەی کە (سەرحەد) لە دەستییدا (جیهانگیر) بیگێڕێتەوە و دروستی بکات. (جیهانگیر) ئەرکێکی قورس دەکەوێتە سەر شانی و خۆی دەخاتە ناو کارەکانی باوکی و بەو تەمەنە کەمەوە وردە وردە درێژە بە هونەر دەدات و بە هاوکاری هاوڕێکانی باوکی کە سەردەمانێك پێکەوە کاریان کردبوو دەڕواتە ناو ئیشەکە و خێزان و دایك و باوکی بەخێو دەکات. دیارە دوو خوشکەکەی ئەو سەردەمە تازە مێردیان کردبوو، لە ماڵەکانیاندا تەنیا (ریحانە بارام) و (سەرحەد)ی باوکی مابوون. باوکی بە خۆی و ئەو گۆچانەی (جیهانگیر) لە دار گوێز بە شێوەیەکی هونەری و نەخشە سازی دروستی کردبوو، بە کۆڵانەکانی شاردا

پیاسەی دەکرد و جار جار دەچوو بۆ دووکانەکەیان و لەوێ هاوڕێکانی بەسەر دەکردەوە. ئەو کوڕەکەی نەدەبینی کە کار دەکات، بەڵام کوڕەکەی باوکی دەبینی و زۆری خەفەت لێ دەخوارد. (سەرحەد) وای دەبینی کە گەڕانی بێبڕانەوەی ئەو بە نێو روحی هونەردا وای لێکردووە ژیانی لە تاریکییدا بەسەر ببات، بەڵام هیچ کات لۆمەی خۆی نەدەکرد بەوەی لە سۆنگەی هونەر و ئازارچەشتنەوە بۆ هونەر کوێر بووە.

هەمیشە لەناو تاریکییدا رێگایەکی رووناك هەیە کە چاوی ئاسایی هەستی پێناکات و لەوپەڕی تاریکییەوە دەرگایەك هەیە دەکرێتەوە، بەڵام کوێرەکان هەستی پێدەکەن. کوێرەکان لە مرۆڤێکی چاوساغ باشتر رووناکاییە نەمرەکە دەبینن. دواجار دەگەینە ئەو راستییەی کە مرۆڤی کوێر باشتر دنیا دەبینێت. دنیایەکی دیکە، کە راستترە لەو دنیایەی ئێمە هەستی پێدەکەین. هەر جێیەکی ئەم دنیایە بگەڕێی داهێنانەکانی سەرحەد دەبینی. تا ئەمڕۆکەش لە هەندێك وڵاتی دنیادا وجوودیان هەیە و مامەڵەیان لەسەر دەکرێت. بەڵگەش بۆ ئەوە (سێوی حەوا)ی (سەرحەد) لە ئیتاڵیایە و لەوێ لە پێشانگا بە نرخەکاندا خەڵکی هەموو دنیا دەیبینن لە تەنیشت شاکارە مەزنەکان و لە وڵاتی هونەر و لە تەنیشت بەرهەمە ناوازەکانەوە هەن. لە بنکەی بەشی پێشەوەی پەیکەرەکە نووسراوە (سێوی حەوا) و ناوی (سەرحەد). لە ژێریدا نووسراوە، سەردەمانێکی دوور ئەم پەیکەرە دەمێنێتەوە و لە ئەوروپا سەفەری خۆی دەکات.

بەڵێ کوردیش وەك هەموو نەتەوەیەکی دنیا (بێ بەرهەم) نییە و شاکاری ناوازەی هەیە. (سەرحەد) بەرهەمی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد، کە لە داهاتوودا دەبێتە راست و نرخی هێندە مەزن دەبێت کە نەتەوەی کورد شانازیی پێوە بکەن.

وردە وردە (جیهانگیر) گەورە و گەورەتر دەبوو. (سەرحەد)یش پیر ترو پیر تر دەبوو. سەرحەد ریشی سپی دەبوو سەری سپی دەبوو دەموچاوی چرچ دەبوو. (جیهانگیر) گەورە دەبوو، دەبووە هەرزەکار و تواناکانی (جیهانگیر) زیاتر دەبوو. هونەری (جیهانگیر) شتێکی بۆماوە نەبوو، شتێکی واش نەبوو کە لەم سەردەمەدا کوڕ لە باوك و باپیرو لە باپیرە گەورەوە هونەر وەربگرن، بەڵکو روحی هونەری پەیکەر و دارتاشین و زەخرەفەسازی لە (جیهانگیر)یشدا چەکەرەی کرد. لە بیستساڵیدا دەبینین کاتێك بە چەند کارێکی ناوازەوە سەردانی وڵاتی ئێران دەکات و هاوڕێ کۆنەکانی باوکی دەناسێتەوە و وەك میراتی (سەرحەد) خۆی نیشانی ئەوان دەدات. ئەوانیش بەم شێوەیە ستایشی (هونەرەکەی سەرحەد) دەکەن. (ئەی کوڕی سەرحەد، کوڕی هونەرمەندە مەزن و دەستڕەگینەکە، بەڕاستی وێنەی کارەکانی ئەو پیاوە لە دنیادا کەمن، ئێمە سەردەمانێکی زۆر

یەکدیمان دەناسی و پێکەوە بووین و زۆر وڵاتی دنیا گەڕابووین، بەڵام هیچ کات نموونەی (سێوی حەوا)مان لە دنیادا نەبینی. ئەو ژنە خەمگینەی تامی (مۆنالیزای) دەدا. ئەو ژنەی سێوێکی گەورە بە دەستی راستییەوە هێناویەتە راستیی چاوەکانی و لە ناخی سێوەکە رادەمێنێت و بە شێوەیەکی زۆر خەمناك لەسەر بەردێك دانیشتووە و دیمەنی جلوبەرگی کوردەواریی دەڤەری خۆتانی لەبەردایە. ئەو هونەرەی لەو پەیکەرەوە و لە رەنگی وەنەوشەیی ئەودا بەرجەستە بوو کارێکی ناوازە و دەگمەنی دنیایە). کاتێك (جیهانگیر) لەسەر هەندێك کەرەستە و پێداویستی هاوچەرخی هونەری پەیکەر و دارتاشی داوای کۆمەکیان لێدەکات بە خۆشحاڵییەوە هاوکاری دەکەن و کەرەستەکانی بۆ پەیدا دەکەن، هەر لەو رۆژەوە (جیهانگیر) لە روحی خۆیدا بڕیار دەدات چیدی رێچکەی باوکی نەشکێنێت و بە هەموو هەوڵی خۆی بەرەو بەو کارە بدات. ئەو دەمە تێدەگات باوکی ئەو (سەرحەد)ە پیرە کوێرەی کە بە کووچەکانی (شاری سێوان)دا هێدی هێدی رادەبووری، سەردەمانێك هونەرمەندێکی گەورەی وڵات بووە و خەڵکی بێگانە بەو چەشنە ستایشی دەکەن. هەموو رۆژێك کە دیمەنی حەزینی باوکی دەبینێت چەند خولەکێك بە ئەسپایی بۆی دەگری، بێ ئەوەی (سەرحەد) هەست بەوە بکات، (جیهانگیر) پەیوەندیەکی پتەو لەگەڵ هەموو هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمەی وڵات پەیدا دەکات و سەردانی شارەکانی دیکە دەکات.

(جیهانگیر) رۆژێك بیر لە موعجیزەی دەست و پەنجەکانی باوکی دەکاتەوە، و بڕیار دەدات وەك قوتابییەکی ئەو رێگایە نوور بچێنێتەوە و قەڵەم و چەکوش و کەرەستەکانی باوکی لە مۆزەخانەی زەینیدا هەڵبگرێت و سەفەری ئەبەدی خۆی بکات لەنێوان هونەری نەخشە سازی و دار و پەیکەر تاشی داو روحی (سێوی حەوا) بگەڕێنێتەوە بۆ چاوەکانی و تاریکی لە روحیدا وەدەرنێت. ئەو دەیزانی کە سەفەری بەهرە لەبن نەهاتووەکانی (سەرحەد) ئەو پەیکەرە بوو، کە لە دار گوێز دروستی کردبوو و بە شێوەیەکی هونەری بەرز و ماوەیەکی زۆر کاری تێدا کردبوو. ئەو دەمانەی خەڵك لە گەرمەی خەودا بوون ئەو تەقەی لە دارگوێزەکە دەکرد و روحی ئەو ژنەی لەناو دارەکە دەردەهێنا. دەیزانی کە ناچاری (سەرحەد) و پێویستی بە پارە بۆ ژیان کارێکی وایان کرد، کە ئەو بەرهەمە مەزنەی بە عەرەبێك بفرۆشێت و ئەویش وەك دوورێك، یان ئاسەوارێکی مەزنی سەردەمی سۆمەرییەکانی چنگ کەوتبێت بە تەوسەوە لە سەفەرێکدا بیبات بۆ مەملەکەتی فیرعەونەکان و لەوێ بە کابرایەکی (ئیتاڵی)ـی بفرۆشێت. وەك (حەسەن سەعدوون) دەیگوت، ئەو دەمەی (سەرحەد)ی باوکی بە دوای (سێوی حەوا)دا چووتە پایتەخت بیهێنێتەوە، بە (سەرحەد)ی وتبوو (ئەی هونەرمەندی مەزن، زەمانێکی دووری دەوێت تا کەسانێك بتوانن کارێکی وێنەی ئەو

کارەی تۆ بکات تۆ توانیت وێنەی ئافرەتێکی نەتەوەکەی خۆت بە جیهان بناسێنیت، بەڕاستی ژن مەزنە زۆریش مەزنە، لە دروستبوونی ئادەمەوە و لەسەر زەوی کۆمەکی بە ئادەمیەت کردووە ئەوەی تۆش کارێکی گەورەیە و ئەتوانم بڵێم ئەو کرپیارە ئیتالیە کارەکەی تۆی لە ریزی پەیکەرە یۆنانییە کۆنەکان و ئەوانەی داڤنشی و جاکۆب داڤیدس و چەند هونەرمەندێکی دیکەی مەزنی سەردەمانی کۆن نرخاند و من ناوی ئەوانەم لەیاد نەماوە... تۆ مەزنیت. کەسێکی بەهرەمەندیت و لە تواناتا هەیە کاری دیکە بکەیت، بە روحیش بێت دەتوانیت کاری وەها بکەیت. هەر بۆیە بڕیاری دا تا مردن کار بکات و بە پەیژە وەهمیەکانی ئاسماندا سەربکەویت. خۆی فێری هونەری ئەستێرە و هەسارە نەدۆزراوەکانی گەردوون بکات ئەو هەسارانەی رەنگە سەردەمانێکی دیکە ببنە مۆڵگەی کۆچی بە کۆمەڵی ئادەمیزاد و دەستی ئادەمیزاد بگاتە ئەوێندەرێ و هاوکێشە گەردوونییەکانی بشێوێنن.

(جیهانگیر) خۆی سەرقاڵ کرد بە خوێندنەوەی رووکەشی پەیکەرەکانی دنیاوە و زیاتر لە رەنگ و کانزای بەکارهاتوودا، هونەری هەڵکۆڵین و دیزاینی قاڵبی هونەری قووڵ کردەوە. ئەگەرچی لەبەر باری سیاسیی ئەو سەردەمە و هاتنە سەر حوکمی رژێمێکی دیکەی داپڵۆسێنەر (جیهانگیر) نەیتوانی بخوێنێ و بچێتە پەیمانگا و بە شێوەیەکی ئەکادیمی لە هونەری پەیکەرتاشیدا رۆبچێت، بەڵام بە لێهاتوویی خۆی و ئەو هەستەی لە سای باوکییەوە لە خوێنیدا گوورابوو، قۆناغی زۆر سەختی بڕی. بە راستی هونەر مەرج نییە هەر بە بڕوانامە بپێورێت و بارستایی بۆ دابنرێت. ئەزانی خەڵکانێك هەن خۆیان بە مامۆستای هونەری مرۆڤایەتی دەزانن، بەڵام لە راستییدا لە هونەری مرۆڤ نازانن مەرج نییە ئەوەی توانیی چوار کتێب بنووسێت و رۆژنامە و گۆڤار چاپ بکات و پەیکەری مەزنی لە زێڕ و تەلا دروست کراو تابلۆی سووریالی و زەیتی دروست بکات، ئەوە هونەرمەند و داهێنەرە داهێنان پەیوەندیی بە ناوەوەی ئینسان هەیە، ئەوەی نەیتوانی داهێنان لە عەقڵی خۆیدا بکات و بیخاتە خزمەتی مرۆڤایەتیەوە، ئەوە هونەرمەند نییە. ئەوەی نەیتوانی لە زەیندا بەردێك لەسەر دیوارەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن دابنێت، هونەرمەند و وەستا نییە. وەستا ئەوەیە ئیش بکات ئیدی ئیشی مادی دەکات یان مەعنەوی و خەیاڵی، گرنگ نییە.

(جیهانگیر) بە خەیاڵییش ئیشی دەکرد و وێنەی نیگای جوانی دەخوێندەوە و دەیکردە کاری هونەری. راستە (سەرحەد) دارتاش بوو، لە دارتاشیەوە هونەری دەرهێنانی زیندەوەرەکان فێر بوو، هەرچەند مامۆستا و مەلا ئایینییەکان و پیرە بێ بەهرە و قسە زلەکانی ئەو سەردەمە دەیانوت (ئەم پیاوە سەردەمی جەهالەت و بتپەرستی زیندوو دەکاتەوە، ئەمە دروستکەری بتە و کارەکانی

هیچ جوان نین و ئەو تەنیا بت دروست دەکات و ئەمە کفرە و حەرامە ئێمە پێی قایل نـین)، بـەڵام دەرگایەکی مەزنی بەڕووی دنیادا کردەوە و دنیای فێری ئەوە کرد کە بەدوای شوناسی نەتەوەیەکـدا بگەڕێن بە ناوی کورد. هەر بۆیە (جیهانگیر) ڕێچـکەی بـاوکی بەرنـەدا و بـە هـەموویانی گـوت (ئەوەی باوکم کردی هونەر بوو، ئەوەی منیش دەیکەم هونەرە، دەزانم ئێوە نازانن هونــەر چـییە؟، هونەر یانی هونەر) ئەوەی (جیهانگیر) بەوانی دەووت لە دیدی ئەواندا دژوار بـوو، چـونکە ئـەوان نەیانـدەزانی هوونــەر چـییە و بۆچـی باشـە؟ ئیشـی هونــەر لەسـەر ئـەم گـۆی زەوییـە چـییە؟ کاردانەوەکانی چین؟ لە راستییدا هونەر ئەو پێناسە قووڵەیە کە منیش ناتوانم حەقی خۆی بدەمێ، بەڵام دەتوانم بەم شێوەیە دەری برم. هونەر و هەموو ئەوانـەی بـە دەوری هونـەردا دەسـووڕێنەوە و گرێیەك لەلای مرۆڤ بەجێ دەهێڵن. مرۆڤی عـەقڵ داخراو بەشێکن لەو یاسـا گشـتگیرەی بـە دوای حەقیقەت و یەقیندا وێڵە و بەشێکە لە فەلسەفەی ژیان. ژیان بێ هونەر و داهێنان کـاڵ و کرچـە و هیچ سەردەمێکیش بێ داهێنان ناڕواتـە نـاو مێـژوو و لـە بـیری مرۆڤـدا نامێنێتـەوە. داهێنـان مرۆڤەکان لە درندە جیا دەکاتەوە و لە ئاژەڵیان بە نرخ تر دەکات، بەڵام ئەو مرۆڤانەی نرخی مـرۆڤ نازانن ئاژەڵن ئاژەڵێکی قسەکەر و هیچی دی ئەو مرۆڤەی هەر قسەی کـرد و کـاری نـەبوو ئـەوا ئاژەڵێکی قسەکەرە و کاری ئەو تەنیا ئەوەیە پەرە بە ئاژەڵایـەتی خـۆی بـدات. بـە راسـتی زۆرن ئەوانەی سیفەتی گوێدرێژیان هەیە، بەڵام مرۆڤن. من مێژووی ئەو کارە ناوازانە دەڵێم کە سنوور و نەژاد ناکەنە بەربەست و کار بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دەکـەن، ئیـدی پەیکەرتاشـینە، دروسـتکردنی دەرگایە، وێنەکێشانە! مۆسیقایە ئەندازە و بەنداو دروسـتکردنە، گـرنگ ئەوەیـە هەریەکـە و لـە پێگەیەکی بچووکی خۆیانەوە بەرەو دنیا دەڕۆن و سەردەم دێت و ئەوان بەردەوام دەبن و رۆژهـەڵات و رۆژئاوا نازانن و ئەوانە ناناسن. سەردەم دێت و سەردەمەکانی دیکـە بـە جـێ دەهێڵێـت، بـەڵام کەس هەیە بە (پیتا) بڵێت هونەر نییە. کەس هەیە بڵێت ئەو بـەردەی لـە دەسـتی (داود)دایـە و دەیەوێت بیگرێتە (جولیاس)ی گەورە و بیکوژێت. بەرد نییە و هونەر نییە کەس هەیە بڵێـت ئـەو گەنجەی لە ئامێزی (پیتا)دایە مرۆڤ نییە، خۆ ئەگەر مرۆڤ زۆر ورد و ژیـر نـەبێت، دەڵێـت (پیتـا) لەگەڵ ئەو گەنجە رووتەڵەیەدا لە پڕ بوونەتە بەرد. هونەرە چرچـی جلـەکانی (پیتـا) و دەرکـەوتنی ماسوولکەکانی جەستەی گەنجەکەی باوەشی. ئەو رۆژبەڕۆژ لەگەڵ پیشەی دارتاشین و دروستکردنی کەرەستەی جوانکاریی ناوماڵەکان پەرەی بە تێڕامان دا. لە هونەرە زیندووەکانی دنیا ئـەو چـەند وێنەیەکی نموونەی گرافیکـی ئـەو هونـەرە مەزنانـەی (مایکـڵ ئـەنجیلۆ)ی لـە رێگـای هەنـدێك هاوڕێیەوە دەستکەوت، کە بەر لەم (سەرحەد) ئەم وێنەنانەی نەبینیبوو، بەڵام لە خەیاڵییـدا و لـە

توانا نەبڕاوەکانیدا هونەری مەزنی (سێوی حەوای) دروست کردبوو بە مادەیەکی کیمیاوی شێوە بۆیەی وەنەوشەیی روو پۆش کردبوو کە بەرگەی پلەی گەرمی بەرز و شێ و داخوران و مێرووی گرتبوو لە چەند هاوڕێیەکیەوە لە رۆژهەلاّتەوە بۆیان هێنا بوو، مەزنی ئەو لەوەدا بوو خۆی توانیبووی خۆی دروست بکات و بگاتە خاڵە سەرابیەکانی هونەر، بەلاّم بە وێنەیەکی دیکە و بە چەشنی دیکە و سەردەمی دیکە (جیهانگیر) ئاشنایەتی لەگەڵ کانزاکانی (تیراکۆتا و برونز و براس و مسی سووڕ و ئاسن و ستیل و ئەلەمنیۆم و بەرد) پەیدا کرد و وردە وردە لە دارەوە بازی دایە سەر ئەو کانزایانەی شیاو بوون بۆ قالّبەکانی هونەر، کارکردن بۆ ئەو سەخت بوو لەگەڵ (گرانێت و بازلت)دا، بەلاّم زانیاری تەواو و چەکوش و قەلّەم و فلّچە و کەرەستەی تایبەتی لە ئێران پەیدا کرد و هێدی هێدی چووە ناو ئەو مەیدانەوە و دەستی کرد بە دەرهێنانی مرۆڤ لەناو بەردەکان. یەکەم جار منداڵییکی لەناو بەردێکدا دەرهێنا کە سەردەمێکی زۆر بوو خۆی لەوێدا حەشار دابوو، بەلاّم ئەم توانیی ئازادی بکات، ئەگەرچی لە نیوەی کارەکەیدا منداڵەکە بوو بەدوو کەرتەوە و هەموو رەنجی ئەو ساڵە کارکردنەی بە هەوادا رۆیشت، بەلاّم کۆڵنەدەرانە بەردەوامی بە کارەکەی داو بە باوکی گوت: (ئەی (سەرحەد)ی مەزن! ئەوەی تۆ لەداردا بە فیڕۆت دا، من ئەمڕۆ هەوڵ دەدەم لەناو بەردەکاندا بیان دۆزمەوە. باوکە ئەزیزەکەم! هەرگیز وامەزانە کە بەرد کانزایەکی رەق و ناقۆلاّیە و لەگەڵ مرۆڤدا ناگونجێت، بڕوا بکە نەرم ترین کانزایە لەسەر زەوی من هاوڕێیەتیم لەگەڵ بەرددا بەرەو لووتکە دەڕوات. ئەوە دڵی مرۆڤە رەقە و لە رەقی خۆیەوە بەرد دەخوێنێتەوە. من هەوڵ دەدەم لەبەرد و برونز پەیکەری ناوازە ساز بکەم.) دەستییکی بە چاوە پڕ فرمێسکەکانیدا هێنا و توند گۆچانەکەی دەستی گوشی و وتی: (کوڕی خۆم... سپییدە نزیکە، ئەگەرچی من لە تاریکییدا دەژیم، بەلاّم هەست بەو لێشاوە رووناکییە دەکەم، جیاوازە لەو رووناکییەی خەڵکی دیکە دەیبینین). دیار بووە ئەو مەبەستی لە جودایی رەنگی ئەو تیشکانە بووە کە لەودیوو تاریکییەوە بینیویەتی. سەرسامیی (جیهانگیر) بە کارە مەزنەکانی (ئەنجیلۆ) وایان کرد حەز لە کەڤر بکات و خۆشەویستی لەگەڵدا بکات و بەردەوام بە چەکوش و قەڵەم ورد ورد دەست بکات بە هەڵکەنین. لە ماوەیەکی کەمدا توانیی تەواو لەگەڵ رەگەزە رەقەکەی سەرزەمین ئاشنا بێت و بچێتە ناو روحی بەردەکان و لێیان تێبگات و جۆری بەردەکان بناسێت و پۆلێنیان بکات. بەردی باش لە خراپ جیا بکاتەوە . ئاخر جیا کردنەوەی بەردی باش لەبەردی خراپ کارێکی سانا نییە و هەموو کەسێك نازانێت ئەو کارە دژوارە بکات. رەنگە من بڵێم بەرد هەر بەردە باش و خراپی بەرد دەبێت چی بێت؟، بەلاّم هەموو شتێك لەم گەردوونەدا باش و خراپی هەیە مرۆڤی باش و

مرۆڤی خراپ داری باش و داری خراپ دوورگەی وێران و دوورگەی ئاوەدان و هێمن، کـەناری ئـارام و کەناری هەڵچوو، ئەستێرەی درەوشاوە و ئەستێرەی بێنرخ و دزێو و مردوو.

بەڵێ ئەو لە ماوەیەکی کەمدا فێری هونەری جیاکردنەوەی کـانزا و ماتریاڵـە باشـەکان بـوو، توانیی کچێکی فەریك لەناو بەردێکی گەورەی دامێنی چیاکەدا دەربهێنێت.

ماوەیەکی چەند مانگی بوو ئەو بەردەی نیشانە کردبوو بە گالیسکەیەك هێنابوویە حەوشـەی ماڵەکەیان و لە تەنیشت حەوزە بچکۆلەکەی ماڵیان و لەنێوان دارگوێزەکاندا رۆژانە کـاری لەسـەر دەکرد. دوای ساڵێك و دوو مانگ کچێکی فەریکی لێ دەرهێنا. ئیدی دیـار نییـە ئـەو کچـە لـە خەیاڵەوە هـاتووە یـاخود وجـوودی هـەبووە و شـێوەی ئادەمیـەکی ئـەو سـەردەمەی لـە خۆیـدا هەڵگرتووە، بەڵام گرنگ ئەوە بوو ئەو کیژەکەی نیوە رووت و نیوە داپۆشراو دروست کردبوو...

لەنێوان چڵی دار گوێزەکەوە تیشـك و تیرێـژی خـۆری دەکەوتـە سـەر و سـێبەرێکی کـەمێك تاریکی لەسەر چیمەنتۆی تەنیشت حەوزەکە دروست دەکرد. (جیهانگیر) بـە فلچـە بـەردەوام وردە بەرد و تۆزی بەردی لەسەر رووخسار و سەر سنگی روتی پەیکەرەکە لا دەبرد. پەیکەرەکـە بریتـی بوو لە کیژۆڵەیەکی عـازەب، لـەنێوان چـواردە تـا هـەژدە سـاڵان. پرچـێکی لـوولی هـەبوو کـە (جیهانگیر) هونەرێکی زۆری تێدا بەکار هێنابوو تا توانییوی پێچ و لوولی تاڵەکان بەسەر یەکـەوە رابگرێت و تا نزیکی سەر شانەکانی کەمێك خوارتر درێـژ بکاتـەوە. بـە دوو چـاوی گـەورەوە لـە دووری دەڕوانی، وەك شانی دادابێت لەسەر بەردێك و وێنەی گیرابێت ئەوهابوو. مەمکـەکانی کـە هێندەی دوو لیمـۆی گـەیوی کـەمێك گـەورە دەچـوون، قـوت ببوونـەوە و هـەر دانەپۆشـرابوون. ملوانکەیەکی لە ملدا بـوو دەنکـەکانی هێنـدەی بۆڵـە ترێیـەك گـەورە بـوون. تـەنیا عـەورەتی داپۆشرابوو لەگەڵ کەمەری، دەنا هەموو جەستەی بە دەرەوە بوو.

دەستەکەی دیکەی لەسەر رانی داناوبوو و هەردوو لاقی بۆ دواوە نووشتاندووەتەوە و وەك لـەناو کۆڕێکی گەورەی خەڵکدا دانیشتبێت ئەوها بووە و هەر تۆزێکی جێ گرتبوو. زەردەخەنەیـەکی زۆر ناسك بە رووخساریەوە دیار بووە و وای کردووە کەمێك کوڵمەکانی هەندێ قوت ببنەوە. دیار بـووە (جیهانگیر) کوڕی (سەرحەد)ی هونەرمەند بە خەیاڵ ئەوو پەیکەرەی دروسـت کـردووە و نموونـەی فریشتەیەك یاخود حۆرییەکی ئاسمانیی تێدا نواندووەتەوە و لەدوا رۆژی تـەواوبوونی کارەکەیـدا بـە ئامێری تایبەت و بە هونەرێکی ورد بە هاوکاریی هاوڕێیەکی شاری (سێوان) نـاوی خـۆی لەسـەر کاغەزێك بۆ دەنووسێت و بە هاوڕێکەی دەڵێت: (من خوێندەوار نیم، بـەڵام بـە شـێوەیەکی دیکـە دنیا دەبینم، رەنگە ئەو حەرفانەی کە تۆ ناوی (جیهانگیر)یان پێ دەنووسیت و یەك لەدوای یەك لە

چەپ بۆ راست ریزیان دەکەی، بۆ من ئاماژە و هێمای دیکە بگەیەنن. تۆ بەو زمانەی پێی دەوترێت ئینگلیزی ناوی من و ناوی تابلۆکە لەسەر ئەو کاغەزە دەنووسیت، منیش لەسەر پەیکەرەکە دەیان نەخشێنم، ئاخر نووسین وێنەیە و هیچی دیکە، چونکە لە مێشکی مندا ئەو پیتانە وێنەن و هیچی تر).

پاش ئەوەی ناوی خۆی لەسەر پەیکەرەکە دەنووسێت (جیهانگیر سەرحەد) و لە ژێر ناوەکەی خۆیدا پیتەکانی ناوی پەیکەرەکە هەڵدەکەنێت کە هاورێکەی بۆی نووسی بوو لەسەر پارچە کاغەزێك (جینا) دیار بوو. لەژێر کاریگەریی خەڵکی ئەو سەردەمەدا و سەرسامییان بە هونەری هیندستان و تەکنیکی فیلمسازییەکەی ئەوان ناوی وای بەرگوێ کەوتبوو و لە کتێبێکدا کە باسی ئەفسانەیەکی خۆرهەلات و هیندی کردبوو، ناوی شازادەیەکی تێدا هاتبوو بەو ناوە، بۆیە (جیهانگیر) ناوی پەیکەرەکەی نابوو (جینا). زۆر کەس پاش بینینی پەیکەرەکە وتبوویان لەبەر ئەوەی لەگەڵ ناوی خۆیدا رێك بکەوێت بۆیە وا ناوی ناوە، بەڵام دیار بووە (جیهانگیر) دوورتر بۆ ئەوەی روانیبوو. زانیبووی ناوەکە زۆر لە زمانەکانی دیکەوە نزیکە و لەسەر زمان خۆشتر دێتەوە و رۆژێك ئەم پەیکەرە ناوبانگ پەیدا دەکات و ناوی (جیهانگیر سەرحەد) دەگەرێتەوە لووتکە و زۆر ستایش دەکرێت و دەبێتە ئەستێرەیەکی درەوشاوەی هونەری دنیا. پاش ئەوەی بە یەکجاری کاری هونەری (جینا) تەواو دەکات، بە قوماشێکی کەتان پێچابوویەوە و جوان جوان بەستبووی و ئامادەی کردبوو بۆ ئەو پێشانگا گەورەیەی لە شارێکی دیکەی کوردستان ساز دەدرا و شارەکە بە شاری هونەر و زێدی شاعیران ناوبرابوو. شارێکی جوان و ماندوو لە ژێر رەحمی چەقۆ و قامچیی رژێمی بەعسی ئەوکاتەدا کە لە هەرەتی کوشتار و کاولکاریدا بوو، ئەو سەردەمە بوو کە پێشمەرگە لەناو شار و لە چیاکان چالاکیی گەورەیان دەکرد و گوزریان لە رژێم دەوەشاند و ئەویش بە ئاگر و ئاسن جەستەی لاوان و نەوەکانی کوردی بۆردوومان دەکرد و خەڵکێکی زۆری لە سێدارە دەدان و زۆریشی لێ گوللەباران دەکردن و لەو سەردەمەدا کە هەموو شتێك لای مرۆڤ وەك ژەهری مار وابوو. کۆمەڵێك دەست و پەنجە هەبوون حەزیان لە گەمەکانی هونەر بوو. حەزیان لەوە بوو شتی جوان پێشکەش بە خەڵك بکەن. حەزیان لەوە بوو مرۆڤ لە جەنجاڵی و سیاسەت دوور بخەنەوە و فێری ئەوەیان بکەن مرۆڤ لە توانایدایە دنیای جیاواز و جوانتر لە دنیای حەقیقی دروست بکات هەمیشە و لە هەموو دەمێکی مێژوودا، کەسێك یان چەند کەسێك هەبوون جیاواز لە بیرکردنەوە و جیاواز لە دنیا و جیاواز لە خوێن و کوشتن، حەزیان لە قەشەنگیی ناخی مرۆڤ بووە و دنیای رەنگاورەنگ و بێسنووری خەیاڵییان هێناوەتە بەرچاوی مرۆڤ.

لەو سەردەمەی کە دەنگۆی سەرهەڵدانی جەنگ لەناو خەڵکیدا بڵاو بوو بۆوە، جەنگ لەگەڵ وڵاتی ئێرانی دراوسێ لە ترسی بڵاو بوونەوەی بیرو باوەڕی ئیسلامی شیعی و هەندێك کێشە لەسەر ئاوە هەرێمییەکانی (شەتی عەرەب) کە لەناوەندی ساڵی ١٩٧٩ لەلایەن هێزە سنوورییەکانی ئێران چەند هێرشێك کرابووەسەر گوندە سنوورییەکانی ئەو ناوچەیەی باشووری وڵات. ئاگری شەڕ هێدی هێدی پریشکی دەدا. (جیهانگیر) خۆی ئامادە کردبوو بۆ پێشانگاکە و بە ئوتۆمبێلێکی تایبەت خۆی گەیاندبووە شار بۆ بەشداربوون لە پێشانگاکەدا بە پەیکەری (جینا)وە. راستە سەردەمی جەنگ و نەهامەتی بەڕێوە بوو، بەڵام خەڵکێکی زۆر و خوێندکار و مامۆستا و ئەندازیار و لایەنگرانی هونەر پەرۆش بوون بۆ تەماشاکردن و بینینی ئەو پێشانگا گەورەیەی چەندین هونەرمەندی پەیکەر تاش لەناوچە جیا جیاکانەوە بەشداریان تێدا کردبوو. هەر هونەرمەندە و بە کارێك یان دوان و سیان بەشدار بوون و هەریەکە چاوەڕوانی ئەوە بوو ناوبانگ و پلەیەکی باش بەدەست بهێنێت. لە یەکێك لە هۆڵەکانی شار و لە وەرزی وەرینی گەڵا زەردە ئاڵتوونییەکاندا دەمەو بەیانییەکی هەوراوی پێشانگاکە کرایەوە. دیار بوو (جیهانگیر) رۆژێك بەر لە کردنەوەی لەوێ ئامادە ببوو و لە یەکێك لە ئوتێلە کۆنەکاندا مابۆوە. ستافی بەڕێوەبردنی پێشانگاکە پۆستەر و بڵاوکراوەی باشیان لەبەردەمی هۆڵەکە و شوێنە گشتییەکاندا هەڵواسیبوو. خەڵکێکی زۆری شار بەوەیان زانیبوو. لە ریکلامەکانی تایبەت بە پێشانگاکە نووسرابوو: (وەرن سەیری جوانیی جەستەی ئادەمیزاد و ئازارەکانی بکەن، مرۆڤ بە رووتییەوە جوانە و جلوبەرگ جوانییەکانی دەکوژێت... وەرن جەستەی ئەو فریشتانە ببینن کە لەمێژە لەناو ناخی بەردەکاندا حەپس کراون و ئەمڕۆ ئازادییان بەدەست هێناوە... وەرن بە چاوی عەقڵ بیان بینن).

هەڵبەتە دوای تەواوبوونی پێشانگاکە (جیهانگیر) زانیبووی، کە ئەو کەسەی ئەم دێڕانەی نووسیوە لە لایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی رژێمەوە گیراوە و بێ سەروشوێن کراوە، بەو پێیەی بۆنی سیاسەتی لێهاتووە و کاریگەریی هەبووە لەسەر دەسەڵات و مەرامی دیکەی لە پشت بووە. بەو کردارەیان زۆر تووڕە ببوو. زانیبووی ئەوەی دەست ئەوان بکەوێت بەئاسان قوتاری نابێت. بۆیە خەمێکی قووڵی لێ خواردبوو. بە هەرحاڵ پێشانگاکە کرایەوە و خەڵکانێکی زۆر پێشوازیان لێ کردبوو پۆل پۆل و دەستە دەستە خەڵك هاتبوون بۆ تەماشای پەیکەرەکان پەیکەرەکەی (جیهانگیر) لەسەر مێزێکی ستیل لەوپەڕی هۆڵەکە دانرابوو خەڵك بە شەوقەوە تەماشای (جینا)یان کردبوو. خەڵکێکی زۆر دەستخۆشییان لە (جیهانگیر) کردبوو. لەنێوانیاندا

کیژێکی مامۆستا هەبوو، ئەو دەمەی هاتبووە بەردەم پەیکەرەکە و تەماشای ئەو نیگا سیحراوییەی کردبوو، لە چاوەکان و جەستەی روتی (جینا)دا حەپاسابوو و دەمودەست لە هۆش خۆی چووبوو. یەکێك لە هاورێ کچەکانی پەلاماری دابوو گرتی بوویەوە و نەیهێشتبوو بکەوێتە سەر زەوی. (جیهانگیر) کتوپڕ زۆر ترسابوو و جامێك ئاوی هێنا بوو پرژاندبووی بە دەموچاویدا و بە هۆشدا هاتبووەوە و پاش ئیستێك وتبووی (زۆر سەیرە من لەوە لە هۆش خۆ نەچووم، جەستەی روتی پەیکەرێك ببینم و پیاوان حەرامزادانە تەماشای بکەن! من حەپەساوم بۆ ئەو سیحرە قووڵەی لە چاو و زەردەخەنە و جەستەی ئەو پەیکەرەدایە، ئەوەی لەم پەیکەرەدا دەی بینم تەنیا لە پەیکەرە یۆنانییەکاندا هەیە و شتێکی ناوازەیە... لەم وڵاتەی ئێمەدا مرۆڤێك هەبێت توانیبێتی ئەم کارە بکات. من دەمەوێت بزانم کێ ئەو پەیکەرەی تاشیوە؟ بەڕاستی بە سیحرەکانی سەرسامم)! بە کەمێك شەرمەوە بە دووچاوی هەنگوینی تەڕی پڕ لە ئاوەوە (جیهانگیر) وتبووی: (خانمی بەڕێز من ئەو پەیکەرەم دروست کردووە). کە ئاوڕی دابۆوە و لە چاوەکانی (جیهانگیر) رامابوو، پاش وچانێکی کورت و وەستانەوەیەکی چرکەئاسا بە شێوەیەکی زۆر سەیر تەماشای(جیهانگیر)ی کردبوو، هەڵسابووە سەر پێ و (جیهانگیر)ی باڵابەرز لەگەڵی هەڵسابووە سەرپێ و چاوەڕوانی ئەوەی کردبوو رەخنەی توندی لێ بگرێت، بەڵام بە پێکەنینێکی سەیر و پێکەنینێکی ئاسایی مرۆڤی سەر زەوی دەستی درێژ کردبوو و تەوقەی لەگەڵ (جیهانگیر) کردبوو. وتبووی (بەڕاستی تۆ هونەرمەندێکی مەزنیت خۆشحاڵم ئەگەر بتوانم ئەو (پەیکەرەت) لێ بکڕم بەهەر نرخێك بێت، بەڵام (جیهانگیر) وتبووی (خاتوونی بەڕێز! من پەیکەر نافرۆشم. من هونەرمەندم زۆر ماندوو بووم تا ئەو کارەم تەواو کردوە روحی کارەکانم لەودا نیشان دا، من نامەوێت هەمان چارەنووسی باوکم بەسەردا بێت. ببوورە ناتوانم بیفرۆشم). ئەویش نەیزانیبوو چارەنووسی (سەرحەد) و رابردوویان چییە؟ و بە تەوسەوە وتبووی: (من خۆشحاڵ دەبم کە گوێت بۆ بگرم بزانم بۆچی نایفرۆشیت؟ ئەو نهێنییەم بۆ باس بکە). لە شڵەژان و پەشۆکاندا لە بیری چووبووەوە سەرەتا خۆی پێ بناسێنێت. ئەو تەمەنی بیست و یەك ساڵان بووە. وەك کچێکی بوویر و ئازای ئەو سەردەمە خوێندنەوەی بۆ هونەر هەبووە، پاشان بە فکریدا هاتبوو خۆی بناسێنێت. (جیهانگیر سەرحەد)یش وەك لە

حۆرییەکی راستەقینەی سەرزەمین رابمێنێت بە سووکە شەرمێکەوە لە جوانی ئەو کچە راما بوو. کچێکی باریکەلەی سپی پێستی دەموچاو مامناوەندی و بالآبەرز، بە جووتێك چاوی رەشی قەترانی و دوو برۆی کەوانەیی و پرچێکی لوول وەك لوولی پەیکەرەکە و تەنوورە و بلوسێکی هەنارەییەوە بە لێوێکی کەمێك ئەستووری پەمەییەوە بەو زەردەخەنە سیحراوییەی کە کتومت لە پەیکەرەکە چوو بوو، لەبەردەم (جیهانگیر)دا وەستابۆوە و چاوەڕوانی جوابی لێ کردبوو. لە وەڵامدا گوتبووی: (سەرەتا من ناوم (جیهانگیر سەرحەد)ە خەڵکی (شاری سێوان)ـم. لە منداڵییەوە لەسەر دەستی باوکم فێری هونەری دارتاشی و پەیکەرتاشی بووم لەدار، بەڵام دواتر پەرەم بەکارەکەم داو هەوڵم دا لەناو رەقی بەردەکانکدا مرۆڤی نەرموونیان ئەو مرۆڤانەی لەناویدا زیندانن دەریان بهێنم و هەناسەی سەر زەویان پێ ئاشنا بکەم). دەمودەست کیژەکە وتبووی: (ببوورە هونەرمەندی مەزن من ناوم (وەنەوشە مەحموود شەلەنگ)ـە. مامۆستام و حەزم زۆر لە هونەرە بە هەموو شێوەکانییەوە و چێژی تایبەتیان لێ وەردەگرم. من تاقانەم و دایك و باوکێکم هەیە لە مرۆڤی سەر ئەم هەسارەیە ناچن. زۆر پاك و بێ گەردن و سەربەستیی تەواویان داومەتێ. خۆشحاڵ دەبم بە هونەرمەندێکی مەزنی وەك ئێوە ئاشنا دەبم). بە کەمێك شەرمەوە کە سەرەتا لە مرۆڤدا دروست دەبێت و وشەکان بەباشی ناوترێن، لەو کاتەی لەبەردەم کچێکدا دەوەستیت لە دڵی خۆتدا دەیان رستەت ئامادە کردووە، بەڵام هیچیانت بۆ ناوترێت. (جیهانگیر) وتی: (خانم!، بەڵام من ئەلفوبێ لەیەك جیا ناکەمەوە و نەخوێندەوارم، کەچی هونەرێك لە ناخمدا دەژی و حەزی ئەوەم تێدا دروست دەکات کە وەك هونەرمەند مامەڵە بکەم). لە وەڵامدا (وەنەوشە) وتبووی (چۆن تۆ بتوانیت هونەرێکی وا بخەیتە بەرچاو و خوێندەواریشت نییە؟، بەڵام گرنگ نییە، زۆر جار ئەوانەی دێڕەکان دەخوێننەوە خراپترن لەوانەی ناتوانن پەڕەیەك بخوێننەوە، چونکە خوێندن زۆر جار بەڵایە و لەکۆڵ مرۆڤ نابێتەوە. کەس هەیە بتوانێت خوێندن و خوێندەواری لە بیر من بباتەوە زۆر جار لەبیرچوونەوەی هەموو شتەکانی رابردوو حیکمەتە). بە نەرمە پیاسەیەکی کەمێك سەرنجڕاکێشەوە (جیهانگیر) و (وەنەوشە خۆل) و هاوڕێییەکی (وەنەوشە) لەناو هۆڵەکەدا هاتبوونە دەرەوە و لەناو باخچەی بەردەم هۆڵەکەدا لە بن دارێکی رووتەڵی پاییزیدا، لەگەڵ ورشە ورشی خەزان و

هەڵوەرینی گەڵاکاندا، بە زەردەخەنەوە باسیان لە دنیای هونەر کردبوو، باسیان لە زمانی بەردەکان کردبوو. (جیهانگیر) باسی لەو نائومێدیانە کردبوو کە هونەرمەند سەبارەت بە دنیا هەیەتی، باسی لە مەینەتییەکانی باوکی کردبوو، کە پاش لە دەستدانی پەیکەری (سێوی حەوا) تووشی ببوو ، وای لێکردبوو کە چاوی کوێر بن و چیتر نەتوانێت رووناکی دنیا ببینێت. باسی لە سەفەری پەیکەرەکە بۆ وڵاتانی ئەوروپا کردبوو. هەموو ئەو بەسەرهاتانە (وەنەوشە)ـیان تووشی رامان و حەپەسان کردبوو. بۆیە بە (جیهانگیر)ی وتبوو: (هونەر بۆماوە نییە، بەڵام سیحرێکە هەر کەس دەستەکانی پێ بشوات چیدی ناتوانێت دەستەکانی بشارێتەوە و دەبێت پیشانی هەموو دنیای بدات). بە چیرۆکەکانی (جیهانگیر سەرحەد) سەرسام ببوو. زۆریش گریا بوو، چونکە کچێکی زۆر هەست ناسك بووە. (جیهانگیر) زۆر سەرنجی پرچی (وەنەوشە)ی دابوو سیحری لوولی پرچەکە و وەستانیان لەسەر یەك، وای لێ کردبوو بۆ ماوەیەکی زۆر لەو (گوڵە بچکۆلە وەنەوشەییە) رابمێنێت کە وەك قردێلە و تەوقە دابووی لە سەری و سیحر و ئەفسوونێکی واهەیان دابوویە لە حۆریەکانی بەهەشت بچێت. سەرەتای یەکترناسینی (جیهانگیر) و (وەنەوشە)، کۆتاییەکی تراژیدیان دروست کرد، کە رەوتێکی سەرەکی چیرۆکەکەمان پێك دێنێت، لەو یەکترناسینە و لە بەشەکانی داهاتوودا زیاتر لەگەڵی ئاشنا دەبین و ئەو کاتە ئێوەی خوێنەر و بینەرانی ئەم راستییانە فرمێسکی یاقووتی دەڕژێنن و دەڵێن: ئای ژیان چەند سەیرە و چەند پڕە لە بەیەکداکەوتنی جوانی و ناشرینییەکان....

## ٩

## (کچێك بە گریان خەم دەنووسێتەوە)
## بەهاری ٢٠٠٤

ئەو کاتەی چووینە پرسەی (ئاسمان خۆشناو مینا)، تەنیا هەفتەیەك بوو (سەهەندی بایز ئاغـا) مەنزڵگای خۆی لە گۆڕستان ئاوەدان کردبۆوە. تەنیا هەفتەیەك بوو مـاڵاوایی یـەکجاریی کردبـوو، سەفەری کردبوو بۆ دنیای یەکگرتنەوەی هێڵە جیاوازەکان. من و (کامەرانی وەنەوشە) بـە قـات و بۆینباخی رەشەوە بـە پێـوە وەسـتابووین، چـاومدان بووبوونـە گـۆمی خـوێن، بـەڵام (کامــەران) چاویلکەیەکی رەشی لە چاوان کردبوو. (کامەران) بە ئەسپایی بە منی گـوت: (شـاپووری خـەزان) ئەوە مامۆستا (خۆشـناو مینـا) نییـە)؟ مـن وتم (کامـە؟ ئـەوەی دەگـری بـا خۆیـەتی بـاوکی (ئاسمان)ـە! زۆر بە کوڵ دەگری)! بە دەست چاوەکانی دەسڕی و هێدی هێـدی دەگریـا و دەیگـوت: (هەرگیز پێم نەگوت) من و (کامەرانی وەنەوشە) تێنەدەگەیشتین مەبەستی لەو رسـتەیە چییە؟، بەڵام بوو بە پرسیارێکی سەیر لامان و دنیای لێ تاڵ کردین. دوای ئەوەی زانیان بە کـوڵ گریـاین، بەڕاستی دنیا پڕێتی لە وێنەی ناشرینی مرۆڤ و پڕە لە دڕندەیی و سیناریۆی خوێنیاوی. دەڵێم بریـا نەمان زانیایە و سەری ئەو سندووقەمان هەڵنەدایەتەوە. ئەو سندووقەی هاڵاوی جەهالـەتی پیـاوی لێ هەڵدەسێت. پیاوی سمێڵ زلی سالار و پاشای سەردەمەکان. مەبەستم لە سندووق ئەو راسـتییە بوو کە لە ژیانی (ئاسمان مینا)دا هەبوو. (خۆشناوی مینـا) بـە کـوڵ دەگریـا و دوو پیـاوی قـات لەبەری سەر ماش و برنجی دەستییان دەگرت و دەیان گوت: (ئارام بـە مامۆسـتا کـاری خودایـە، دەسەڵات نییە). دیار بوو ئەو گریانەی ئەو بـێ هـۆ نـەبوو ئـەو لەوسـەری شـتەکانی دەڕوانـی و مەبەستی نەداریی و کلۆڵی ئەو مرۆڤانەیە کە بە نەگبەتی لەدایك دەبن و دواتر دەمرن. راستە ئەو مرۆڤەی یەکەم گڕوگاڵی کرد نەگبەت بوو هەتا هەتایە نەگبەت دەبێت و خۆشی لە دنیـا نابینێـت (ئاسمانی مینا) یەکێك بوو لەو ئافرەتە ستەم دیدانەی دنیا کە بەشێکی قورسایی ئەم گۆی زەوییە، لەسەر شانی ئەوانەو تەحـەمول و توانـای قـورس و نامـەردی دنیـا ناکـەن و دەمـرن دەسـووتێن دەکوژرێن. ئافرەت ئەو رەگەزەی ژیان کە هەمیشە زوڵمی لێدەکرێت و کەس بە راسـتی گـوێ لـە ئازارەکانیان ناگرێت.

وەك ئەوەی کرمێك لە مێشکمدا بجوولێت خولیای زانینی راستییەکانی ژیانی (ئاسمان) لە مێشکمدا کەوتە جوولە جوولّ و لە دەرگای ئەو نهێنییانەمدا کە دەمویست بیان زانم دواجار مرۆڤ بەدوای هەموو شتێکدا دەگەڕێ ئەگەرچی کاری ئەویش نەبێت چاوی حەسوودی مرۆڤ هیچ کات داناخرێت و لەدەرگای زۆر شتی ترسناك دەدات کە کاری ئەو نییە.، بەڵام وەك خولیایەك حەزم دەکرد هەموو راستییەکانی دنیا بزانم من لە منداڵییەوە زۆر پرسیارم لەبارەی مردنەوە کردووە. بیرمە لەو دەمەوەی فامم کردۆتەوە و پرسیومە زۆر جار بە دایکم گوتووە: (مردن چییە؟ یانی سەفەرکردن بۆ ئاسمان؟ ) منداڵییکی زۆر بلّێ و چەنەباز بووم و هەمیشە باوك و دایکم بە پرسیارە سەیروسەمەرەکانم بێزار و بێتاقەت کردبوو. هەر ئەمەش وای لێ کردم دوو رۆژ دوای تەواوبوونی پرسەکە سەردانی ماڵی (خۆشناو مینا) بکەم و لەبارەی مەرگی کچەکەیەوە لێی بپرسم تا ئەوکاتەی لەگەڵ مامۆستا (خۆشناو) دانیشتم و قاوەیەکم خواردەوە نەم زانیبوو، کە ئەو منداڵی نەبووە و وەجاخکوێر بووە. نەم زانیبوو کە (ئاسمان) کچی راستی ئەو نەبووە و ئەو لە هەتیوخانە هەڵی گرتۆتەوە.

ئەو دەمەی مامۆستا (خۆشناو مینا) وتی (کوڕی خۆم (شاپوور) (ئاسمان) کچی من نەبوو لەراستییدا من وەجاخکوێر بووم، بەڵام بەر لە بیست ساڵ من ئەم کچەم بەخێو کردووە تا هەنووکە). من تووشی شۆك بووم وەك برووسکەی هەورە چەخماخە لە چاوەکانم بدات بۆ ئیستێك وڕو کاس دەرکەوتم وتم: (چۆن؟ تێناگەم، مەبەستت چییە؟ ) هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و ئاوڕی لێ دامەوەو وتی: (مەبەستم ئەوەیە، ئەو کچی راستی من نییە، بەڵام وەك منداڵی خۆم بیست ساڵ بەخێوم کرد و گەورەم کرد و هەموو شتێکم وەك کچی خۆم بۆ دەکرد، من هەرگیز نەمهێشت ئەو وا هەست بکات، کە هەتیوەو کچی من نییە من ئەو راستییەم لەو شاردبووەوە و نەمدەهێشت بزانێت. ئەگەر نەش مردبایە هەرگیز پێم نەدەگوت، چونکە زۆرم خۆش دەویست و قەد لێی زوویر نەبووم و نازێکی زۆریم هەڵدەگرت، ئەو لەگەڵ ئێمەدا زۆر خۆش دەژیا، بەڵام نازانم بۆ وا لەپڕدا خۆی کوشت نازانم بۆ... بۆ؟ ) زۆر بە پەرۆشەوە گوێم بۆ گرت، چاوەکانم پڕ بوون لە گریان مامۆستا. (خۆشناو مینا) بەر لە مردنی (ئاسمان) ئێمەی دەناسی، چەند جارێك (ئاسمان) ئێمەی بانگێشت کردبوو. لەبەر ئەوە (مامۆستا خۆشناو مینا) من و (کامەرانی وەنەوشە) و (سەهەندی بایز ئاغا) و (یاسەمین حوسێنی ) و (سەردار بێخەو)ی دەناسی. ئەو کابرایەکی رۆشنبیر و مرۆڤدۆست بوو. رێزی زۆری لە ئێمە گرتبوو. لەو چەند جارەدا و خوانی ناوازەیان بۆ ساز کردبووین بۆیە نامۆ نەبووم، کە چوومە ماڵیان و لەو ڤێلایەدا پێشوازیان لێ کردم

هەردووکیان زڕ باوك و زڕ دایکی (ئاسمان) لە جلوبەرگی رەشدا پێیان وتم: (کچـەکەمان زۆر خـۆش دەویست ئەو هیچ کێشەیەکی نەبووە، بەڵام دوای مردنی (سەهەندی بایز ئاغا)، پـاش هەفتەیـەك ئەمیش خۆی کوشت). ئەوان ئەو راستییەیان نەدەزانی کە مـن دەمزانـی. (ئاسمـان) (سـەهەند)ی خۆش دەویست. کۆتاییهێنانی ژیانی (سەهەند) کۆتایی (ئاسمان)یش بوو. (ئاسمـان) زوو زانیبـووی کە (سەهەند) دەڕوات بۆ دنیای شتە بزربووەکان بۆیە ئەمیش نەرزی کردبوو ئەو سەفەرە بکات.

(شوعلە نەسرەدین)ـی زڕدایکی (ئاسمان) وتی: (کوڕی خۆم، تکات لێ دەکـەین ئـەم راسـتییە بپارێزە کە ئێمە بۆت باس دەکەین). ئەگەرچی ئەو کەسی نییە و ئێمە تەنیا کەسـی ئـەو بـووین، بەڵام با روحی ئازاد بێت، تکایە). من زۆر دەگریام و ئەوانیش وەك مـن دەگریـان. ئەمـە راسـتی یەك بوو لەم وڵاتەدا دووبارە دەبۆوە مردن و سووتان و دەرمان خواردنی ژنان و کچان شتێکی سادە بوو رۆژانە دووبارە و دەبارە دەبوویەوە لەم شارەدا کە بە (شاری مێژوو)ی ناو دەبـەن چـەندین کـچ لەبەرچاوبازیەك تەلەفونێك پیاسەیەك دەکوژران و کەسیش ئـاوڕی لێنەدەدانـەوە زۆر دیاردەیـەکی سەیر بوو لەهەمان کاتدا ئاسایش بوو. دەسەڵاتیش هیچ کاردانەوەیەکی باشـی لەمـەڕ کێشـەکان نەبوو تەنیا هەندێك قسەی پووچ و بێ بایەخ نـەبێت. بـە دەسـتە سـڕەکەم چـاوەکانم سـڕی و وتم: (مامۆستا خۆشناو) تکایە ئەو راستییەم پێ بڵێ (ئەو کێ بوو؟) لە جێگای خۆی هەڵستا و هاتـە تەنیشتم و لە گیرفانیا رەسمێکی منداڵیی (ئاسمان)ی دەرهێنا و وتـی: (ئـەو کچـی ئاسمـان بـوو، کەسی نەبوو هەر بۆیە ناوم نا (ئاسمان). وام هەست دەکرد خودا بەتایبەت بۆ ئێمەی نـاردووە و لـە ئاسمان کەوتۆتە خوار). لەسەر قسەکانی رۆیشت و بە گریانەوە وتی: (ماوەیەکی زۆر بوو منـداڵمان نەدەبوو، زۆر جێگاو پزیشك گەڕاین چارەسەر نەبوو دواتر بڕیـارم دا منـداڵییك هەڵبگرمـەوە. بـە هۆی ناسیاوێکەوە سەردانی هەتیوخانەی (منداڵە ئاوریشمییەکان)م کرد کە دەکەوتـە ناوجەرگـەی شار لە نزیك (قەڵای سەوز). دایەنەکە بـەخێرهاتنی کردمـو وتـی: (مـادام دۆسـتی! منـداڵییکی جوانت دەدەمێ کە دوێنێ شەو لە کاتی بارانە زۆرەکەدا لەبەردەم هەتیوخانە فڕێ درابوو. لـە ژێـر باراندا لەناو کیسەیەکدا فڕێ درابـوو، پاسـەوانەکە لـە گریـان و نووزانـەوەی بەخەبـەر هـاتبوو ، هێنابوویە ژووری. چیی نەمابوو بمرێ، بەڵام باش بوو سەلامەت دەرچوو. پاش ئەوەی جلمان لەبـەر کرد، شیرمان دایە و گەرممان کردەوە، ئیتر هێـور بـووەوە، ئێسـتاش لێرەیـە کچـێکی چاوگەشـی خنجیلانەیە بۆ ئێوە زۆر باشە). منـیش بـە سپاسـێکی زۆرەوە قبـووڵم کـرد، بـەڵام دایەنەکـەی هەتیوخانە وتی: (مامۆستا ئەم بەستەزمانە نامەیـەکی لەگەڵدایـە، لـەناو کیسـەکەدا دانرابـوو. کاتێك منداڵەکەمان لەناو کیسـەکە دەرهێنـا نامەیـەکی لەگەڵـدا بـوو. هەنـدێ راسـتیی تێـدا

نووسرابوو کە حەز دەکەم بۆ خۆت بیخوێنیتەوە). من دەگریام و وتم: (مامۆستا (خۆشناو) چیی تێدا بوو؟ ) هەڵساو وتی: ئێستا دێمەوە. پاش نزیکەی پێنج خولەك هاتەوە و سندووقێکی بچکۆلەی کانزایی هێنا و فوویەکی لێکرد و بە کلیلێك قوفڵەکەی کردەوە و کاغەزێکی زەردی لێ دەرهێنا و وتی: (شاپوور گیان! ئەم نامەیە بیست ساڵە لەم سندووقەدا، لەژێر زەمینەکەدا هەڵم گرتووە و پاراستوومە و نەمهێشتووە کەس بیبینێت. تۆ مرۆڤێکی پاکیت. متمانەم پێتە، بۆیە ئەم راستییانەم لا باس کردیت دەتوانیت نامەکە بخوێنیتەوە، بەڵام با نهێنی بێت...نهێنی) چاوەکانم سڕی و بە دەنگییکی گڕی گریاناوییەوە وتم (بە چاوان مامۆستا ئەو هاوڕێیەکی بەوەفای ئێمە بوو... بە چاوان). نامەکەم لە دەست وەرگرت تۆزاوی بوو. سڕیمەوە و دەستم کرد بە خوێندنەوەی کاغەزەکە. لێی نووسرابوو: (ئەی ئەوەی ئەم کچە هەڵدەگرێتەوە... من کە ناوی خۆم نابەم و بکوژی دایکی ئەوم... دایکیمان کوشت لەبەر ئەوەی داوێنپیس بوو... هەندێ رەحمم هەبوو چاوەڕوانم کرد تا منداڵەکەی لەدایك دەبێت. من دوای ٤ مانگ بەوەم زانی، بەڵام دایکی ئەوم زیندانیکردبوو، نەبادا لە دەستم هەڵبێت. رۆژم دەژمارد تا دایکی منداڵەکەی دەبێت، چونکە نەم دەویست دوو کەس لەیەك کاتدا بکوژم. دایکی ئەم کچە بەر لەماوەیەك پێش ئەوەی من بزانم لەگەڵ کوڕێکی ئاشقی خۆیدا کاری بێناموسییان کردبوو. راستە ئەوان ئاشقی یەك بوون، بەڵام من دوژمنی ئەشق و ئازادیم! ئافرەت نابێ ئاشق بێت! داوێنپیسی باجەکەی کوشتنە، من رەحمم پێکرد بۆیە بە تەور کوشتم، دەبوو بە زیندوویی بیسووتێنم، بەڵام وام نەکرد، چونکە خودا خۆی لەو دنیا دەیسووتێنێت! من بە تەور دایکیم کوشت، دوای ئەوەی گریا و تکای زۆری لێ کردم کە نەی کوژم، بەڵام تەورێکی تیژم هێنا. زۆر نەبوو بە هەسان تیژم کردبوو، سەریم کردبوو بە دوو کەرتەوە و خەڵتانی خوێنم کرد و تەرمەکەیم خستە گوێنییەکی کۆنەوە و لەناو ماشێنەکەم ناو شەوێکی درەنگ لە دەرەوەی شار لەو جێگایەی خودا خۆی و من دەیزانم کردم بەژێر گڵەوە و بۆ هەتا هەتایە سەری ئەشقم داپۆشی و ئەشق و ئاسەوارەکانیم ناشت. ئەم کچەیش کە لەو بوو. لە رەحمی خۆم و سیحری چاوەکانی نەکوژرا. لە راستییدا سیحرێك لە چاوەکانیدا هەیە کە لەو کاتەدا وای کرد من نەیکوژم، هەر بۆیە بە چاکم زانی لەبەردەم هەتیوخانەکەدا فڕێی بدەم و خۆم لە ئاسەواری ون بکەم، کوشتنی ئافرەتی داوێنپیس سەروەرییە بۆیە کردم. دایکی ئەم کە ناتوانم ناوەکەی بڵێم تەمەنی بیست ساڵ بوو کە من کوشتم. شەوێك بە ناشەرعی لەگەڵ کوڕێکدا داوێنپیسیی کردبوو، نەیتوانیبوو حاشای لێ بکات و نەشیتوانیبوو بە خۆشەویستەکەی خۆی بگات من دوای چوار مانگ زانیم. کاتێك وردە وردە سکی بەرز دەبووەوە و نەیدەتوانی

بیشارێتەوە، نەشیتوانیبوو لەباری بەرێت، رۆژێك من بەمەم زانی و لە ژوورێکدا زینـدانیم کـرد. دوای تەواوبوونی نۆ مانگ و نۆ رۆژ و منداڵبوونەکەی، ئەومان لێ جیا کردەوە و منـیش دایکـیم کوشت بە تەور. ئەگەرچی ئەو زۆر جوان بوو، بەڵام داوێنپیسی هەموو جوانییەك دەسڕێتەوە. هـەر بۆیە بە خوێن جوانییەکەیم شێواند و ئاسەواری ئەو و منداڵەکەی و خۆشم ون کرد و کـەس نـازانێ کەسمان کێین؟ بۆ هەتا هەتایە ون دەبین، رەنگە رۆژێك دەربکەوینەوە...، بەڵام کەی؟ نـازانم، تـۆش ئەی ئەو کەسەی ئـەم منداڵـە دەدۆزیتـەوە دڵنیـام ناتوانیـت لێـی هـەڵبێیت ئـەو سـیحرەی لـە چاوەکانیدایە هەمیشە بە دواتەوەیە و ناتوانێت حاشای لێ بکەین، بەڵام من بە خوێن گەورە بووم، ئەو کەسانەی کە بە خوێن گەورە دەبن، دەتوانن لە هەموو رابردوویـان هـەڵبێن و ئـاوڕ نەدەنـەوە. هەر بۆیە من توانیم خۆم لەم ساوا بچکۆلەیە رزگار بکەم. مەبەستیشم لە نووسـینی ئـەم نامەیـە ئەوەیە، کە راستیی ژیانی ئەم کچە بزانن و بـەدوای هـیچ ناسـنامەیەکیدا نەگـەڕێن و سـەربردەی ژیانی بزانن... من هەڵدێم بۆ وڵاتێکـی دوور کـە کـەس نەمدۆزێتـەوە...) کـە لـە خوێندنـەوەی نامەکە بوومەوە، لەرزو تایەك دایگرتم وەخت بوو بمرم. بە کوڵ دەستم کرد بە گریان. دیار بوو بـەر لە من ئەوان ناوەرۆکی نامەکەیان باش زانیبوو.

زۆر لەمێژ بوو، ناوەرۆکی ئەو نامە خۆینینە لای ئەوان ئاشکرا بوو. ئەوانیش ئەگەرچی بـاوك و دایکی راستەقینەی (ئاسمان) نەبوون، راستە لـە تـۆو و خـوێنی ئـەوان دروسـت نـەببوو، بـەڵام هەمیشە وەك کچی حەقیقی خۆیان تەماشایان کردبوو. زۆر جار ئەو دڵۆپـە ئـاوە خاوێنـەی پێـی دەوترێت ئاوەڵە و مرۆڤی لێوە پەیدا دەبێت، مەرج نییە بۆ ناسینەوەی کۆرپەکەی خـۆت. هـەموو مرۆڤایەتی وەك دەڵێن لە تۆوی (ئادەم) دروسـت بـوون و بەسـەرزەمیندا بـڵاو بوونەتـەوە، بـەڵام هەندێ کات ئەو دڵۆپە ئاوە لە شەیتان دەکەوێتە خوار و تێکەڵی روحی بەشەڕ دەبێـت و دەیکاتـە بوونەوەرێکی دڕندەی بخۆر و بکوژ و خوێنمژ، ئەو کاتەی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤ دەکوژرێت ئەوا بـێ گومان بە لەوەی لە نەوەی ئەهریمەنەکانە و بە رێکەوت هاتۆتە سەر ئـەم زەمینـە. لـەو دەمـەوەی کوڕەکانی ئادەم دەبێتە شەڕیان، لەو دەمەوەی یەکەم دڵۆپـە خـوێن لەسـەر زەوی رژا، مرۆڤایـەتی کەوتە سەر رێچکەی ناتەبایی و ئاژاوەی جەنگە یەك لە دوای یەکەکان. دنیا گەواهیی ئـەوە دەدەن کە مرۆڤ لە پێناوی پارەو سەرمایە و زەوی و جووتبوون و پەڕینـدا، چـیها کارەسـاتێکی گـەورەی خولقاندووە!!! ئەگەرچی مرۆڤ بۆ پەیامێکی پیرۆز هاتووە و ئاشتی و خۆشگووزەرانی رەوتی رێگای بووە، بەڵام دواجار ئەو کارەکتەرەی کە پێی دەوترێت مرۆڤ، ناشرینترین و قیزەونترین کائینی سـەر ئەم هەسارەیە بووە و چەپەڵ ترین شتێك بووە کە هەموو ناشرینەکانی گـەردوون لـەودا کۆبۆتـەوە،

گەورەترین کێشەی سەر ئەم هەسارەیە مرۆڤ خۆیەتی خۆ بەر لە مرۆڤیش ئەم هەسارەیە بە ملیۆنانساڵ هەبووەو بێ کێشە بووە، بەڵام لە دوای هاتنی خەلافەتی مرۆڤ کوشتن و خوێن دروست بوون، کوشتنی مرۆڤ بە تەور شتێکە وا دەکات چاوەکانت بن بە گۆمی خوێن و هۆشت وەك بەستەڵەکێك ببێت بە سەهۆڵ.

کاتێك هۆشم هاتەوە (شوعلە نەسرەدین) ئاوی دەپرژان بە دەموچاومدا. ئاخر دیمەنێکی برووسکە ئاسایە ئەو هەموو رووداوە لەبارەی هاورێیەکی خۆتەوە بزانیت لە ماوەی چەند خولەکێکدا. مامۆستا (خۆشناو مینا) وتی (کوڕی خۆم تۆ چارەکە سەعاتێکە بووراویتەوە، ئەوەندەمان زانی کەوتیت بە لادا). بە دەسرێك دەموچاومم وشك کردەوە. هەستم دەکرد دنیا رەش دەچیتەوە لە پێش چاوم و هەموو چوار دەورم دەخولێتەوە. پاش کەمێك هێور بوومەوە وردە وردە لێڵییەکەی بەرچاوم رەوییەوە. قنج بوومەوە و سەیرێکی ئەو ژن و پیاوە پیرەم کرد، کە چەند خەمبار و کلۆڵ دیار بوون. سەیرم کرد مامۆستا (خۆشناو مینا) کاغەزەکەی دەخستەوە نێو سندووقە قاوەییە بچووکەکە و دەیوت: (شاپوور گیان تۆ وەك کوڕی خۆمانی، با ناوەرۆکی ئەو نامەیە، کەس نەیزانێت). بە دەنگییکی کزۆڵەوە وەك لە بنی بیرێکی قووڵەوە بگاتە گوێ لە ژێر لێوەوە وتم: (ئەو... یەکێك بوو لە ئێمە... یەکێك لە ئەندامانی بازنەکە، هەرگیز لە یادی ناکەم... هەست دەکەم... ئەم هەرێمە بۆنی خوێن گرتوویەتی... مەرگ هەمیشە لە پەنا گوێچکەمانە و فرسەتمان نادات... ئەو مەزن بوو... نەوەی ئاسمان و ئەستێرەکان بوو... ئێستا لە کۆشکەکەی خۆی ئاهەنگ دەگێرێت و شەرابی نەمری دەنۆشێت)... هەستم دەکرد ئەوان لەو زمانە شیعرییەم باش حاڵی نەدەبوون. (شوعلە نەسرەدین) دەیگوت: (ئاسمان)... هەمیشە لەبەرچاومدایە و لەنێو ماڵەکەمدا پیاسە دەکات و هەرگیز لەبەرچاوم ون نابێت)... بە راستی رۆژێکی پڕ نەهامەتی بوو. حەزم دەکرد بمتوانیایە لە مێژووی ژیانمدا چەند رۆژێك رەش بکەمەوە و لە هزرمدا دەریان بکەم، بەڵام ناتوانم، ئەزانی هەموو مرۆڤێك حەز دەکات چەند رۆژێك لە ژیانی لەناو بەرێت، بەڵام ناتوانێت! دواجار ئەوان رەگ دادەکوتن و بە ئاسانی وشك نابن. ئەو رۆژەی من نهێنییەکانی (ئاسمان)م زانی، یەکێك بوو لە رۆژە شووم و رەشەکان کە وایان لێ کردم بۆ هەتا هەتایە لەژێری دەرنەچم و رقم لە پیاوەتی خۆشم بێتەوە. شیکاریی هەڵەکانی مرۆڤ مەرگ نییە، مەرگ خۆی دێت و کەس دروستی ناکات دەستکاریی هێڵکارییەکانی مەرگ تێکدانی مانای مرۆڤە و هیچی تر، مەرگ خۆی دەتوانێت سەردەمی خۆی دروست بکات، نەك مرۆڤ.

کێشەی مرۆڤ لەسەر ئەم گۆی زەوییە ئەوەیە چاوەڕوانی مردن ناکات و هەمیشە دەیەوێت بەرەو لووتکەی هەموو شتەکان بڕوات و هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەم دنیایە بە تەنیا موڵکی ئەو نییە و سەروەریی خۆی تۆمار بکات، بەڵکو دنیا چرکەیەکە و بەشی هونەر و ڕەنگاوکردنی ماتریاڵەکان ناکات.

ئەگەر من سەرقاڵی گلەیی بم لە ژیانم، ئەوا ئەوکاتە منیش بێ بەرهەم و هیچم نەکردووە، بەڵکو دەبێت قۆڵ هەڵماڵم لە داهێنان و وریاکردنەوەی مرۆڤەکەی ناخی خۆم، کە نووستووە و خۆم وام کردووە ئەو قسە ناکات و ئازاد نەبێت. گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە هێندە دڵم ئەسووتێنێت گریان لە چاوانم نابڕێت و سزام دەدات. بریا من بمردمایە و ئەو ڕۆژەم بە چاو نەدیبایە وەك کەسێکی وڕ و کاس و بێ ئاگا لە دنیا و جادە و دار و بەرد و باڵندە و ئوتۆمبێل، خودا حافیزم لەوان کردبوو. بیرمە (شوعلە نەسرەدین) و مامۆستا (خۆشناو مینا) هەتا دەم قاپی حەوشەکەیان لەگەڵم هاتن و بە گریانەوە خودا حافیزیان لێ کردم. لەو کاتەدا ئاوڕێکم دایەوە، بینیم (شوعلە) خانم دەستی لەسەر دەمی دانابوو هەنسکی دەدا و، دەستییکی بۆ بڵند کردم و بیست مەترێك دوور بووم کە دوا ئاوڕم بۆ دانەوە. دواتر سەرم دانەواند و بە خەمێکی قووڵەوە بە جێم هێشتن و، سەردەمانێکی درێژ سەرم لێنەدانە و کاتێك بۆ دواجار چوومەوە بۆ لایان مامۆستا (خۆشناو مینا) لەسەرەمەرگدا بوو، گیانی دەدا.

وەك شێتێك، دەرەنگانێك گەیشتمەوە بەشی ناوخۆی (قەڵای ئاڵتوونی). بە قادرمەکاندا سەرکەوتم. هێشتا بازاڕ گەرم بوو و خەڵك لە بازاڕ بوون. دەستم برد کلیلەکانم لە گیرفانم دەرهێنا و خەریك بووم دەرگام دەکردەوە. هاوڕێکانم و دراوسێ ژوورەکان خەریکی ئامادەکردنی شێو بوون و بۆنی خواردن ئەو قاوشەی پڕ کردبوو. دەرگاکەم کردەوە و پێڵاوەکانم داکەند یەك تەختە لەسەر جێگاکەم پاڵ کەوتم و سەیری بنمیچی ژوورەکەم دەکرد. ئاگام لە خۆم نەما و کەوتمە خەونێکی قووڵەوە... بیرم چوو دەرگاکە دابخەم. لەهۆش خۆمدا نەبووم... تاقەتی هیچم نەببوو هەتا ئەو کاتەی مەلا بانگی ئێوارەی داو بڵندگۆی مزگەوتەکەی تەنیشت باڵەخانەکەمان دەنگی دەدایەوە و بانگی شێوان بوو... ئیتر دواتر ئاگام لە خۆم نەمابوو... کە بەخەبەر هاتم (کامەرانی وەنەوشە) ڕایدەوەشاندم و دەیگوت: (کوڕی باش ئەوە بۆ وا خەوتوویت، خەڵك بە ئێواران چۆن دەخەوێت! خراپە! وا دەڵێن ئیتر دەڵێن باش نییە! پاشان بۆ نەهاتیت بۆ لای من لە کوێ بوویت! هەست دەکەم شتێکی نائاسایی لە چاوە خەواڵووەکانتدا دیارە و بەمنی ناڵێیت ناشێ ئاشق بوو بیت ئەی بۆ جلوبەرگی خەوت لەبەر نەکردووە... چییە (شاپووری خەزان) باش نایەیتە بەرچاوم، ئەم خەوتنە

نائاساییە... وایە؟ )... کە سەیرم کرد دەمودەست لە جێگای خۆم قنج بوومەوە و وتم (کامەرانی وەنەوشە) ئەی ئازیزترین هاوڕێم خەونێکی سەیرم بینی... خەون... خەونێکی سەیر... لە خەونەکەمدا... (ئاسمانی مینا) و (سەهەندی بایز ئاغا)... پێکەوە بوون لە باخێکدا شوێن پەپوولە کەوتبوون و پێ دەکەنین. تاجێکی چنراوی گوڵی مۆر لەسەر سەری (ئاسمانی شین) بوو جۆرە قوماشێکی شینی سەیری لەبەردا بوو. لە تەنوورە دەچوو. (سەهەند)یش جلێکی سپی لەبەردا بوو. ئەوان منیان نەدەبینی وەك من سەیری فیلمێك بکەم وابوو ئەوان لەو باخەدا بە دوای پەپوولەدا رایان دەکرد و پەپوولەگەلی بێژمارە لەو باخچە و ئاسمانەدا دەفڕین و هەریەکە و لە رەنگێك بوو. تەنیا گوێم لە پێکەنینەکانیان بوو و هیچی دیکە. پێکەنینەکان دەنگییان دەدایەوە و بەو سەرزەمینەدا بڵاو دەبوویەوە. وا هەست دەکەم ئەوان بیری ئێمە دەکەن (کامەرانی وەنەوشە). سبەینێ رۆژی هەینییە و دەچینە گۆڕستان. ئەوان داوای گوڵمان لێ دەکەن و حەز دەکەن ببینە میوان لەلایان... سبەی دەچین... دەچین... شەوێکی درێژمان بەسەر برد و هیچم بۆ (کامەرانی وەنەوشە) باس نەکرد. کامەران پێی دەگوتم (کوڕی خەزان... چییە؟ بۆ راستییەکانم پێ ناڵێیت ئەمڕۆ شتێکی نائاسایی رووی داوە... تەنیا دەمەوێت بزانم لە کوێ بوویت؟) بە کەمێك زەردەخەنەی دروستکراوی خۆمەوە وتم: (کورە مۆرەکە... لەلای دارەکەی تۆ بووم... لە باخچەی (گوڵە ژاکاوەکان) بووم، لەبن دارەکەی تۆ، دار چنارەکە... بە تەنیا کەمێك لە دنیا رامام) کە قسەکانم تەواو کرد، کەمێك راماو وتی: (دەزانی هەموو مرۆڤێك پێویستە درەختێکی هەبێت و قسەی لەگەڵ بکات، دواجار، قسەکردن لەگەڵ گەڵای دار جۆرە ئاواز و نەشئەیەکی تێدایە، ئەندێشەکان قووڵتر و قووڵتر دەکاتەوە و دنیا، بە رەنگێکی دیکە لەبەرچاو سەوز دەبێت). قسەکانم پێ بڕی و وتم (کامەران ژیان چییە؟ زۆر جار گەڕانەوە بۆ رابردوو مرۆڤێکی نەخۆشت لێ دروست دەکات. لە ئێستادا و لە خاڵێکدا دەتوەستێنێت. رابردوو وەك ئەوە وایە سەر قاپی سندووقێکی دێرینە هەڵبدەیتەوە و بتەوێت لەو سندووقە مێژووییەدا زێڕ و گەوهەری دنیا دەست تۆ بکەوێت، بەڵام جگە لە گڵ و قوڕ هیچت چنگ ناکەوێت و مایە پووچ دەردەچیت) (کامەرانی وەنەوشە) کەمێك لە جێگاکەی خۆی جووڵاو وتی (من نازانم تۆ مەبەستت چییە؟، بەڵام گەڕانەوە بۆ رابردوو، گەڕان بە دوای سندووقدا... بۆ خۆی راکردنە لە زەمەنی ئێستا، من رابردوویەکم هەیە، ناتوانم لە ئێستای جودا بکەمەوە من بە تۆ ناڵێم رابردووم چییە، بەڵام رۆژێك رابردووی من و تۆ و هەموومان دەکەوێتە دەست تۆ و ئەوی تر و دنیا) ئەویش زۆر بە قووڵی قسەی دەکرد، من لێی حاڵی نەدەبووم، بەڵام گوێگر بووم.

کەوتنی ئادەمیزاد، لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات کە نەزانێت هـزری بەرانبـەر و مەبەسـتی راوێژەکانی چییە؟، بەڵام هەندێ جار مـن زۆر لـەوە گـێلتر بـووم کـە لـە قسـەکانی (کامـەرانی وەنەوشە) تێ بگەم، هەر بۆیە هەمیشە داوای کۆمەکم لێ دەکرد کە کەمێك سـادە بـۆم بـدوێت، بەڵام دواجار لەژێر نووری دەستەکانی ئەودا توانیم رێگایـەکی دیکـەی ژیـان بدۆزمـەوە و ئـەدەبم خۆش بوویت و حەزم لە شیعر و رۆمان و چیرۆك کرد. من ئەگەرچـی گـەلێك مانـدوو و خـەمبار بووم، بەڵام بۆ ساتێکیش لە قسەکانی هاوڕێم و نزیکترین کەسم (کامەرانی وەنەوشە) بێزار نەبووم، بەردەوام گوێم بۆ راگرتبوو بە دەنگییکی کـەمێك گـڕ و کـەمێك نـزم قسـەی دەکـرد، دەتگـوت نووسەرێکی گەورەیە و دەیان کتێبی هەیە. لە راستییدا من هێنـدە زاکـیرەم بـاش نییـە هـەموو قسەکانی بهێنمەوە یادی خۆم.، بەڵام بەدبەخت بوو، کە کەس کۆمـەکی نـەدەکرد بـۆ چـاپکردنی کۆمەڵە شیعرییکی خۆی. ئەو شەوە تا چەنەمان شل بوو بیر و رامان گۆڕییەوە، لەسەر زۆرشـت و زۆر کون و کەلەبەری دنیامان بڕی. دەنگی سەدەها جانەوەرمان بیست، دەنگی ئـازاری تـەنیاکانی شەو، ئەوانەی لەسەر شەقامەکان لەسەر پارچە کارتۆنی دۆشاو و شیر دەخەوتن و گۆرانیان دەچـڕی و ئاگریان دەکردەوە و هەیان بوو دەگریا هەیان بوو گۆرانی (حەسەن زیرەك)ی دەگوت. بـە گـۆرانی شەوگاریان شەق دەکرد و نووریان لە ئاسمان دادەگرت. شەو دەڕۆیشت و بـەیانی نزیـك دەبـووەوە و رووناکی تۆز تۆز دنیای رۆشن دەکردەوە. ئێمە هەر قسەمان دەکرد، پشـوویەکی سـەیر بـوو. لـەو جۆرە شەوانە زۆر لە ژیانیاندا دووبارە دەبوونەوە، بەڵام من هەمیشە یادم لای نامەکەی بکوژەکەی دایکی (ئاسمان خۆشناو مینـا) بـوو. هەمیشـە وام هەسـت دەکـرد کەسـێك بـە تەورێکـەوە بـە دوامەوەیە و دەیەوێت سەرم قاش بکات. هەمیشە حـەزم دەکـرد کەسـێك هـەبێت قسـەم لەگـەڵ بکات. تەنیایی روحم بەرەو دەرەوە رەوانە بکەم، نەوەك ناو خودی خۆم دواجار لە خۆم بێزار بـووم و هەستم بە مردنی روحم دەکرد. رۆژ دەبـووەوە و رووداوی نـوێ رووی دەدا بـەر لـە هـەڵاتنی خـۆر (کامەرانی وەنەوشە) هەڵدەسا و سووراحییەکی دەگرد بە دەستییەوە و دەچووە باڵکۆنەکـە و گوڵـە وەنەوشەییەکانی ئاو دەدا. گوڵەکان بۆ (کامەران) پێ دەکەنین و ماچیان بۆ هەڵدەدا. گیـان و دڵـی لەسەر گوڵەکان بوو. ئەو گوڵانە لە گوڵی سەرزەمین نەدەچوون.تـەنیا گوڵێـك دوای کردنـەوەی لـە چڵەکان نزیکەی یەك مانگ زیاتر رۆشن و جوان دەمایەوە و کامەران دەیدا لەسنگی کراسـەکانی و چاکەتەکانی پێ دەڕازەنەوە. ئەو کاتانەی دنیا گەرم بوو ئەو گوڵەکەی لەسەر سـنگی دەدا دەیکـرد بەکونی قۆپچەی کۆتایی کراسەکەیدا. زۆر جار دەیکرد بەلای گیرفانەکانیدا، هێـدی هێـدی ئـاوی دەپرژاد بەسەر گوڵەکاندا. گوڵەکان تەڕ و پاراو دەیانواند. سێ ئینجانە بـوون هەریەکـەی نزیکـەی

دووسەد گوڵی بچووکی (وەنەوشەیی) پێوە بوو. چوار وەرزی ساڵ گەش و سەوز بوون و هەرگیز وشك نەدەبوون. من تا دواجار نەمزانی نهێنیی ئەو گوڵە چییە؟ بۆ نامرێت! من هەڵسام دەموچاوم شووشت و قۆرییەکەم پڕ کرد لە ئاو و لەسەر تەباخەکەم دانا و گڕم دا و چای بەیانیم ئامادە کرد. (کامەرانی وەنەوشە) وتی: (دەبێت زوو بڕۆین بۆ سەر گۆڕستان، ئەوان لە سپییدەدا چاوەڕوانمان دەکەن، نابێ دوا بکەوین). پاش کەمێك چایی ئامادە بوو سەرو چاییمان خواردوو خۆمان گۆڕیی و پۆشاکی رەشمان لەبەر کرد. (کامەرانی وەنەوشە) چاویلکەیەکی رەشی کردە چاوەکانی و پرچەڕەشە درێژەکەی بە کەمێك کرێم دەوەستاند و گوڵێکی وەنەوشەی دا لە یەخەی چاکەتەکەی. دوو چڵ گوڵی وەنەوشەیی لە ئینجانەکان بڕیبوو، ئاڵاندبووی لە رۆژنامەیەکەوە و گرتبووی بە دەستی راستییەوە و بە دەستی چەپی چاویلکەکەی رێك دەخست. رۆژێکی بەهاریی شێدار و کەمێك گەرم بوو. جار جار پەڵە هەور بەری خۆری دەگرت و زەوی تاریك دادەهات و دواتر بای شەماڵ لە رۆژئاواوە هەڵی دەکرد و هەورەکانی رادەماڵی و دووبارە خۆر دەردەکەوتەوە. لەسەر شەقامەکە سوار تاکسیەکی چڵکن بووین. (کامەرانی وەنەوشە) لە دواوە سوار بوو. وەك پیشەی هەمیشەی خۆی، من بە شۆفێرەکەم وت (کاکی برا باژوو بۆ گۆڕستانی رۆژهەڵات). بە درێژایی رێگا من و (کامەرانی وەنەوشە) هیچمان نەوت. من لە (کامەران) خەمبارتر بووم. شۆفێرەکە هەر زانیی بۆ گۆڕستان دەچین، دەمودەست کاسێتێکی قورئانی هاویشتە سەر ریکۆردەرەکە و دەنگی دایە، ئێمەش بێدەنگ ملی رێمان گرت و لەگەڵ هەر تاسەیەکدا بستێك هەڵدەبەزیینەوە، (کامەرانی وەنەوشە) لە پەنجەرەی سەیارەکەوە تەماشای دیمەنی شەقامە چۆڵەکانی بەیانی دەکرد بەسەر شەقامە بازنەییەکەدا بەرێ کەوتبووین، شۆفێری تاکسیەکە کابرایەکی جامانە بەسەری بەتەمەن بوو. بە رەنگ و رووخساردا لە پیاوێکی بەدین دەچوو. زوو زوو دەیگوت:(یائەڵڵا) نزیکەی بیست خولەکێك بەڕێوە بووین پاشان لەبەردەم دەرگای گۆڕستان دابەزین و خوداحافیزیمان لە شۆفێرەکە کرد. بە نێو گۆڕەکاندا بە ئەسپایی هەنگاو دەرۆیشتین. نەبادا پێمان لەسەر گۆڕێك بکەوێت، نزیکەی چەند مەترێکمان مابوو بگەینە سەر گۆڕی (ئاسمان خۆشناو مینا)، لە چەتری گۆڕێك تێپەڕین، لە دوورەوە ژن و پیاوێکمان بینی. بێ گومان (خۆشناو مینا) و (شوعلە نەسرەدین) بوون. دیمەنی دوو مرۆڤی رەشپۆش و خەمبار و کزۆڵ دیار بوون. سەری مامۆستا (خۆشناو مینا) وەك بەفر سپی دەچۆوە (شوعلە نەسرەدین) سەرتاپا رەش بوو، کاتێك ئێمە نزیك بووینەوە و گەشتینە سەر گۆڕەکەی (ئاسمان) سڵاومان کرد و کامەران وتی (الفاتحە)، پێکڕا فاتیحەمان خوێند و هەردووکیان بە گەرمی بەخێرهاتنی ئێمەیان

کرد. کامەران دانەوییەوە و لەسەر گۆڕەکەی (ئاسمان) یەکێك لە دوو چڵە گوڵەکەی چەقاند. گڵەکە زۆرر نەرم بوو، بەدەست کەمێکی بۆ هەڵکەند و چڵە گوڵەکەی چەقاند و گڵکەی بە دەست کوتییەوە بە دەوری چڵە گوڵە وەنەوشەییەکەدا و هەڵسایە سەر پێ، چاویلکەکەی لە چاوی لابرد و بە دەستە سڕەکەی کەمێك چاوی سڕی، چاوەکانی سوورِ ببوون. من خۆم پێ ڕانەگیراو دامە پڕمەی گریان و بە چۆکدا کەوتم و دەستم گرت بەدەموچاومەوە هەموو بە کۆرس دەستمان کرد بە گریان دەنگی گریانمان ئاوازێکی ئەفسووناوی لە ئاسماندا دەخولقاند کە ئاوڕم دایەوە (کامەرانی وەنەوشە) لە دیمەنی ئەو چۆلەکانەی دەڕوانی کە لەسەر چلی درەختەکانی دەوروبەرمان نیشتبوونەوە و ئەوانیش دەیان جریواند، بەڵام جریوەی ئەو بەیانییەیان جیاواز بوو، نەغمەی گریان بوو (کامەران) هەر دەیڕوانی و زوو زوو چاوە گەشەکانی دەسڕی کە سوورِ هەڵگەڕابوون. ماوەی نیو کاتژمێر ئێمە لەسەر گۆڕەکەی (ئاسمان) گریاین و دواتر خودا حافیزیمان لە یەکتر کرد. هەردووکیان (خۆشناو مینا) و (شوعلە نەسرەدین) دەستی یەکیان گرت و ئەوانیش رۆیشتن، بەڵام (کامەرانی وەنەوشە) چلە گوڵەکەی تری ئالاَند لە (ڕۆژنامەکەوە) و ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆین. وتم: (کامەران ئەو گوڵەی سەر گۆڕەکەی (ئاسمان) وشك دەبێت بڕوا ناکەم سەوز بێت، گوڵ چۆن وا دەروویت)، بەڵام ئەو وتی: (سەوز دەبێت، من دەزانم تا ئێستا هیچ گوڵێکم نەڕواندوە سەوز نەبێت). بە نێو گۆڕستانەکەدا بەرەو گۆڕەکەی (سەهەندی بایز ئاغا) کەوتینە ڕێ. گۆڕەکەی (سەهەندی بایز ئاغا) دەکەوتە سەرووی گۆڕستانەکەوە. نزیکەی دوو سەد مەتر لە گۆڕی (ئاسمان) دوور بوو. هەنگاومان دەنا و (کامەرانی وەنەوشە) قسەی بۆ من دەکرد لەبارەی مردنەوە، دەیگوت: (مردن دوا وێستگەی ژیان نییە، ژیانی مرۆڤی زوڵم لێکراو، ئەو کاتە دەست پێ دەکات کە دەمرێت. ئەو دەگەڕێتەوە بۆ دنیایەکی دیکە. لەوێ روحەکان ئاسوودە دەبن و شەڕ و خوێن وجوودیان نییە، وەك چۆن ئەم گوڵەی دەستی من لەسەر خراپترین و بەدترین خاك دەروویت و خۆی دەگونجێنێت. روحەکان لەنێو ئەم گۆڕانەدا لە دنیاکەی دیکە خۆیان یەك دەخەن. من زۆر سەرسامم بە فەلسەفەکانی (سۆکرات)! ئەو زۆر جوان لەو سەردەمەی خۆیدا باسی شتە لێکدژەکانی کردووە. (شاپووری خەزان) تۆ دەزانی ئەو هەمیشە وتوویەتی: (هەموو دوو شتی دژ بەیەك بە دوای یەکتردا دێن، هەرووەك چۆن ژیان و مەرگ و مەرگ و ژیان). تەماشا بکە، لەناو ئەو گۆڕەدا تەنیا جەستەیەك راکشاوە، بەڵام روحی لە دنیایەکی دیکەیە)، گەیشتینە سەر گۆڕەکەی (سەهەند). دنیا زۆر کشومات بوو. وردە وردە خەڵك دەهاتن بۆ سەر گۆڕستان و ئەو ئارامییەیان دەشێواند و گریان و زەنا زەنا دەستی پێ دەکرد. (کامەرانی وەنەوشە)، ئاخێکی

قوولّی هەڵکێشا و وتی: (سڵاوت لێ بێت، هاوڕێی ئازیزم، ئەی جەستەی جوانـە مـەرگ و ناکـام، تۆ گوناحێکت نەبوو) گوڵەکەی لە جەریدەکە دەرهێنا و دەستی کرد بە لادانی گڵە نەرمەکەی سەر گۆڕەکە و چڵە گوڵە وەنەوشەییەکەی چەقاند و گڵەکەی دەکردەوە سەر گۆڕەکە و، دەگریـا. هەسـتم دەکرد دڵۆپە فرمێسکەکانی دەکەوتنە سەر گۆڕەکە و گڵکەی تەڕ دەکرد. منیش بە کوڵ دەگریـام، بەر لەوەی ماڵی (سەهەند) باوك و دایکی و خزمەکانیان بێن بۆ گۆڕستان، ئێمە پەلەمان دەکـرد و دەڕۆیشتین. (کامەرانی وەنەوشە) وتی (بڕیار دەدەم جوانترین شیعرییك کـە لـە هزرمدایـە لەسـەر کێلی گۆڕەکەی (سەهەند) بنووسم. ئاخ ئەشـق چـی بـە ئـادەمیزاد دەکـەی، ئـاخ دیانـەت، ئـاخ (ئاروویـن) ئەوکاتـە مـن چـیرۆکی (ئـاروویـن ئیسـحاق)م چـەندین جـار زانیبـوو، بـەڵام هـەرگیز نەمانتوانی بوو بەکەس بڵێین تەنیا من و (کامەران) ئاگـاداری بـووین. لـە کۆلێـژی ئێمـە کـەس نەیدەزانی، بەڵام ڕۆژێك من چووم بۆلای (بایز ئاغا) و هەموو ڕاستییەکانم بۆ باس کـرد... ناچـار بووم وا بکەم... دەبوو بیکەم.

## ١٠

## بۆنی سێو کاسی کردم

## بەهاری ١٩٨٣ تا بەهاری ١٩٨٨

(وەنەوشە مخۆل شەلەنگ) تەنیا سێ مانگ بوو لە شاری (سێوان) نیشتەجێ ببوو. ساڵێك دوای مێردکردنی، مێردەکەی بە سەرباز گیرابوو، چونکە ئەو کاتە ڕەوشی ناوچە سنوورییەکانی شاری (سێوان) زۆر خراپ بوو. عێراق خۆی خستبووە شەڕێکی ماڵوێرانکەری درێژەوە، ماوەی سێ ساڵ بوو شەڕ و جەنگ بەرپا ببوو. هێزەکانی ئێران هەموو دەمێك ناوچەکانی عێراقیان بۆردوومان دەکرد. ئیدی ئەوە جەنگ بوو تەڕ و وشکی پێکەوە دەسووتاند. ڕژێمی عێراق لەبەر پێویستیی زۆری بەسەرباز هونەرمەند و گۆرانیبێژ و دارتاش و فەقێ و ئاسنگەر و چی و چی نەدەناسی و دەیکردن بە سەرباز و ڕەوانەی سەنگەرەکانی دەکردن. مێردەکەی (وەنەوشە) ساڵێك بوو گیرابوو بە سەرباز و هیچ سەر و سۆراغێکی نەبوو. ئەو دەمە (وەنەوشە مخۆل) دووگیان بوو. هێدی هێدی سکپڕییەکەی لێ دەردەکەوت، بەڵام لە قوتابخانەی (گوڵان)وەك ژنێکی گورج و ئازا هەر وا دەرسی خۆی دەگوتەوە و نەوەکانی کوردی فێری خوێندن دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا وەك کەیبانوو خزمەتی خەسوو و خەزوری دەکرد و ڕێزی لێدەگرتن و دڵنەوایی دەدانەوە. (سەرحەد)ی پیری کوێر بە دار عاساکەیەوە کۆڵانەکانی شاری (سێوان)ی دەبڕی و لە تاریکییی دەڕوانی. (ریحانە) کاری تەشی ڕستن و دروستکردنی بەرماڵ و لفکە بوو. خەسوو و خەزورێکی بێ گوناه و پاك بوون و خانەوادەیەکی خۆشبەخت دەژیان، بەڵام لە خەمی گەڕانەوەی (جیهانگیر)دا دەسووتان. ئاخرییەکەی تەنیا نامەیەکی (جیهانگیر) دەگەیشتە دەست (وەنەوشە). ئەگەرچی خوێندەواریی نەبوو، بەڵام لە نامەکاندا باسی ڕەوشی خراپی جەنگی دەکرد و دەیگوت: (لە خراپترین باردا هاوڕێیەکم ئەم نامەیەی نووسیوە بۆم). جەنگ بەردەوام بوو. شارەکان کاول دەبوون. گرمەی خومپارە و تۆپ و فڕۆکە جەنگیەکان دەگەیشتە ئەو پەڕی دنیا و دنیا سوور دەچۆوە. خەڵکانێك شاریان چۆڵ دەکرد و زۆریش لە خەڵك دەمانەوە. مانەوەی خەڵك قارەمانێتی بوو. هەندێك کات ڕەوشی شارەکە ئارام دەبووەوە و خەڵك لە گوندەکانی دەوروبەرەوە دەگەڕانەوە و درێژەیان بە ژیان

دەدا. ژیانێکی سەیر بووە خەڵك تێیدا ژیاون، وێرانبوونی وڵات کاتێك دەستی پێکرد کە هێزەکانی ئێران جار جار نزیك دەبوونەوە و بۆردوومانی شاریان دەکرد.

بەهاری چی! گوڵ و گیا و درەخت سوورِ بوون. گوڵەکان دەگریان و ئاسمان شینی دەگێڕا. بەڕاستی مرۆڤ دڕندەیە. چەکی جۆراوجۆر دروست دەکەن و یەکتری پێ دەکوژن، لە پێناوی هاوکێشەیەکی نادروستدا، خوێنڕشتن مرۆڤی ناشرین دەکرد، ماناکانی مرۆڤبوون بە پووشێك. وەك یەکێك لە هاورێ سەربازەکانی جەهانگیر باسی جەنگ دەکا و دەڵێ: کاتێك بە مۆڵەت دەگەڕێتەوە هیچی پێ نییە بیداتە دەست (وەنەوشە)، جگە لە مەدالیا زیوییەکەی ملی (جیهانگیر). ئەو مەدالیایەی تایبەتە بە سەربازەکان و ناو و تەمەن و هەندێك شتی تایبەتی لێ نووسراوە. دروست نازانم چی لێ نووسراوە، بەڵام ئەو سەربازەی هاوڕێی (جیهانگیر) کە ناوەکەی نازانم و لە هیچ یەك لە بەڵگەکاندا دەستم نەکەوتووە، باسی ئەوە دەکات کاتێك لە یەکێك لە هێرشەکاندا بریندار دەبێت (جیهانگیر) لاقی گوللەی بەردەکەوێت، لە سەنگەرەکەدا بەرگری دەکات. خۆی نازانێت بەرگری لە چی دەکات و بۆچی دەجەنگێت، دواجار جەنگ مەودای بیرکردنەوەی سەرباز تەسك دەکاتەوە و مۆڵەت نادات هیچ بڵێت. ئەمان پانزە کەس دەبن و بەرامبەر تانك و زرێپۆشەکانی سوپای ئیسلامیی ئێران دەجەنگن. لەناو سەربازگەیەکی بچووکی ناوچە سنووریەکاندا هەموویان دەکوژرێن و (جیهانگیر) بە سەختی لاقی دەپێکرێت، بەڵام داوا لە سەربازەکەی هاوڕێی دەکات کە ئەو مەدالیایە بداتە دەست (وەنەوشە). هەر کات بە سەلامەتی گەیشتە شاری (سێوان)، بەزۆر داوای لێدەکات کە ئەو هەڵبێت و ئاوڕ نەداتەوە. سەربازەکە وتویەتی (هەتا مەودای سێ سەد مەتر دوور کەوتمەوە و ناوە ناوە ئاوڕم لە (جیهانگیر) دەدایەوە، شەڕی دەکرد و فیشەکی دەتەقاند، تا دوا فیشەك ئاگادار بووم و هەڵاتم بەناو دارستانێکدا ئیدی نازانم (جیهانگیر) چی بەسەر هات. سوپای ئێمە لەو هەڵمەتەدا شکستی خوارد و نەمتوانی بە هیچ شێوەیەك بگەڕێمەوە. هەموو جەستەم لە خوێن و رەشی باروتی سووتاو هەڵکشابوو. هەر رامدەکرد بەنێو دارستان و ناوچە سەختەکانی سنووردا، هیچ ئاسەوارێکی ئادەمیزادم بەرچاو نەدەکەوت، جگە لە ئاسەواری جێگا تۆپ و هاوەن و گوللە. هەموو ئەو سەرزەمینە تێکڕا بۆردوومان کرابوو. هەندێك جار هاوەن و تۆپ لە نزیکم دەکەوت و وردە بەردوو دارو خۆڵ هەموو جەستەمیان بێژابوو. وام هەست دەکرد کە لە چاوی هاوێنەکانی ئەوانەوە دەبینرام، هەر ئەوەندەم دەتوانی بە هەموو هەرەکەتی خۆم هەڵبێم. ئیدی ئاسەواری (جیهانگیر)م نەدییەوە. گەیشتمە شوێنگەیەکی سەربازیی هێزەکانی خۆمان، هیچ کەسی تێدا نەبوو. جگە لە قەوانی گوللە تۆپ و

فیشەك و كیسە گڵی هەڵچنراو، خوێن لەناوچەكە دەچۆڕا. خەریك بوو لە تینوویێتییـان دەخنكـام. وەك دڕندەم لێهاتبوو. هەركەس لەو كاتەدا بیبنمایە لێم دەتۆقی. لە دڕندەیەكی مرۆڤخۆر دەچـووم و بە دوای نێچیر كەوتبووم. وا دەهاتمە پێش چاو، لە گۆلێكی ئاوی قوڕاویدا كـەوتم و تێـر قـوڕاوم خواردەوە. سەرزەمینی زۆرم بینی، بەردەوام هەڵدەهاتم لە دوورەوە دیمەنی ئاوەدانییەكم بینی، كات شەو بوو. دنیا تاریـك بـوو. وەك قەلـەڕەش دیمـەنی چـرا و رووناكیی گونـدێك لـە پـێش چـاوم دەردەكەوت، هێنـدەم خـۆش بـوو رووناكیی لایتێكـی تونـدم كەوتـە سـەر و هاواریـان لێكـردم (بووەستە). لە جێی خۆم وەك نەمام چەقیم و دەستم خستە سەر سەرم. دیتم دوو زەلام لـێم نزیـك دەكەوتنـەوە هاوزمـانی خـۆم بـوون. وتیـان (كێیـت زەلام؟) دەمـم گـۆی نـەدەكرد هـیچ بڵـێم. تفەنگەكانیان خستە سەر سەرم و وتیان (كێیت زەلام، تـۆ كێیـت؟ ) هەرچـۆنێك بێـت، كـەمێك ترسەكەم رەوییەوە، چونكە زانیم نزیكم لەناوچەكەی خۆمان و هاوزمانی خۆمانن، بـە شـێوەیەكی پچـڕ پچـڕ و كـز وتم (مـن سـەربازم؟) خـەڵكی شـاری (سـێوان)م، لەشـەڕ هـەڵهاتووم. تێكـڕا سەربازەكانمان كوژران تەنیا من دەرباز بووم و لە دەستی پاسدارەكانی ئێران هەڵاتووم). دەسـتبەجێ كە زانیان راست دەكەم و لـە مەبەسـتم حـاڵی بـوون، هاتنـە ژێـر بـاڵم و بردمیانـە یـەكێك لـە سەربازگەكانی نزیك (شار) و پێشانی فەرماندەكەی خۆیانیان دام و راستیی باسەكەم بۆ گێڕانـەوە. پاشان بە ئوتۆمبێلێكی تایبەتی سەربازی گەیاندمیانە شاری (سێوان) و وتیان بۆ ماوەیـەك پشـوو بدە، ئەوە بەسەرهاتی من بوو، ئێستاش ئەم مەدالیایەم پێیە بۆ تۆ).

بەم شێوەیە سەربازە هەڵاتووەكە هەموو چیرۆكەكەی بۆ (وەنەوشە) گێڕابۆوە و هـەموو دایانـە گریان و بڕیاریان دا پرسە بۆ (جیهانگیر) بگێڕن. ئەگەرچی روون نەبوو كە كوژراوە یان نـا... هـەر لە رۆژی یەكەمی پرسەكەدا (سەرحەد)ی هونەرمەند و داهێنـەر و دروسـتكەری پەیكـەری لـەدار دروستكراوی (سێوی حەوا)، (سەرحەد)ی كـوێری نابینـا بـەلادا دەكـەوێت و لـە حەژمـەتی بـێ سەروشوێنبوونی كوڕە تاقانەكەیدا گیانی دەردەچێت و روحی ئازای رێگایەكی دیكە بـەرەو ئاسمـان دەگرێتە بەر و دەڕواتەوە بۆ ئەو جێگا و سەرزەمینەی (سـێوی حـەوا)ی لێـوە هـاتووە و لـەوێ را تێكەڵی رووبارەكانی بەهەشت دەبێتەوە. دواجار مرۆڤ دەمرێت و ئاوڕ ناداتەوە. سەرسەختیی مرۆڤ لەوەدایە كە بیر لە مردن ناكاتەوە. حەزی زۆری ئادەمیزاد لـە مـردن دەگەڕێتـەوە بـۆ بێبایـەخیی سەرزەمین و نا دروستی سروشت، ئەو دەمەی (سەرحەد) مرد و بە یەكجاری سـەفەری ئەبەدییـەی خۆی دەست پێكرد و بەدوای (پەیكەری سێوی حەوا) كەوت هێشتا لە تەمەنی پەنجا و نۆساڵی دا بوو، بەڵام پیری و گەنجی شتێكی دنیاییە و هیچ گرنگییەكی نییە، كلۆڵی عەقڵی مرۆڤ ئـەو كاتـە

دەست پێ دەکات کە لەبەردەم ئاوێنەدا دەست بۆ پرچ و ریشی خۆی دەبات و دەڵێت: (بەخوا پیر بووم) مرۆڤ هەرگیز پیر نابێت ئەوەی کە چرچ دەبێت و لاواز و لەرزۆك دەبێت تەنیا رووکاری دەرەوە و رووخسارە و هیچی دیکە، بەلاّم لەناو هەر مرۆڤێکدا مرۆڤێکی دیکە هەیە هیچ کات پیر نابێت و نووستووە تەنیا یەك چرکە بەخەبەر دێت و دواتر بە یەکجاری سەفەر دەکات و لەناو جەستەیەکی دیکەدا دەردەکەوێتەوە، دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ ژیان، ئەوە مرۆڤە گەمژەکانن بڕوایان بە پیری هەیە و هەمیشە لەم جۆرە قسانە دەکەن دەڵێن: (بەڕاستی عەیبە ئەو کارە بکەم من سەرم سپی بووە و پیر بووم) ئەمە هاوکێشەیەکی هەڵە و کوشندەیە و روحی ئەفراندی شتە جوانەکانی ناو ئینسان دەکوژێت، ئەگەرچی ئەوەندەی مرۆڤ ناشرینییەکانی دەخاتە روو نیو هێندە کار لەسەر شتگەلی جوان ناکات، بەهەر شێوەیەك بێت جەستەی پیر بووی (سەرحەد) لە گۆڕستان بە ئارامی بەخشراو بۆ دواجار سەفەری دوورو درێژی خۆی دەستی پێکرد، پاش پێنج مانگ و لە شەوێکی گەرمی هاویندا (وەنەوشە) ژان گرتیی و (کوڕێکی جوانی بوو) ئەو کوڕە (کامەرانی وەنەوشە)یە یەکێك لە پاڵەوانە سەرەکییەکانی چیرۆکەکەمان راستە، زۆرینەی رووداوەکانی ئەم کتێبە باس لەدایك بوون و مردن دەکات بەهەر هۆکارێك دواجار ئەوە گەمەیەکی ئەبەدی ژیانە و لە خاڵێکدا دەست پێدەکات و لە خاڵێکی دیکە سکوت دەکات، بەلاّم رووداوی بێ پایان و نەبراوە لەنێوان ئەو دوو خاڵەدا روودەدات و کۆکردنەوەیان و ریز کردنیان چیرۆك و رۆمانی زۆر دروست دەکات، هەر کووچەیەکی ئەم هەرێمە تەی بکەیت سەدان رۆمان و چیرۆك بەرهەم دەهێنێت، ئێمە هەوڵمان داوە ئەو رووداوە سەرەکی و لاوەکییانە باس بکەین کە سەروکاریان لەگەڵ رەوتی چیرۆکەکەماندا هەیە راستەوخۆبێت یان نا راستەوخۆ، بەلاّم بە شێوەیەك لە شێوەکان خاڵ گەلی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە و هەریەك لەو رووداوانە تەواوکەری ئەوی دییە.

(وەنەوشە) لە ماڵێکی خنجیلانەی کوردەواریدا لە شاری (سێوان) دەمێنێتەوە و خۆشەویستی بۆ ئەو شارە سەوزە خنجیلانە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەگەڵ (جیهانگیر)دا دوای پەیوەندیەکی قووڵی خۆشەویستی، خانوویان بنیات ناوەو چوونەتە ناو ژیانی یەکدیەوە ئەو بە هەناسەیەکی ئەو شارە ژیاوە و بڕیاری داوە تا دوا هەناسەی لەو شارەدا بمێنێتەوە و چیدی بە جێی نەهێڵێت و هەموو کاتێك بیر لە یادگاریەکانی رابردووی خۆشەویستی خۆی بکاتەوە.

زۆر سەیرە پەیوەندی نێوان (جیهانگیر سەرحەد) و (وەنەوشە شەلەنگ) مەبەستم پەیوەندی خۆشەویستییان درێژتر بووە لە پەیوەندی خێزانداری و ژن و مێردایەتیان رژێمێکی سەرکوت کەری شەڕ خواز هەزاران پەیوەندی لەو شێوەیەی کۆتا پێهێناوە، رەوشی سیاسی ئەو سەردەمە بوواری

بەوان نەداوە خانەوادەیەکی هونەری لەسەر بناغــەی خۆشەویســتی دروسـت بکـەن و بــە تراژیــدیا کۆتایی پێهاتووە، نەگبەتی مرۆڤ ئەوەیە زەمانێك خۆشەویستی راستەقینە بکـات کـە چـەکوش و چەك زاڵ بن بەسەر دنیادا و سەردەمی سەرهەڵدانی خوێن بێت، دواجـار خۆشەویسـتی ئــەو کاتــە یەکسانە بە سفر کە سەردەمێك بژیت شەڕ حوکم بکات.

شەڕ هەموو جوانییەکان هەڵدەتەکێنێت یەکێك لەو نموونانە ئەوە بوو کە باسم کرد، (وەنەوشە) هەمیشە لە چاوەڕوانی دا بووە و لە مەرگی (جیهانگیر) دڵنیا نەبوو، چـونکە بــە گوتــەی هــاوڕێ سەربازەکەی بە چاوی خۆی نەیبینیووە کە (ئەو) بکوژرێت، هەمیشە لە خەیاڵی ئــەوەدا بــووە کــە (جیهانگیر) ماوە و رۆژێك لە رۆژان دەگەڕێتــەوە ئــەو هــەموو کـات بــە (ریحانــە بـارام) دایکــی (جیهانگیر)ی وتبوو (خەم مەخۆ ئەو دیلــە و دەگەڕێتــەوە)، بــەڵام گەڕانــەوەی چــی؟ (وەنەوشــە) هەمیشە لە خەونی ئەوەدا بوو چەندین جار بەدەم خەوەوە راچڵەکی بوو کە (جیهانگیر) دەگەڕێتەوە و بەڵام ئاسەواری ئەو هەر دیار نەمابوو بە یەکجاری ئەوی نەیبینییەوە.

زەمانێکی زۆری بە خەیاڵی گەڕانەوەی (جیهانگیر) بەســەر بردبــوو، بــەڵام بــێ ســوود ببــوو شەوێك لە خەونیدا، پیاوێك بە جلی سپییەوە هاتبوو بۆ ماڵەکەی و وتبووی من (جیهــانگیر)م بــە ریشێکی درێژی ماش و برنجییەوە، پاش کەمێك رامان (کامەران)ی فڕاندبوو هەڵاتبوو (وەنەوشــە) لە عەزرەتدا راپەڕی بوو یەك بە دنیا قیژانــدبووی و وتبــووی (کامــەران)، (ریحــان) خــانی دایکــی (جیهانگیر) بە کۆمە کۆم گەیشتبووە سەر (وەنەوشە) و دڵنەوای زۆری کردبوو.

ژیانێکی پڕ چەرمە سەری ژیابوو لە ساڵانی جەنگدا هیچ جوانییــەك شـکۆفە ناکـات، ئــەوان تەنیا لەگەڵ خەم و پەژارە ژیا بوون و درەختی خەمیان رواند بــوو (وەنەوشــە شــەلەنگ) زۆرینــەی کاتەکانی بە پاکژ کردنەوەی پەیکەرە دەســت کردەکــانی (جیهــانگیر)ەوە تــەرخان کردبــوو، لــەنێو هەموویاندا هەموو کات بەسەر (پەیکەری جینا)دا گریا بوو، ئەوان لەژێر نــووری ئــەو پەیکــەرەدا پەیوەندی خۆشەویستی و پەیمانیان بەست بوو، هونەری نــاوازەی دروســت کردنــی ئــەو پەیکــەرە و سیحری پرچی لــوول و جەســتەی نیــوە روتــی (جینــا) (وەنەوشــە)یــان شــەیدای چــاوە تــەڕەکانی (جیهانگیر) کرد و زنجیرەی پەیوەندیەکانیان درێژەی پێدرا، هــەر درێــژکراوەی ئــەو پەیوەندیــە بــوو بەرهەمی (کامەرانی وەنەوشە)ی لێکەوتەوە ئەو کوڕە بلیمەتە زیرەکەی لەناو دێــڕی کتێبەکانــەوە ئەفسوونی دەردەهێنا و هاوڕێکانی فێری وانەکانی ئەشــق و نــوێ بوونــەوە دەکــرد، بەهــەرحاڵ بــا بازنەدەم بۆ داهاتوو لەسەر رەوتی گێڕانەوەکەی خۆم بەردەوام بم و بێ وچان ئەم چــیرۆکە بگێڕمــەوە و ئێوەی پێ ئاشنا بکەم چونکە هێشتا زەمەنی زۆری ماوە و کارەساتی قورس لەمــەو دوا دەســت

پێ دەکات وەك لەسەرەتاوە وتم ڕووداوەکان وەهابوون وەك پچڕانی پەتی تەزبیح وەهابوون چۆن دەنك دەنك بە دوای یەکدا بەردەبنەوە و هەریەك و دەڕواتە جێگایەك هێچیان لەلای یەکەوە ناوەستن دواتر خاوەن تەزبیحەکە هەر بۆ خۆی یان بە هاوکاری چەند کەسێك کۆیان دەکاتەوە و لە پەتێکی تازەی دیکەی هەڵدەکێشێت، واتە من وەك خاوەن تەزبیحەکە وام و بە هاوکاری چەند لایەك ئەم ڕووداوانە لەدوای یەك دادەنێم، بەڵام هەندێ جار پاش و پێشیان دەخەم بۆ جوان کردنی گەمەکە و یاری کردنم بە ڕەگەزی کات.

کات ئەو پێکهێنەرەی من لەناوی دا گەمە دەکەم و ناگەمە هیچ کەناریك... نازانم بۆ؟ چونکە دواجار کات ئەو هێڵە ڕاستەیە و بەردەوام بەرەو رابردوو بەرەو داهاتوو درێژە و کۆتای نایەت، ئەوە ئێمەین توانای بڕینی ئەو هێڵە درێژەمان نییە، کە پێی دەوترێت کات.

لە ساڵانی جەنگی عێراق و ئێراندا بە هەزاران کوژراو ڕۆژانە لە مەیدانەکانی جەنگەوە دەهێنرانەوە بۆ شارەکانی عێراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی پشکی باشی لەو کوژراوانە بەرکەوتبوو سەربازی سەربڕاو قاچ و دەست بڕاو هەبوو ریخۆڵەی لە سکی هاتبووە دەر و دەستی بە سکیەوە گرتبوو هەبوو قاچەکانی بە دوای خۆیدا رادەکێشا هەندێك لە سەربازەکان هێشتا نیوەی باڵیان بە جەستەیانەوە مابوو وەك بەندۆڵی کاتژمێر هاتوو چۆی دەکرد لەمبەر بۆ ئەو بەر، سەرزەمین ڕەنگی سووری دەنواند و ژیان لەوپەڕی خراپیدا ببوو، ساڵ دەڕۆیشت و جەنگ هەر بەردەوام بوو هەندێ جار جەنگ دەوەستا و پاشان نەعرەتەی تۆپ و خومپارەکان دووبارە سەریان هەڵدەدایەوە. خەڵك لەبەر چراو مۆم ڕۆژیان دەکردەوە. زۆرینەی وێستگەکانی کارەبا لەلایەن ڕەسەدەکانی وڵاتی دراوسێوە بۆردوومان کرابوون. ژیان بەو شێوەیە بوو. جەنگ هەموو جوانییەکانی کوشتبوو وڵاتێکی خوێناوی بوو مەرگ لە هەموو لایەکەوە شاڵاوی دەهێنا و تا نزیك روح دەهات و لەگەڵیدا دەکەوتە زۆرانبازی و دواجار دەدۆڕا و بەرەو زێدی خۆی دەگەڕایەوە، مەرگ هەرێمێکی وێنە کردبوو بەدەست و پەنجەی خۆی کە کاڵ بوونەوەی مەحاڵ بوو، لەناو ئەو هەرێمەدا (وەنەوشە) کوڕە تاقانە هەتیووەکەی بە خێو دەکرد، دوو ساڵ بەسەر لەدایکبوونی (کامەران)دا ڕۆیشتبوو، دەیکردە سێ ساڵ لە بێ سەروشوێنبوونی (جیهانگیر)ی مێردی، بەڵام لەناو خزمان و هاوڕێکانیدا (کامەران) نازناوی وەنەوشەیی دایکی هەڵگرتبوو. هەموو کات (وەنەوشە مخۆل شەلەنگ) بانگی دەکرد. (کامەرانی وەنەوشە)، هەر لە منداڵییەوە گوڵێکی وەنەوشەیی هاوڕێی بوو، ئینجانەی گوڵە وەنەوشەییەکانی دایکی بە ماڵەکەدا بڵاو ببۆوە. چیرۆکی ئەو گوڵە وەنەوشەییە کارێکی دژوارە و ڕەنگە خەڵکی سەردەمی ئێستا بڕوای پێ نەکەن، بەڵام

ئەوە راستییەکی حاشاهەڵنەگر بـوو لـەکاتی خۆیـدا باسـی دەکـەم و دەگەڕێمـەوە سـەری، بـەڵام کامەران منداڵ بووە، بـە گاگۆڵکـە دەسـتی بـۆ ئینجانـەکان بـردووە و پەپوولـەکانی لەسـەریان هەڵفڕاندوە، چیرۆکی ئەو ئینجانە گوڵانە لەشاری (سێوان) چیرۆکێکی دیار و بەرچاو بوو. ئەو شارە ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی حەفتا هەزار کەس بووە. هـەموو یـەکێك لەوشـارە ئـەو چـیرۆکەی زانیوە و ماڵی (جیهانگیر)یان زانیووە، بەر لە هاتنی (وەنەوشە) بۆ (شاری سێو)، هەموو خـەڵکی ئەو شارە لە سیحری هونەرەکەی (سەرحەد) و کوڕەکەی شارەزا بوون، تەنانەت ناوبانگی ئەوان بـە هەموو وڵات و بگرە وڵاتانی دراوسێدا بڵاو ببووەوە. بەڵگەش بۆ ئەوە کارە ناوازەکانی (سـەرحەد) و (جیهانگیر) بوو (سێوی حەوا) و (جینا) دوو نموونەی زۆر ئەفسووناویی کارە پەیکەرتاشـینەکانی ئەوان بوون لە دوو سەردەمی جودادا. هەر ئەو پەیکەری (جینا)یە بوو دیواری ئەشقێکی ئەبـەدیی لەسەر ئەم زەمینە بنیاد نا و بەشێکی هەرە سەرەکیی ئەم چیرۆکەی دروست کرد.

بەڵام لە دوای نەمانی باوك و کوڕ، ئینجانە گوڵە وەنەوشەییەکانی (کچەکەی شـەلەنگ) بـووە بنێشتە خۆشەی ژێر ددانی خەڵکی شاری (سێوان). هەموو خـەڵك بـە تاسـەوە باسـی ئـەو گوڵـە وەنەوشەییە ناوازە گەشە جوانە دەم بە پێکەنینانەیان کردبوو. وەك خۆم دواجار بینیم نموونـەی ئـەو گوڵانە بێ وێنە بوون. بەڕاستی ئەو گوڵانە پێدەکەنین جۆرێك لە پێکەنین لـەناو پـەڕەی گوڵەکانـدا هەبوو کە دەنگیان دەگەیشتنە گـوێ، بـەڵام هـیچ کـات دەنگییـان ئەوەنـدە بـەرز نـەبوو، کـە گوێچکەی ئینسان ئازار بدەن، بە ئاوازێکی هارمۆنیی نەرم و نیان دەگەیشتنە گوێ.

لە هەیوانی ماڵەکەیدا چەندین ئینجانە گوڵی دانابوو. بەیانیان زوو گوڵەکانی ئـاو دەدا لەگـەڵ گەورەبوونی (کامـەران)دا ژمـارەی گوڵـەکانیش زیادیـان دەکـرد. (وەنەوشـە) بـەدەر لـە کـاری مامۆستایی، ئینجانەی گوڵی دروست دەکرد و گوڵی نوێی دەچاند. ئەو گوڵانە لە هـیچ جێگایـەك نەدەڕوان، ئەگەر دەستی وەنەوشەیان بەرنەکەوتبایە. هەر ئەو دەیتوانی ئەو گوڵانە بڕووێنێت. هـیچ کەس لـەو نهێنییـەی نـەدەزانی، بـەڵام چـیرۆکەکە سـەرزارەکی بـڵاو ببـۆوە. ئـاخر سـەیر بـوو لەسەردەمێکی خوێنیندا و لە جەنگدا کەسێك خزمەتی گـوڵ بکـات و ژمـارەی گوڵـەکانی زیـاد بکات. خەڵك لە رۆژانی شەڕدا تەنیا بیر لە راکردن و مەرگ دەکەنەوە، بەڵام ژنێکـی کـورد دێـت گوڵ دەڕووێنێت! چ گوڵێك! گوڵی وەنەوشەیی سیحراوی! حـەزی لەبنـنـەهاتووی ئـەو بـۆ گوڵـەکان دێرینە بوو. پەیکەری (جینا)ی لە حەوشەکەدا دانابوو، بەهەر چـواردەوریدا بـە گـوڵی وەنەوشـەی رازاندبوویەوە.

ماڵێك سەراپا لە گوڵ لە هەرێمێکی خوێنیندا مایەی سەرسوورمان بوون، زۆر جار خومپارەکان وەك دڵۆپە باران بەسەر شاردا دەکەوتن و خەڵك لەسەر جادەکان دەکەوتن و دەبوونە قوربانی، بەڵام گوڵەکان هەر بەردەوام بوون لە ژیان و گەورە دەبوون. (کامەران) گەیشتە تەمەنی پێنج ساڵی و لە گەمەکردنی خۆی بەردەوام دەبوو. کوڕێکی سپییکەڵەی قژ ڕەشی جوانی لێ دەرچووبوو. یارمەتیی دایکی دەداو گوڵەکانی ئاو دەدا. بەیانیان زوو لەگەڵ دایکی گوڵەکانی ئاو دەدا. دەستی دایکی دەگرت و یاریی لەگەڵ پەپوولەکانی بەیان دەکرد. زۆر جار پەپوولەی باڵ نەخشینی بە دەست دەگرت و یاریی لەگەڵ دەکردن، بەڵام هیچیانی ئازار نەدەدا و بەری دەدان و دەیگوت: (بفڕن، بەرز ببنەوە) دواتر (وەنەوشە) (کامەران)ی لای (ڕیحانە بارام) دادەنا و دەڕۆیشت بۆ قوتابخانە و منداڵانی فێری زانست دەکرد و درێژەی بە کاری مامۆستایی خۆی دەدا. ئەو وای هەست دەکرد لە ڕۆژگاری کەوتنی مرۆڤەکاندا لە ڕۆژگاری سەربڕین و بۆگەنبوونی لاشەی سەرباز و خەڵکانی مەدەنیدا خوێندن و گەیاندنی پەیامی نووسین و وانەبێژی پیرۆزە و خەڵك لە جەنگدا جگە لە خواردن و خواردنەوە پێویستی بە زانیاری و خوێندەوارییش هەیە. هەر بۆیە بەردەوام دەبوو. مامۆستایەکی وا شۆخ و شەنگ و حۆریئاسا لەناوچەیەکی سنووری و لە هەرێمێکی شەڕاویدا وانە بڵێتەوە، سەرکێشییە و کارێکی دژوارە. بێوەژنێکی ئازادی وەك (وەنەوشە) ئاقیبەتێکی باشی نەدەبوو. کاتێك چەند سەربازێك هەڵیان کوتایە سەر ماڵەکەیان و بە بیانووی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی دژ بە ڕژێم گێچەڵیان پێ کرد، بەڵام ئەو زۆر لەوە مەردانەتر بەردەوامی بە کارەکانی دا و گوێی بە هیچ کام لە قسەکانیان نەدەدا و دەیگوت (من مێردێکم هەبوو، سەرباز بوو. لەلای خۆتان لە پێناوی پاراستنی وڵاتدا جەنگا و شەهید بوو. ئێوەش بیانووی ناڕاست بە من دەگرن. نازانن من کەسێکم لەدەست چوو لە پێناو ڕێبازی ئێوەدا کارامەترین و دەستڕەنگین ترین پیاوێك بوو کە لە سەر ئەم زەمینە دیبێتم! بە پەنجەکانی مرۆڤی لەناو بەردەکان دەردەهێنا، سەیر کەن ئەو چ پەیکەرتاشێك بوو! پەنجەی بۆ (جینا) ڕادەکێشا و دەیگوت: (ئەوە دستکردی ئەوە).

لە ماوەی ساڵانی جەنگدا (وەنەوشەی مەحموود شەلەنگ) چەندین جار سەردانی شارەکەی کردبوو، بەردەوام چاوی بە (دولبەر داود غولام) و (مەحموود شەلەنگ) کەوتبوو. دایك و باوکێکی بەساڵاچوو بوون. چەندین جار بە گریانەوە داوایان لە (وەنەوشە) کردبوو کە لەگەڵ (کامەران) بێنەوە بۆ لایان و لێرە بژین، بەڵام (وەنەوشە) زۆر لەوە سەرسەختر بوو کە بتوانێت شاری (سێوان) بەجێ بهێڵێت هەمیشە چاوەڕوانی گەڕانەوەی (جیهانگیر)ی کردبوو. لە ماوەی ژیانی هاوسەریدا

بە هاوکاریی (مخۆل شەلەنگ) کاری زۆریان لە (کتێبە وەنەوشەییەکە)دا کردبوو. چەندین ڕووداو و گۆڕانکاریی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی خۆیان تێدا بەیان کردبوو،. ڕۆژێك (مخۆل شەلەنگ) بە (وەنەوشە)ی کچی وتبوو: (کچی خۆم! ئەی پاکیزەکەم، ئەی تۆوی ئاسمان! ئەوەی لە دوای من بۆ تۆ و (کامەران) بەجێ دەمێنێت، تەنیا ئینجانە گوڵەکان و ئەم کتێبە بەرگ وەنەوشەییەیە بیبە و کاری تێدا بکە و بیپارێزە بۆ مێژوو. با بەردەوام سەفەری خۆی بکات. ئاخێر هەر ئەم کتێبە ڕاستییەکانی ژیانمان دەخاتە بەر چاوی عالەم. ڕاستە هەموو شتە تەلیسمییەکان و ئەفسووناوییەکان لەناو ئەو کتێبەدا هەن و دەبێت لە فەوتان بپارێزرێت، تۆ دەزانی هەموو ناوچەکانی ئێمە ئێستا (موحەڕەمە)ن و، کەس ناتوانێت سەفەریان پێدا بکات. ئێستا ڕەزەکان بێ نازن. درەختەکان گریاون. کچی خۆم من حەز دەکەم بگەڕێمەوە بۆ گوندەکەم و دنیای ئەوێ ببینم، دیمەنی دیوار و مزگەوتە ڕووخاوەکان ببینم... ئیتر لێرەوە ئیشی تۆیە ئیش لەسەر ئەم کتێبە بکەیت، ئەوە عادەتی منە و تۆش کچی باوکی خۆتی، ئەم کارە تەواو بکە و دوای تۆش نەوەکانی تۆ و (کامەران) و ئەوانی دیکە. مەرجە ئەم کتێبە تا ئاخر زەمان بڕوات و بە هەموو سەردەمەکاندا سەفەر بکات. بەو شێوەیە دایەلۆگی سەیریان لە مەڕ کتێبەکە کردبوو. (وەنەوشە) زۆری لای سەیر بوو کە (مخۆل شەلەنگ) بەو شێوەیە قسە دەکات، هەستی کردبوو کە گۆڕانکاریی سەیرتر لە ژیانیدا ڕوو دەدات هەر بۆیە داواکارییەکەی پەسەند کردبوو. هەموو ڕووداوەکانی ژیانی خۆی لە کتێبەکەدا نووسیبوو.

بە چەند شێواز و چەند دەست و خەت ئاماژەی جودا جودا لەو کتێبەدا هەبوو. (وەنەوشە) باسی یەکترناسینەکەی خۆی و (جیهانگیر) و پەیکەرەکان و (سەرحەد) و شەڕ و گریان و نەگەڕانەوەی (جیهانگیر) و قسەکانی سەربازەکەی هاوڕێی، مەدالیاکە و نهێنی گوڵەکان و بڵاوبوونەوەیانی کردبوو.

دواتر لەسەر وەسێتی باوکی (کتێبە وەنەوشەییەکە)ی لەلای خۆی پاراستبوو. هەڵبەتە سەبارەت بەو کتێبە زانیاریی دیکەی بە (ڕیحانە بارام) و کچەکانی دابوو. هەردوو خانم (جانۆ و جواناو)، ئەوانیش دەیانزانی ئەو کتێبە دەبێت بپارێزێت و بە شتێکی پیرۆزیان دەزانی. پاراستنی ئەو کتێبە وەك پاراستنی کتێبێکی ئاسمانیی پیرۆز وەهابوو، هەندێك ڕاستی سروشتی لەناودا بوو، کە لەو سەردەمەدا هیچ نووسەرێك هیچ مێژوونووسێك لێیان بەئاگا نەبووە و هەرکەسە و سەرقاڵی دەردی تایبەت بە خۆی بووە.

هەر لەو ساڵانەدا ڕۆژێك خەبەری ئەوە بۆ (وەنەوشە) دێت کەوا (محۆل شەلەنگ و دولبەر داود غولام) لەماڵ دەرچوون و سەفەری ناوچە حەرامەکانیان کردووە ئەو ناوچانەی ڕژێم یاساغی هاتووچۆی تێدا کردبوو تەنانەت گیاندارانیش بە ئازادی بۆیان نەبوو سەفەری پێدا بکەن، هەواڵەکە بەپەلە لە یەکێك لە دراوسێکانی ماڵی باوکی لە شاری گەورەوە گەیشتبوو شاری (سێوان) کە گوایە دایك و باوکی (وەنەوشە) بەرەو ناوچەکانی شارباژێر سەفەریان کردووە و بە دوو پریاسکە نان و تفاقەوە بەرەو گوندەکەیان گەڕاونەتەوە بۆ سۆراخی زەوی و ڕەزەکانیان، بەپەلە (وەنەوشە) (کامەران) لەگەڵ خۆی دەبات و بە ئوتۆمبێلێك دەگەڕێتەوە بۆ شاری گەورەی دایك و باوکی و ڕاستی مەسەلەکەی لە چەند ناسراوێکەوە بە دەست دەگات کە ئاماژە بەوە دەکەن ئەوان بەرەو ناوچە حەرامەکان سەفەریان کردووە و ژیان لەو ناوچانەدا ئەستەمە، چونکە یەك پارچە زەوییەکان مینڕێژکراون و گیاندارانیش بە ئازادی ناتوانن بەناو کانیاو و چیا و مێرگەکاندا پیاسە بکەن، هەلاهەلا دەبن. ئیدی سۆراخی (وەنەوشە) بۆ دایك و باوکی بێ ئەنجام مایەوە و (وەنەوشە)یش هەتا هەتایە ئەو گرێیەی نەکردەوە.

دروست نازانم کە دایك و باوکی (وەنەوشە) چیان بەسەر هاتووە، بەڵام هیچ کەسێك ئاسەواری ئەوانی نەدۆزییەوە. سەفەریان بەرەو ئاسمان کرد یاخود بەرەو چیاو گوندەکانی شارباژێر، یان گەڕانەوە بۆ باخچەکانی فردەوس! ئەم گرێیە هەروا مایەوە، هەرچییەك بێت ئەوەش کۆستێکی دیکە بوو لە ژیانی (وەنەوشە)دا. تەنیا گوڵەکان و کتێبەکە و (کامەران) و مەدالیایەکەی (جیهانگیر) یادگار بوون لەلای خانمی (وەنەوشە). ژن و پیاوێکی سەرو ریش سپیی نوورانی بە بەرگی سپییەوە سەفەری حەجی شارباژێر و ئاسمان پێکەوە گرێ دەدەن و هەرگیز ناگەڕێنەوە. دیارە هۆکاری ئەم سەفەرە دەگەڕێتەوە بۆ گەڕان بە دوای حەقیقەت و ئازادیدا. هەڵبەتە (محۆل شەلەنگ) لە بارودۆخ و ڕەوشی سیاسی ئەو سەردەمە نارازی بووە و وەك (پیاوانی ئەشکەوت) بڕیاری سەفەرکردن و ڕاکردنیان لە واقیعی خوێناوی کردووە و ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردووە.

دیارە زۆر جار ڕاکردن لە جەنگ و شەڕ وەك کرانەوەی درزێکی بچووکی دەرگایەکە بە ڕووی تاریکاییەکی نەبڕاوەدا. هەڵبەتە (محۆل) زۆر لەوە وردتر بیری لەوە کردۆتەوە و کارەکانی خۆی باش ئەژمار کردووە، دەنا پێچانەوەی چەند پریاسکەیەك و لەبەرکردنی بەرگی سپی کە چەند ناسراوێك ئەو ڕاستییەیان لای (وەنەوشە) درکاندبوو، ئەوە کارێکی دژوارە و سەفەرێکی خەیاڵییە. ڕەنگە لەو کاتەی (محۆل شەلەنگ) و (دولبەر داود) لە سنووری یاساغ دابوون، سەربازە عەرەبە دڕندەکانی ڕژێم گوللەبارانیان کردبن و تەرمەکانیان سووتاندبێتن ، یان کەوتوونەتە ناو زەوییە

مینرێژکراوەکان و پارچەپارچە بوون و بوونەتە تۆز و غوبار. یان لەو ناوچـانەدا لـە ئەشـکەوتێکدا وەك دوو مرۆڤی سەرەتایی وەك دوو مرۆڤی شێوە نیاندەرتاڵی لە سفرەوە دەست دەکەنەوە بە ژیـان و دوور لە شارستانییەتی مرۆڤ دەژین! یان لە یەکەم هـەنگاوی سـەفەرەکەوە دەرگایـەکی نهێنیـی ئاسمانیان کردۆتەوە و بە پەیژەیەکی خەیاڵییدا بەرەو عەرشی خـودا سـەرکەوتوون و لـە فـیردەوس پشوویان داوە. دروست نازانین، بەڵام ئەوان دیار نەمان و سەفەریان کرد. سەفەر بە مانای مـردن و ژیان هەردوو بەرجەستەن و تەواو دیار نییە کامیان زاڵە بەسەر ئەوەی دیکەدا مرۆڤی سـەفەرکردو وەك جەستەیەکی بیٚ روح وەهایە و هیچ کات خاوەنی روحی خۆی نییە و لەهەر جێگایەك بێت بـە روحی ئەویٚ دەژی و روحی خۆی شتێکی غاییە و دوورە لە جەستەی. سەفەرکردن بۆ هەر کەنارێك بۆ هەر کیشوەرێك راکردنە لە خود، راکردنە لە ناخی خود، گەڕانەوەیە بۆ حەقیقـەتێکی شـاراوەی نەبینراو. هەڵاتن گەمەیەکی ئەبەدییە و بە درێژایی مێژوو مرۆڤ لـە هەنـدێك شـتی مەعنـەوی و حەقیقی و خەیاڵی هەڵدێت، هەڵاتن شەرعیەتدانە بە هەبوونی کەناری دیکە! بۆ خۆشەویسـتی بـۆ نزیکبوونەوە لە لێوارەکانی جوانی و رووناکی. هـەڵاتن بـەرەو ئاسمـان راکردنـە لـە هەسـارەیەکی خوێناوی و گەڕانەوەیە بۆ ماناکانی دیکەی مرۆڤ! گەڕانەوەیە بە دوای دەنگی دیکـەدا، شـێوەزاری دیکە، شێوەی دیکە، شەراب و ترێی دی، هەنگوینی دیکە کە هیچـیان لـە شـێوە حەقیقیەکـەی هـەرێمی خـۆت ناچـێت. گەڕانـەوەی (مخـۆل شـەلەنگ) و (دولبـەر غـولام) بـۆ نـاو رەزەکـان، شەرعیەتدانە بەوەی تەنیا میوە و خاکی بیٚ ئاو شایەنی ئەوەن مرۆڤ کڕنۆشـیان بـۆ ببـات نـەوەك شارستانییەت. رەنگە راکردنی (شەلەنگ) و (دولبەر) راکردن بووبێت لەو هەموو تەنە ئەندازەییـە دەستکردانەی دەستی مرۆڤ. زۆر جاران راکردن لە شێوەی رێك و ئەندازەیی دەستی مرۆڤ وەك پـرد و جادە و ستوونی کارەبا و شۆستە و کورسی و ئوتۆمبێل و چی و چی گەڕانەوەیە بۆ سـەرەتاکانی مانای مرۆڤ و لە گوشاری دەروونی رزگارت دەکات.

بە هەرحاڵ بەو شێوەیە تراژیدیایـەکی دیکـە لـە ژیـانی (وەنەوشـە)دا رووی دا و تـاڵاوێکی وەهایان پیٚ نۆشی، کە بۆ مـاوەی مانگێـك تاکـە وشـەیەکی نەدرکانـد و گوڵـەکانی لـە رەنگـی وەنەوشەییەوە بەرەو رەش چوون و درزێکی دیکە کەوتە روحیەوە و ریکۆردی دیکە بۆ سەر (کتێبە وەنەوشەییە)کە زیاد کراو، قەوارەی بەرەو گەورەبوون چوو. ئەو کتیبە وەك دەریا وا بووە و هەر پـڕ نەبووە لە زانیاری و سەیر و سەمەرەکانی دنیا. بەم شێوەیە (وەنەوشە) و (ریحانە بارام) و (جـانو و جواناو) لەسەر رەوتی ژیان مانەوە و لە سەردەمێکی جەنگاویدا لە شـاری (سـێوان) درێـژەیان بـە ژیان دا و ململانێیان لەگەڵ تۆپ و خومپارەکانی ئێـران و عێـراق دەکـرد و دەژیـان و بەیانییـەك

(وەنەوشە) و (کامەرانی وەنەوشە) ئاوی گوڵەکانیان دەدا و پەیکەرەکانیان خاوێن دەکردەوە. بەیانییەکی بەهاریی جوان بوو چۆلەکەکان دەیانجریواند، گوڵەکان بە شێوەیەکی نائاسایی دەمیان کردبووەوە و قاقا پێ دەکەنین و عەتریان بە حەوشەکەدا دەپژاند. (وەنەوشە) بە جلێکی رەشەوە بە دۆلکەیەکەوە ئاوی گوڵەکانی دەدا (ڕیحانە بارام) بەرماڵی دەچنی و جار جار فرمێسکی دەسڕییەوە و یادی رۆژانی رابردووی دەکردەوە. دەنگی تەقینەوە لە هەموو لایەکەوە دەهات و دنیای کاول دەکرد خومپارە و تۆپ و هاوەن و مووشەکەکانی بەرەی شەڕکەران لەناو کۆڵان و ماڵ و سەربان و مزگەوتەکانی شاری (سێوان) دەکەوتنە خوار و شاریان یەکپارچە کاول دەکرد. (وەنەوشە) دەستی (کامەرانی) دەگرت و لەگەڵ (ڕیحانە)خان رایان دەکردە ژێر زەمینەکەیان و خۆیان لە تۆپباران دەپاراست شەڕو گرمەی فڕۆکە لە هەموو لایەکەوە نەعرەتەیان دەکێشا. خەڵك رایاندەکرد و خۆیان لە ژێر زەمین و سەردابەکاندا دەشاردەوە. شەڕ بەردەوام دەبوو، گوڵەکان و پەیکەرەکانی (جیهانگیر) لە حەوشەکەدا سنگیان بۆ تۆپ و فڕۆکە کردبۆوە نەدەترسان. (ڕیحانە بارام) هەر دەگریا و دەکڕوزایەوە و دەترسا و هاواری دەکرد و دەیگوت: (خودایە لە جەنگ بمانپارێزیت... خودایە بەشەڕەفەوە بمانکوژیت). دواجار شەڕ یەخەی بە هەمووان دەگرت و شاری کاول دەکرد. شارێکی سەیر بوو. سەدان جار کاول دەبوو، بەڵام هەر زوو نوێ دەبۆوە بەر لەوجارەی کە بۆ هەمیشە شەهید کرا و هەرگیز زیندوو نەبووەوە و بۆ هەمیشە خاپوور کرا، خەڵك زوو دیوارەکانیان دروست دەکردەوە، گوڵەکان دار هەنارە سوورە عەیارەکان زوو سەوز دەبوونەوە، بەڵام لە رۆژێکی بەهاریدا بۆ یەکجاری روحیان کوژرا و بۆ ئەبەد ماڵاوایيان کرد و نەگەڕانەوە. (وەنەوشە) کتێبە وەنەوشەییەکەی هەر بەدەستتەوە بووە و ریکۆرد و داتای نوێی تێدا نووسیوە و بە چرکە دەستی لێ خافڵ نەکردووە. بە گوتەی (جانۆ سەرحەد)ی پووری (کامەران)، کە لە ئێران لە یەکێك لە کەمپەکان نیشتەجێ دەبن، زانیاریی دیکە زیاد دەکرێت بۆ کتێبەکە، لەو ماوەیەدا شەڕی قورس لەنێوان پاسدارانی ئێران و سەربازانی رژێمی سەدام روو دەدات، پێشمەرگەکانی حزبە کوردستانییەکان ئەو هەلانە دەقۆزنەوە و زۆر گوورزی گورچکبڕ لە هێزەکانی رژێم دەدەن و هەندێك سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. پاسدارانی ئێران دێنە نێو قووڵایی خاکی عێراق و (شاری سێوان) داگیر دەکەن. خەڵك لە شاردا قەتیس دەمێنن، ئەوەی دەتوانیت را دەکات بەرەو شارەکانی دیکە و گوندە سنوورییەکان، ئەوەیش لە توانایدا نییە لە شاردا، لە ژێرزەمینەکاندا خۆیان حەشار دەدەن، هێزەکانی پێشمەرگە دڵنەوایی خەڵك دەکەن، بەوەی هیچ شتێکی ئەوتۆ روو نادات. بەوەش ئەو روحە لە خەڵکدا دەچێنن کەس لە شار هەڵنەیەت و خەریکی ژیانی خۆیان

دەبنەوە. بەهەر شێوەیەك بێت ڕووداوەکان بەو شێوەیە تێدەپەڕن، ئەگەرچی پـازداران لـە هەنـدێك قۆڵەوە پاشەکشە دەکەن، بەڵام ڕژێمی (سەدام) بە دڕندانـەترین شـێوە شـارەکە گـەمارۆ دەدات و بەبێ گوێدانە هیچ بەهایەکی مرۆڤانە بۆردوومـانی شـار دەکـات و کارەسـات دەخولقێنێـت، بـە کۆمەکی هەندێك خزمی خۆی (وەنەوشە) و خانـەوادەی (سـەرحەد) لـە یـەکێك لـە خانووەکـانی ناوەندی شار بە کۆمەڵ خۆیـان حەشـار دەدەن، ڕێگـای دەربـازبوون زۆر زەحمـەت دەبێـت. ناچـار چاوەڕوانی دەرفەتێك دەکەن. (وەنەوشــە) ملوانکەکـەی (جیهـانگیر) دەکاتــە ملـی (کامــەران) و یەکێك لە ئینجانە گوڵە (وەنەوشــەییەکان) لـە چـاکەتێکەوە دەئاڵێنێـت. کتێبـە وەنەوشـەییەکە دەکاتە ناو جانتایەك و لەلای خۆی دەیانپارێزێت، دەزانێـت ڕووداوێکـی نائاسـایی بەڕێوەیـە. دوو شت زۆر گرنگن لەلای و هەمیشە پاراستوونی، دوو شتی تاقانە، کە لـە (دولبـەر داود غـولام) و (مخۆل شەلەنگ) بەجێ مابن و نیشـانەی زینـدووی خانەوادەکـەیانن، ئـەو دوو شـتەیش ئینجانـە گوڵەکان و کتێبە وەنەوشەییەکە بوون. هەر بۆیە زۆری هەوڵ دابوو، بە چـاکی بیانپارێزبێـت و لـە فەوتان ڕزگاریان بکات. زانیبووی تەنیا خۆی دەتوانێت لە زمانی ئەو گوڵە (وەنەوشەییە) سـەیرانە بگات. بە گوێرەی نووسراوەکانی سەر کتێبـە وەنەوشـەییەکە، لـەو زەمـانی جـەنگ و خوێنـەدا، (وەنەوشە) ڕۆژانە قسەی لەگەڵ گوڵەکاندا کردووە و گـوێی لـە سـەدا و گۆرانییـەکانیان گرتـووە. ئەوانە گوڵی ئاسایی نـەبوون. شـێوازیان زیندوویـیـەتی تێـدا بـووە، سـەردەمەکان تێپـەڕ بـوون، ئەمانەش بەردەوام بوون لە ژیان! چەندین سەردەمیان بڕیووە و ژیانیـان لەبەرزیـدا بـووە و بۆنیـان جوانیی بە ڕوحی مرۆڤ بەخشیوە. هیچ کات لەوە دوو دڵ مەبە کاتێك گوڵێـك بـۆت پێـدەکێنێت، ئەوە سیحر و ئەفسانە نییە، ڕاستییە و لە کاتی مەستیی مرۆڤدا زۆر جـار گـوڵ قسـە دەکـات و گۆرانی دەبێژێت و سەما دەکات و ئارەق دەردەدات.

پاراستنی چوار شت کاری خانەوادەی وەنەوشە بووە، (پەیکەری جینـا)، (ئینجانەیـەك گـوڵ) (کتێبە وەنەوشـەییەکە)، (مەدالیاکـەی جیهـانگیر)، ئەمانـە بەڵگـەی مێـژوویی و بـەرزی ئـەو خانەوادەیە بوون، لەو دەمەی کە کاتیوشاو و خومپارەکان دەکەونە ناو شاری (سێوان)، (وەنەوشـە) و (جانۆ سەرحەد) پەیکەری جینا لـە چـەند قـەدێك نـایلۆن دەپێچـن و جـوان قیاسـەی دەدەن و شەتەکی دەدەن و بە گوریسێکی بەن کە (ڕیحانە بـارام) دروسـتی کـردووە، شـۆڕی دەکەنـەوە نـاو بیرەکە کە دە مەترێك قووڵ دەبێت. ئـیتر تـەواو لـەوە دڵنیـا دەبـن کـە لەوێـدا لـەناو ناچـێت و دەمێنێتەوە، هەر بۆیە سەری بیرەکـە دەنێنـەوە. لـە ڕاسـتییدا چـەند پەیکـەرێکی دیکـە لـەناو حەوشەکەدا هـەبووە، بـەڵام ئـەوان تـەنیا توانویانـە ئەمــەیان ڕزگـار بکـەن، چـونکە گـرنگترین

یادگارییەك بووە لەنێوان (وەنەوشە) و (جیهانگیر)دا، پەیمانی خۆشەویستییان لەو پەیکەرەوە دروست کردبوو. بەو شێوەیە هەڵدێن و روو دەکەنەوە رێژ زەمینەکەی ماڵی خزمەکەیان و لەوێ دەمێننەوە. شەڕ هەر دێت و بەردەوام دەبێت فڕۆکەکان شار بۆردوومان دەکەن، ماڵەکان دەسووتێنن درەختەکان دەکەون. مرۆڤ پارچە پارچە دەبێت و منداڵان لەنێوان دیوارەکاندا سەریان پان دەبێتەوە. ئوتومبێل بلێسە دەسێنن و دەتەقنەوە. دیمەنی شەڕلێدراوی شار لە باسکردن نایەت. دنیا رەش دادەگیرسێت، دووکەڵ و بۆنی سووتانی نایلۆن و باروووت و ئادەمیزاد و شت، کاولکاری دەخەنە بەرچاو. ئەوەی لەو شارەدا رووی دا دواتر بووە سەردێڕی تاوانە نامرۆییەکانی دنیا و دیکتاتۆریان بە دنیا ناساند و وێنەی دیکتاتۆریان لەسەر ئاستی دنیا بە شێوەیەکی زۆر ناشرین نەخشاند. لەو کاتەدا دەنگی ئەوە هەبوو کە رژێم چەکێکی نائاسایی بە شاری (سێوان)دا دەکات و شار دەخنکێنێت. (وەنەوشە) بانگی (ڕیحانە بارام) دەکات و دەڵێت: (خانم بۆنی سێو کاسی کردووم، بۆنی سێو دێت... ئێوە هەست ناکەن)؟ دەمودەست (ڕیحانە بارام) بەلادا دێت و دەکەوێت. (وەنەوشە)، (کامەران) و جانتاکەی دەخاتە بندەستی و بەرەو دەرەوە رادەکات. (جانۆ سەرحەد) و منداڵەکەی و مێردەکەی رادەکەن بەدوای (وەنەوشە)دا و خۆیان دەگەیننە ناو ئوتۆمبێلەکەی مێردەکەی (جانۆ). کاتێك چەند پارچە خاولییەکی تەڕ دەدەن بە دەموچاوییاندا و بە کۆڵانەکانی (شاری سێوان)دا رەت دەبن، دیمەنی قیامەت دەبینن. منداڵ و ژن و پیاو و پیر و تەیر و چۆلەکە لەسەر جادەکان گیان دەدەن و کەوتوون. لەو کاتەدا کەس نەیتوانیوە کەس رزگار بکات. هەر کەسەو ئازا بووە و خۆی رزگار کردووە. تەمێکی سپی بەشێوەی هەور بەسەر شاردا خۆی مەڵاس داوە، لە هەمان کاتدا خومپارە و تۆپ بە هەزاران کەوتوونەتە ناو شار و هەزاران کەسیان شەهید و بریندار کردووە.

دیمەنی کەوتن و مردنی بە کۆمەڵی خەڵك شتێك بووە وەسف نەکراوە. هەندێك جەستەیان تا سەر ئێسقان دارزاوە و هەنگاویان ناوە هەندێك بەقەدەر دوو کەس ئاوساون و تەقیون. هەندێك بە پێکەنینەوە بەسەر شەقامەکاندا رایان کردووە، هەندێك بە گریانەوە چاوەکانیان سڕیوە و هەندێك دەستییان گرتووە بە دەمیانەوە و بە دیوارەکاندا خۆیان هەڵپەساردووە. هەندێك بە پشتا کەوتوون و لە خەونێکی قووڵدا بوون. دیمەنی قیامەت بوو هەزاران کەس بە کۆمەڵ و تاك تاك لەمبەر و بەری جادەکان کەوتوون و وەك پەیکەرەکانی (جیهانگیر) رەق و نەبزۆك وەستاون. دیمەنی پیاوێك کە خۆی داوە بەسەر منداڵە ساوەکەیدا، تاکو نەمرێت، لەبەر ئەوەی تاقانە کوڕی بووە دوای هەشت کچان، دیمەنی کەوتنی ژنێك کە منداڵەکەی لە سکیدا دەجووڵایەوە بەردی دەتاواندەوە،

ئەوان هەر چۆنێك بێت بە پەلەپرووزێ و بە نەخۆشی لە شار دەرچوون و بەرەو ناوچە سنوورییەکانی ئێران رایان کردووە. لەمبەر و ئەوبەری جادەکاندا لەناو مێرگ و کانیاوەکاندا سەدان ئادەمیزاد و ئاژەڵی مردوو هەبوون، چەندین سەیارە بە یەکیاندا دادە و جامی ئوتومبێلەکان سوورِ بوون لە خوێندا. ئەمان بە نیوە مردوویی لە سای چەند خاولیەکی تەرِەوە، هەر چۆنێك بێت دوای چەند سەعاتێك رێگەبڕین، دەگەنە ناوچە سنوورییەکان. چەند سەد مەترێك بەر لە گەیشتنیان ئوتۆمبێلەکەیان لە کار دەکەوێت. ناچار دادەبەزن و بەپێیان دەڕۆن. هەندێك جار (وەنەوشە) لەبەر نەخۆشی و ماندوویتی دەیەوێت جانتاکەی و ئینجانە گوڵەکە فڕێ بدات، بەڵام دواجار تاو دەداتە خۆی و پاشگەز دەبێتەوە و فڕێیان نادات و بیر دەکاتەوە کە ژیانی ئەو بریتییە لەو ئینجانە گوڵە و ئەو کتێبە، هەر بۆیە بە شەل و شەکەتی ملی رێ دەگرێت و، دوای (جانۆ سەرحەد) و (سەیوان شاهۆ) دەکەوێت و لە سنوور دەپەڕنەوە و، لەوێ هێزەکانی سنووری ئێران پێشوازییان لێ دەکەن و بەپەلە دەیانخەنە ناو کەمپێکی پزیشکی و برینەکانیان تیمار دەکرێت. لەوێ بە هەزاران کەس بریندار و سووتاو دەبینن هاوار و زەنای ژنان و منداڵانی سووتاو دەگاتە عەرشی خودا، لەبەر سەختی برینەکانی جەستەی (وەنەوشە) لەژێر گوشاری هەناسە تونگیدا دەمرێت ئای لەو مردنە جوانە بێدەنگەی کە روح بەرەو ئاسمان دەفڕێت ئەو بە پێکەنینەوە باوەش بۆ مەرگ دەکاتەوە و دەنگییکی خیزە خیز بەر لە مردن هەندێ قسە دەکات و داوا لە (جانۆ) دەکات بە ئەمانەتەوە بیان پارێزێت ئەو ئاخاوتنانەی (وەنەوشە) بەر لە مەرگ دەیان کات دواتر وەك شێوە (وەسێتنامە)یەکیان لێدێت و لە دوو توێی کتێبەکەدا هەڵدەگیرێن دیارە من لەبەرژەوەندی (وەنەوشە)وە دواتر وەك بەشێکی ئەم پرۆژەیەی خۆم دەیانخەمە روو، بەڵام سەرەتا دەمەوێت ئەوەتان بیر بخەمەوە کە مەدالیا و کتێبەکە و ئینجانەیەك لە گوڵە سیحراوییەکانی لەو سەرزەمینە زیندوو دەبنەوە و دووبارە باوەش بەژیانـدا دەکەنەوە، دیارە پوورەکەی دیکەی (کامەران) کە ناوی (جوناو سەرحەد) دەبێت بە گازی کیمیاوی و بوونی (سێو) لە شاری (سێوان) خنکاون لەگەڵ خانەوادەکەیدا سەدان خزم و کەسیان لەدەست دا یەکەمین کەسیان کە بەرگەی بۆنی سێوی نەگرت و خوێن لە دەموچاوەکانی هات (رِیحانە بارام) بوو.

کارەساتی کوشندە بە ژیانیاندا تێپەڕی، بەڵام بە کولەمەرگی و دەردی سەری و نەداری لە یەکێك لە کەمپەکانی وڵاتی ئێران (کامەرانی وەنەوشە) لەگەڵ ماڵی پووری (جانۆ سەرحەد) و (سەیوان شاهۆ) و منداڵەکەیان دەژین کوڕەکەی پووری ناوی (ڕاجۆ سەیوان) بووە و هەرزەکار بووە

و خزمەتی زۆری (کامەرانی وەنەوشە) کردووە و کۆمەکی زۆری بە دایکی واتـە (جـانۆ سـەرحەد) کردووە لە ریکۆرد کردنی رووداو گۆڕانکاری نویێ بۆ ناو (کتێبە وەنەوشـەییەکە) و دەسـت خـەتی ئەو دیارە و لە زۆر شوێندا ناوی (ڕاجۆ سەیوان) هەیە و ئاماژە بەوە دەکات کە کۆمەکی نووسینی زۆرشتی تایبەت بە ژیانیانی کردووە و یەکێکە لەوانەی پایەیەکی راوەستاوی ئەو کتێبەیە و کـاری جوانی ئەنجام داوە زۆر باسی گوڵەکان و ژیانیان لە غوربەت دەکات و لە دەستنووسـەکاندا ئـازار و ئەشکەنجەی ژیانیان بە روونی بەرچاو دەکەوێت باسـی گـەورەبوونی (کامـەران) دەکـات و نهێنـی سیحری چاوی و بۆنی گوڵەکان دەخاتە ناو باسەکانەوە بەهەر حـاڵ دەبێـت ژیانیـان چـۆن درێـژەی کێشابێت؟ لە وڵاتێکی ئیسلامیدا لەناو کولتوورێکی جیاواز و رۆژهەڵاتیـدا رووداوی دیکـە دێتـە ژیانیانەوە با لێرەدا راوەستم و وچانێك بدەم دواتر دەگەڕێمەوە سەر زنجیرەی باسەکان.

## ١١

## (گۆرانی وتن نەگبەتیە)

## ناوەندی ساڵی ٢٠٠٣

کەش و سەقای دنیا مامناوەند بوو من لە پێشەوەی ئوتۆمبێلەکەی (سەهەندی بایز ئاغا) بووم (کامەرانی وەنەوشە) لە دواوە سوار ببوو هەرسێکمان جلی ڕەشمان لەبەر کردبوو (سەهەندی بایز ئاغا) بە باشی زانی بوو پیاسەیەکی ئێوارە بکەین بە نێو (پارکی ئاشتی)دا، خرەی درەختە بڵندەکان و خورەی ئاوی فوارەکان دەروونی ئادەمیزادیان هێور دەکردەوە هەر بۆیە بڕیار بوو کە بچینە پارك و ئێوارە لە شارۆچکەی گاورەکان نان بخۆین و خۆمان مەست بکەین زەمانی دوای جەنگ و کەوتنی پەیکەری دیکتاتۆر شتێکی دڵخۆش کەر بوو، ئاواتی هەموو مرۆڤێك بوو رۆژێك لە ڕۆژان دیکتاتۆر بەسەر شۆڕی ببینن ئاخر زەلیلن ئەو مرۆڤانەی لەسەرزەمینێك بژین یەکێك لە هەرە جەللادەکان حوکمی بکات، مایەی ئەوە بوو خۆتی بۆ مەست بکەیت، ئەو کاتەی لە شاشەکانی تەلەفزیۆنەوە بە بەرچاوی هەموو دنیاوە پەیکەرە بروونزیەکەی دیکتاتۆر رووخێنرا و خەڵك لە کەیف و شایی بەردەوام بوون، هەمووومان چاوەڕوانی گۆڕانی گەورەمان دەکرد، وامان هەست دەکرد ئیدی فیردەوس بەسەرماندا دەکەوێت و لەناو بۆنی عەتر و سەوسەنی بەهەشت تەژی دەبین لە شیعر و هەموومان سەماو سەرگەرمی خۆمان دەکەین، (سەهەند) دەنگی رادیۆکەی بڵند دەکرد و گۆرانی (حەسەن زیرەك) پەخش دەکرا شار یەك پارچە ئاڵ و واڵا دەینواند هەستم دەکرد، خەڵکی بە باڵ دەفڕین و لە فڕین ماندوو نەدەبوون هەموو بە بەرگی کوردییەوە نوقڵ و چکلێتیان بە ئاسماندا هەڵدەدا ماوەی مانگێك بوو پەیکەری دیکتاتۆر رووخێنرا بوو پایتەختی عێراق لە دەستی بەرەی هاوپەیمانیدا بوو، لەم لاو لەولاوە تانك و زرێپۆشی ئەمریکایی بەناو شاردا دەگەڕان سەربازەکان چاویلکەی گەورەی رەشیان لەچاو کرد بوو لوولەی چەکەکانیان بەهەر چوار لادا دەسووڕاند، بە هەموو نەعرەتەی خۆی هاواری دەکرد (بژی ئازدی) (کامەران) دەیدایە قاقای پێکەنین و دەیگوت: (سەهەندی برام، خۆ یەخسیری سەردەمی رۆمانییە کۆنەکان نیت؟ تۆ هەمیشە ئازاد بوویت و بە ئازادیش گەورە دەبیت و ئازادیش دەچڕیت) من لە خەیاڵی ئەوەدا بوو

داخۆ دیکتاتۆر له چی جێگایەك خۆی حەشارداوه هێشتا ترس به تەواوی نەڕەویوویەوه، هەر لە خەیاڵدا بووم و بیرم له زۆرشت دەکردەوه.

سەردەمێکی درێژ بوو وڵات لەوپەڕی بێ توانایدا بوو، خەڵکی زۆر وڵاتیان بەجێ هێشتبوو، خەڵکی زۆر له پێناوی هیچدا له خوێنی خۆیاندا گەوزابوون، من لەناو بازنەیەکدا دەسووڕامەوه و بەردەوام دەهاتمەوه سەر خاڵی دەست پێکردنی سەرەتا و دەسووڕامەوه و نەدەگەیشتمە هیچ راستییەك (سەهەندی بایز ئاغا)، خەیاڵاتی پچڕاندم کاتێك وتی (شاپووری خەزان چییه لەسەر گەڵا زەردەکانی خەزانی خۆت لە سەفەری کێهان دنیا بوویت؟، ئەتو له خەیاڵی دنیای درەختە رووتەڵەکاندا بووی یاخود لە رەشەبادا بۆ هەوره خەوتووەکان شوناسی خۆت دەگەڕایت؟) راچڵەکیم و وتم (له گەڕان به دوای ئاسەواری وڵاتێکدا بووم کە لانکەی ژیانە و لانکەی مردنیشە، هەر سەرزەمینێك مردن و ژیان لەبەرەی جەنگدا نەبن ئەوه سەرزەمین نییە و سەرابە) (کامەرانی وەنەوشە) وتی (له کتێبێکدا کەبه نرخێکی بێ پایان کڕیم و ئێستا لەناو کتێبخانە بچکۆلەکەمدایه و دەگەڕێتەوه بۆ سەردەمانێکی زۆر دێرین و بە زمانی عەرەبی نووسراوه و باسی شەڕی سەردەمی رۆمانییەکان دەکات که دەکەوێتە نێوان دوو بەرەی جەنگەوه و داوای راگرتنی شەڕیان لێ دەکات و دەڵێت شەڕ راگرن... جا گوێ بگرن با کەمێك له چیرۆکی ئەو کچە ئازایەتان بۆ بکەم، بەڕاست نموونەی ئەو جۆرە ژنانە له دنیادا کەمە، بەڵام وجوودیان هەیه و له هەر هەرێمێکدا هەن. ) ئاوڕم دایەوه و وتم (پەله مەکه براکەم وا هەست دەکەم، چیرۆکێکی زۆر بەهێزبێت، هەر شتێك تۆ باسی بکەیت و لەبەرگی کتێبێکدا به دوایدا بگەڕێیت بێ حیکمەت نییه و سەرسام دەبین بە بینینی) (سەهەند) قسەکەی لە دەمی من سەندەوه و بە زەردەخەنەیەکی هێمنەوه وتی (شاپوور راست دەکات، ئێستا دەگەینە پارك لەوێ دادەنیشین ئاو هەوای خۆش و سازه لەوێ قسەی زۆر دەکەین لەمەڕ دنیا، هەندێك شتی گرنگ هەیه لەسەر ژیانی خۆم و تازه روویان داوه حەز دەکەم بۆتانی باس بکەم، چونکه سیقەی تەواوم لەسەر ئێوەیە، ئێوه دوو هاوڕێن لۆ من که بتوانم پشتان پێ ببەستم راستە من برام نییه بەس به خودای له برا زیاترن لۆ من لەبەر ئەوه هیچ لە ئێوه ناشارمەوه و ئەوەی ئەمرۆ روویدا سەر لەبەیانی هەمووتان لۆ باس دەکەم) گەیشتینە پارك و لە شوێنێکی تایبەتدا ئوتۆمبێلەکەمان راگرتوو لە دەرگای

سەرەکییەوە رۆیشتینە نێو پارك (کامەرانی وەنەوشە) دەستییکی برد بۆ زنجیرە زیوەکەی ملی کە پلێتێکی زیوی وەك مەدالیا پێوە هەڵواسرا بوو بە وردی هەندێك شتی لێ نووسرا بوو من باش نەمبینی بەر لەو رۆژە هیچ کات ئەو مەدالیایەم نەبینیبوو لە ملی (کامەران)دا وام هەست دەکرد تازە دەستی کەوتبێت یاخود کڕیبێتی لە مەدالیای سەربازە ئەمریکاییەکان دەچوو کە لە شەڕی ڤێتنام لە ملیان کرد بوو ئەو ملوانکانەم تەنیا لەو فلیمانەدا بینیبوو کە باسی شەڕی ڤێتنامیان دەکرد و پاش سووتان و پارچە پارچەبوونی سەربازەکان دەبرایەوە بۆ کەسوکاریان وەك نیشانەی شەهیدبوونی کوڕ یان مێردەکانیان یان باوکیان ئیدی ئەوە دوا شتێك بوو کە لە سەربازەکان دەمایەوە بە هەرحاڵ ئەو رۆژە بۆیە ئەو مەدالیایەم بینی لەبەر ئەوەی کامەران دوو قۆپچەی کراسەکەی کردبۆیەوە، بەڵام رۆژنانی رابردوو هەموو قۆپچەکانی تا قورگی دادەخست، هەروەها گوڵێکی وەنەوشەیی لە یەخەی کراسەکەی قایم کرد بوو، ئەوە عادەتی هەمیشەیی بوو لە جەنگ و ئاهەنگ و ئاشتی و کۆبوونەوە و وانەدا ئەم گوڵەی لە یەخەی دەدا بۆنێکی گولەکەی سەرسنگی خۆی کرد و ئاوڕی بۆ ئێمە دایەوە ئەو لەسەرپەڕەوە رێی دەکرد بە شێنەیی بە نێو گۆڕەپانەکانی باخچەکەدا پیاسەمان دەکرد (سەهەند بایز) دەستی کرد بە گێرفانیدا و تەزبیحێکی قەزوانی ئەبڵەقی دەرهاورد و دەنك دەنك دەیژمارد من بێ خەم دەستم خستە پشت سمتم و هێدی هێدی دەڕۆیشتم.

لەنێو سەدان جۆر گوڵدا رێمان کرد سەدان جۆر بۆنی جیاوازمان هەڵمژی دەستمان بەر هەزاران جۆر پەپوولە کەوت کە یەکەم جار بوو لەو شێوە پەپوولانە ببینین بەر لە جەنگ هیچ جۆرێك پەپوولە بەسەر گوڵەکاندا نەدەفڕی، لە زەمانی جەنگدا گوڵەکانیش لەناوخونچەکاندا نە دەهاتنە دەر پەپوولەکان لە قۆزاخەکانیاندا لە سووڕی مت بووندا بوون چەندین جۆر نەخشی پەپوولەمان بەدی کرد هەندێك لە پەپوولەکان پیت و حەرفی بابردوو لەسەر باڵەکانیان بڵاو ببوونەوە کە ئاماژەیان بە ئازادی دەدا رەنگی ئاسمان شینێکی تۆخی دەنواند گوورزە تیشکێکی رەنگاوڕەنگ دەکەوتنە سەر سەرمان هەستم دەکرد لە گیرفاننەکانمان تیشك هەڵدەقوولێ تاك و تەرا خەڵك پیاسەیان دەکرد لەنێو پارك و هەموو تێیان دەڕوانین، نموونەی چەند کوڕ و کچێکی ئاشقمان لێرە و لەوێ دەدی باوەشیان بە یەکدا کردبوو راموسانیان دەکرد و شەرمیان لە کەس نەدەکرد و ناو

دەمی یەکتریان دەمژی لەو ئێوارە پرتەقاڵیەدا تیشك لە ئێمە دەچۆڕایە خوارەوە ئاشقەکان بە شەرمەوە لە ئێمەیان دەڕوانی، بەڵام یەکدیان بەر نەدەدا و بێ ترس ئاوێزانی یەکتر دەبوون.

ئەو پارکە یەك پارچە پڕ ببوو لە کۆتر و قومری و بە ئاسماندا بێ شوومار چۆلەکە دەفڕین و دەیان جریواند هێشتا ماوەیەکی زۆری مابوو خۆر ئاوا بێت لەسەر مێزێکی کلاسیکی لە دار دروست کراو کۆبووینەوە و بە چوار دەوریا هەرسێکمان دانیشتین سێبەری درەختە زەیتوونەکە دەکەوتە سەر مێز و چوار دەورمان و درێژ دەبوویەوە بۆ چەند مەترێك ئەولا خۆمانەوە، فوارەی ئاوی پارکەکە لە پشتمانەوە دەنگی خوڕە خوڕی دەهات و هاژە هاژێکی مۆسیقا ئامێزی دروست دەکرد لەنێوان درزی گەڵانەکانەوە رەنگی پرتەقاڵی خۆر بە نێو بەرزی فوارەکەدا تێدەپەڕی و وەك ئاوێزە رەنگەکانی خۆری شیتەڵ دەکرد و دەکەوتە سەر سەرمان وتم ((سەهەندی بایز ئاغا) بە راستی دەنگت گەلێك خۆشە بەر لەوەی باسی قسەکانی ئەمڕۆت بکەی، بەر لەوەی (کامەرانی وەنەوشە) باسی، چیرۆکەکەی بکات دەبێت گۆرانییەکی (مەزهەری خالقی)مان بۆ بڵێیت من و (کامەران) حەزمان لێیە گوێ بیستی دەنگت بین (بووکی ئازادی) بڵێ باشە براکەم).

دەستی کرد بە پێکەنین و وتی (بە چاوان بۆتان دەڵێم ئەمڕۆ دڵم زۆر خۆشە، ئەوەی لە دڵمدا بوو سەردەمێکە و چەند جارێك سەرە مقەستێکم لۆ باس کردونە ئەمڕۆ سەری گرت، بەڵام من بەو رادەیە دەنگم خۆش نییە، گۆرانی بڵێم من هەر لە منداڵییەوە حەزم لە گۆرانی کردووە، خەڵك هەموو دەڵێن گۆرانی بڵێ میوانمان هاتبێت باوکم وتویەتی گۆرانییەکیان لۆ بڵێ شەرمم نەکردووە و وتوومە هەموو خەڵك دەڵێن دەنگت گەلێك خۆشە، بەڵام هەست ناکەم وابێت بە هەرحاڵ لۆتان دەڵێم) دەستی کرد بە گۆرانی وتن لەگەڵ خوڕەی ئاوەکەدا سەدایەکیان دروست کرد هەرچی خەڵك هەبوو لە پارك لێمان کۆبوونەوە تەنانەت پاسەوانەکانی پارك و باخەوانەکانیش بە پاچ و خاکەنازەوە هاتنە سەیرمان، ئاشقە سەر مەستەکانی ئێواران دوو دوو دەست لە ملی یەك کەوتنە سەما کردن و هەموو چوونە هەوای خۆیانەوە چ دەنگییك چۆلەکەکان لەسەر چڵ کۆترەکان بە ئاسمانەوە هەموو مات بوون بە دەنگییکی سافی پاکژی هەست بزوێنی ورووژێنەر دەیچریکاند دەنگە ژێیەکانی وەك ژێی کەمان دەیان قیژاند سەدایەکی دەرکرد من و (کامەران) چاوەکانمان پڕ بوون لە فرمێسك و تێر گریاین چ دەنگییك! وای مەست کردم ئاگام لەوە نەمابوو کە خەڵکانێکی زۆر لە چوار دەورمان کۆبوونەتەوە چاوەکانم نووقاند و لەگەڵ سەدای ئەودا چوومە دنیایەکی دیکە.

لەودیو بینایییەمەوە دنیایەکی دیکەم دەبینی هەستم بە وجوودی فەزایەکی دیکە دەکرد دنیایەکی تەواو جیاواز، مرۆڤم دەبینی بە روتی رێیان دەکرد کچان عەورەتیان رووت دەکرد و

هاواریان دەكرد منداڵان بە ئاشكرا مەمكی كچ و ژنیان دەمژی و شیریان دەخوار دەمودەست وام هەست دەكرد ئەمە رۆژی قیامەتە، چاوەكانم كردەوە خۆر وردە وردە لەگەڵ نزیك دەبووە، (سەهەند) بەردەوام بوو لە گۆرانی و دەیچریكاند هەندێك لە دێڕەكانی دووبارە و سێ بارە دەكردەوە، تەماشام كرد یەكێك لە باخەوانە بەرگ پرتەقاڵییەكانی (پارك) خۆی دابوو بەسەر خاكە نازەكەیدا و هۆن هۆن دەگریا، نەم دەزانی بۆچی دەگری دیمەنی كچ و كوڕێكی ئاشق لە دووررا سەرنجیان راكێشا ئاوێزانی یەك ببوون و دەمیان لەنێو دەمی یەكتردا بوو شەرمیان لە پاسەوانەكانی نێو پارك نەدەكرد و ئاوێزان دەبوون رادەموسان (سەهەند) دەستی دەجووڵاند و سەری دەلەقاند، (كامەرانی وەنەوشە) گوڵەكەی سەر سنگی با دەداو، هەناسەی قووڵی هەڵدەكێشا، گۆرانی هەر بەردەوام بوو، كەرنەڤاڵی سەمای خەڵك و مەلە لانەوازەكانی ئێواران بەردەوام بوو، لەو كاتەی كۆتا وشەی گۆرانییەكەی وت، ئێمە بە شێوەیەكی نا سروشتی مات دەبووین و تێكرا دەماین خەڵك دایە چەپڵە لێدان (سەهەند) شەرمی دەكرد و سەری دادەنەواند، كچان و كوڕان و باخەوان و خەڵكی پیادە هاواریان دەكرد و دەیان گوت (ئافەرین، ئافەرین، بۆ ئەو دەنگە خۆشەت بە راستی مەستت كردین) لە هەموو لایەكەوە هاڕەی چەپڵە دەهات زۆربەی ئەو خەڵكە داوای ئەوەیان دەكرد كە رەسمیان لەگەڵ بگرن، ئەوان لە چاوانیاندا ژیان و جوانی دەبینرا و ئێمەیان بەفریشتە دەزانی گوێم لێ بوو كچێك بە دەنگییكی نزم وتی (سێ كوڕی زۆر سەیرن لە هەموو شتێكدا لە یەك دەچن، جوانییەكەیان بێ ئەندازەیە) ئەگەرچی من و (كامەرانی وەنەوشە) گۆرانیبێژ نەبووین، بەڵام هاوڕێی (سەهەند) بووین لە هەموو لایەكەوە خەڵك دەهات و فلاشیان دەدا و وێنەیان لەگەڵ دەگرتین وەك ئەوەی، لە ئاسمانێكی دیكەوە دابەزیبین، كچان و كوڕان تەوقەیان لەگەڵ دەكردین وەك ئەوەی ئێمە فریادڕەسی ئەوان بین و ئازادیمان بۆیان هێنا بێت، بەڵام، لەسەردەمی جەنگدا ئەوەی دڵی خەڵك خۆش بكات ئەوە فریادڕەسە لەبەر ئەوەی كەلێنێك لە رۆشنایی لەناو مرۆڤدا نامێنێت لەسەردەمی جەنگدا.

من جار جار سەرنجی (كامەرانی وەنەوشە)م دەدا زۆر بێدەنگ دەردەكەوت لێم پرسی و وتم (كوڕە وەنەوشەییەكە، بۆ وا بێدەنگ دەتبینم، تۆ لە رۆژی وەهادا دەبێت، دنیا بە شێوەیەكی دیكە ببینیت دەبێت زیاد لە خەڵكی ئاسایی رەفتاری جودا بكەین، ئێمە تۆ بە مامۆستایەكی بلیمەتی خۆمان دەزانین) بە كەمێك زەردەخەنە و سنگی كراسەكەی چاك كرد و دەمی كردەوە ددانە سپییە ئەڵماسیەكانی لە ژێر خۆرئاوابوونی ئێوارەدا دەبریسكانەوە تاڵێك قژی هاتبووە سەر ناوچەوانی بە پەنجە لای داو وتی (ئەم جۆرە ئازادییانە، خەم لەگەڵ خۆیان دەهێنن، روحی جەللادمان تیا

دروست دەکەن و دواتر بە شوێن ماتریاڵدا وێڵ دەبین، ئەو ماتریالانەی مرۆڤ شەڕیان لەسەر دەکات، ئێمە هەمیشە دژی ئەو ماتریالانە بووین کە دەبنە مایەی سەر ئێشە بۆ مرۆڤ، مرۆڤ خۆی بۆ خۆی ماتریالێکی بۆگەنە و دنیاش بۆگەن دەکات، دڵنیام ئەوەی لە کۆندا رووی داوە بەردەوام لە سەدەکانی داهاتوودا دووبارە دەبنەوە، چونکە مرۆڤ هەر چییەك بێت لە جوانی مانای خۆی تێناگات هاوکێشەکانی ژیانی خۆی تا هاوسەنگ دەکات و تەوازنی ژیان ناشرین دەکات، سەیری مێژوو بکە لە کوشتن زیاتر هیچ لە هەگبەی مرۆڤدا نەبووە لە جەنگەکانی جیهانی یەکەم و دووهەمەوە بگرە تا ئێستا ملیارەها مرۆڤ کوژراون بە چەکی جودا جودا، ئایا شارستانییەت ئاوها دەبێت؟ دەبوو مرۆڤ بیر لە شتی جدی تر بکاتەوە نەوەك جەنگ، راستە من بە رووکەش کەمێك ئاسوودەم، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی من رازیم لەم جۆرە ژیانەی لەسەر ئەم زەمینە پیادە دەکرێت) کەمێك وەستا و چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو، ئەو کاتە هێدی هێدی خۆر ئاوا بوو دنیا تاریك داهاتبوو گڵۆپەکانی پارك کەوتبوونە کار، خەڵکی بە جێیان هێشتبووین و گەڕابوونەوە ناو ماڵەکانی خۆیان، (سەهەند) دەیگوت: (کامەرانی برام باسی چیرۆکەکەمان بۆ بکە... ئەوەی لەناو ئوتۆمبێلەکەمدا... باست کرد و وتت تەواوی دەکەم بۆتان ئێستا کاتی ئەوەیە، ئەو چیرۆکەمان بۆ باس بکەی، دواتر منیش نهێنییەکانی ژیانمتان بۆ باس دەکەم).

پلووتارخ مێژوونووسی کۆنی یۆنان و رۆمانییەکان باسی دیرۆك دەکات، بەم شێوەیە دەستی کرد بە باس کردنی چیرۆکەکەی بە وتەی خۆی زۆر کاریگەری هەبووە لەسەری، لەم جۆرەڕووداوە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا زۆر دووبارە بۆتەوە کامەران گوتی (ئەو وێنەیە زۆر جوانە لەلام نموونەیەکە بۆ ئافرەتی ئازاو سەربەرز، من هەمیشە ئەو وێنەیە ژیانم بیر دەخاتەوە لە مانای ئافرەت تێ دەگەم، جەنگ ئافرەت لەناو دەبات و ژیان دەکوژێت وەك چۆن منیان کوشت و بێبەشیان کردم، لە هەست کردن بە ئافرەت) درێژەی بە گێڕانەوەکانیدا و دەیگوت: (یەکێك لە مێژوونووسە دێرینەکان (پلووتارخ) لە ساڵی ٤٦ ی زاین ژیاوە تەمەنی هەشتا و یەك ساڵ بووە و دواتر کۆچی دوایی کردووە یەکێکە لە مێژوونووسە دێرینەکانی یۆنان ژیان نامەی کەسەکانی نووسیوە کتێب و دەستنووسەکانی بەڵگەی مەزنی مێژووین، من یەکێك لەو کۆپیە عەرەبیانەم دەستکەوتووە کە باس لە نووسین و ژیانی ئەم پیاوە دێرینەی مێژوو دەکەن لە یەکێك لە خانەوادەکانی یۆنان هاتۆتە دنیاوە باسی لاقەکردنی ئافرەتانی خێڵی (سابین) دەکات، رەنگە ئێوە تەواو لەم ئاخاوتنانەم تێ نەگەن، بەڵام وردە وردە بە کورتی بۆتان باس دەکەم) هەردووکمان من و (سەهەند) وتمان (بەردەوام بە، گوێمان راگرتووە) ئەویش دەیگوت: (نەتەوەی (سابین) یەکێك بوون لە هەرە خێڵە کۆنەکانی

ئەو کاتەی وڵاتی (ئیتاڵیا)ی ئێستا ئەوان لەو ناوچانەدا ژیاون، بەڵام ڕۆژێك لە ئاهەنگێكدا ئابروویان دەبرێت و لەلایەن پاشایەکی ڕۆمیەوە (ئافرەتانی سابین) دەست بەسەر دەكرێن و لاقەیان دەكرێت جا با بۆتان باس بکەم ئەمە چۆن ڕوویدا لە کتێبەکەی (پلووتارخ)دا هاتووە بەم شێوەیەیە (لەسەر زەوی (ئەلبا لۆنگا) ڕۆمانییەکان ژیاون و ئەنجوومەنی پیرانیان هەبووە و پاشایان هەبووە، ئەمە بە پێی ئەفسانە کۆنەکانی ڕۆمان پاشایەکیان هەبووە بە ناوی (کۆمتیا کۆریتا) دواتر بەرنامەڕێژی زیاتریان کردووە و دامەزراوتر بوون، بەر لە دروست کردنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمان لەناوچەی (ئەلبا لۆنگا) ژیاون پاشایەکیان هەبوو بە ناوی (ئەنیاس) تاکە کەسێکە کە کوڕی (ڤینۆس) بووە و لە شەڕی (تەڕوادە)دا ڕزگاری بووە و لەو ناوچەیە ژیاوە نەوەکانی (ئەنیاس) درێژەیان بە ژیان داوە لەناوچەکانی (ئەلبا لۆنگا) (ئەمیلۆس) کوڕی (ئەنیاس) پاشای (ئەلبا لۆنگا) بووە، جا سەیری ئەم ڕووداوانە بکەن (نومیتەر) برای (ئەمیلۆس) دەبێت براکەی لەسەر حوکم دەخات و خۆی دەچیتە جێگاکەی، (ڤیستاڵ) کچی (ئەمیلۆس) دەبێت کە لەلایەن مامی واتە (نومیتەر) سزا دەدرێت بەوەی کە نابێت منداڵی ببێت لەبەر ئەوەی منداڵەکانی ئەو دەسەڵات لەم وەرنەگرنەوە، بەڵام (ڤیستاڵ) دوو کوڕی دەبێت لە ساڵی ٧٧١ پ. ز. ئەو کاتە لە زیندان دەبێت چونکە مامی زیندانی کردووە.

باوکی ئەو دوو کوڕە ناوی (مارس) دەبێت خودای شەڕ لەلای ڕۆمانییە کۆنەکان ئەمانە ئەفسانەی کۆنی ڕۆمانین، بەڵام ئەفسانە وا بەستەی ژیانی مرۆڤەکانی بووە و دەبێت هەر بێت، کاتێك (نومیتەر) دەزانێت (ڤیستاڵ) دوو کوڕی بووە، کوڕەکانی لێدەسێنێت و فەرمان دەکات کە هەردووکیان بخاتە ناو ئاوی ڕووبارێکەوە، پاش ئەوەی هەردوو کوڕەکە (ڕۆمیلۆس و ڕیمۆس) فڕێ دەداتە ناو ئاوی ڕووبار بە فەرمانی ئاسمان ئەو دوو منداڵە نامرن و کەناری ئاو دەگرن و لە ڕۆخی زەوییەکی سەوز دەگیرسێنەوە، لەو کاتەدا گورکێکی مێنەیی تینوو دێت ئاو بخواتەوە، بە دەنگی منداڵەکان بە ئاگا دێتەوە و بە ددانەکانی هەردوو منداڵەکە هەڵدەگرێتەوە و منداڵەکانیش شیری گورگە مێنیکە دەخۆن دواتر پیاوێك بە ڕێکەوت ئەو دوو منداڵە بە گورگەکە دەبینێت، ناوی ئەو پیاوە(فاوستاڵ) بووە هەردوو منداڵەکە دەخاتە نێو کڵاوەکەیی و بە دیاری دەیاندات بە خێزانەکەی و ئەوانیش ئەو دوو منداڵە بە خێو دەکەن و گەورەیان دەکەن و دواتر لە ساڵی ٧٥٣ ز (ڕۆمیلۆس) دەبێتە یەکەم پاشای ڕۆم و ئیمپراتۆرییەتی ڕۆم دروست دەکات، بەڵام (ڕیمۆس) لەگەڵ (ڕۆمیلۆس) دەبێتە شەڕیان لەسەر ناونانی ئەو شارەی بە نیازن بنیادی بنێن هەر یەکەیان دەیەوێت ناوی شارەکە ناوی خۆی بێت، بەڵام پێشبڕکێی یەك دەکەن و (ڕۆمیلۆس) دەیباتەوە هەندێك دەڵێن

(ڕیمۆس) لە پێشبڕکێیەکدا براوە بووە و (ڕۆمیلۆس) کوشتوویەتی بە هەرحاڵ (ڕۆمیلۆس) یەکەم شاری (ڕۆم) بنیات دەنێت بە شێوەیەکی زۆر جوان و بە بینای گەورە و ناوازە شار دروست دەکەن هەڵبەتە پێویستی بەسەرباز و سوپا دەبێت هەر بۆیە لەبەر کەمی سەربازی رۆمی (ڕۆمیلۆس) پلانێك ساز دەکات لەربارەی خەڵکی (سابین) تا ئافرەتەکانیان شوو بە پیاوانی رۆمی بکەن، بەڵام ئەوان داواکەیان رەت دەکەنەوە، ناچار (ڕۆمیلۆس) هەموویان بۆ ئاهەنگ یان بڵێین کەرنەڤاڵی (نیبتۆن) بانگێشت دەکات، خێڵی (سابین) لە چەند ناوچەیەك ژیاون لە دەوروبەری (ئیتاڵیا)ی ئێستا لەبەر ئەوەی سوپای (ڕۆمیلۆس) کەمن و پێویستیان بە نەوەیەکی نوێ دەبێت لەبەر کەمی ئافرەت ناچار پەنا بۆ (سابین)ەکان دەبەن، دوای ئەوەی هەموو خێڵی (سابین) تێکڕا دێن بۆ کەرنەڤاڵەکە پیاو ژن و منداڵ دێن و دەبینن شارێکی نوێ بە ناوی (ڕۆم) دروست کراوە سەرسام دەبن بەوەی کەوا زوو ئەم شارە بنیات نراوە بینای گەورە و منارە و قەڵا و قادرمە و چەندین شتی دیکە لەوێ (ڕۆمیلۆس) ئامادە دەبێت دیارە پێشتر پلانەکەی بە پیاوەکانی راگەیاند بوو ئاماژە بەوە دەدات کە دەست بەکار بن ئەوانیش بە ئاماژەکەی (ڕۆمیلۆس) دەست بەکار دەکەن و لە پیاوەکانی (سابین) دەدەن و زۆریان لێ دەکوژن و هەموو ژنەکانیان دەگرن و هەر سەربازە و دانەیەك دەگرێت و لاقەی دەکات ئافرەتانی (سابین) ناسك و جوان بوون هەندێکیان بە دیاری دەدرێن بە ئەندامانی پیرانی رۆم و بەم شێوەیە کەرنەڤاڵەکە کۆتایی دێت و شەڕەفی (سابین) دەشکێنرێت.

وەك لە وێنەکەدا دیارە کە من لەناو یەکێك لە کتێبەکانمدا هەڵم گرتووە ئافرەتێکی سپیپۆش لەنێوان شەڕکەراندا دەست رادەگرێت و داوای ئاشتی دەکات ئافرەتانی (سابین) هەموو رووت کراونەتەوە و دەستدرێژیان کراوەتە سەر زۆربەیان بەباوەشی سەربازەکانی (ڕۆم)ەوەن ئەم وێنەیە کە باسی ئەو کەرنەڤاڵە دەکات لە ساڵی ١٧٩٩ ز لە لایەن (جاکۆس لویس داڤیدس)ەوە دروست کراوە وێنەکێشی بە ناوبانگی کلاسیکی فەڕەنسی بووە، بە هەرحاڵ ئەوەی لەو شەڕەدا رزگاری دەبێت دواتر لەناو سوپایەکی تردا دامەزراو دەبێت و بەسەرکردایەتی پاشایەکی (سابین)ی بە ناوی (تاتیوس) هێرش دەکەنە سەر (ڕۆم) و شارەکە داگیر دەکەن و ئافرەتانی (سابین) رزگار دەکەن، بەڵام (ڕۆمیلۆس) بە شێوەیەکی دیبلۆماسی کێشەکە حەل دەکات و بڕیار دەدات دەست بەرداری کورسییەکەی بێت بۆ (تاتیوس) بە مەرجێك ژن و ژنخوازی لەنێوانیاندا پەرە بسێنێتەوە.

بەم شێوەیە بوو، بەڵام ئەوەی جێگای سەر سووڕمانە ئەویە کە مرۆڤی ئەو سەردەمە مرۆڤی سەرەتایی بوون و ئەوندە سیاسی ئیشیان کردووە شەیتانئاسا بوون، زۆر شێوەکار وێنەی ئەو

کەرنەڤاڵەیان کێشاوە وەك (نیکۆلاس پۆسین) و (جۆهان هینریك) و (جۆن لیچ)، بەڵام لای من وێنەکەی (داڤیوس) لە هەموویان جوانتر و قەشەنگ ترە، ئەو وێنەیە هەڵدەگرم و جوانترین شتە لەلام یەکێکە لەو شتانە ئەرشیڤم کردون و دەیان پارێزم، ژیان لە هەموو کاتێکدا لە ململانێدایە مرۆڤ هەر لەسەرەتای دروستبوونی ئەم سەرزەمینەوە بە دەوری شەڕ و جەنگدا سووڕاوەتەوە ئێستاش جەنگ پانتاییەکی بێ شوماری داگیر کردووە، براکانم ئەوە چیرۆکەکە بوو کە بۆم گێڕانەوە راستە من مێژوونووس نیم، بەڵام ناتوانین پشت لە مێژووی مرۆڤ بکەین مرۆڤ تا لە رابردوو نەڕوانێت ناتوانێت داهاتوو وێنە بکات.

دەستی گرت بە ناوچەوانییەوە و کەمێك لەسەر مێزەکە راما و دووبارە وتی (سەیرترین شتێك کە مرۆڤ فێری ببێت هونەری کوشتنە) زۆر بە دەوری کوشتندا دەسووڕایەوە هەمیشە گلەیی لە مرۆڤ هەبوو، وا قسەی دەکردو وەك لەودیو سنووری مرۆڤاکانەوە گفتوگۆ بکات بە شێوەی فریشتەیەك جودا لە ئادەمی قسەی دەکرد، من هەروام هەست دەکرد کە ئەو ئادەمی نییە و جیاوازە لە مرۆڤ هەموو ململانێکانی ئەو لە پێناوی جوانی مرۆڤدا بوو، بەردەوام بە دوای ریگایەکدا دەگەڕا کە جوانی بۆ مرۆڤ بگەڕێنێتەوە، هەمیشە دەیگوت: (سەروەری مرۆڤ ئەو کاتە دێتە بەرهەم کە پشت لە حەزەکانی خۆی بکات و لە خەمی مرۆڤاکانی دیکەدا بێت، ئەگەر ئەم هاوکێشەیە بەم شێوەیە بێت هەموو کەسێك دڵسۆزی بەرانبەرەکەی بێت ئیدی کەس نامێنێت دێوانەی سەر شەقامەکان بێت) شەوێکی سەیرمان بەڕێ کرد، مانگ بە ئاسمانەوە دەبریسکایەوە دنیا رووناك دەینواند وام هەست دەکرد لەسەر تەختەی شانۆیەك نمایش دەکەین و رووناکی دنیا هەموو بۆ ئێمە دانراوە، سێ پیاو گفتوگۆمان دەکرد لەسەر رەوڕەوەی ژیانی مرۆڤ لەسەر جەنگ و ئەشق لەسەر ئەفسانە و راستی لەسەر کۆتر و گوڵ لەسەر ئەستێرە و دەریا لەسەرزەمین و بەهەشت و... چی و چی... کات تێدەپەڕی و ئێمە هەر لە قسەکردن بەردەوام بووین، (سەهەند) دەیگوت: (براکانم، نۆرەمە... قسە بکەم... ها ها ها... نۆرەی منە...) هەستم دەکرد کارێکی گرنگی ئەنجام داوە و دەیەوێت بۆمان باس بکات، بەر لەو شەوە چەند جارێك سەرە داوێکی بۆ باس کردبووین، بەڵام ئەنجامێکی وەهای نەبوو تەواو لە مەبەستی تێ بگەین... بە هەرحاڵ بەم شێوەیە دەستی بە وتەکانی کرد، کەمێك خۆی قنج کردەوە و ویقاری خۆی لەژێر نووری مانگ دا پیشان داین (براینە ئێوە ناوی (ئاروویین)تان بیستووە؟ ) من تەماشای (کامەرانی وەنەوشە)م دەکرد ئەویش چاوە بریقەدارە تەڕەکانی بڕیبووە من بە ئاماژەکانماندا دیار بوو کە ئەو ناوەمان بیستووە، وتی (ها... ها... ها، چەند جارێك هەروا هەندێك شتم لۆتان باس کردووە لەربارەی ئەو کیژە)...

یەکسەر بیرم کەوتەوە ئەو کچە ئەوەیە کە شەوێك لەگەڵ (کامەرانی وەنەوشە) پێکەوە لە بەشی ناوخۆیی باسیان دەکرد.

(کامەرانی وەنەوشە) دەستی دەکرد بە قسە کردن و دەیگوت: (سەهەند ئەو کچەی لە کۆلێژی ئەدەبیات دەیخوێنێت، ئەوەی خەیاڵی تۆی بردووە، ئەو کەسەیە وانییە؟ ) لە وەڵامدا (سەهەند) گوتی (بەڵێ... بۆ خۆیەتی... یەکەم جار بە سەردانێك چوومە ئەوەێندەر بینیم، نیگامان تێکەڵاوی یەکدی بوو) درێژەی بە قسەکانی دا ئێمەش بە شەوقەوە گوێمان بۆ قسەکانی گرتبوو، جوانترین مرۆڤ و گەورەترین کەس ئەوەیە، لە کاتی وتووێژی کەسێکدا بێ وچان گوێی بۆ بگرن ئەوە جوانترین رەوشتی مرۆڤە، ناخۆشترین شت ئەوەیە کە قسە بکەیت و بەرانبەرەکەت گوێت لێ رانەگرێت وەك ئەوە وایە، بە درێژایی رۆژ کرێکاری بکەیت و سەر لە ئێوارە خاوەن کار بڵێت سبەی پارەکەت دەدەمێ، بە هەرحاڵ ئەو لەبەر ئەو هۆیە ئێمەی بە برای خۆی دەزانی چونکە بەردەوام پشتیوانی بووین و گوێمان لە وتەکانی دەگرت، (سەهەندی بایز ئاغا) بەردەوام دەبوو لە قسە کردن و دەیگوت: (ئەمڕۆ ئاهەنگێك لە کۆلێژی ئەدەبیات رێخرا بەبۆنەی ئازادبوونی عێراق لە دیکتاتۆریەت بە رێکەوت، هاوڕێیەکم گەیاندە ئەوێ بە ئوتۆمبێلەکەم هەر بۆیە ئەمڕۆ نەمتوانی سەر لە بەیانی ئێوە ببینم، هاوڕێکەم تکای لێکردم کە بچم لەگەڵی، لە راستییدا نەم توانی دڵی بشکێنم و بە هاوڕێیەتی ئەو زۆر کەشخە خۆمان گۆڕی بوو، چووینە ناو ئاهەنگەکەوە و لەسەر دوو کورسی لەلایەك دانیشتین، تیپی مۆسیقا کەوتە کار و ئاهەنگ دەستی پێکرد هاوڕێکەم کە ناوی (شالاّو ئیحسان)ە و ماڵیان لە نزیك ماڵی ئێمەیە خوێندکاری ئەو کۆلێژەیە لە بەشی شوێنەواردەخوێنێت بە هەندێك لە هاوڕێکانی خۆی ناساندم و بە شەوق و پێکەنینەوە خۆم پێدەناساندن، ئەو وەك کوڕێکی دەنگخۆش ناوبانگی منی بیستیبوو لەناو کۆڵان و گەڕەك سەردەمانی منداڵییمان، راست قسە بکەم تەنانەت دەیزانی کە من لەلای هەندێك مامۆستای تایبەت وانەی مەقاماتی کوردی و حەیران فێر بووم بۆیە وەك هونەرمەندێکی مەزن منی بەوان ناساند وای لێکردین دەنگۆی ئەوەی بڵاو کردەوە کە کوڕێکی دەنگخۆش لێرە ئامادەیە و خوێندکاری ئەندازیارییە و گۆرانی زۆر خۆش دەچڕێت.

هاوڕێکەم واتە (شالاّو ئیحسان) دەستییك جلی کوردی رەنگی خۆڵەمێشی لەبەردا بوو تەزبیحێکی گەورەی بە دەستتەوە بوو، کوڕێکی زۆر قۆز و جوانی کۆلێژەکەی خۆیان بوو، لەبەر جوانییەکەی چەندین هاوڕێی کیژی هەبوو، لەگەڵ ئەوەی کە کوڕێکی کەشخەی وەك من لەوێ بووم هەموو بە دەوری (شالاّو)دا دەهاتن و دەچوون و بزەیان بۆ من دەکرد، پاش ئیستێك لە

دووررا لە سووچێك چاوم كەوتە سەر كیژێك زۆر جوان بوو كیژێكی سپی پێستی چاو سەوزی قژ لوول كە لە (هۆلیا ئەفشەر)ی تورك دەچوو تەنوورەیەكی رەشی كورتی لەبەردا بوو لەگەڵ بۆدییەكی سەوز پرچی بڵاو كردبوویەوە پرچی زەرد وەك تەڵا دەبریسكایەوە كاتێك روونتر تەماشام كرد زانیم ئەمە ئەو كیژەیە كە بەر لە ماوەیەك بۆ یەكەم جار لێرە بە سەردان هاتبووم و بینیم دیتم ئەویش بە هەمان شێوە سەیرم دەكات، یەكسەر خورپەیەك بە دڵم دا هاتوو رەنگم بۆ تاوێك تێك چوو دیتم (شاڵاو) دەستی دا بە شانمدا و وتی (سەهەندی بوولبول، ئەوە چییە؟ بۆ رەنگت پەڕی چی بووە؟ ) من سەرەتا ویستم (شاڵاو ئیحسان) واهەست نەكات كە شتێكی نائاسایی بەسەر من هاتووە وتم (هیچ نییە) داوای یارمەتی لێ كردم و وتی (سەهەندی بوولبول) ئێستا دێمەوە) دیتم (شاڵاو) رۆیشت بۆ لای سەحنەی تیپی مۆسیقاكە و چپاندی بە گوێی (عەریف)ی ئاهەنگەكەدا و پاش كەمێك گەڕایەوە كن من، من هەر لە كیژەكەم دەڕوانی، تا ئەو كاتە نەم زانیی بوو لە چ بەشێك خوێندكارە و زانیاری وەهام لەسەری نەبوو، (شاڵاو) بووتڵێك ئاوی بۆ هێنام و گەڕایەوە و وتی (كەمێك ئاو بخۆوە) كەمێك ئاوم خواردەوە و سەیرم كرد كەوا (ئارووین) لەودیوەوە چاوی لەسەرمە و بەردەوام بۆم دەڕوانێت، بە راستی لەو شارەدا باو بوو، هەر كەسێكی غەریبە سەردانی جێگەیەكی وەهای بكردبایە وەك ئەوە بوو قازێكی شین لەناو كۆمەڵێك قازی سپییدا بەرەڵا بكەی وەها دیار و نەشاز بووم لەناو خوێندكارە شای كەرەكاندا، ریزی هەڵپەڕكێ دەستی پێ كرد و هەموو بە كەیف و خۆشی هەڵپەركێی كوردیان دەكرد و دەسووڕانەوە و سەمایان دەكرد سەرچۆپی بە ئاڵای كوردستان دەگێرا و نەدەكەوتە سەر عەرد، هەموو هەڵدەپەڕین بێ جیاوازی لەنێوان كورد و توركمان و عەرەب و مەسیحی و مسوڵمان و كاكەیی و ئێزیدی)، (سەهەند) كەمێك لە قسەكردن وەستا و هەناسەیەكی قووڵی هەڵمژی و تەماشای من و (كامەرانی وەنەوشە)ی دەكرد و دەیگوت: (براكانم... تكایە سەرتان دێشێنم ئەگەر بێزار بوونە، ئەوا ئیدی دەوەستم)... (كامەرانی وەنەوشە) وتی (نا (سەهەندی بوولبول) ئەی دەنگخۆشترین مرۆڤی سەر ئەم زەمینە بەردەوامبە ئێمە بە تاسەوە گوێ دەگرین، ئەوەی لەناو گۆرانی و نۆتەكانی تۆوە دێتە دەر... پڕن لە جوانی و بەهار... قسە بكە مانگە شەو لە ئاسمان بێ تۆ وەستاوە) (سەهەند) وتی (ها... ها... ها بەڵێ با وابێت، ئیدی بە زۆر (شاڵاو) دەستی گرتم و بردمیە ناو هەڵپەڕكێ كەران و دەستم كرد بە شایی كردن و دوو سووڕ یان زیاتر هەڵپەڕیم و دەستم بەردا و لە جێگای خۆم دانیشتم، براكانم ئەشق لە یەكەم بینینەوە كاری خۆی دەكات ئەو دەمە

هەستم کرد کە ئەم هاتنەم بە ڕێکەوت نەبووە بۆ ئێرە هەستم کرد قەدەرێکی ئیلاهی پـاڵی نـاوم و هاتوومە ئەم ئاهەنگە.

ئاهەنگ کاتژمێرێك زیاتر بوو بەردەوام بوو، پشوویەکی کورتیان وەرگرت دیارە خۆتان دەزانـن لەو پشوو وەرگرتنەدا دەبێت گۆرانییەکی هێواش بگوترێت و خەڵك بە دانیشتنەوە گوێ بیست بـن و هەڵپەڕکێ بووەستێت نەمزانی گوێم لێ بوو عەریفی ئاهەنگ وتی (با ئێستا بوولبولێکی میـوان بێت و گۆرانییەکی خۆشتان بۆ بڵێت ئەویش خوێنـدکارێکی میـوانی ئـازیزە و نـاوی (سـەهەندی بوولبول)ە خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیارییە و لێرە میوانە با بفەرمووێت بۆ سەر شانۆ) وەك ئەوەی دنیام لێ ئاخر بێت بەرچاوم ڕەش داگیرسا و زۆر ترسام، ئاوڕم دایەوە بۆلای (شالاّو ئیحسان) دیـتم وا پێدەکێنێت کتوپڕ وتم (ئەمە کار بوو تۆ کردت من خۆم ئامادە نەکردووە و ناتوانم گۆرانی بڵـێم) وتی (ئەوەی (کازم ساهر) بڵێ دەزانم تۆ باش لێی دەزانیت دەنگت زۆر خۆشـە بـڕۆ براکـەم بـڕۆ). براینە، هەر چۆنێك بێت هەڵسامە سەر پێ تـازە چـارم ناچـار بـوو شـورەیی بـوو بـۆ خـۆم و بـۆ هاوڕێکەم ئەگەر نەچم لەلایەك، لە لایەکی دیکە (ئاروویـن) سەرسام دیار بـوو کـە منـی بینـی و هەڵسام بۆ سەر شانۆ، چونکە ئەو تا ئەو دەمە ناوی منی نەبیستبوو و زۆر بە سـادەیی تەماشـای کردبوو هەرگیز لە بیری ئەوەدا نەبوو کە من دەنگم خۆش بێـت، بـەڵام وام هەسـتم دەکـرد ئەمـە تاقیکردنەوەیەکی باش بێت و بتوانم زیاتر خۆم بخەمە ناو دڵی، ئەو کاتەی کە دەچـمە سـەر شـانۆ دەمزانی کە زۆر بە پەرۆشەوە گوێم بۆ دەگرێت دەبوو هەرچی زوو بوو کارێکی وەها بکەم لە دڵێـدا جێگای خۆم بکەمەوە زانیبووم ئەو مەسیحییەو موسوڵمان نییە ئاخر کارێکی دژوار بـوو، راسـت بوو من گۆرانی زۆرم دەزانی و لە هەموو زمانێك چەند نوتفەیەکم لە ناخدا هەبوو، دەشمزانی وتنـی گۆرانی بە زمانی عەرەبی بۆ ئـەو خۆشـترە و ئاسـانتر لـە نـاخی مـن دەگـات و دەچـمە دڵێـەوە نیگاکانی ئاسایی نەبوون لەسەرم، تەماشایان دەکـردم هـەموو ئامـادەبووان، هـەر چـۆنێك بێـت چوومە سەر شانۆ لە راستییدا من لەوە بە شان و شەوکەت تر بووم کە (ئاروویـن) چاوەڕوانی دەکرد خۆشبەختانە زۆر بۆشناخ خۆم گۆڕی بوو پرچم بە لادا خستبوو بـە شـێوەیەکی زۆر جـوان بریقـەی قۆنەرەکانم سەرنجی زۆریانی راکێشا بوو، من عادەتمە هاوڕێیـان زۆر گرنگـی بـە قۆنـەرەکانم دەدەم ئەوەی قۆنەرەکانی بریقەدار و سەرنجڕاکێش نەبێت ناتوانێت بازد بداتە نێو دڵی دڵنەوازەکەیەوە، بـە هەر حاڵ چوومە سەر شانۆ و مایکم گرت و خۆم پێیان ناساند) و وتم (خۆشحاڵم بـەوەی ئێمـە لـە ئێستادا ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێڕین جیاوازی لەنێوانماندا نییە لە ڕووی نـەژاد و ئـایین و نەتـەوە هەموومان مافێکی مرۆڤانەمان هەیە و لەسەر ئەم خاکە دەژین وەك وتار بێژێك دەردەکەوتم دواتر

وتم (گۆرانییەکی هونەرمەندی گەورەی عێراقیتان بۆ دەڵێم، بە گوێی مۆسیقارەکانمدا چرپاند کە مۆسیقایەکم بۆ بژەنن لەگەڵ ئاستی دەنگمدا بگونجێت، بە کابرای ئۆرگ ژەنم وت هەوڵ بدات مۆسیقای گۆرانی (انا و لیلی) ی هونەرمەند (کازم ساهر) بژەنێت پاش چەند جارێك لە تایم دانی ئامێرە مۆسیقاییەکان ئاوازی گۆرانییەکەی بە شێوەیەکی زۆر جوان عەزف کرد... ها... ها...) بە پێکەنینێك لە قسەکانی وەستا منیش وتم (سەهەندی بوولبول) (بۆ وەستایت، ئەزانم کات بەرەو درەنگی دەڕوات، بەڵام ئێمە لێرەدا ناجووڵێین تا باسەکەمان بۆ تەواو نەکەیت... زۆر تامەزرۆین تا دوا دێڕ لەگەڵت بین بزانین چی روویدا دواتر) سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد و دەستی کردەوە بە قسە کردن بە شێوەیەکی زۆر هێمن و لەسەرخۆ (لەو کاتەدا کە چەند چرکەیەك لە مۆسیقا رۆیشت، یەکەم وشەی گۆرانییەکەم گوت، چاوم نوقاند و وام هەست دەکرد کە لەناو باخێکی بێشوومارداو و بە تەنیا گۆرانی بۆ خۆم دەڵێم، دەستم کرد بە گۆرانی وتن و لەناو وشەکاندا تێکەڵاو ببووم، دنیایەکی سەیر لە پێش چاوم بوو، هەستم بە دەنگی مۆسیقا و دەنگی خۆم دەکرد، جگە لە من و مۆسیقاکان هیچ دەنگییکی دیکە وجوودی نەبوو، براینە بڕوام پێ بکەن وام دەزانی کە لەسەرزەمینێکی دیکەم و بە تەنیا گۆرانی بۆ لاوانەوەی گوڵەکان دەڵێم، من بەردەوام دەبووم لە گۆرانی و لەگەڵ مۆسیقادا دەڕۆیشتم و مایکەکەم دەگرت بە دەستمەوە و یاریم بە مایکەکە دەکرد و لە دەستەکانمدا دەملەرزاند و لەسەر مەسرەح دەهاتم و دەچووم وەك مەلێکی لەرزۆك جووڵەی سەیر و سەمەرەم بە خۆم دەخست، ئیدی رۆژ رۆژی من بوو نەدەکرا، دەرفەتی وەها نەقۆزمەوە و بە شێوەی ئەکتەرێکی سینەمایی دەبوو نمایشی خۆم بکەم، ئەوەی هەیە و نییە بە وشە و بە گۆرانی بیگەیەنمە گوێی (ئاروین)، وام هەست دەکرد ئەوە ئیدی هەموو دنیای منە ناچار بووم وا بکەم ئەوە دوا دەرفەتم بوو ئیدی ناچار بووم براینە... بە راستی دەنگم سەدایەکی نەبڕاوەی لە هۆڵەکەدا دروست کردبوو، ئاپۆڕای ئامادەبووان هێند زۆر بوو بۆ ساتێك کە چاوم کردەوە تاکە جێگایەکی بە تاڵم نەدەبینی هەموو ئاهەنگخوازان سەرسام و حەپەساو سەیریان دەکردم... دووبارە دەستم دەکردەوە بە گۆرانی وتن، دەمزانی کە (کازم ساهر) هەواداری زۆری هەیە و زۆرن ئەوانەی بە دیار گۆرانییەکانییەوە مەست و حەپەساو دەبن و دەگرین، ئەو رۆژە رۆژێکی خۆش بوو رۆژی لە گۆڕانی زۆردارێکی سەرزەمین بوو وەلێ، هەستم دەکرد، هۆن هۆن کچان بەو گۆرانییەی من دەگریان، جار جار چاوم دەکردەوە و دەمڕوانییە جێگاکەی (ئاروین)، بەڵام ئەوەندە قەرەباڵغ بوو تەواو دەموچاوەکانم لە یەکدی جودا نەکردەوە رووناکی زۆرم ئاراستە دەکرا زۆرینەیان فلاش کامێراکانی خوێندکاران بوون چەندین جۆر لە رووناکی و ئینارەش لەسەر

شانۆ یارییان دەکرد و بـە شـوێن هەنگاوەکانمـدا دەهـاتن و دەچـوون، گـۆرانی درێـژەی کێشـا... براینە... تا دوا وشەم وت، هەستم دەکرد ئەو دەمە دەنگم جودا لە رۆژەکانی دیکە کراوەیە و نـەم دەزانی هۆکاری چییە؟، نازانم بۆ مرۆڤ لە کاتی دۆزینەوەی یەکەمین ئەشقی راسـتەقینە ویاسـاغدا هەمیشە کاردانەوەیەکی نائاسایی تێدا روو دەدات کە بەر لەوکاتە مرۆڤ پەی پێنابات، ئەمـە ئـەو راستییە دەسەلمێنێت کە لەناو ناخی هەر مرۆڤێکدا هێزێکـی نائاسـایی و بـێ پایـان هەیـە و بـە شێوەی جیاواز دەردەکەوێت یان بە گۆرانی یان بە هونەر یان بەشەڕ یان بەفڕین یان... یان... یـان، بە هەرحاڵ... ئەوەی کە نەدەکرا و لە ژیانمدا نەدەکرا ئەو رۆژە واتە ئەم سـپییدەیە کـراو ئەنجامـدا گۆرانییەکەم تەواو کرد و چاوم کردەوە و سەری رێزم دانەواند بۆ ئامادەبووان براینە بڕوام پێ بکـەن بوو بەیەك چەپڵە رێزان، لە ژیانمدا چەپڵەی وەهام نەدیتووە بۆ هیچ سەرکردەیەی سیاسی و بۆ هـیچ وتار بێژێکی بووبر لێدرا بێت یەکپارچە دەست بوو دەیدا بە دەستدا وەك ئەوە وا بوو لە ئاسمان بم و لە دیمەنی فڕینی پۆلێکی گەورە لە نەورەس بڕوانم کچانم دەبینی چاوەکانیان دەسڕی و هەڵدەسـتانە سەر پێ و هاواریان دەکرد (ئافەرین ئەی بوولبول)) من کە سەیری (سەهەند)م دەکرد هەنـدێ جـار کەمێك خەمگین دەبینرا و هەندێك جار کەمێك گەشاوەتر بوو هەر بۆیە وتم (سەهەند ئیتر لـەمڕۆ بە دواوە... باشترە پێت بڵێن (سەهەندی بوولبـول) (کامـەرانی وەنەوشـە) کـەمێك بـە رامانـەوە دەیگوت: (دەنگت دیاردەیەکی نا سروشتییە بە راستی دەنگە ژێیەکانت لە تار دەچن ئاوازی سـەیر لە قوڕگتدا دروست دەکەی، لە شێوازەکانی مەقامدا تەواو شارەزایت، بە راسـتی توانـای دووبـارە کردنەوەی زۆر گۆرانی نەمرت هەیە وەك ئەوانـەی مامۆسـتا مەزهـەر و مـاملێ و سـەید عـەلی ئەسغەری کوردستانی و عەلی مەردان و تایەر تۆفیـق و مامـە سـێوە و رەشـۆڵ ئەمانـە دەنگـی رەسەنن تۆ تەواو لەمانەدا تواویتەوە، بە زەردەخەنەیەکی گوماناوییەوە قسـەکانی بـە (کامـەران) دەبڕی و دەیگوت: (ڕاستە من جیاوازم و دەنگم خۆشە، بەڵام دەنگم مایەی نەگبەتی منە زۆر جـار مرۆڤ لە یەکێك لە پێدراوە سروشتیەکانی خۆی وەڕس دەبێت و حەز دەکات لێی هەڵبێت و دەبێتـە بەڵا بۆی وەك جوانی و دەنگخۆشی و زیرەکی و هونەری ناوازە ئەمانە مایەی نەگبەتین مـن حـەزم دەکرد زۆر ئاسایی بوومایە و ئەوها ناسراو نەبوومایە دەنگم وای لێکردوم لە قسە کردنشـیمدا لـە خەڵك هەڵبێم و حەز بکەم دوور بکەومەوە لە ئاوەدانی، بەهرە شتێکی خەتەر ناکە و مرۆڤ دەکاتە ئاسك و سەدان پڵنگی چنگ بە خوێنینی بۆ پەیدا دەبێت) من هەڵمدایە و وتم (سەهەندی بوولبـول بەردەوام بە بزانم دواتر چی روویدا، پاش ئەوەی گۆرانییەکەت تەواو کرد، چی نائاسایی روویدا، لـە چاوەکاندا زۆر شت دەبینم، هەست دەکەم دیاردەیەکی نائاسایی یەخەی پێگرتوویت و چاوەکانی پـڕ

کردویت لە ئەسرین) دووبارە، دەستی کردەوە بە ئاخاوتن (براینە دوای ئەوەی چەپڵە بـاران کـرام و لەسەر شانۆ دابەزین دەموچاوم ئارەقێکی ساردیان دەردابوو بە سەدان کوڕ و کچ تەوقـەیان لەگـەڵ دەکردم و خۆیان پێ دەناساندم سەدان ستایشی جۆراو جۆرم بیست هەندێك دەیان گوت بـە راسـتی پشتی کازم ساهر ی شکاندووە هەندێك دەیان گوت چریکەی نائاسایی بوو لە سەرو دەنگی مرۆڤی ئاساییەوە بوو سەد حەیف ئەم کوڕە نەبووە بە گۆرانیبێژ هەندێکی دیکە دەیان گـوت ئـەم کـوڕە و ئەندازەیان نەوتووە براینە بڕوام پێ بکەن سەدان کەس بەردەوام داوایان دەکرد وێنەم لەگـەڵ بگـرن، جار جار هەستم دەکرد هەندێك کوڕی حەسوود خەریك بوون لـە داخـا دەتـەقین، دایـم کۆمـەڵێك کەسی نابەکام دوژمنایەتی بەهرەداران دەکەن ئەمـە هاوکێشـەیەکی دنیاییـە هەمیشـە کەسـانی راست بێژ و داهێنەر و بەهرەمەند کەسانێکی حەسوود و بێ بەهرە و مرۆڤ کوژیان لێ پەیدا بـووە، هەستم دەکرد، هەندێك چەقۆیان لێ دەسووم، پاش ئەوەی چوومەوە لای (شاڵاو ئیحسان) باوەشـی بۆ کردمەووە و وتی (سەهەندی بوولبول بۆ خۆم دەمزانی کەسێکی وەك تـۆ لـەم دنیایـەدا کەمـە، گوناه نییە دەنگە ژێیەکانت ئاوا زوو زوو مەقامی ئەوها نەپچڕن، بەڕاستی سـەر بـەرزت کـردم و بەهۆی تۆوە منیش چوومە لووتکە (سەهەند) تـۆ فریشـتەیەکی ئاسمانیـت دەنگییکـی زینـدووت هەیە و هیچ کات نامرێت، تۆ شایەنی هەموو شتێکی شازیت دەنگت شازە و خۆشت تەواو جـوان و ناوازەیت و دڵنیام دڵی هەزاران کیژت پارە پارە کردووە، کێ هەیـە کەسـێکی وەك تـۆی خـۆش نەوێت کێ هەیە بە سەدات سەرسام نەبێت مـن دڵنیـام بـەم گۆرانییـە و بـەو هـەموو وێنەیـەت ناوبانگێکی سەیر پەیدا دەکەی، بە گوێی مـن دەکـەی بـەردەوام بـە هونـەر دروسـتت دەکـات و بەختەوەرت دەکات) دیار بوو ئەو نەیدەزانی من ژانم لە کوێوە سەرچـاوەی گرتـووە مـن دەمزانـی هونەر بەدبەختم دەکات گۆرانی شەڕابی تاڵم پێ دەنۆشێت براینە من ئەو هەسـتەم هەیـە...)کات زۆر تێپەڕی بوو، هەستم کرد بە تەنیا ئێمە ماوین و لە ژێر نووری مانگە شەودا قسە دەکەین سـێ پارچە لە رووناکی سێ بوونەوەری جودا لە شارێکی کۆنی مێژوودا لەنێو پارکێکی چەپەکی شـاردا لەسەرزەمینێك کە هێشتا بۆنی خـوێنی لێ دەهـات بـەردەوام لەسـەر ژیـان و گـۆرانی و ئەشـق قسەمان دەکرد رووم دەکردە (سەهەندی بـایز ئاغـا) و (کامـەرانی وەنەوشـە) و دەیگـوت: (سـێ جەستە لە ژێر نوورێکدا باسی سەروەرییەکانی مرۆڤ دەکەن. سەیرە ئێستا خەڵکانێك هەن بـیر لـە بڕینی مۆزەخانەکانی وڵاتی سـۆمەر دەکەنـەوە بەرنامـە دادەڕێـژن و چـاوەڕوانی سـپییدە دەکـەن چاوەڕوانی دزینی زانکۆکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق دەکەن، لە هەمان کاتدا کەسـانێك هـەن لە تاریکییدا بە دوای ئەشق و رووناکی کپکراوی مرۆڤدا وێڵن) (کامەران) پـتر لـە شـێوازی وتـار

بێژیدا شارەزا بوو قسەکانی لە دەمی من وەرگرتەوە و وتی (سەفەر کردن بە نێو کووچەکانی نـاخی مرۆڤدا سەرگوزشتەی سەیر پەیدا دەکات، هەندێك کەلێنی نەبینراو لـەناو خـودی مرۆڤـدا هەیـە کەتەنگ و تاریکە و هیچ جۆرێك لە رووناکی نایگاتێ تەنیا رووناکی یەك بتوانێـت ئـەو کەلێنانـە پڕ بکاتەوە ئەویش درۆ نەکردنە، ئەگەر درۆ لە مرۆڤ بترازێت ئەوا هەموو ناخی یەك پارچـە رۆشـن دەبێتەوە، ئەگەر مرۆڤ درۆ لەگـەڵ مانـایی خۆیـدا نـەکات هـەموو کارەکـانی ئاسـایی دەڕوات و دەتوانێت سوود لەو هێزە ناوەکییەی ناخی وەربگرێت و بیخاتە خزمـەت رەوتـی ژیـان و رەوڕەوەی ژیانی مرۆڤەکانی دیکەش بگۆڕێت، من ئەگەر درۆ بکەم و بڵێم دەنگی (سـەهەند) ناخۆشـە ئـەوا دوو روح دەخەمە تاریکییەوە ئەو دەمە من لەسەر درۆکردن رادێم و لە راستی هەڵدێم بـە راسـتی ئەستەمە مرۆڤ لە راستی هـەڵبێت و بتوانێـت داهێنـان بکـات هـەموو داهێنـەرەکانی دنیـا لـە درۆکردن دوور بوون دیارە مەبەستم لە درۆی ئاساییە، چونکە بە جۆرێك لـە جۆرەکـان هـەموومان درۆ دەکەین، بەڵام هەندێك درۆ هەیە ئاساییە و نزیکە لە راستییەوە، بـەڵام درۆی گـەورە ئەوەیـە تامی جوانی بکوژێت و حەز بە هێنانی خوێن بکات) (سەهەند) دەیووت (هـەرگیز هەسـت ناکـەم رۆژێك گۆرانی وتن بەختەوەرم بکات، چونکە گۆرانی راکردنە لە ژیان ئەوانـەی دەنگـی رەسـەنن و گۆرانی بۆ خەڵك دەڵێن لە خۆیان هەڵدێن و بەرەو ناخی خـەڵك رادەکـەن، بـەڵام هەنـدێك دەنـگ هەیە بۆ ناو ناخی خۆی رادەکـات و حـەز بـە هـەبوونی خـۆی و نـەبوونی تـۆ دەکـات) بـەردەوام قسەکانی بەم شێوەیە دەکرد، من دەمزانی کە ئەو کوڕە واتە (سەهەند) زۆر رەش بینە و ژیـان بـۆ ئەو مانایەکی ناکامی هەبوو، هەموو دێڕێکی قسەکانی شێوە بەرز و نزمییەکی سەیری تێـدا بـوو هەندێك جار قاقای لێدەدا زۆر نا سروشتی دەنگی بـەرز و نـزم دەکـردەوە کـە مـن و (کامـەرانی وەنەوشە) تەواو لە وشەکان دەگەیشتین و دەمانزانی زۆر لەوە قووڵتر قسە دەکات کـەبتوانین کتـوپڕ تەفسیری هەموو دێڕەکانی بکەین.

شەوێکی سەیرمان بەڕێ کرد کات دەڕۆیشت و مانگ لە ئاسمان شوێنی خـۆی دەگـۆڕی و یاری دەکرد و دەڕۆیشت، دەمودەست (کامەرانی وەنەوشە) وتی (سەهەندی برام، دواتـر چـی روویدا ئەوەم بۆ بـاس بکـە، سـەیرترین شـتێك لـە دوای گۆرانییەکـە روویـدا چـی بـوو؟ ) دەستییکی بە دەموچاویدا هێنا و چاوی هەڵبڕی و کەمێك زەردەخەنەی کرد و وتـی (ئـەوەی کە زۆر سەیر بوو روو بدات، زۆر بە ئاسانی روویـدا، بـڕوا ناکـەم لـە ژیانمـدا رووداوی وەهـا دووبارە ببێتەوە، براینە خۆی پێ نـەگیرا و هاتـە بـەردەمم و بـە دەنگییکـی زۆر ناسـك بـە کوردییەکی نارێك و پێك کە خەڵکی نـاکورد لـە کـورد جیـا دەکاتـەوە وتی(دەسـتە خـۆش

عافەرم...) چەند جارێك بە هێواشی لەبەردەمم چەپڵەی لێدا و وتی (عافەرم) دەستی بۆ تەوقە کردن راکێشا، من لەوە حەپەساو تر بووم کە بتوانم هەروا زوو دەستم بۆ تەوقە رابکێشم بۆ تاوێك حەپەسا و وەستام لە جێگای خۆم راست بوومەوە دەنگییکی زۆر ناسك کە هیچ کات دەنگی وەهام نەبیستبووە بڕوا بکەن لە دەنگی ئاسایی سەرزەمین نەدەچوو وتی (عافەرم، دەنگت زۆرە خۆشە، زۆر زۆرە سەرسامم بەو دەنگە جوانەت) من هیچم پێ نەدەوترا، تەنیا ئەوەندە نەبێت زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و وتم (سپاس) ئێوە دەزانن من کێ دەڵێم؟ کچە مەسیحییەکە (ئارووین) دەڵێم) من سەیری (کامەرانی وەنەوشە)م دەکرد و حەپەساو بووم و بە شێوەیەکی زۆر نا سروشتی وەك گەڵای دارەکان خامۆش دەبوومەوە، لە راستییدا هەستم نەدەکرد لە کۆمەڵگایەکی داخراوی کوردیدا کچە گاورێك بەو شێوە ئاساییە لە کوڕێکی موسوڵمانی کورد بێتە پێشەوە و دەستخۆشی لەوە بکات دەنگی خۆشە و هەست بزوێنە، ئەوە کارێك بوو نامۆ بوو، چونکە هەر خودی خێزانە مەسیحییەکان ئەوەیان پەسەند نەبوو لەگەڵ کوردە موسوڵمانەکاندا پەیوەندی و هاوسۆزی زۆریان هەبێت، هەمیشە لە کۆلێژ و یانەی کۆلێژەکاندا بە گرووپی جیاواز جیاواز دادەنیشتین و بارستەیەکی جودایان پێك دەهێنا، بەڵام، ئەم نموونەیەی (سەهەند) باسی دەکرد جیاواز بوو وەك جیاوازی بەرد لە ئاو وەك جیاوازی خۆر لە مانگ.

(سەهەند) رووی بەرەو (کامەرانی وەنەوشە) وەردەگێڕا و بەردەوام دەیگوت: (بەڵێ بە باڵایەکی بەرز و جووتێك چاوی گەورەی سەوز و پرچێکی زەردی لوولی کراوەوە و بە تەنوورەیەکی کورتی رەش و بۆدییەکی سەوز لەبەردەممدا وەستا بوو، منیش لە ئاستیدا وەستا بووم براینە باڵای هێندێك لە من کەمتر بوو چاوە سەوزە ئەفسووناوییەکانی بڕیبووە چاوم و تێیدەڕوانیم، لام سەیر بوو کە تەماشای دەوروبەری خۆم کرد دەمبینی زۆرینەی خەڵك تەماشای من دەکەن دیمەنی هەندێك کوڕی حەسوود جوان وەك رۆژی روون دیار بوو کە بە ئاشکرا پەست و بێ نەزاکەتانە لە دەرفەتی خراپدا بوون بۆم، لە راستییدا (ئارووین) یەکێك بوو لە هەرە جوانەکانی کۆلێژی ئەدەبیات، بەشی شوێنەوار ناسی، سەرەتا هەستم کرد جوانی وەها نموونەی کەمە، براینە بڕوام پێ بکەن من سەرسام تر بووم لەوەی بتوانم لە ئاستی بەرز و نزمی سەدایدا خۆم رابگرم پاش سەرنج دانێکی زیاتر وتی (کاك سەهەند خۆشحاڵم بەوەی بتناسم من ناوم (ئارووین ئیسحاق سلێوە)یە لە بەشی شوێنەوار لە قۆناغی یەکەم دەخوێنم هیوادارم یەکدی ببینینەوە) ئەوەندەی وت و تەوقەی لەگەڵ کردم نەرمترین دەستییك تا ئێستا تەوقەم لەگەڵ کردبێت ئەو بوو پەنجەی درێژی

شمشالئاسای سپی ناسك بیٚ زبری و گریٚ نەرم کـەمێك شـێدار بـە راسـتی سـەیر بـوو رۆیشـت و هەنگاوی ورد وردی دەنا تەقەی قۆنەرە بن بەرزەکانی لە گوێچکەمدا دەزرینگێتەوە بە شێوەی ئەو کیژانەی لە نمایشی جلوبەرگ ئیش دەکەن بە لەنجە و لارێکی سیحراوی رۆیشت لە دووررا چـاوم لیٚ بوو کورێکی جل سپی چاو زەقی کەمێك ریشنی قژ لوول زۆر ناحەزانە تەماشـای دەکـردم، تـەنیا هەستم بە مۆرە کردنە نائاساییەکەی کرد و هیچی دیکە، (شالاٚو ئیحسان) دایـە چـەپڵە و گـوتی (جوانترین و حۆری ئاساترین کیژی بەشەکەمانە، شانازییە ئەو کیژە لەگەڵ هیچ جـۆرە ئـامرازێکی کوڕی دیکە تەبا نییە و هاوڕێیەتی کەس ناکات، دیارە دەنگـی تـۆ سـیحرە ئـەمڕۆ مـوعجیزەت خولقاند، زاڵم چیت بەو کچە کردووە؟، تەواو پەرێشان دیار بوو) من زۆر سەریتر لە (شـالاٚو) بـیرم دەکردەوە لە قسەکانی ئاگام لە خۆم نەمابوو برابینە، نەمتوانی لـەناو ئـاپۆڕای خەڵکـدا سـرەوت بکەم بۆیە، زۆر پەشۆکام و خەریك بوو لە هۆش بچم (شالاٚو) بردمیە دەرەوە کـوڕە بـەرگ سـپییە چاو زەقەکە، لە هەموو هەڵسوکەوتەکانم چاودێر بوو ئاگادار بووم کە لە کۆلێژ هاتمە دەر بە دووری بیست مەتر تەماشای دەکردم کاتێك سوار ئوتۆمبێلەکـەم بـووم ئـەو هەرتەماشـای دەکـردو وەك جاسووس و سیخوڕ رەفتـاری دەکـرد، دواتـر رۆیشـتمەوە بـۆ مـاڵ، ئـەوە بـوو خـۆم دوای چـەند کاتژمێرێك لە پشووحەزم کرد لەگەڵ ئێوەدا پیاسەیەك بکەم و باسی ئەم رووداوەتان بۆ بکـەم) بـەم شێوەیە قسەکانی بۆ تەواو کردین دواتر بڕیارمان دا بـە پیاسـە بـڕۆین بـۆ شارۆچـکەی گاورەکـان (سەهەند) دەیگوت: (هیـوادارم جـارێکی دیکـە ببیبنمـەوە... بـەو شـێوەیەی خـۆی دەیـەوێت) یەکتریان بینییەوە لە رەوشێکی دیکەدا کە یەکێکە لە سەیرەکانی ئەم چیرۆکە و لە بەشەکانی تردا تەواو راستییەکانی دەزانین. سەیر بوو زۆر زۆر.

## ١٢

دوای ئەو شەوەی خەونەکەی بینیبوو (مخۆل شەلەنگ) سەر لـە بەیانییەکـەی دوای چـوونی بـۆ مزگەوت و گەڕانەوەی هـەردوو چـڵە گوڵـە وەنەوشـەییە تەڕەکـەی لـەناو ئینجانەیـەکی قوڕیـندا رواندبوو. بە ئەمری خوا هـەر زوو گوڵـەکان گـەورە و زۆر بـوون و ببوونـە چـەند دانەیـەك، دوای خواردنەوەی شەڕابی بەهەشت پەڵەیەکی شێوە گوڵ پەڵەیەکی مۆر لەسەر لێـوی (مخـۆل شـەلەنگ) دروست ببوو کە وەك نـەخش بـە سـانایی لەسـەر لێـوی بینرابـوو. دیمـەنێکی جـوانی بـە لێـوی بەخشیبوو، هەر لە ئەو شەوەی (مخۆل) خەونەکەی بینیبوو، (دولبـەر داود غـولام)ی هاوسەریشـی هەر کتومت ئەوەی بینیبوو بێ زیادو کەم، بـەڵام هـیچ کامیـان لـەو سـەفەرە ئەفسـووناویەیاندا رێکەوتی یەکیان نەکردبوو، بەڵکو هەریەکە و بە لایەکـدا سـەفەری خۆیـان کردبـوو، ئیـدی دوای ئەوەی خەونەکەیان بۆ یەکتر گێڕابۆوە، حەپەسا بوون و هەستیان بەوە کردبوو کە ئەمە مۆجزەیەکی خوداییە و نیشانی ئەمانی دەدات تا زیاتر بە دیانەت بن و ئامۆژگاریی یەکدی و خەڵکی ناوچـەکە بکەن لەسەر دەسەڵاتەکانی خودا و بێ ئەمریی خودا نەکەن. هەر لەو ڕۆژەوە بڕیاریان دابـوو بچـنە حەجێ. گوڵەکان گەشەیان سەندبوو لە ئینجانەیەك بۆ دەیان ئینجانە و باخ و دار و دیـوار دیمـەنی گوڵی وەنەوشەیی. پەڵە وەنەوشەییەکەی لێوی (مخۆل شەلەنگ) خولیـای ئـەو کتێبـە لەسـەری دا دروست دەکەن، بە بڕوای خۆی ئەوەی لە ژیانیدا رووی داوە و لە خەونەوە بۆتە راستی شتێکی کـەم نەبووە و بڕیاری داوە شتێکی وەها دروست بکـات کـە ئـەو راسـتییانەی تێدایـە بـەیان بکـات و خەڵکی دوای خۆی بڕوای پێ بکەن. زۆر نابات کاتی ئەوە دێت کە خەڵك بچن بۆ حەج. ئـەمانیش هەردووکیان خۆیان ئامادە دەکەن و لەگەڵ کاروانێکدا دەچن بۆ مەککە و لەوێ حەجەکەیان دەکەن و دوعا بۆ داهاتووی خۆیان دەکەن و داوای نەوەیەك لە خـودا دەکـەن و بـە دەوری مـاڵی خـودا و بەردەکەی کەعبەدا دەسووڕێنەوە، تەواف و سرووتە ئایینییە تایبەتەکان تەواو دەکەن. پاشان دوای سەفەرێکی چەند مانگی دەگەڕێنەوە، کە دێنەوە، ماڵەکـەیان یـەك پارچـە گـوڵی وەنەوشـەییە و گوڵەکان بۆیان پێدەکەنن و قسەیان لەگەڵ دەکەن، بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز.

با بیرمان نەچێ، بەهەر هۆکارێك بێت (محۆل) بە سەدان پەڕە لە دوو توێی بەرگێکی چەرمی بە ئاوریشمی وەنەوشەیی رووپۆشکراو دروست دەکات و بە قەڵەمی داری ئەو سەردەمە بە خەتی تایبەت بەخۆی دەست بە نووسینی دەکات و ئەوەی لە ژیاندا رووی داوە و لە توانای بیرکردنەوەیدا ماوە لەو دەستنووسەدا دەنووسێتەوە. هەر لە سەردەمی ژیانی باوانییەوە هەتا سەفەری حەج و کۆچیان بۆ شار و لەدایکبوونی یەکەمین و دواهەمین منداڵیان.

پاش چەند مانگێك واتە پاش تێپەڕبوونی نۆ مانگ بەسەر دیتنی خەونەکەیاندا، لەبەرەبەیانێکی رۆژی هەینیدا (دولبەر داود غولام) منداڵی ئەوەڵ و ئاخیر منداڵیی دەبێ. بیرمان نەچێ سکپڕییەکەی هیچ لێ دیار نەبووە، هیچ کامیان تەواو هەستیان بەوە نەکردووە.

بەڵام لەو بەرە بەیانەدا ژانێکی تاقەتبڕ دەیگرێ. مامانێکی ئاوایی منداڵییکی لە سك دەردەهێنێت، ئەویش کچێکی جوانی ئەفسووناویی دەبێت لە بری ئەوەی بە گریانەوە بێتە دنیاوە سەرەتا پێدەکەنێت. مامانەکە و (محۆل) و (دولبەر) سەریان سووڕ دەمێنێ، لەو دیاردە سەیرەی لە ژیانیاندا رووی داوە. دیارە ئەو منداڵە کە لەدایك بوو (وەنەوشە)ـە و یەکێکە لە کارەکتەرەکانی ئەم چیرۆکە و رۆڵی زۆری لە ژیانی ئەم کتێبەدا بینیووە و، نموونەی ئافرەتی سەربەرزی کوردەواری و بلیمەت و دەستڕەنگین بووە، بە دڵ و گیان ئاشقی گوڵە وەنەوشەییەکان بووە، هەر بۆیە کە گەورە دەبێ، ژیانی خۆی بۆ گوڵەکان تەرخان دەکات و هەر بۆ ئەو گوڵانەش دەژی.

دوای لەدایکبوونی (وەنەوشە)، (محۆل شەلەنگ) لە جاران پتر خۆی بۆ خزمەتی خودا تەرخان دەکات و رۆژانە دەیان جار نوێژی سوننەت و دەستنوێژ و چێشتەنگاو و شەونوێژ و زیکر دەکات و قورئان دەخوێنێ. بە جوانترین شێوە خزمەتی تاقە کچەکەی دەکات و هەرگیز بە خەیاڵییشیدا نایەت، بڵێ بۆچی خودا کیژی داوەتێ! بەڵکو زۆر شوکرانەبژێرانە شوکری خودا دەکا. لە مزگەوتدا لە مەولوودنامەکاندا زیکر و دەفژەنیی خۆی درێژە پێ دەدات و کاروباری گوند و جووتیارییەکەی خۆی بە چاکترین شێوە دەکات و خزمەتی رەزەکانی دەکات و ترێ و میوەی جوان بەرهەم دەهێنێت و بژێوی خۆی و خانەوادەکەی دابین دەکات.

دەژین لە ژیانێکی شادی و ئاسوودەدا، بەڵام لە هەمان کاتدا لە هاوکاریی برایانی پێشمەرگە و خەباتکارانی ئەو سەردەمە و شۆڕشی ئەیلوول بێ دەنگ نابێت و ئەوەی بۆی دەکرێت بە چاکی بۆیان دەکات. هەندێك جار وەك پەیامبەر و نامەبەر کارەکانیان بۆ رادەپەڕێنێت و لە سنوورە ئاسیەکانی شارباژێڕەوە کاغەزی لوولدراوی کوڕانی خەباتگێڕ دەگەیەنێتە شارە گەورەکان و نەخشە

و پلانەکانیان بە جوانی بۆ جێبەجێ دەکات. هەڵبەتــە ئــەرکی (مخــۆل شــەلەنگ) کــەمتر نــەبووە لەوانەی بە تفەنگ رووبەڕووی رژێم شــەڕیان کــردووە، بــەڵام ئــەم بەشــێوەیەکی دیکــە و پیرۆزتــر چەندین کاری راپەڕاندووە و نیشتیمانی خۆی خۆش ویستووە و ئامادەیی ئەوەی تێدا بووە بەرگریی لێ بکات و لە پێناو بەردێکی ساردی کەنار دۆڵێکــدا خــۆی بــەخت بکــات. ئــەوە لــە خزمــەتی پێشمەرگە نوقسانی نەبووە و خواردنی بە وڵاخ بۆ گەیاندوونەتە ئەشکەوت و چــیا سەرکەشــەکان و دڵنەوایی کردوون ئەوانیش بە کابرایەکی بەرز و خانەدانیان زانیوە و رێزی زۆریــان لێ گرتــووە. لــە راستییدا خەباتکردن هەر ئەوەندە نەبووە کە دوژمن بکوژیت، بەڵکو خەبات ئەوە بوو چۆن هێزێــك رابگرین بەرامبەر دوژمن. ژیانی (مخۆل شەلەنگ) بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت وەك لــەلام روونــە و لە نووسینەکانیدا رەنگی داوەتەوە، مرۆڤێکی سەرڕاست و بێ خەوش و بەنەزاکەت بووە. هەمیشە لە گۆشەنیگای خۆیەوە بە شێوەیەکی سروشتی و دێهاتیانەی خۆی، بــەڵام تــەواو بەرنامەدارێــژراو کاری کردووە هەمیشە لە ئاسۆی روانیوە، بەڵام تاکە رێگەیەکی قەدەری بۆ خودا بەجێ هێشتووە، بەردەوام ئەم رستەیەی بەکار هێنــاوە و وتوویــەتی: (بــە حــەول و قــوەتی ئیلاهــی بــە روانــین لــە دەسەڵاتەکانی ئەو دەگەمە دوا مەنزڵ). هەڵبەت ئەگــەر بڵــێم ئــەو تەلیســمی زۆری لــە دەرەوەی سنووری مرۆڤەوە بۆ هاتووە، رەنگە هەڵە نەبم. ئەو هەموو کارەکانی لە سنووری خــودای گــەورەدا چڕ کردووەتەوە و بەبێ ئەمری ئەو کاری نەکردووە. رەنگە پەیوەندیەکی روحیــی تونــد و تــۆڵی بــە زاتی ئیلاهیەوە هەبووبێت راستە ئەو سۆفی نەبووە، بــەڵام ئاشــقێکی سەرمەســتی خــودا بــووە و هەمیشە وای هەست کردووە کە ئەم گۆی زەویە وەك کەشتییەك وەهایە و کاپتنی تێدا نییــە. لــەو ئامۆژگاریانەی کە بۆ کچەکەی کردوویەتی لە تەمەنی منداڵییدا دوای ئەوەی (وەنەوشــە) هەســتی بەو ئامۆژگاریانە کردووە، (شــەلەنگ) بــە (وەنەوشــەی) وتــووە: (کچــی خــۆم ئــەم زەمینــە وەك کەشتییەك وەهایــە و لــە دەورانــی نادیاردایــە بــەو مانایــە، هــەموو ئەوانــەی لەســەری دەژیــن دەسوورێنەوە، کەوایە لە چاوی خودادا ئێمە مرۆڤگەلی بــە جووڵــەین و ئــەرك و فرمانمــان هەیــە، هەمیشە ئەو رەقیبە و چاودێریمان دەکات، تۆش دەبێت ئەوە بزانیت کە کچێکی تەواو جیاوازیــت، دروستبوونی تۆ جیاوازترە لە کچەکانی دیکــە، تــۆ بەرهــەمی دنیایــەکی دیکــەیت، هــەرگیز لــە دەسەڵاتی خودا غافڵ مەبە... کچی شیرینم خودا جەستەیەکی پیرۆزە و ئێمە لە ئاستیدا هەمیشە دەبێت سوجدە ببەین و دەست لە یاساکانی وەرنەدەین). ئەم چــەند دێــڕەی ســەرەوە دەلالــەتی زۆر لەسەر ژیانی (مخۆل) دروست دەکەن ئەوەمان بۆ روون دەکاتــەوە کــە مــرۆڤ پێویســتە لــە هــەموو ساتێکدا نەکەوتبێتە دوژمنایەتی لەگەڵ خودا، چونکە خودا لە دیدی (مخۆل)دا جیاوازتر بــووە لــەو

خودایەی خەڵکانی دیکە لێی تێگەیشتوون، هەر مرۆڤە و بە شێوەیەك لە خودا دەڕوانێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە خودا... دوژمنی مرۆڤ نییە و دۆستی مرۆڤە.

(وەنەوشە) کچە روحسووکەکەی خانەوادەی (شەلەنگ) لە قوتابخانەی گوند دەچیتە بەر خوێندن. هەر لە منداڵییەوە دیاردەیەکی نا سروشتی لە ژیانیدا روو دەدات، ئەویش زیرەکیی لەڕادەبەدەری (وەنەوشە)یە. بەر لە هەموو منداڵانی دیکە فێری وانەکان دەبێت. زۆر جاران بەر لە مامۆستا وانەکان لەبەر دەکات و لە بیرکاریدا تەواو ژمارەکان کۆ دەکاتەوە، لێکیان دەردەکات نووسین زوو فێر دەبێت و، بە خەتێکی گەلێك جوان وانەکانی خۆی دەنووسێتەوە، کە لە خەتی مرۆڤی تەمەن گەورە دەچێت و بە شێوەی نائاسایی لاپەڕەکان رەش دەکاتەوە، لە وێنەکێشاندا تەواو بلیمەت دەبێت وێنەی درەخت و گوڵ و چیا و قەد پاڵەکان بە شێوەی تەواو واقیعی دەکێشێت دەبێتە جێی سەرنجی مامۆستاکانی گوند و ئەوانیش هەر زوو (محۆل شەلەنگ) لە توانای خاریقی کچەکەیان ئاگادار دەکەنەوە و داوا لە (محۆل) دەکەن ئاگاداری کچەکەی بێت و دەستگیرۆی بکات، چونکە دوا رۆژی پرشنگدار دەبێت. (محۆل شەلەنگ) لە ماڵەوە لەناو رەزە ترێکانی شارباژێر سەکۆ و جێگای تایبەت بۆ (وەنەوشە) دروست دەکات، کەپر و ساباتی لە گوڵی رەنگاوڕەنگ بۆ بنیات دەنێت و لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکات و وانەش فێری ئەوان دەکات. کاریگەریی گوڵی وەنەوشە و رەنگی مۆر و وەنەوشەیی لەسەر (محۆل) وا دەکەن تەواو دنیایەکی وەنەوشەیی لە کچەکەیدا دروست بکات. پاش ئەو خەونە سەیرەی (محۆل شەلەنگ) بینیبوونی، دیمەنی پەڵەیەکی شێوە گوڵ لەسەر لێوی خوارەوەی ببووە جێگای سەرنجی ناوچەکانی شارباژێڕ و پەیتا پەیتا خەڵکی سەردانیان کرد و هۆی پاکی و بێگەردیی خودای بۆ روون کردبوونەوە. هەڵبەتە (شەلەنگ) لەناوچەکەدا لە رادەبەدر خۆشەویست بووە. بەدەر لەوەی کابرایەکی دینی بووە و کابرایەکی تەواو کۆمەڵایەتی بووە و هاوکار و هاوبەشیی لە زۆرێك لە کارەکانی ناوچەکەدا کردووە، کشتیاری و رەزداری و جووت و گێرە و درووینە و گەڵاکردن و مەڵۆکردن و دەسکەنە و زۆر ئیشی دیکەی دێهاتی کردووە و بەروبوومی جیاوازی پەیدا کردووە و زستانی پڕ لە ژێوار و رزق کردووە و هاو خەمی هەژاران بووە و هەمیشە پێشەنگی خێرکەرانی گوند بووە.

(دولبەر داود غولام) کابانیی ماڵ دەکات و جارناجار (وەنەوشە) لەگەڵ خۆی بەرەو کانی گوند دەبات و لەولاوە بە گۆزە ئاوێکەوە دەگەڕێنەوە. (وەنەوشە) بۆ گوڵەکان پێدەکەنێت و یاری لەگەڵ چۆلەکەکاندا دەکات. هەر لە منداڵییەوە حەز لە دیمەنە سروشتیەکانی کوردستان دەکات و لەسەر پارچە کاغەزی تایبەت وێنە و شێوەی سروشت دەکێشێت. زۆر جاران بە قوڕ بووکەڵە و شتی سەیر

و عاجباتی دروست دەکات. هەر زوو باوکی دەزانێت کچەکەی تەواو حەز لە هونەر و داهێنان دەکات. هەر زوو هەست دەکات کە دەبێت ئەم کچە شتی زۆر گەورە بکات و مۆمی خانەوادەکەیان بە دەستتەوە بگرێت و زەمەنەکان تێپەڕێنێت و سڵ لە هیچ نەکاتەوە. (وەنەوشە) لە خوێندن بەردەوام دەبێت. پۆلەکانی خوێندنی سەرەتایی بە سەرکەوتوویی دەبڕێت. بە نمرەی بەرز و ناوازەوە ساڵەکان تێدەپەڕێنێت و بەردەوامی بە زانستی خۆی دەدات. هەمیشە حەز دەکات دیوانی شاعیرانی کۆن بخوێنێتەوە و هەرگیز لێیان تێر و ماندوو نابێت.

پاش ئەوەی (مخۆل شەلەنگ) هەموو پلانەکانی خۆی رادەپەڕێنێت، سەرانی شۆڕشگێڕی کورد ئاگادار دەکاتەوە، لەوەی بڕیاری سەفەری شاری داوە و بە یەکجاری دەڕواتە ئەوێ. ئەو نەیویستوە کچەکەی لە خوێندن دوا بکەوێت.لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕشگێڕان ئاگادار دەکاتەوە کە لە شار تیپ و گرووپی کارا دروست دەکات و کارەکانی خەبات بە جێبەجێ دەکات، دوای ئەنجامدانی هەموو کارەکانی ناو گوند چەند خزمێکی خۆی دێنێتە سەر ماڵەکەیی و داوایان لێ دەکات بێ بەرامبەر لە ماڵەکەیدا بژین و خزمەتی رەزەکانی بکەن. پێی گوتبوون، ناو بەناو بە پێی توانا سەردانیان دەکاتەوە، ئەوانیش لەبەر خۆشەویستییی زۆریان بۆ (مخۆل شەلەنگ) بە هەموو مەرجەکانی رازی ببوون و کارەکانیان لە ئەستۆ گرتبوو.

دواتر (مخۆل شەلەنگ) و (دولبەر داود غولام) و (وەنەوشە) بە ماشێنێکی تایبەت کەلوپەلەکانیان دەپێچنەوە و سەفەری شار دەکەن. دیارە بەر لە هاتنیان (مخۆل) بەوبڕە پارەیەی چەندین ساڵ بوو کۆی کردبووەوە خانوویەکی ئاسایی لە یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری بابانەکان کڕیبوو. لە یەکێك لە گەڕەکە ناوەندییەکانی شار و ئامادە باشی تەواوی کردبوو. بەر لە سەفەرکردنیان لە گوند بۆ شار هەموو رێو شوێنەکانی بۆ کارکردن و ئامادەیی شار کردبوو، چونکە لە کۆمەڵگایەکی بچووکی گوندییەوە بۆ شارێکی تا رادەیەك گەورە و فرەژیان و فرەکردار بەرنامەداڕێژیی دەوێت. هەمیشە سەفەرکردن لەناوچەیەکی بچووك بۆ ناوچەیەکی گەورەتر واتە کوشتنی روحی ناوەکیی ئەو شوێنە و دروستکردنی کارەکتەرێکی نوێ و جیاواز، ئەمەیش کارێکی هەروا ئاسان نییە. مرۆڤ لەناو خۆیدا مرۆڤێکی جیاواز دروست بکات و لەگەڵ جوگرافیایەکی دیکەدا ئاشنایەتی پەیدا بکات. هەلومەرجی ئەو کاتەش تەواو نالەبار بووە. لەبەر رەوشی سیاسی، هەمیشە سیخوڕەکانی دەوڵەت چاودێری ماڵ و کەسانی تازەیان کردووە بۆ شار و، زۆریان بۆ هێناون و لە هەموو لایەکەوە چاویان تێ بڕیبوون و بە دوای نهێنییەکانیاندا وێڵ

بوون. هەڵبەتە (مخۆل شەلەنگ)یش هەروا سانا لە دەست دوژمن قوتاری نەبووە و تووشی زۆر کێشە و لێدان بووە کە لە کاتی خۆیدا بۆ ئێوەی خوێنەریان باس دەکەین.

کێشەی سەرەکیی مرۆڤ ئەوەیە لە شاردا بژی. شار هەمیشە ناشرینیی مرۆڤ دەخاتە روو جیاوازیی نێوان ژیانی شار و ژیانی گوند وەك جیاوازیی نێوان بەهەشت و دۆزەخ وەهایە. وەك جیاوازیی نێوان ئاو ئاگر وایە. هەمیشە شار سەرچاوەی نەگبەتیی مرۆڤە. هەموو شەڕەکانی سەردەم لەسەر شار دروست بوون. شار ناشرینترین دروستکراوەکانی سەرزەمینە، بەڵام گوند جوانییەکانی جیاوازترن. نرخی مرۆڤ لە گوندا زیاترە و سروشت باوەشی بۆ دەکاتەوە، بەڵام شار مرۆڤ لە جووڵە دەخات و دەستەمۆی هەندێك ئارەزووی ئیبلیسیانەی دەکات. ژیان لەناو چیاو ئەشکەوتەکاندا وا دەکەن لە دەسەڵاتی سروشت رابمێنیت. ململانێی شار لەگەڵ دروستکراوە ئەندازەییەکانی دەستی مرۆڤە و هەستی داهێنان و پێکەنین لە مرۆڤدا دەکوژن و کویلەی شێوە ژیانێکی دیکەت دەکەن، کە راکردن لێی دواجار ئەستەم دەبێت.

سیحری درەختەکانی چیا و دارەبەن و دەوەنەکان جیاوازە لە درەختە ساردەکانی سەر شەقام و کالیپتۆزەکان، جادەی قیرتاوکراو ئەندازەی عەموود و دار تەلەکان جیاوازە لەو رێگا خۆڵاوییە دەستکرانەی بە چیادا سەردەکەون و بەرەو خاڵی درەوشانەوەی رووناکی دەڕۆن. بە هەر شێوەیەك بێت (مخۆل شەلەنگ) لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٢ـدا لە شار نیشتەجێ دەبێت و درێژە بە ژیانێکی شارییانە دەدات و هەوڵی دروستکردنی کارەکتەرێکی نوێ لە خۆیدا دەدات. وەك هەر ئادەمیزادێکی دیکەی شار بە دوای کارێکی نوێدا دەگەڕێت، بە هۆی چەند هاوڕێیەکی خۆیەوە کە جاران لە گوندەوە نامەی شۆڕشگێڕانی بۆ هێنابوون دەستی لە کارێك گیر دەبێت و دووکانێکی بەقاڵی و سەوزەفرۆشی دادەنێت و کار و فرمانی بەقاڵی و سەوزەفرۆشیی تێدا دەکات. هەر زوو (وەنەوشە) لە قوتابخانەیەکی ناوەندی ئەو سەردەمە داخڵ دەکات و گوڕوتینی بەردەوامی لە ناخی تاقە کچەکەیدا دەچێنێت و وای لێدەکات بەردەوام بێت لە خوێندن و چرایەك بۆ رۆشنکردنەوەی رێگای ژیانی خۆی و خانەوادەیەکی دابگیرسێنێت. (مخۆل شەلەنگ) بەدەر لە کاری بەقاڵی بە نهێنی لەگەڵ شانە چەکدارییەکانی ناو شار کاری سیاسی دەکات. هیچ کات لە رەوتی سەرەکی و ئایینیانەی خۆیشی لا نادات و لە مزگەوتێکی نزیك ماڵەکەی خۆی درێژە بە قورئانخوێندن و زیکرەکانی رۆژی هەینی دەدات و بە شێوەیەکی دیکە هاوڕێی و هاوسۆزی دینی بۆ خۆی دروست دەکات. لە هەمان کاتدا فریای سۆز و خۆشەویستییدان بە کچ و ژنەکەی دەکەوێت و هیچ کات لە میهر و سۆزی خۆی بێبەشیان ناکات. بەم شێوەیە وردە وردە وێنەیەکی شاریانە لە ناخی خۆیدا

دروست دەکات و تەواو ڕەوتی ئاسایی خۆی دەدۆزێتەوە. بە تێپەڕبوونی کات (مخۆل شەلەنگ) بەردەوام دەبێت لە کاروباری جیاواز جیاواز و وەك کۆڵەکەیەکی گرنگی شۆڕشی ئازادیخوازی کورد لە شاردا ڕەگ دادەکوتێت و ناوبانگی بە شێوەیەکی نهێنی دەگاتە گەورە سەرکردەکانی ئەو سەردەمەی چیا و ئەوانیش ستایشی زۆری دەکەن و داوای بەردەوامبوونی لێ دەکەن و چەندین نازناوی سەیر و سەمەرەی لێدەنێن: وەك (هەڵۆی شار) و (چاوی پڵنگ) و (بەوری بەیان) و (شێری شۆڕش) و (ئەستێرەی کورد) چەندین ناوی دیکەیش، بەڵام ئەو بەبێ گوێدانە هیچ کام لەو نازناوانە بۆ مەبەستێکی سیاسیانە و مەبەستێکی کوردانەی خۆی لە کارکردن بەردەوام دەبێت و کار و چالاکییەکانی شار بەڕێوە دەبات و سەرکەوتووانە ڕووبەڕووی تەنگ و چەڵەمەکان دەبێتەوە.

مرۆڤ هەندێك حورمەت خۆی پەیدای دەکات و هەندێکی دیکەی لە دوورەوە بۆ پەیدا دەبێت. ئەگەر بتەوێت حورمەتت دەست بکەوێت دەبێت بە دوایدا نەگەڕێیت، بەڵام ئیشکردن ئەو حورمەتە دروست دەکات و دەتگەیەنێتە لووتکەی هێزێکی نەبڕاوە. زۆر بوون ئەوانەی لەو سەردەمەدا کاریان بۆ بەدەستهێنانی بێحورمەتی دەکرد، چەندین خۆفرۆش پەیدا بوون و نهێنی و زانیارییان بە سیخوڕەکانی ڕژێم دەدا. یەکێك لەوانەی پلانە گەورەکانی (مخۆل شەلەنگ) ی دەگەیاندە دەست ڕژێم (حسە زیپکە) بوو. ئەو پیاوە لووت زل چاو و برۆ ڕەشەی دەموچاوی هەمووی دوومەڵ و زیپکەی گەیوو بوو، کە زیپکەکانی دەموچاوی وایان ناشرین و قێزەون کردبوو، خەڵك لە دووکان و پاس و شوێنە گشتییەکاندا ڕوویان لێ وەردەگێڕا و هێڵنجیان دەهاتێ. برۆکانی کەوانەیی کەوتبوونە بان لوتی و دیمەنی سنگێکی تووکنی ناشرین کە وەك نۆبەرەی مەیموون وەها بوو، چاوەکانی سپی و ڕەش و زەق هەرووەك دزێکی بێ سەروا دەبینران، کە بەردەوام بە دوای نێچیری باش دەکەوت. ئەم پیاوە (مخۆل شەلەنگ) باش وەسفی کردووە، بەڵام من دواتر لە ڕێگای خانەوادەکەی خۆمەوە زانیاریی زیاترم لەسەری پەیدا کرد و هەموویان لەگەڵ وەسفەکانی (مخۆل شەلەنگ) چوون یەك بوون و دژی نەبوون. پیاوی ڕژێم بوو بە نەتەوە کورد بوو، بەڵام کوردێکی خۆفرۆش بوو لە ژنێکی داوێنپیس ببوو، بەردەوام بە دوای باوکیدا گەڕابوو و سۆراخی نەکردبوو، بە حوکمی هەندێك پۆستی حزبی دەسەڵاتێکی وەرگرتبوو. لە شاردا سەرانەی لە خەڵك وەرگرتبوو خەڵکی زۆر عەزێت کرد بوو. دووکانی زۆر کەسی بەرشەق دابوو. عارەبانەی بەقاڵی و میوە و سەوزەی زۆر کەسی بە پێ پان کردبۆوە و شەق شەقێنی بە خەڵکێکی زۆر کردبوو.

سەرەتای دوژمنایەتیی نێوان (حسە زیپکە) و (مخۆل شەلەنگ) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی (حسە) بە خۆیی و چەند چەکدارێکەوە دەکەونە دوای گەنجێکی ڕاکردوو لەسەر هەبوونی

ریش، بەڵام کوڕە لەناو گووزەری بەقاڵەکاندا خۆی بـزر دەکـات. (حسـە زیپکـە) دەکەوێتـە وێزەی بەقاڵ و سەوزەفرۆشەکان و بە لەقە و شەق میوە و توور و سەوزە و کوزلەکە و تەماتـە پان دەکاتەوە، هەڵبەتە (مخۆل شەلەنگ) و دووکانەکەی لەو هەڵمەتە قوتار نابن و زەرەرێکـی باشی لێدەدەن. (مخۆل) لەسەر ئەو کارە بێدەنگ نابێت و هەتا هێزی تێدایە دەکەوێتە لێـدانی (حسە زیپکـە) و دەموچـاوی هـەموو بـە مشـتەکۆڵە دەشـکێنێت. ئـەوانیش بـە خـۆیی و پاسەوانەکانییەوە زۆر لە (مخۆل شەلەنگ) دەدەن و لەگەڵ خۆیان راپێچـی زینـدانی دەکـەن و ئەشکەنجەیەکی باشی دەدەن. پاش ماوەیەك ئازاد دەبێت ئیـدی لـەو دەمـەوە دوژمنایـەتیی نێوانیان پەرە دەسێنێت و (مخۆل شەلەنگ) هەمیشـە لـە هـەوڵی ئەوەدایـە لـەناوی ببـات و بیکوژێت. چەند جارێك پلانی لە دژ ساز دەکات و سەرکەوتوو نابێت، (حسە زیپکـە) لـەناو هێزەکانی ئەمندا سیخوڕی و کاری تێکدەرانـە دەکـات و خـەڵکی زۆر بـە ئاکـامی مـەرگ دەگەیەنێت، ئەم دوژمنایەتیەیان ساڵان دەخایەنێت و درێژە دەکێشێت.

لەو کاتەی (سەدام حوسێن) دێتە سەر حوکمی سەرۆکایەتی و رەوشی سیاسیی کوردستان بەرە و خراپی دەڕوات و کوردسـتان دەبێتـە پێگـەی کوشـتار و رەشـەکوژی، ئـەم دوژمنایەتیـە پـەرە دەسـێنێت. (مخـۆل شـەلەنگ) هەمیشـە بەسـەر مەشـقی خـەباتکارانی شـار دەناسـرێت و هەڵسووڕێنەری کارە سەختەکانی لەناوبردنی خۆفرۆشان دەبێت، بە بەرنامـە و پلانـی ئـەو زۆر لـە بەعسییە پیسەکان بە سزای گەل و شۆڕش دەگەن.

ژیان بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت. (مخۆل شەلەنگ) هەمیشە لـە خـەمی کچـەکەیدا دەبێـت و دەترسێت رۆژێك رژێم بە کارە سیاسەکانی بزانێت و کارێك بکەن کچـە نازدارەکـەی لەدەسـت دەر بهێنن و شەرەفی بڕووشێنن. بۆیە زۆر بە نهێنی و وردەکارییەوە کار دەکات و بەرەو پێش دەچـێت، (وەنەوشە) لە خوێندن بەردەوام دەبێت، درێژە بە خوێنـدنی خـۆی دەدات وەك پەرییـەکی ناسـك و نازدار وەك ئاسکێکی سرکی گەرمیانی بە کۆڵانەکانی شاری باباندا بێ سەروا رەوتی رێگاکان بـەر نادات و رووناکی دەخاتە ناو دڵی هەزاران کوڕ و گـەنجی رەنجـەڕۆی ئـەو سـەردەمە. بـۆنی گوڵـە وەنەوشەییەکانی کە دەیاندات لە پرچی سەدان و هەزاران گەنج و پیر مەست و سەرخۆش دەکـات. ئەوەمان بیر نەچێت (مخۆل) لەکاتی هاتنی بۆ شار بە دەستی بە تاڵ نەهاتبوو، شـتێکی زۆر پـیرۆز کە لە ژیانیدا رووداوێکی نائاسایی بوو. گوڵە (وەنەوشە)ییەکان بوو چـەند ئینجانەیـەکی بـۆ شـار هێنا بوو ئەوانیش بە شێوەیەکی سیحر ئامێز لە گەشـەکردنی خۆیـان بـەردەوام بـوون (وەنەوشـە) هاوڕێ نزیکی گوڵەکان بوو خزمەتی زۆری کردبوون و بەردەوام گوڵێکی بە پرچـدا کردبـوو، بـۆن و

ڕەنگی گوڵەکان و پێکەنینیان نائاسایی بوو. هەزارن لاوی بۆ لای خۆی کەمەندکێش کردبوو، بەڵام ئەو لەوە مەزنتر بووە کە هەروا ئاسان خۆی تەسلیمی گەنجانی خێرنەدیووی شار بکات، شتێك کـە لە ناخی (وەنەوشە)دا بووە ئەوە بووە، لە کاتێکدا بە دوای پیاوی خەونەکانیدا بگەڕێت کە جـوانی لەبەرچاویدا بگاتە لووتکە دیارە. مەبەستم لە جوانیی روح و کەماڵی شتەکان، ئیدی ماتریاڵ بێت یاخود جەستە یان گوڵ یا نیگار، گرنگ ئەوەیە شتێك نەبووە، بە خواستی دڵی بێت هەر بۆیــە بـۆ چرکەیەکیش ئەشقی هیچ کوڕێك یاخود پیاوێکی هاو شاری خۆی نەبووە، ئەو لە تـافی لاویـدا لـە ترۆپکی هەڵچوون و هەڵدانیدا دەبێت، بەڵام هەمیشە بە دوای جوانیدا وێڵ دەبێت و نایدۆزێتەوە.

جوانی ئەو چەکەیە بەکار دێت، کە لە ئەتۆم بەهێزترە و لە ڕەگەوە روح هەڵدەتەکێنێت، بـەڵام دواتر لە ئاوابووندا خۆی دەدۆڕێنێت، جـوانی چـییە؟ سـەرابێکە دەڕوات و دێـت، لـە دوای خـۆی پەژارە بەجێ دەهێڵێت، هەرگیز بە جوانی مەنازە، ئەگەر ڕۆژێك لەبەرانبـەر ئاوێنـەدا وەسـتایت و وتت ئەوە منم جوانم! بزانە ئەوە تۆ نیت کە خۆت دەبینیت، یەکێکی تر وەك تۆ دەجووڵێت و لەنجە و لار دەکات. جوانی و هەندێك بەهرە کە لـە مرۆڤـدا هـەن زۆر جـار دەبنـە مایـەی پـەژارە بـۆ خاوەنەکانیان و وەك تەوق لە گەردنت دەئاڵێن، بەڵام جوانی خۆی لە شوێنێکی نەبینراودایە و دیـار نییە، هەمیشە بە دوایدا دەگەڕێین و نایدۆزینەوە. ئەو بەشەی کە بـە جـوانی دەبینیـت هـەمووی نییە، پارچەیەکە و هیچـی دیکـە، چـونکە جـوانیی ڕەهـا وجـوودی نییـە و نادۆزرێتـەوە، ئـەو لەشوێنێکی ئاسیدایە لە ئاسمانێکی تەواو جیاوازدا دەسووڕێتەوە.

جوانیی (وەنەوشە) جوانیی روخسار نەبووە، بە تەنیا جوانیی کردار و خەونەکانی بووە جـوانیی بیرکردنەوە بووە، جوانیی ئەو لەوەدا بووە لە خەمی خۆیدا نەبوو. لە خەمی ئـەوەدا بـووە جـوانیی دیکە دروست بکات و گەشە بە ژیانی ئاسایی خەڵك بدات هـەر لەبـەر ئـەوەش بـووە... ڕۆژێـك دەگاتە کەماڵ ڕۆژێك... دەگاتە ترۆپکی ئاسمانەکان و سووڕی ژیانی خۆی تـەواو دەکـات، ڕەنگـی وەنەوشەیی گوڵەکان ڕەوتی ژیانی (وەنەوشە) دەگۆڕن و وا دەکەن ڕەنگی گوڵـەکان و گوڵـەکان بـە شێوەیەك بە هەموو سەردەمەکانی مرۆڤایەتیدا بگێڕێت.

(وەنەوشە) لە ڕەنگی وەنەوشەیدا بە دوای ئەشقێکدا وێڵ دەبێت، کە داهێنانی تێدا بێـت ئـەو هەمیشە وتوویەتی: (بـە دەسـت و بـازو هونـەر و ڕەنـگ و ئەشـق دروسـت دەکرێـت) هەڵبەتـە مەبەستی ئەوە بووە کە بە عەقڵ و بە بازوو بگەیتە ئەو راسـتییەی تـەعبیر لـە جـوانی و ئەشـق بکەیت، هەر بۆیە هیچ کات بیر لەوە ناکاتەوە ئاشقی کوڕێك بێت، کە هیچی لە هەگبـەدا نییـە و

پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە دەبێت کوڕێك بکاتە هاوسەری خۆی بە راستی هونەرمەند بێت و دەستی لە دەستی مرۆڤی ئاسایی نەچێت.

هەمیشە لەگەڵ (دولبەر)ی دایك و (مخۆل)ی باوکی قسە گەلێکی زۆریان لەمەڕ ژیان و هونەر و گوڵ و خەون و ئاسمان کردووە، هەر ئەوان راستییەکانی خەونەکە و سەفەری حەج و ئەستێرەکان و رووناکی بۆ دەکەن (مخۆل شەلەنگ) بە زەردەخەنەیەکی هێمنەوە پێی وتبوو: (سەفەرکردن بەرەو گەردوونی پان و بەرین بە روح و بە خەیاڵ فێری تێڕامانت دەکات لە خودا لە نووری پاکی خودا)، ئەو مەبەستی ئەوە بووە کە (وەنەوشە) لە نووری خودادا بە دوای راستی ژیانێکی زیندوو تردا بگەڕێت و جیاواز لە ژیانی خەڵکانی ئاسایی لە دروست کراوەکان و هونەری گەردوون رابمێنێت، دیارە مرۆڤ گەر بیەوێت لە هونەری ژیان فێری وانەی زیندوو بێت دەبێت شەوان شەوانی ساماڵ لە دیمەنی ئەستێرەکان رابمێنێت، چونکە سەیرکردنی ئەستێرەکان و بریسکەی شەوان مرۆڤ فێری دڵنیایی و تەحەمول و سەبری نەبڕاوە دەکەن، وا لە مرۆڤ دەکەن هیچ کات لە شەڕ و جەنگدا لە هەرەس و ناخۆشییدا نەڵێت ئیدی کۆتایی شتەکانە و تەواو، بەڵکو دەبێت تا هەتایە بە دوای چارەسەر و خۆشەویستییی راستەقینەی ژیاندا بگەڕێت، هەڵبەتە هەر ئەم وانانە وا لە (وەنەوشە) دەکەن لە کۆتاییەکانی ژیانیدا بیر لە ئاسمان و فڕینی دیکە بکاتەوە. بیر لە ژیانێکی دیکەی هەسارەیەکی دیکە بکاتەوە.

(وەنەوشە) وەك گوڵێکی ناوازەی شار دێت و دەچێت و لەوپەڕی جوانیدا بە شەقامەکاندا رادەبرێت، ئەو لە تەمەنی هەژدەساڵیدا دەبێت، کاتێك بۆ جاری دووەم (حسە زیپکە) و پیاوەکانی بە سیخوڕی و بێئابڕوویی خۆیانەوە نامەیەکی شانەکانی پێشمەرگەی ناوشار، کە بە فەرمانی (مەحموود شەلەنگ) نووسراوە و تێیدا چەندین وردەکاری لەسەر رەوشی شار و جموجۆڵی بەعسییەکان بە روونی لە نامەکەدا نووسراوە. بەهۆی سیخوڕێکەوە نامەکە دەست (حسە زیپکە) دەکەوێت، ئەویش زۆر بەنامەردی نامەبەرەکە دەکوژێت، کە کوڕێکی گەنجی هەرزەکار دەبێت، لە قەراخی شاردا لە رێگایەکی گڵدا دەکەوێتە کەمینی بەعسییە دڕندەکان و نامەردانە لەلایەن (حسە زیپکە)وە دەکوژرێت و روحی بەرزەفڕی ئەو کوڕە گەنجە بە ئاسمان رادەگات. دوای لێکۆڵینەوە لەناوەڕۆکی نامەکە بە تەواوی هیچ ناوێکی (مخۆل شەلەنگ) یاخود هیچ ئاماژەیەکی دیاری تێدا نییە لەسەر ناوی هیچ یەکێك لە ئەندامانی شار، بەڵام پێشمەرگە گەنجەکە یان بڵێین نامەبەرەکە ویستوویەتی لە دەستییان هەڵبێت. هەربۆیە (حسە زیپکە) دەسڕێژی لێدەکات و دەمودەست گەنجەکە دەکوژێت. دواتر لە دوای پشکنینی

جەستەکە نامەکەیان دەستکەوتووە، خۆ ئەگەر بە زیندوویی بیانگرتبا بێشك دوور نەبوو لە ژێر ئەشکەنجەدا زۆر شتی بدرکاندایە. رەنگە واش نەبووایە، هەڵبەتە (حسە زیپکە) هەروا ئاسان دانانیشێت و بەدوای ناوەرۆك و مەبەستی نامەکەدا وێڵ دەبێت و بەهۆی ئەو تۆڕە سیخوڕانەی لە شاردا بڵاو بوونەتەوە. شەوێك هەست بە کۆبوونەوەیەکی شانە شۆڕشگێڕەکانی شار دەکەن و بە خۆیان و چەندین هێزی ئەمن هێزی تایبەتەوە هەموو کۆڵان کووچەکان دەگرن و ماڵەو ماڵ بەشەق دەرگاکان دەکەنەوە. شەوێکی زستانی ساڵی ١٩٨٠ دەبێت لە یەکێك لەو کۆڵانانەدا شەڕێکی قورس روو دەدات. هەر لەو شەڕەدا هێزەکانی ئەمن و بەعسییەکان دوو پێشمەرگەی ناوشار شەهید دەکەن و (مخۆل شەلەنگ)ی پیرەپیاویش گوللەیەك بەر لاقی دەکەوێت و بریندا دەبێت و بە برینداری هەڵدێت. شۆڕشگێڕانی شاریش چوار بەعسی دەکوژن، (مخۆل شەلەنگ)ی بریندار خۆی دەگەیەنێتەوە ماڵ و بۆ ماوەیەکی زۆر لە ماڵەوە خۆی قایم دەکات، لە رێگەی (وەنەوشە)ی کچییەوە و هاوڕێیەکی (وەنەوشە) و دەرمان و پێداویستی پێدەگات وردە وردە برینەکەی ساڕێژ دەبێتەوە. دیارە (مخۆل شەلەنگ) پێش وەخت زۆرشتی ئەژمار کردووە، هەربۆیە لە یەکێك لە ژوورەکانی ماڵکەیدا لە ژێر فەرشە راخراوەکانەوە دەلاقەیەکی نهێنی، دروست کردبوو کە سەردابێکی لە ژووری میوانەکەدا و سەردابێکی دیکەی لە دواوەی ماڵەکەیدا بووە. بۆ ئەوەی لە هەموو حاڵەتێکی ترسدا یان لە کاتی هەبوونی مەترسییدا هەرزوو بگاتە بەشی دواوە و لەوێوە بە پەیژەیەکی داریندا بەسەر دیوارەکەدا بتوانێت باز بداتە ئەو دیوی ماڵەکەی، کە کەلاوەیەکی چۆڵ بووە و هەڵبێت بۆ دوورترین شوێن. دیارە ئەم سیناریۆیە بە شێوەیەکی دیکە و ساڵانێکی دواتر روویان دا، ئەو دەمە (وەنەوشە) لە ماڵ نەبوو، نەك هەر لەم شارە نەبوو، بەڵکو لە شارێکی دیکەی نزیك سنوورەکانی کوردستان بوو. لەوێ باوەشی بۆ تۆپ و خومپارەکانی سوپای ئێران کردبۆوە. لەوێ لەناو ئاگر و ئاسندا دەژیا. ئەو لەو شارە دەژیا، ناوی شاری (سێوان) بوو، شارێکی خنجیلانەی جوان لەوێ لەگەڵ کوڕە تاقانەکەی دەژیا.

(حسە زیپکە) ئەو پیاوە خراپەکارەی بە نالەباری لەدایك ببوو. ئەو هەر لە منداڵییەوە بە نالەباری ژیاوە لەسەر شەقامەکان و لەناو کەلاوەو لە سەر تەختەی سندووقە سێو و گوێنی دڕاو پارچە مقەبای ناو گووزەری بەقاڵ و تووڕفرۆشەکان گەورە ببوو، لە کەس روون نییە دایك و باوکی کێن، بەڵام من زۆر سەربووردەم لەبارەی ئەوەوە دەستکەوت، زۆر چیرۆك کە هەموویان دەچنەوە سەر هەمان رێڕەوی راستی بابەتەکە. دەڵێن ژنێکی سۆزانی هەبووە لەو

سەردەمەی شاردا ژیاوە بەناوی (سوهەیلە بێبن)، کە زوو ئامۆزاکەی خۆی لە شارۆچکەیەکی دوورە دەست بێبنی دەکات، دواتر لەبەر ئەوەی ئابڕوویان نەچێ، بەزۆر لە ئامۆزاکەی مارە دەکرێت. ئەوانیش سەفەری ئەم شارەی ئێمە دەکەن. ئامۆزاکەی ناوی (جافر جووزەلە) دەبێت، شەوان لە یانەکانی خواردنەوەو قومارخانەکانی شاردا پیشەی جووزەلە لێدان دەبێت و پیاو دەکێشێت بەسەر خۆیدا. زۆرجار بە (جافرە قوندەر) بانگی دەکەن. ئەویش هەر زوو ژیان لە خۆی تاڵ دەکات و میوانی سەرخۆشی یانەکان لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە بۆ ماڵ و بە بڕێک پارە رازی دەبێت کە لەگەڵ (سوهەیلە بێبن)ی ژنیدا رابووێرن و بخەون. ئیتر سوهەیلە دەبێتە لەشفرۆش و دەکەوێتە ناو گێژاوی دنیایەکی پۆخڵەوە و دەبێتە نێچیرو خۆراکی پیاوانی سەرخۆشیی مەیخانەکانی شەوان و هاوڕێ داوێنپیسەکانی مێردەکەی.

ئیدی خەڵکی شار رۆژانە و بەردەوام توانج لە (جافر جووزەلە) دەدەن و هاواری لێدەکەن (جافر جووزەلە، جافرە قوندەر، جافرە ناپیاو، جافرە ژن حیز) لەسەر ئەم توانج و سووکایەتی و ناوناتۆرە قۆڕانە چەند جار بەشەڕ دێت و خەڵکی بەر چەقۆ دەدات و چەندین جاریش تێی هەڵدەدەن و بەم شێوەیە ئابڕووی لە شاردا دەتکێ و دەبێتە بنێشتەخۆشەی ژێر ددان، بۆیە چیتر توانای نامێنێت لەو شارەدا بژیت.

شەوێك دەڕواتە یەکێك لەو یانانەی خواردنەوە و قوماری تێدا دەکرێت و تەواو خۆی خەیاڵ دەکات و دێتە دەرەوە. لە دوورەوە هاواری لێدەکەن (جافر میوان بێن؟ بەڕاستی تامی مەمکی (سوهەیلە) زۆر خۆشە)! یەکێکی دیکە هاواری لێدەکات: (کوڕە بۆ باسی ممتی ناکەن ئەڵێی بەفرە) ئەوەندە سووکایەتی پێدەکەن هەست بەوە دەکات کە چیتر ژیانی هیچ نرخێکی نەماوە. هەربۆیە بە مل شۆڕی و نائومێدی و گریانەوە دێتە دەرەوەو شەو بە هەموو شاردا پیادەگەڕێت، دواتر دەڕواتە یەکێك لە کووچەکان و ئاگرێك دەکاتەوە و شووشەیەك کحول لە گیرفانی دەردەهێنێت و دەیرێژێت بە گیانی خۆیدا و ئاگر لە جەستەی خۆی بەردەدات و خۆی دەکات بە خەڵوز و بە برینداری و بێکەسی گیان دەدات و دەمرێت. ئیدی (سوهەیلە)ش دوای ماوەیەك سکی پڕ دەبێت و کوڕێکی دەبێت ناوی دەنێت (حوسێن). بەو شێوەیە بۆ بەڕێکردنی ژیانیان ناچار کاری لەشفرۆشی دەکات و بەردەوام دەبێت. ئەگەرچی دەڵێن خۆی وتوویەتی (خۆم حەزم لێیە و هیچ پەشیمان نیم) هەر بەم چەشنە دەژی، پاش پێنج ساڵ دوای لەدایکبوونی (حوسێن) تووشی نەخۆشییەکی پیس دەبێت و دەمرێت. ئیدی (حسە) تەنیا دەکەوێت و هەر لە منداڵییەوە دەکەوێتە سەر شەقامەکان و خەڵکی خێرخواز نان و جلوبەرگی دەدەنێ. (حسە) وردە وردە

کوڕێکی شەڕانی و دز و چەقاوەسووی لێدەردەچێت و لە کەلاوەکاندا دەخەوێت و منداڵییکی ناشیرینی لێدەردەچێت. لووتێکی زل و دەموچاوێکی پیسی زیپکاوی کە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە دوومەڵ و لووی جۆراوجۆر لە دەموچاوی دێن، کەس قێزی نایەت تەماشای بکات.

کە گەورە دەبێت و دێتە تەمەنی هەرزەکاری، ئەوەندە ناڕەسەن و شەڕاشۆ و بەدفەڕ دەبێ، دەسبەجێ خۆی لە رژێم دەباتە پێش و سەرەتا کاری سیخوڕیان بۆ دەکات و دواتر بە پارە خەڵکیان بۆ دەکوژێت. هێدی هێدی دەبێتە جەللادی بەعس. لەگەڵ تێپەڕی تەمەنی زیاتر و زیاتر خۆی لەلای جەللادەکان شیرین دەکات و دەچێتە پێشەوە. بە دوو برۆی گەورەی کەوانی و لووتێکی زل و دەموچاوێکی زیپکاوی و دوومەڵاوی خۆی دەگەیەنێتە ژوورە ئاسی و نهێنییەکانی رژێم و لەوێ راپۆرت لە چەندین گەنجی خێرنەدیو و ستەمدیدەی کورد دەدات. بە تێپەڕبوونی کات رەوش و بارودۆخی ئەمنی کوردستان بەرەو خراپی دەڕوات. لێرەو لەوێ هێزە خەباتگێڕەکانی کورد چالاکی مەزن ئەنجام دەدەن. لە شاخ و لە شار یەکێك لە هەڵسووڕێنەر و بزوێنەرە دیارەکانی ئەوکاتە لە شاردا (مەحموود شەلەنگ) دەبێت کە لە پاڵ کارو کاسبی خۆیدا لە خەباتیش راناوەستێت و بەرەو پێش دەچێت، نازناوگەلی زۆر بەدەست دەهێنێت، ئیدی دەبێتە جێگای مەترسی و هەست دەکات رژێم بە شوێن پێکانیدا دەگەڕێت و بە ئاشکرابوونی سەر لەبەری پرۆسەکانی شار ئاشکرا دەبێت بۆیە زیاتر نیگای خۆی لەسەر وردەکاریی کارەکانی چڕ دەکاتەوە. هەمیشە لە هەوڵی کوشتنی (حسە زیپکە)دا دەبێت، ئاخر ئەو کابرایەکی دیندار ببووە و بڕوای بە کوشتنی ئادەمیزاد نەبووە، بەڵام جەنگی بەرانبەر بەعسییەکان بە خەزا و جیهاد زانیوە. لەو هەوڵانەدا دەرفەتی وەهای بۆ رێك ناکەوێت زۆر جاران پلانەکانی بە وردی دادەڕێژێت بە ناردنی کارەکتەرەکە، دواتر یاخود شوێن پێی هەڵناگرێت یان کەسی نێردراو تووشی تەنگوچەڵەمە دەبێت و دواتر لەناو دەچێت.

(مخۆل شەلەنگ) هەمیشە وەك راوچییەکی وریا و لەسەرهەست لە بۆسەدا دەبێت بۆ لەناوبردنی ئەو دوژمنە سەرسەختەی خۆی و نەتەوەکەی، ئەو وەك فریادڕەسێك دەکەوێتە وردەکاریی دیکە و بەردەوام هەلومەرجی گونجاو دێنێتە ئاراوە. ئەو دەمەی وەك پیرێکی نووورانی هێدی هێدی ریشی درێژ دەکاتەوە، ریشێکی موبارەك و خاو کە رەونەقی نەخشە مۆرەکەی سەر لێوی وێنەی پەیامبەرێکی دیکەی پێدەبەخشێت، زۆر کەس بە چاوێکی زۆر سەیر تەماشای دەکەن، ئەو رۆژبەڕۆژ خزمەتی خێزانەکەی و نەتەوەکەی دەکات، لەبەر سەرقاڵی گوڵ و ئینجانەکان دەسپێیرێت بە (وەنەوشە) و پێی دەڵێت: (کچی شیرینم گوڵەکان بێناز مەکە، ئەوان تاکە رەفیقی

زیندووبوونی تۆن. دەبێت ئەوان زەمەنە درێژکان ببڕن و زینـدوو بـن و سـەروەریی خانەوادەکـەمان بپارێزن. ئەو گوڵانە دیاریی خودان بۆ ئێمە).

بیرمان نەچێت ئەو شەوەی چەکدارەکانی (حسە زیپکـە) (مخـۆل شـەلەنگ)یان بریـنـدار کـرد، ماوەی ساڵێك بـوو (وەنەوشـە) کـەوتبووە داوی ئـەوین و خۆشەویسـتیی کـوڕێکی هونەرمەنـدی دەستڕەنگینەوە، کوڕێکی کوردی دانیشتووی شاری (سێوان). سـەرەتا هیچـی لای دایـك و بـاوی باس نەکردبوو، بەڵام دوای چاکبوونەوەی باوکی زۆری باسی هونەر و خۆشەویستی بۆ دنیـای پیـاوە دەسـتڕەنگینەکان بـۆ کردبـوو، گـەلێ باسوخواسـیان هێنـابووە گـۆڕێ، دواجـار گەیشـتبوونە دەرەنجامێکی تەواو. ئەوەدەمەی (مخۆل شەلەنگ) راستییەکانی زانیبوو لەلایەك زۆر خۆشحاڵ ببوو، لەلایەکی تر زۆر خەمگین ببوو، بەڵام بە بڕوای مـن هۆکـاری خۆشـحاڵبوونەکەی ئـەوە بـووە کـە پێشوەخت (مخۆل) بڕیاری سەفەری دابوو. شتەکانی لە مێشـکی خۆیـدا هەڵسـەنگاندبوو، بڕیـاری دابوو کە ئەبێت رۆژێك سەفەر بکات ئیدی بەرەو چ هـەرێمێك؟ بـەرەو چ مەملەکـەتێك؟ نـازانم، هەڵبەتە سەفەرکردنی خۆی و (دولبەر داود غولام) وای دەکرد (وەنەوشـە) تـەنیا بمێنێتـەوە. بۆیـە (مخۆل شەلەنگ) حەزی کردبوو کچەکەی بچیتە ماڵ و مێردی خۆی و دوور بکەوێتـەوە لـە چـاوی خراپەکارانەی (حسە زیپکە) و بەعسییە داوێنپیسەکان. نـەبادا ئـابڕووی ببـەن و کچـەکەی لاقـە بکەن، چونکە بەرنامەی ئەوان تەڕو وشکی پێکەوە دەسـووتاند، هـەر بۆیـە کـە زانیبـووی کـوڕە هونەرمەندەکە خەڵکی شارێکی دیکەیە و دوورە لەم شـارە بڕیـاری بـە ئـەرێ دابـوو، لەلایـەکی دیکەوە خەمبار ببوو بەوەی ئاگری شەڕی هەڵگیرساوی عێراق و ئێـران ئـەو شـارە دەسـووتێنێت، چـونکە شـارێکی سـنووری بـوو و پێگـەی جـەنگی جـەنگاوەرەکانی هەردوولایـە و ئـەوان ئـەو سەرزەمینە دەشێلن و گوێ بە هیچ شتێك نادەن.

لەو ماوەیەدا چەندین جار هونەرمەندەکە (جیهانگیر سەرحەد) لەشاردا (وەنەوشە)ی بینیبوو و چەندین جار سـەردانی کردبـوو لەسـەر زۆر تـەوەرەی ئەوکاتـەی ژیـان قسـەیان کردبـوو دواجـار خۆشەویستییەکی بەتین لەنێوانیاندا دروست ببوو.

هاوینی سـاڵی ١٩٨٠ رووداوێکـی ترسـناك قـەوما. رووداوێـك سـەرلەبەری هاوکێشـەکانی هەڵوەشاندەوە. ژیانی هەموو عێراقییەکانی گـۆڕی و رەوتـی سیاسـی کوردسـتان و خـەباتکارانی کوردیش بەهەلومەرجی جیاوازتردا تێپەڕی. ئیدی ژیانێکی نەهامـەتی بـەڕێوە بـوو. سـەردەمێك هات بۆنی خوێن سەراپای شار و دێهات و ناوچـەکانی عێراقـی ئـاخنیبوو. کۆڵانـەکانی شـاریش کشومات و بێ سەروا، ئەو دەمە سەردەمی کەوتنەخوارەوەی خومپارەکان و دەسپییکی شـەڕێکی

ماڵوێرانکەر باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا. (سەدام حوسێن) خۆی خزاندە نێو شەڕێکی قورس لەگەڵ دراوسێیەکی ئەویش وڵاتی ئێران بوو. لە هەموو لایەکەوە هوتافات بۆ سەرۆکی گەورە دەکێشرا و لە هەموو لایەکەوە سەرباز کۆ دەکرایەوە زۆر لاو و گەنجی کورد بێ هەڵامەت دەرباز نەبوون و بە سەرباز و بە زۆرەملێ راپێچی بەرەکانی جەنگ کران. زۆریان فیراریان کرد و لەناو چاڵ و سەردابە نهێنییەکاندا دەرهێنرانە دەرەوە و گوللەباران کران، دیمەنی چاوبەستنەوەی گەنجانی کورد لە شەقام و کۆڵانەکاندا دەبینران پاشان لە گۆڕەپانە تایبەتیەکاندا گوللەباران دەکران بە تاوانی هەڵاتن. سەردەمێکی پڕ لە نەهامەتی و ئاشووب بوو. دیمەنی کەوتنی تەرم و بۆگەنبوونیان لە گەرمای هاویندا. رەشەبا بەردەوام بۆنی بارووت و حەشوە و خوێن و لاشەی سەربازی سووتاو و بۆگەنبووی لە سەر سنوورەکانەوە لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و بەسەر شاردا بڵاوی دەکردەوە. دیمەنی راکردنی خەڵکی لە ترسی کەوتنی تۆپە بیئەژمارەکان بەرەو سەرداب و ژێر زەمینەکان هەژێنەر بوو. هەر گەڕەکەو چەندین ژێر زەمینی هەبوو چەند دەرچەو سەردابی نهێنی هەبوو کە خەڵك خۆیان تێدا حەشار دەدا لە ترسی جەنگ و خومپارە و تۆپەکانی ئێران. ئەو سەردەمە هەموو وەستاو بەنناکانی شار، هەموو ئەندازیارەکانی دروست کردنی بینا و خانوو دەبوو نەخشەی جیاوازتر بکێشن و حسابی چەندین سەرداب و مەنهۆڵ و ژێرزەمینی نهێنی بکەن. دیاربوو (مخۆل شەلەنگ) هەرزوو ئەو وردەکاریانەی کردبوو، بۆ مەبەستی جیاوازتر، بەڵام رۆژگارێك کەڵکی لێوەرگرتن. ئەو هیچ کات نهێنیی ئەو سەرداب و کون و کاژێرانەی ناو ماڵەکەی بۆ کەس باس نەکردبوو. تەنیا خۆی و (دولبەر داود غولا) و (وەنەوشە) دەیانزانی، ئەو دەمە زۆر جاران ئەو کون و سەردابانەیان لە ترسی کەوتنی تۆپ و مووشەك و خومپارەکان بەکار هێنابوو.

بە کەڵکوەرگرتن لە شەڕ هێزەکانی ناوشار گەلێك چالاکییان کردبوو و ترسیان خستبووە دڵی رژێمی بەعس و زۆر جاریش بە بردنی نامەکانی شار و هەواڵ و گۆڕانکارییەکانی ئەو کاتە و رژێمی بەعس، سنوورە سەختەکانی شارباژێڕی بڕیبوو. لەو ماوەیەدا گەلێك جار چووبووە شاخ و بە نهێنیی لەگەڵ سەرکردە گەورەکانی کورد کۆ ببووەوە و سەردانی گوندەکەی خۆیشی کردبوو. سەردانی رەز و باخە ماندووەکانی کردبوو. هەناسەی چیاکانی هەڵمژیبوو. بۆنی گوڵە وەنەوشەییەکانی کردبوو. بینیبووی ژمارەی گوڵەکانی ناو ماڵەکەی کە ئەو کات چەند خزمێکی خۆی تێدا بوو ئەمێستا ببوونە دەیان هەزار، سەراپای ماڵ و داڵان و حەسارەکانی داگیر کردبوو. دیمەنی ماڵەکەی کردبووە پەڵە هەورێکی بچکۆلەی وەنەوشەیی. لەسەر داوای خۆی خەڵکی گوند چەندین گوڵی لەسەر داڵان و لەناو باخچەکاندا

رواندبوو. لەسەر حەسارەکەوە تەماشای چیاکانی کردبوو. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشابوو و لە دیمەنی جوانی سروشت رامابوو. تەماشای ئەو پەیژە وەهمییە ئەفسووناوییەی کردبوو، کە لەناو رەزەکەوە بەرەو قووڵایی ئاسمان هەڵکشابوو و لە چاو ونببوو. دواجار تەنیا ئەو ئەو پەیژەیەی بینیبوو، پەیژەیەکی کریستاڵیی بڵند تا قووڵایی ئاسمانەکان.

ئەو زۆر سەرسام ببوو چەند جارێك بە پیاوانی گوندی وتبوو: (ئەرێ خزمینە ئێوە ئەو پەیژە سەیرە نابینن لەناو رەزەکەی منەوە بە شاوڵی بەرەو ئاسمان کشاوە سەیرکەن دەبریسکێتەوە)؟ لە وەڵامدا هەموو سەرسامانە وتبوویان: (لالە مخۆل! ئەی پیاوی خودا! ئێمە هیچ نابینین)، دیار بووە تەنیا تەلیسمەکە (مخۆل) بینیویەتی. پاش مانەوەی چەند رۆژێك بە توولە رێگایەکی نهێنییدا گەڕابۆوە بۆ شار. هەمیشە بیری لە ژیانی ئەو سەردەمە کردبۆوە و خەمی بە کوژرانی مرۆڤەکان خواردبوو، دواجار رژانی خوێن لەسەر ئەم گۆی زەمینە سیناریۆیەکی شەیتانیانەیە و ماناکانی جوانی لە مرۆڤ دەسێنێتەوە.

زۆر جار لە شاردا دەنگی تەقەی زۆر بیسترابوو، (مخۆل شەلەنگ) لە شەوانی درەنگدا هاتبووە حەوشەکە و تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمانی کردبوو. ئەو زۆر جار ئەم دێڕەی وتبوو، لەگەڵ بینینی ئەستێرەکاندا هەمیشە گتووی (ماڵی منن رۆژێك دێت تەنیا من ئەستێرەکان دادەگرم لەبری ئەو ئەستێرانە گوڵ دادەنێم)! من ئەم دێڕەم لە چەند شوێندا بینیوە، بەڵام زۆر درەنگ زانیم مانای چییە.

هەمیشە شەڕ بەردەوام ببوو هەمیشە خەڵك دەکوژرا و لە زەمانی جەنگدا شالاوی ئافرەتی لەشفرش لەشاردا گەشەیان کردبوو. گەلەك ئافرەتی عەرەبی لەشفرۆشی ناوەڕاست و باشووری وڵات سەفەریان بەرەو ناوچەکانی ئێمە کردبوو، لە ماڵی ئەمن و بەعسییەکاندا ببوونە خزمەتکار و زۆرینەیان ماڵیان بە کرێ بۆ دەگیرا. دیارە جەنگ لە هەر وڵاتێکی دنیادا دروست ببێت ئابووری وڵاتەکە تێك دەدات خەڵك بۆ پەیدا کردنی نان و ژیان کاری هەمەجۆر دەکەن. ئەوەی لە شاری لینینگرادی سۆڤیەتی جاران رووی دا و گەنم لەناو سایلۆکاندا نەماو دەستییان کرد بە مردوو خواردن، ئەوە بە شێوەیکی دیکە لە وڵاتی ئێمەدا قەوما و بەسەر ئێمە هاتەوە. خەڵك بۆ ژیان دەسیان بە دزی و لەشفرشی کرد. هەڵبەتە ئەو ژنانەی لە خواروی وڵاتەوە هاتبوون، هەموو لە برسا و بۆ پەیداکردنی نان و ژیان شارەو شار دەگەڕان و لەشی ناسك و نازداری خۆیان دەکردە خۆراکی پیاوانی شەهوەتاوی و جاش و مستەشارەکانی بەعس. زۆر لەو ئافرەتانە مێردەکانیان لە جەنگەکاندا لەدەست دابوو، ئیدی یان کوژرابوون یا بە دیلی کەتبوونە دەست پاسدارەکانی ئێران و

ڕەوانەی زیندانی ئەوین کرابوون. شاڵاوی ئافرەتانی لەشفرش لە زیادبووندا بوو، دواجار یەکێك لە دیارییەکانی جەنگ دروستکردنی ئافرەتانی لەشفرۆشە. ئەمە لە پاڵ دەرد و نەخۆشییە پیس و خراپەکاندا. ڕۆژانە ئافرەتی لەشفرۆش دەبینران، هەندێکیان بەڕوتی بەسەر شەقامەکانەوە بوون و دەگریان، هەندێکیان دەستییان بە سنگ و بەرۆکیانەوە دەگرت و هاواریان دەکرد. هەندێکیان بە شەقامەکاندا رایان دەکرد و دەیان قیژاند، سەربازی شەهوەتاوی بە شەقامەکاندا بە دوای ئافرەتەکاندا رای دەکرد و هاواری دەکرد.

(مخۆل شەلەنگ) زۆر شەوان تا بەیانی دەگریا و شەونوێژی دەکرد. زۆر رۆژ دەچوو بۆ مزگەوت و لەوێ قورئانی دەخوێند. ئەم دیمەنانە زۆر ئازاریان دەدا. هەربۆیە دیمەنی پیری زووتر لە روخساریدا دەبریسکایەوە. رۆژ بەڕۆژ زیاتر ریشی دەبریسکایەوە و دەبوو بە دەزولکەی کریستاڵی. چاوەکانی زیاتر دەترووسکانەوە و وەك دەریایان لێدەهات. نوور لە پەنجەکانی دەچۆڕایەوە. تیشك لە هەموو جەستەی دەهاتەدەر، کە بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت، دیمەنی فەسادییەکانی لێ ون دەبوو.

(حسە زیپکە) زیاتر و زیاتر خەڵکی ئازار دەدا. دووکان و عەرەبانە و مێزی زۆر کەسی بە شەق دەدا و زۆر گەنجی راوەدوو دەنا و لە کەلاوەیەکدا دەیدانە بەر فیشەك. بە ئاشکرا لەناو جەرگەی بازاڕدا باوەشی بە ئافرەتدا دەکرد و شەهوەتی خۆی تێدا بەتاڵ دەکردەوە. دەگەڕا بەدوای کچانی ناسك و نازداری کوردا و بە زۆرەملێ دەیبردن بۆ ئەمنەکان و دەوری گەوادێکی سووکی دەبینی. لەلای بەعسییەکان خۆی هەڵدەکێشا و خۆی ئازا دەکرد. (مەحموود شەلەنگ) زۆر لە ئابڕووی (وەنەوشە) دەترسا و هەمیشە لە خەمی ئەودا بوو. دەترسا لەوەی نەبادا (حسە زیپکە) کارێکی خراپ بکات و سەرلەبەری ژیانی تێك بدات. ئیتر ژیان وایە هەمیشە خەڵکی خراپ و بەدخوو درەنگ دەمرن و هەردەمێننەوە، بەڵام کەسانی چاك و داهێنەر و مرۆڤ دۆست زوو کۆتای بەسەفەرەکەیان لە ژیان دەهێنن دەگەڕێنەوە بۆ زیندەگی دیکە و ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵن.

جوانییەکانی دنیا بە جوانییەکانی مرۆڤ دەگەشێنەوە و ئەو کاتەی مرۆڤ جوانی نازانێت و هەموو شتێك ناشیرین دەکات، ئیدی مرۆڤ مانای نامێنێت، باز دەدات بۆ دڕندەبوون و ئاژەڵبوون.

(مەحموود شەلەنگ) بەردەوام باسی لە دنیایەکی جوانی مرۆڤانەی کردووە، هەموو هەوڵی خۆی داوە تا بتوانێت شار لە بۆگەنی و لەش بۆگەنبوونی مرۆڤە پیسەکان خاوێن بکاتەوە. هەوڵ و تەقەلای بۆ ئەوە بووە، دوای دوو ساڵ لە برینداربوونەکەی و شەڕە دلێرانەکەی شۆڕشگێڕان (مخۆل شەلەنگ) کچە تاقەنەکەی کە چەند ساڵێك بوو مامۆستا بوو، دای بە کوڕە پەیکەرتاشەکە. ئەو

کوڕەی وا پێرارەکـە (وەنەوشـە)ی لـە پێشـانگایەکی هونەریـدا لەبـەر بـەرزی و دەسـترەنگینیی هونەرەکـەی ناسـیبووی و پـاش ماوەیـەك لـە هاوڕێیـەتی و چـەند قۆناغێـك لـە خۆشەویسـتی پەیوەندیەکی بەتینیان دروست کردبوو و لەوسەردەمەی جەنگ باڵی بەسەر تەواوی وڵاتدا کێشـابوو ئەوان دوو ئاشقی راستەقینە، پەیمانیان بەیەك دابوو.

ماوەیەکی زێڕن بوو لە ژیانی ئەو دوو ئاشقە راستەقینەیەدا کە لەسەر بناغەی جـوانی و هێـزە شاراوەکانی ناخی مرۆڤ ئەشقێکی ئەبەدییان دروست کـرد، مـاوەی دەسـگیرانیان زۆری نەخایانـد، هەرزوو (وەنەوشە) بڕیاری دا، کۆچ بکات بۆ شاری (سێوان) و لەوێ لەگەڵ (جیهانگیر سـەرحەد) و ماڵباتەکەیدا بژی و مـاڵێکی جـوان بنیـات بنـێن، ئـیتر (وەنەوشـە) لـەوێ درێـژە بـە پیشـەی مامۆستایەتی خۆی دەدات لە قوتابخانەیەك بەناوی (گوڵان).

(محۆل شەلەنگ) و(دولبەر داود غولام) زۆر خەمبارو بێزار دەبن بەوەی تاقـە کچـەکەیان، ئـەو کچەی بەرهەمی ئاسمانەکان بوو لێیان دوور دەکەوتـەوە، لەلایـەك خـەمبار و لەلایـەك خۆشـحاڵ بوون، بەو شێوەیە ژیانیان درێژە پێدا، بەڵام (وەنەوشە) پێی لە دایك و باوکە پیرەکەی نـەبڕی و زوو زوو سەردانی دەکردن. ئەگەرچی لە سەردەم و رۆژگارێکی تاڵ و ناخۆشدا دەژیان و جـەنگ تـەواوی وڵاتی کاول و وێران کردبوو، شەقامەکانی شار یەك پارچە خوێن بوون. دیوارەکان هەموو بە خـوێن رەنگ کرابوون. هەورەکان رەنگی خوێنیان گرتبوو. دنیا گـەرم داهـاتبوو، بـە گـەرمای سـووتانی باروت و خومپارە و مووشەك و تۆپەکان بە سووتانی ماڵ و مزگەوت و نەخۆشخانە و دارسـتان و پووش و پاوەنەکان. هەموو وڵات خەمبار بوو. سەرۆك و دارودەستەکەی نەبێت ماتەم باڵی بەسـەر گشت لایەکدا کێشابوو. (وەنەوشە) وەفای خۆی ون نـەدەکرد و دەهـات و بـاوك و دایکـی بەسـەر دەکردەوە و گوڵەکانی بۆ ئاو دەدان. ئەو دەمە هێدی هێدی نیشـانەی دووگیـانی لـە (وەنەوشـە)دا دەردەکەوت و هەست بەبوونی کۆرپەیەك دەکرا لە سکیدا. (محۆل شەلەنگ) دڵـی زۆر بـەوە خـۆش بوو، کە نەوەیەکی دیکە دەخاتەوە و لەم سەر زەوییە وەجاغی کوێر نابێتەوە.

سـاڵانی هەشـتاکان زۆر بـە خێرایـی تێدەپـەڕین، کارەسـاتی زۆر لـەو سـاڵانەدا روویـان دا، کارەساتگەلی وەها روویان دا هەرگیز لە مێژووی کورد و مرۆڤایەتیدا ناسڕێتەوە و هەر دەمێنن.

سـاڵی ١٩٨٧ کـە گونـدەکان راگـوێزران و هـەموو دێهاتـەکان سـووتێنران و کـاول کـران، خەڵکەکەی بەزۆر لە ئۆردوگاکاندا نیشتەجێ کران. گوندەکەی (محۆل شەلەنگ) بەدوور نـەبوو لـەو کاولکارییە، (محۆل شەلەنگ) کاتێك بەوەی زانی یەك مانگی رێـك شـەوان تـا سـپییدەی بـەیانی دەگریاو ئارامی لەبەر هەڵدەگیرا. ئەو تاکـە شـتێك کـە ئـارامیی پێدەبەخشـی سـەردانی رەز و

باخەکانی بوو. لە شارباژێڕ بەدیمەنی گوڵــەکانی ماڵەکــەی شاگەشــکە دەبــوو. ئێســتاکە هــەموو ناوچەکانی کوردستان بوونەتە زەوی حەرام کراو قەدەغەیــە هــیچ روحلەبــەرێك بــەناویادا بــڕوات، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی ئارامی لەبەر هەڵبگیرێت و ماوەیکی زۆر وەك شێت خەو خۆراك لەخۆی حەرام دەکات و بیر دەکاتەوە و دەیەوێت بڕوات دیمەنی خــانوو و بــاخ و رەزەکــانی ببینێــت، بــەڵام هاوڕێ و دۆستەکانی تکای لێدەکەن واز لــەو بیرۆکەیــە بهێنێــت و خــۆی لــە قــەرەی ئــەو ناوچــە حەرامکراوانە نەدات، چونکە هەموو مینرێژکراون و لەسەر هەر بەرزایی و گردێــك ســەربازگەیەك دانراوە و هەر رێبووارێك بە بەرسێرە و نیشانەی تفەنگەکانیاندا بــڕوات، دەســتبەجێ گوللــەبارانی دەکەن و دەیکوژن.

ئەو قسانەیان بەگوێدا نەچوو. هەربۆیە بێ ئــەوەی خــودا حــافیزی لەکــەس بکــەن و کەســێك ئاگادار بکەنەوە (مەحموود شەلەنگ) و (دولبەر داود غولام) لە بەیانییەکی زووی دوایین رۆژەکانی ساڵی ١٩٨٧ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ــدا بە بەرگی سپی و چەند پریاســکە و کەشــکۆڵێکەوە لــە ماڵ دێنە دەر و بەرەو چیاکانی شارباژێڕ دەکەونە رێ و بەرەو رەزەکانی خۆیان دەگەڕێنــەوە. ئیــدی وەك دوو فریشتە دوو مرۆڤی نوورانی لەبەرگی سپییدا، بزر دەبن و ئاســەواریان ون دەبێــت و هــیچ کەسێك نایان بینێتەوە. (محۆل شەلەنگ) بە بــەرگی ســپی و ریشــێکی خــاوی درێــژی ســپی وەك پیاوێکی نوورانی و پەیامبەرێکی ئیلاهی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاکەی تێیــدا لــەدایك بــووە. لــەوێ دەڕواتە ناو رەزەکەی ئیدی لەو بەیانییەوە تا هەنووکــە کــەس ســۆراخێکی ئــەو ژن و پیــاوە پــیرە نازانێت و بۆ ئەبەدی بزربوون. زۆر کەس دەڵێن (لە کێلگــە مینەکانــدا پارچەپارچــە بــوون) و زۆر کەسی دیکە لە خزمەکانی خۆی دەڵێن (بە هۆی پەیژەیەکی کریستاڵیەوە کە بەر لە چــەند ســاڵێك لەبەردەم چەند پیاوێکی گونددا باسی کردووە، بەرەو قووڵایی ئاسمانێ هەڵکشــاون.) هەنــدێکی تــر دەڵێن: (لەگەڵ خەباتکارانی کورد چوون بۆ ئێران). چەند ئەگەر و گریمانەی تر دێتە باس و خــواس، بەڵام هیچ کەس نازانێت کام لەوانە وەڕاست دەگەڕێن و دروستن. بەم شێوەیە (محۆل شەلەنگ) خۆی لەبەرچاوی دوژمنانی کوردو (حسە زیپکە) بزر کرد. هەڵبەتە (محۆل شەلەنگ) لە دواجاردا حــەزی نەکردووە سەردەمی نەهامەتی و جەنگ و مەرگی هەزاران هاونیشتیمانی خۆی ببینێت، کــە دوای سەفەرەکە ئەو کارەساتی زۆر مەرگاوی بەسەر کورددا هات و سەرلەبەری هاوکێشەکانی گۆڕی.

## ١٣

### گفتوگۆی نێوان

### کاوە میرخاس و کامەرانی وەنەوشە

عەسرێکی کەمێك گەرم بوو. لە پەنجەرەکەوە تەماشای شارم دەکرد. تەمێکی زەردی وەك خۆڵ و تۆز شاری تەژی کردبوو. ئەو خۆڵبارینە کەشوهەواکەی گەرمتر کردبوو. بە خاولیەك لەشم دەسڕی و ئارەقم لە جەستەم دەکردەوە. زۆر کتوپڕ دەنگییکی نائاسایی هاواری کرد و وتی: (سڵاو لە کوڕە وەنەوشەییەکەی خۆمان... ئەو دوو هێڵە لێرەدا بەیەك دەگەن. دەمودەست بێدەنگ بوو، بەلای دەرگای ژوورەکەمدا ئاوڕم دایەوە و تەماشام کرد مامۆستا (کاوە میرخاس) لەبەردەم ژوورەکەم بە کراس و پانتۆڵێکی قاوەیی و چاویلکەیەکەوە وەستاوە، چەند کتێبێك لەبن باڵی دایە و دەمی هەتا بناگوێی داپچڕیوە و لە جێی خۆی دەخنێتەوە و ددانەکانی دەردەکەون و لێوی بۆ سەرەوە و خوارەوە دەبزوێت.، بەلامەوە زۆر سەیر بوو. لەم عەسرە خۆڵاوییەی شاردا مامۆستا (کاوە) لەبەردەم ژوورەکەی مندا لە بەشی ناوخۆیی وەستاوە و قاقا پێ دەکەنێت. وەك سووکە شەرمێك کراسێکم کردە بەرم و بەگەرموگوڕییەوە پێشوازیم لێ کرد و وتم: (فەرمووو... فەرمووو... مامۆستا گیان... زۆر سەیرە بە راستی هیچ کات لەو بڕوایەدا نەبووم کە ئێوەی بەڕێز رۆژێك بێن و ئەم خەراباتەی من بەسەر بکەنەوە. هەڵبەتە شەرمەندەم کە... ناتوانم لەبەردەم ئەم حورمەتە گەورەیەدا بە پێی پێویست بم تکایە، ببوورە). مامۆستا (کاوە میرخاس) قۆنەرە قاوەییە پانەکانی داکەند و هاتە ژوورەوە و لەسەر کورسییەك دانیشتن و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە ژوورەکەیدا روانی و گوتی: (فەزایەکی شیعری لە ژوورەکەتدایە. بۆنی سەردەمی قەسیدە و شیعر و چیرۆك لە تەواوی پێکهاتەکانی ژوورەکەت دێت، ژوورەکەت تەواو جودایە و لە ژووری کەسانی دیکە ناچێت. ئەو هەموو وێنەی گوڵە چییە لەسەر دیوارەکان! بۆ هەموویان وا نارێك هەڵواسراون! ئەی ئەو هەموو کتێبە چییە لەسەر رەفەکان! دیارە تۆ خوێنەرێکی باشیت، خۆم سەرەتا لەوە دڵنیا بووم.) کەمێك لەسەر کورسییەکەی پاڵی دایەوە، دیسان قاقایەکی لێدا و هەموو لەشی کەوتە لەرزین. من زۆر شەرمم دەکرد. هەر پێم سەیر بوو کە چۆن ئەو منی بیر

کەوتۆتەوە؟ چۆن ئەم شوێنەی زانیوە؟ ئەی بۆچی هاتووە بۆ ئێرە؟ ئەم پرسیارانەم بە مێشکیدا هاتن، خۆم پێ ڕانەگیرا و تەکانێکم بە خۆم داو و ویستم بڵێم، مامۆستا (کاوە) چۆن بوو هاتیت بۆ لای من؟ ئەو بەر لە من وتی: (کامەران دەزانم بیر لەچی دەکەیتەوە، دەتەوێت نهێنیی هاتنی من بۆ لای خۆت بزانیت، لە ڕاستییدا هەردووکمان پێویستیمان بە ئاخاوتنە... بەڵێ پێویستە پێکەوە ڕاوێژ بکەین). من نەمدەزانی مەبەستی چییە؟ ناخۆشترین شتێك کە مرۆڤ دەخاتە دڵەڕاوکێوە ئەوەیە، نەزانی بەرامبەرەکەت چیی لە دڵایە.

لە ڕاستییدا یەکەم جار بوو لە ژیانمدا بگرە لە ژیانی زانکۆیمدا مامۆستایەکی زانکۆ سەردانم بکات ئەوە کارێك بوو جێگای تێڕامان و لێوردبوونەوەی قوولْ بوو، چونکە مامۆستایان و دکتۆرەکانی زانکۆ و خاوەن بڕوانامەکانی ماستەر زۆر لەوە لووتبەرزتر بوون کە سڵاویش لە فێرخوازەکانی خۆیان بکەن، زۆرێك لەوان لە گۆڕەپانەکاندا بەلاتدا تێدەپەڕین و بە لووتێکی بەرزەوە وەك ئەسپی کێوی سەرمەستانە دەڕۆیشتن و لە خۆیان هەڵدەدا. هەمیشە بە چاوێکی نزمتر لە پلەو پایەی خۆیان بۆیان دەڕوانیت، بەڵام هاتنی مامۆستایەکی ڕوحسووك و شیرین لە دڵی قوتابییاندا بێ دەمار و سادە کابرایەکی باڵا مامناوەندی سەر ماش و برنجی، بەڵام تا ڕادەیەك گەنج و بە شان و شەوکەت و بە هەیبەت بوو، ڕووخۆش و خاوەن زمانێکی پاراوی ئاخاوتن، خاوەن هەڵسوکەوتێکی مەردانەی مۆدێرن، من زۆر شەرمم لێ دەکرد، بەڵام چەند جارێك لە کۆلێژ گفتوگۆم لەگەڵ کردبوو بە کورتی، لەو ڕۆژەی وانەکەمان بوو بە دایەلۆگی کراوە، ڕۆژێك بوو من تێیدا قسەی زۆرم کرد و لەسەر هێڵە لێکدراوەکان و گەیشتنیان بە یەکدی قسەی جیددیم کرد. هەر ئەو ڕۆژە (سەهەندی بایز ئاغا) و (ئاسمان خۆشناو مینا) بە جودا ڕای تایبەتیان لەسەر حەقیقەتی دوو هێڵەکە وت. من سەرمەشق بووم و پێکڕا باوەڕیان بە بیردۆزەکانم هێنا و تەنانەت مامۆستا (کاوە میرخاس) باوەڕی بە قسەکانم هێنابوو. مامۆستا (کاوە) پتر پێداگریی لەسەر کۆمەڵێك مەسەلە کرد و وتی: (کامەران... من پێویستم بە هێز و تواناکانی تۆ هەیە بۆ سەرخستنی چەند پرۆژەیەك...) لە قسەکردن وەستا. پاش ئەوەی پەرداخێك ئاوی ساردم دایە دەستی و بینی لێ شل کرد و هەڵی چۆڕاند. دیار بوو ئەو ڕۆژە خۆڵبارینە پلەی گەرمی لەشی ئەو و تێکڕای خەڵکیان بە شێوەیەك بەرز کردبووە کە گەرووی وشك ببوو. دەبوو زۆر ئاو بخواتەوە هەتا تۆزێك دڵ و ناخی فێنك ببنەوە. سەرەتا بەر لەوەی باسی پرۆژەکانی بکات، من دەمزانی کە پرۆژەی گرنگی لەلا گەڵاڵە بووە. هەستم بە گەورەیی خۆم دەکرد. لەبەر ئەوەی ئەوە شەرەفێکی گەورە بوو من بتوانم کۆمەك بکەم بە مامۆستایەکی ئازیز و خۆشەویستم، لە هەمان کاتدا

راهێنانی سەرەتایی من بوو بۆ کارکردن لە پڕۆژەدا. ئیدی پـڕۆژە بـە هـەموو ماناکانییـەوە، مـن لەوەوبەر هیچ پڕۆژەیەکی راستەقینەم بەدەستتەوە نەببوو، هەرچەند هەنـدێك هـەوڵی جیـاواز لـە مێشکمدا بوو، بەڵام تەنیا بیرکردنەوە و بیرۆکە بوون، لە تەنیاییدا پڕۆژەی زۆر دێتە مێشکی مرۆڤ و هەر زووش ئاوا دەبن.

من پێشتر لە هەندێك خوێندکارم بیستبوو کەوا مامۆستا (کاوە) تەنیا دەژی و خێزانی نییـە. لە یەکێك لە خانووە خۆشەکانی ئەو سـەردەمەی لـە (شارۆچـکەی گاورەکـان) دروسـت دەکـران. نەخشەی خانووکەیشی هەر خۆی کێشابووی. دواتر چەند جارێـك لەگـەڵ (سـەهەند) و (شـاپوور) سەردانمان کرد و لەوێ لەناو باخچە تایبەتەکەیدا گفتوگۆی دیکەمان لەسەر زۆر شتی گـرنگ سـاز دا و پلان و فۆرمی جیاجیامان بینی و کاری زۆرمان لەناو ئەو گرووپەدا کرد کە مامۆستا (کـاوە) پێکی هێنا.

سەرەتا بەر لەوەی بچینە ناو تەوەری قسەکردنمان، کەمێك سـەرنجی کتێبـەکانمی دا و دەسـتی خستە سەر یەکێك لەو کتێبانەی دانرابوو. ئـەویش کتێبـی (دواهـەمین هـەناری دنیـا)ی رۆمـان نووسی گەورەی کورد (بەختیار عەلی) بوو. وتی: (کامەرانی وەنەوشە، ئەم کتێبـەم خوێندۆتـەوە، بەڕاستی مەزنە ئەم نووسەرە، تالاوی ئەم کتێبە و ئازارەکانی منیان گریاند پـەیامێکی مرۆڤانـەی فەلسەفی لە دوو توێی ئەم کتێبەدا هەیە، چەند کلۆڵن ئەو مرۆڤانەی ئەم کتێبەیان نەخوێندۆتەوە. چەند دۆڕاون ئەوانەی لە ئازارەکانی تێناگەن بە راستی. ئـەم پیـاوە زۆر مانـدووە و مانـدووبوونی خۆی لە تەنیاییدا دەدۆزێتەوە، من سەرسامم پێی بە کارەکانی، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکـەم بگاتـە لووتکەیەکی پرشنگدار) من نەمتوانی هیچ بڵێم، چونکە منیش هەر وەها روانگەیەکەم هەبوو بـۆ ئەو نووسەرە. من بەر لەوە چـەند جارێـك ئـەو کتێبـەم خوێنـدبۆوە بـەر لـەوە تـەواوی شـیعر و قەسیدەکانیم خوێندبۆوە، ئێمـە بازنەیـەکمان هـەبوو کتێبمـان تـێ فـڕێ دەدا و لـە سـووڕانەوەدا دەخوێندرایەوە. ئەو نووسەرە دیاردەیـەکی نـوێ بـوو لـەو سـەردەمەدا گـەنجی زۆر لـە سـێبەری کتێبەکانیدا وەستا بوون.

دواتر من زۆر زانیاریم لەسەر مامۆستا (کـاوە) پەیـدا کـرد، هۆکـاری ژیـانی لـەو شـارەدا و تەنیایی و بیرکردنەوەکانی، هـەموو ئاماژەییـەکی نـوێ بـوون بـۆ پەیوەنـدیی مۆدێرنـەی نێـوان مامۆستا و خوێندکار... من نەمزانیبوو بۆچی ئەو حەز بە ناسراوی لەگەڵ ئێمـەدا دەکـات دواتـر بیرم کەوتەوە کە رۆژێك بە تەنیا لێی پرسیم (کامـەران... تـۆ لـەم شـارەدا لـە کـوێ دەژیـت... حەزدەکەم بزانم شوێن و مەکانت کوێیە؟ ) من بە شێوەیەکی ئاسایی زانیاری تەواوم دابوویە، بەڵام

هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم کە مامۆستا نەخشە و پلانی زۆری هەیە و متمانە بە من دەکات و ڕۆژێك دێت و کۆمەڵێك پەڕە و نووسرا و دەخاتە بەر دەستم، ئەم ڕووداوە وای لێکردم کە لەناو ئەرشیفی خۆمدا تەواوی گفتووگۆکان بنووسم من بە نەژاد بۆمان مابۆوە هەموو ئەجیندای ڕۆژانەم لە دەفتەرێکدا دەنووسیەوە ئەگەر گرنگ بووایە دەمخستە دوتوویێی (کتێبە وەنەوشەییەکە)م. لە دەمی خۆیەوە زۆر ڕاستییم زانی ئەو متمانەی تەواوی بە من هەبوو. پەیوەندیی نێوانمان دواتر زۆر پەرەی سەند و زیاتر وەك دوو هاوڕێ لەگەڵ یەك دەجووڵاینەوە. ئەگەرچی ئەو نزیکەی دە ساڵ لە من گەورەتر بوو، بەڵام تەمەن کاری نەکردە سەر پێوەندییەکەمان و من کەوتمە دوای. ڕۆژانە هەموو زانیارییەکانم تۆمار دەکرد. ئەو کارەم هەبوو، تەنانەت لە زانکۆش لەنێوان وانەکاندا کە ڕێستمان وەردەگرت، من زانیاریم دەنووسی. ماوەیەکی باشم هەبوو ئەو کارە بکەم، بە هەرحاڵ با بگەڕێمەوە سەر باسی کتێبەکە، مامۆستا (کاوە میرخاس) کە پتر لە کابرایەکی کۆمەڵناس دەچوو، زۆر حەزی لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆری حەز لە دنیای شیعر و ئەدەب و ڕۆمان بوو، چەند جارێك کتێبی دانسقەم دایە و پاش خوێندنەوەی بۆی دێنامەوە.

من و (شاپووری خەزان) و (سەهەندی بایز ئاغا) و (ئاسمان مینا) ڕەنگ و خووی یەکتریمان گرتبوو، بەڵام من سەرمەشقی ئەوان بووم. هەمووومان پێکەوە دنیایەکی جیاوازمان دروست کردبوو. خوێندنەوەمان تێڕوانینمان بگرە ئەوانیش فێری ئەوە بوون، کە ژیانی خۆیان بنووسنەوە. هەر کەسە و ڕۆژانەی یادداشتەکانی خۆی دەنووسییەوە، من ئەو بیرۆکەیەم فێری ئەوانیش کرد دەمزانی لە داهاتوودا، ئەم دەستنووسانە گرنگ دەبوون.

من لەلای ئەوان وەك کابرایەکی قسە ڕاست و کوێخا وەها بووم. لە پێشبینیکردندا هەمیشە جێگای بڕوایان بووم، توانایەکی شاراوە لە ناخمدا هەبوو، ئەویش لێکدانەوەی خەونبوو، بە شێوەیەکی تەواو سەر سووڕهێنەر خەونی کەسەکانم لێك دەداوە و هەرچیم دەگوت، ڕاست دەردەچوو. تەنانەت مامۆستا (کاوە) ئەو ڕاستییەی بەر لە ناسینم بۆ خۆی زانیبوو، نازانم لە دەمی کێوە ئەو نهێنییە داکەوتبوو؟ ئەمەش وای لە مامۆستا (کاوە) کردبوو کە زیاتر حەز بە ناسینم بکات. هەر ئەوە بوو وای کردبوو بە من بڵێت: (تۆ هێزێکی شاراوە لە ناختدایە... پێویستە ئەو هێزە بجوولێت و بە پێی یاسا فیزیاییەکەی شتێك بکات). دیار بوو مەبەستی ئەو لە فرمان یان ئیشکردنێك بوو کە ئەفراندنی تێدا بێت. ئاکامی هەبێت. هەر بۆیە متمانەی بە من دابوو دەیزانی دەتوانم پلانەکانی بۆ ڕاپەڕێنم. کارکردن دوورمان دەخاتەوە لە جەنگ. لەو ڕۆژەدا دنیا هەموو چاوەڕوانی گۆڕانی سەیریان دەکرد. جەنگ دنیای تەنیبۆوە. لەسەردەمی جەنگدا

بووین. زەوی ماندوو بوو. بۆیە مامۆستا (کاوە میرخاس) باسی زەویی بۆ دەکردم. دەیگوت: (زەوی هەسارەیەکی نەگبەتە... مەودای چەندین هەزار میل لە گەردوونێکدا پەراوێز خراوە و دەسووڕێتەوە. ئەوەی مرۆڤ لەسەر ئەم گۆی زەوییە دەیکات، لە هیچ کام لە هەسارەکانی گەردووندا ناکرێت. زەوی مادەیەکی گوناهە. سنگی کێڵراوە و دەسووتێنرێت. تەماشەکە ئەم هەسارەیە یەك پارچە جەنگە، یەك پارچە خوێنە یەك پارچە بۆنی بارووت و چەقۆ و مردنی لێدێت. بە راستی من کارم ئەوەیە هاوڕێیەتی لەگەڵ زەویدا بکەم، تەبابم لەگەڵی و ماندووی نەکەم. نەیکوژم. ئەو روحی هەیە. قسە دەکات بە زمانێکی جیاواز لە زمانی ئادەمیزاد قسە دەکات. تەنیا ئەو کەسانە لە زمانی زەوی تێدەگەن کە مرۆڤن و لە مانای جوانی تێدەگەن. ئەوانەی لێی دەدەن و سمی پێدا دادەکوتن، دڕندەن جیاوازن و جەستەی بێ روحن... بۆگەنن). تەواو کاری تێکردم. وای لێکردم لە زەوی رابمێنم و گوێی لێ بگرم. وای کرد شەوان لە باڵکۆنەکەوە لەگەڵ گوڵەکانم دانیشم و گوێ لە زەوی بگرم.

مامۆستا (کاوە میرخاس) کەمێك وەستا و بەلای چەپدا رووی وەرگێڕا و تەماشایەکی باڵکۆنەکەی کرد. وتی: (کامەران، بە راست ئەوە ئەو گوڵانەیە کە تۆ لە سنگیان دەدەی؟ ئەو ئینجانە گوڵانە چین لەناو خۆڵ و تۆزدا بزربوون؟ لەناو ناچن؟ ئەو خۆڵبارینە نایانکوژێت؟ بۆنیان نامرێنێت؟ رەنگیان ناژاکێنێت؟ بۆ نایانهێنییتە ژوورەوە؟ ) لە وەڵامدا زەردەخەنەیەکم کرد و وتم: (مامۆستا گیان ئەوە ئەو گوڵەیە کە لە سنگی دەدەم. ئەوان نامرن! تەمەنیان زۆر درێژە. ئەوانە زنجیرە یادگاریی تاڵ و شیرینی ژیانی منن تا مردن تا ئاخر زەمان. لە سەرزەمینێکی زیندووەوە هاتوون. پەیامێکی مرۆڤانەیان پێیە. بۆ مرۆڤ پێدەکەنن، قسە دەکەن بە زمانێکی جیاواز. ئەوان رەنگی وەنەوشەیی خودان. سەر زەوی لەو رەنگەی لێ نییە. ئەم گوڵە تەنیا من هەمە جیاوازە لە گوڵەکانی دیکە هەموو شتێکیان جیاوازە. سەردەمەکان دەبڕن و نامرن. هەر دەمێنن. چیرۆکی هەموو سەردەمەکان پێکەوە گرێ دەدەن. هاوڕێیەتی لەسەر زەوی دروست دەکەن... دەگەڕێن هەموو دنیا دەتەقێنن*، کەنارەکان دەبڕن. سوار گەمیە دەبن، زەریاکان دەبڕن، لە هەموو دوورگەیەك لەنگەر دەگرن و لە هەموو سەرزەمینێك دەژین. بەدوای جوانیدا دەگەڕێن. هەر پێ دەکەنن، هەرگیز ناگرین. دەگەڕێن و باوەش بۆ پەپوولەکان دەکەنەوە. سنگیان عەتر دەردەدات، ئاونگ دەکات. هەنگوینی جودا و

* تەقاندن: لێرەدا واتە، گەڕانی ورد بە شوێن شتێکدا. ئەو شارەم هەموو تەقاند و نەمدۆزییەوە...

شیرینتر بەرهەم دەهێنێت. هەنگەکان لەسەریان دەژین. بەرەبەیان مۆسیقام بۆ دەژەنن. گۆرانی و سەمفۆنیای نەمرم بۆ دەژەنن. مامۆستا (کاوە) ئەوان شیعرم بۆ دەخوێننەوە. بە هێزی ئەو گوڵانە دەژیم. بێ ئەوان جەستەیەکی بێ روحم. ناتوانم هەرگیز لە یادیان بکەم.) ئاگام لێ بوو ئەو تەواو سەراسیمە و حەپەساو تەماشای باڵکۆنەکەی دەکرد. قسەکانم زۆریان کار تێکرد. بۆیە داوای لێکردم لە نزیکەوە گوڵەکان ببینێت. منیش ئاسایی دەرگای باڵکۆنەکەم بۆ کردەوە. چوو لە نزیکەوە تەماشای گوڵەکانی کرد و دەستی لە گەڵا و چڵەکانی دەدا و لە رەنگی سیحراویی گوڵەکانی روانی. هەرچەندە رۆژێکی خۆڵاوی بوو، بەڵام گوڵەکان وەك چرا دەسووتان، شەوقیان دەداوە. هەزاران گوورزە تیشك لە ملوولە وردەکانی گوڵەکانەوە دەردەچوون. مامۆستا (کاوە) زۆر بە ئاسوودەییەوە تەماشایی دەکردن و هیچی بۆ نەدەوترا. هەستم دەکرد بە راستی پێیان سەرسامە هەر بۆیە دواجار وتی: (کامەران لە ژیانمدا لەم جۆرە گوڵانەم نەبینیوە بە راستی سەیرن تکایە ئاگات لێیان بێ، با نەفەوتێن. ئەمانە شتی دانسقەن و لەسەر زەوی لەم جۆرانە نییە. من نازانم ئەم گوڵانە لە کوێوە هاتوون. ئەتوانم بزانم چیرۆك و سەمەرەیی ئەم گوڵانە چییە؟ هەست دەکەم زۆر گرنگن) من هەوڵم دا زوو ئەو باسە بگۆڕم، چونکە نەم دەویست ئەو چیرۆکانە بۆ کەس باس بکەم. هەر بۆیە بازم دا بۆ پرۆژەکان و وتم: (مامۆستا کاوە پێم وابێ ئێستا سەرەی ئەوە بێت بزانم ئەم پەڕەو نوسراوانە چین پێت؟ ئەی پرۆژەکانت چییە؟ تا من کۆمەکیت بکەم. هەڵبەتە ئەوەندەی لە توانای مندا هەبێت، یارمەتیی پرۆژەکانت دەدەم تا بیانگەیەنمە سەرکەوتن). مامۆستا (کاوە) باسەکەی پێشووتری سەبارەت بە گوڵەکان لەبیر چووەوە و قاقایەکی کێشا و وتی: (ئا وایە راست دەکەی... وایە... دەبێت هەندێك شت باس بکەین کات درەنگە... زۆر بە زەحمەت لە جەنجاڵی بازاڕ رزگارم دەبێت لەسەر مێزەکەی ژوورەکەم کۆمەڵێك وەرەقە و پلانی دەرهێنا چەند هێڵکارییەکی تێدا بوو لە شێوەی فلۆ چارت و هەرەم و سێ گۆشە و چوار گۆشە و هێڵی سووڕ و شین و رەنگاوڕەنگ، یەکە یەکە لەسەر مێزەکە بڵاوی کردنەوە. چاویلکەکەی لە چاویدا قنج کردەوە و ئاماژەی کرد بۆ من کە لێی نزیك بمەوە من بە پێوە وەستا بووم، کورسییەکەم نزیك کردەوە و وتم: (مامۆستا ئەم هێڵکاری و خاڵ و رستە و هێمایانە چین؟ ) سەری هەڵبڕی و وتی: (ها... ها... هی... هی کوڕی خۆم... پەلەمەکە هێشتا شتی تر ماوە، بەڵام ئێستا بۆت باس دەکەم... بەر لە هەموو شتێك... دەمەوێت بزانم تۆ ئاشقیت یان نا؟) من، بەلامەوە سەیر بوو باسی ئەشق لەگەڵ ئەو هەرەم و سێ گۆشانەدا یەکیان

نەدەگرتەوە بە سەرسامی وتم: (مامۆستا من ئاشق نیم، بەڵام ئاشق دەبم هەست دەکەم ئاشق ببم لەمەوبەر نەبووم، بەڵام دەبم) ئەویش بە پێکەنینەوە وتی: (تێ ناگەم کوڕم دەبم نابم بووم هێشتا نەبووم، بەڵام دەبم، ئەمانە چین؟ دێڕەکانت تەواو نین... ڕوونتر قسە بکە کوڕی خۆم...) بۆیە وتم: (مامۆستا ئەشق و ئاشق دوو شتی لە یەك جودان. ئێمە بە هەڵە لێکیان دەدەینەوە. من ئەوە تازە دڵم بۆ کەسێکی دیکە دەکورکێنێ*... دیاردەیەکی نائاسایی پاڵ بە منەوە دەنێت هێزی ئەو خاڵە مۆرە پاڵ بە منەوە دەنێت کە تەواو جیاواز لەناوچەوانی ئەو بڕوانم)، ئەم جارە بە دەنگییکی تەواو بەرز قاقای لێدا و وتی: (کامەران تۆ زۆر بە پارێزەوە قسە دەکەی من نازانم ئەو کێیە؟ خاڵی مۆری چی؟ و ناوچاوانی چی؟) راستە ئەو هیچی نەدەزانی، بەڵام هەوڵم دەدا پێی بڵێم و نەمدەتوانی دووبارە دەستی کردەوە بە قسە، وتی: (کامەران ئەم پرسیارەم بۆیە کرد، چونکە یەکێك لە پرۆژەکانم پەیوەندیی بە ئەشقەوە هەیە. مەرج نییە ئەوەی ئەندازیار بوو ئیدی تەنیا لە کانزا و بلۆك و ئاسن و کارەبا و وزە بکۆڵێتەوە و تەواو ئەم پرۆژەیەم ئەندازەی خۆشەویستییە پلانێکە بۆ ئەشق، بۆ رزگارکردنی ئاشق و ئەشق. حەز دەکەم هەرەمی ئیشکردنەکەت پیشان بدەم و گرووپێك دروست بکەین بۆ سەرخستنی ئەو پرۆژەیە. من ماڵێکی گەورەم هەیە دەتوانم سوودی لێ وەرگرم بۆ ئەو کارە و چەندین پرۆژەی دیکە. هەست دەکەم ئێمە خەریکە دەبینە دڕندە و خۆشەویستی دەتۆرێنین بۆیە دەبێت سەروەری بگەڕێنیتەوە بۆ خۆشەویستی بە هەموو جۆرەکانییەوە. تەماشا بکە من بۆ خۆم بە تەنیام ئاشقم، بەڵام تەنیام. هەر لە کۆنەوە ئاشقم، بەڵام تەنیام، بۆخۆم و باخەوانێك و خزمەتکارێك لەو ماڵە گەورەیەمدا دەژین لە شارۆچکەی گاورەکان. باخێکی گەورەم هەیە و ماڵێکم تێدا دروست کردووە. ماڵێکی پەمەیی زۆر جوان ماڵێکی کریستاڵی، بەڵام خاڵی لە ئەشق دواتر دەزانی ماڵ بەبێ ئافرەت وەك خەرابات و وێرانە وایە. دەزانی سروەی دەنگی ئافرەت چرپەی پێیەکانی و ورشەی دەستەکانی، بۆنی کەزیەی، جێ پێی لە ماڵدا مۆسیقایە، شانۆیە، رەنگارە. دەزانی نەبوونی ئافرەت لە ژیاندا مانای وەحشەیەتە؟! من نەمتوانیوە ئەوە بکەم، چونکە زوو ئاشق نەبووم و دواتریش کەسێکم خۆش نەویستووە، ئێستا هەست دەکەم روحێکم خۆش دەویست نازانم بۆچی تەنیا ئەو نازانم بۆ؟) من نەمدەزانی مەبەستی تەواوی ئەو چییە، بەڵام لەوە زیرەکتر بووم. نازانم، کە ئەوەندەی حەز لە ئافرەت

* دڵکورکاندن: واتە جووڵانی هەستی حەز و خۆشەویستیی ئاشقانەی کوڕێك بۆ کچێك یان بە پێچەوانەوە.

بوو، ئاخۆ یەکێکی خۆش دەوێت؟ بە راست وەسفێکی جوانی ئافرەتی کرد. وای لێکردم ئافرەتم زیاتر خۆش بوویت. من زۆر حەزم بە تێکەڵاویی ئافرەت نەدەکرد. ژیانم دوو پارچە بوو. لەنێوان ژندا من کوشتەی دەستی ئەوان بووم، هەرگیز حەزم نەدەکرد دووبارە نزیك ببمەوە. من رابردوویەکم هەبوو، هەمووی داخ و مەینەت بوو. هەرگیز لەو مۆتەکەیە رزگارم نەدەبوو. بۆیە بۆ خۆ قوتارکردنم ناچار بووم ئافرەت لەیاد بکەم و خۆم تەرخان بکەم بۆ خوێندنی ئەندازە و شیعر و رۆمان. خزمەتی گوڵەکان بکەم و ئەشقبازییان لەگەڵ بکەم، مامۆستا (کاوە) تەواو جیاواز لە هەموو مامۆستایانی ئەو کاتەی زانکۆ هاتە ناو ژیانمانەوە و رێڕەوی ژیانی گۆڕین. وای لێکردین جیاواز بۆ ژیان بڕوانین. جیاواز باڵ بۆ فڕین بکەینەوە. جیاواز بە ئاسماندا هەڵکشێین، بە دەریادا سەفەر بکەین، لە مەرگ تێ بگەین، ماچی زەوی بکەین، لە باخچەدا دەست بۆ بوولبول رابکێشین، بە پەپوولە خۆمان داپۆشین، ماچی بەرەبەیان بکەین، لە دیانەتەکان تێ بگەین، هەرەس بە تابۆکان بهێنین، لە خودا رابمێنین، لە کۆتر ورد بینەوە، لە ئەستێرە ملوانکە بچنین... هەروا بوو، بۆیە لە پڕ وتی: (کامەران ئەم دەفتەرانە پڕۆژە گەلێکن بۆ جوانکاری روحی مرۆڤ بۆ هێنانەوەی سەروەری خۆشەویستی بۆ مرۆڤ کە هەست دەکەم تۆراوە و... گۆڕاوە بۆ مەرامی دیکە) من دەمزانی کارکردن لەگەڵ مامۆستا (کاوە میرخاس) دا پڕێتی لە سەرکێشی و هەزاران نشێوت دێتە رێ. دەمزانی سەرکەشیکردن و لادانی تێدایە. دەمزانی رەنگە ببینە جێگای چاوی هەڵۆ دۆڕاوەکانی دەسەڵات. دەمزانی نووکی رمەکانیان بەسەرماندا دەکەن، ئەوەندە لە دەسەڵات بێزار بووم، لە داخان بڕیارم دا ئەو پڕۆژانەی مامۆستا داوای دەکرد هەموویان پەسەند بکەم. پڕۆژەکان زۆر بوون هەموویانم تەماشا کرد و فۆرم و پلانەکانم خوێندەوە. تەماشای هەموویانم کرد. مامۆستا (کاوە) وتی (کامەران، ئەمانە با نهێنی بن، من نووسخەی ترم هەیە، ئەمانە بۆ تۆ چەند سی دی یەکم هەیە و لە کۆمپیوتەرەکەمدا هەڵم گرتوون، نەخشەکانم کێشاوە، ئەمانە با ئەمانەت بن دواتر وەڵامم بدەرەوە. هەر پرسیارێکیشت هەبوو لە زانکۆ پێم بڵێ دەبێت گرووپێك دروست بکەین بۆ ئەو کارە. سەرەتا تۆم هەڵبژار، بەڵام تۆ چەند هاوڕێیەکی باشت هەیە و دەتوانیت سوود لەوانیش وەرگریت. وەك (شاپوور سبحان) و (سەهەند بایز) و (ئاسمان خۆشناو) و ئەوانی دیکە. هەوڵ بدە دڵنیایان بکەیەوە، ئەم پڕۆژەیە داهاتی نییە، مەرج نییە تەنیا پارە و دراو بێت، بەڵام سەرکەوتنەکەی ناوبانگە، شوهرەیە، جوانییە، مرۆڤایەتییە، خۆشەویستییە، کارایە و کارێکە... من ئامادەم سەرپەرشتیاریی ئەو کارە بکەم، بەڵام بەبێ ئێوە من ناتوانم

کار بکەم، با ئەوە وەلا نێین ڕەنگە گوشارم بخەنە سەر، ڕەنگە بڵێین خۆی خستۆتە زۆنگی شێتییەوە، بەڵام من بیّ باکم لە هەر ڕەخنەیەك، ئەم کارە گرنگە و ڕێکخراوێك دروست دەکات و خزمەت بە ئێوە و هاوڕێکانت دەکات. ئەم شارە پڕێتی لە کەسی مردوو، کە بە عەقڵێکی ئەشکەوتەکان دەڕۆن بەڕێوە، بۆیە دەبێت ئەم ڕەوتە بگۆڕین. کار دەکەین بۆ سەرخستنی کۆمەڵگا و دروستکردنی شۆڕشێك کە ئاشقەکان سەر مەشقی بن. دەسەڵاتێك دروست دەکەین ئاشقان حوکمی بکەن دوور لە چەك. گوڵ چەك بێت، گوڵ لە بری گوللە بێت، گەڵا لە بری ئەستێرەی سەرشان بێت، باخچە لە بری مەکتەبی سیاسی بێت، ماچ لە بری شەق بێت. ئەم کارە وا دەکات وڵاتێکی نموونەییت هەبێت. (کامەران) ئەو دەمە گوڵەکانی تۆ زۆر دەبن و وڵات تێکڕا بۆنی گوڵ دەکەن. لە بری بۆنی باروت و خوێن لە بری دەنگی تۆپ و گوللە، لە پەنجەرەکانەوە مۆسیقا دێتە ژووریّ...) کات دەڕۆیشت ئێمە لەسەر نەخشەکان قسەمان دەکرد، گەلیّ باسمان دەورووژاند، هەر لەو کاتەدا لە دەرگا درا، کاتێك دەرگام کردەوە (شاپووری خەزان) بوو. زۆر سەرسام هاتە بەرچاو، کاتێك تەماشای ژوورەکەی کرد و مامۆستا (کاوە میرخاس)ی بینی. دەمی کەوتە تەتەڵە و وتی (ها... وەڵا نازانم، ببوورن، مامۆستا (کاوە) تۆ باشیت، ئەوە خێرە لێرەیت؟ ببەخشن ڕەنگە کارێکی گرنگتان هەبێت، من پێویست نەکات بیزانم... مامۆستا بەخێر هاتیت سەرچاوانمان، گەورەت کردین، شەرەفێکی گەورەیە، هاتنی ئێوە مایەی ڕێز و پێزانینە، خۆشحاڵم کە تۆ تاکە مامۆستای سەردانمان بکەی... کەس نایەت لە ئێمە بپرسێت، بڕوا بکە ژیانمان گەلێك مەراقی تێدایە، نە کارەبامان کارەبایە نە ئاومان ئاوە... ئەوەتا تەماشای دنیا بکە چەند پیس و خۆڵاوییە، گەرما و وشکەڕۆیی دنیای تەنیوە... بە هەرحاڵ... من نازانم دەڵێم چی... هاتنی تۆ سەیرە مامۆستا گیان. کاتی خۆت وەرگرە چیدی ناتوەستێنم). لە قسەکردن وەستا و دەستییکی بە دەموچاویدا هێنا و ویستی بڕوات. مامۆستا(کاوە) وتی (شاپوور گیان ڕاوەستە، کارێکی نهێنی هەیە، بەڵام ناکاتە ئەوەی تۆ لێی ئاگادار نەبیت. بەڵکو دەبێت لەم پرۆژەیەدا تۆش ئامادە بیت و دەور و ڕۆڵی بەرچاوت هەبێت. دەتوانیت بێتە ژوورەوە، تۆش وەك (کامەران) کەسێکی زیرەکیت، هەڵبەتە بە ڕێکەوت نەبوونەتە هاوڕیّ، هەندێك شتی گرنگ ئێوەی کۆ کردۆتەوە). من بە پێکەنینەوە فەرمووم لە (شاپووری خەزان) کرد. من ئەوم زۆر خۆش دەویست ئەو نزیکترین و ئازیزترین هاوڕێی من بوو. وەك چاوی خۆمان متمانەمان پێی بوو. هیچ شتێکم لیّ نەدەشاردەوە، من و ئەو بە ڕێکەوت لە گەراجی پاسەکانی شار یەکمان

ناسی. دواتر کە زانیم لە هەمان کۆلێژ و هەر ئەو بەشەی من وەرگیراوە، هەر زوو لە پاسەکەدا بووینە هاوڕێ و باسی زۆر شتمان کرد. هەر بۆیە لەو ڕۆژەوە ئەو بەڵێنەمان بە یەك دا هاوڕێ بین و لەیەك جیا نەبینەوە. زۆرمان باسی ژیان کرد و بەیەك سەرسام بووین. ئیتر هاوڕێیەتی هەمووی سووتفەیە، بە ڕێکەوت کەسێك دەبینیت لە یاریگایەکدا لە پاسێکدا لە ئاهەنگێکدا لە مەلەوانگەیەکدا لە فڕۆکەیەکدا لە دائیرەیەکی حوکمەتدا، باسی سەدان شت دێتە گۆڕێ. دواتر هاوڕێیەتی، دواتر تێکەڵاوبوون و توانەوە و نهێنیی گەورە. دواتر مردن بۆ یەکتری و دانیشتن و ماچکردن و خەمخواردن بۆ یەکتری. هاوڕێیەتی هەر ئەوەیە، ئێمە خەم و خولیامان دابەش دەکرد، لە زمانی یەکتری تەواو شارەزا بووین. نەدەکرا (شاپوور) بە نهێنییەکانم نەزانێت، تەنیا چەند نهێنییەکی رابردوو هەبوو بە مەبەست حەزم نەدەکرد بۆی باس بکەم، چونکە دەمویست ڕۆژێك خۆی دەرگاکان بە دەستی خۆی بکاتەوە. من هەستم دەکرد هێزێکی شاراوە لەو کوڕەدا هەیە، حەزی زۆر لە فڕین بوو بە ئاسمانە جیاوازەکاندا حەزی زۆر لە کردنەوەی دەرگا کۆڵۆم دراوەکان هەبوو. دەرگاکانی ژیانی من هەموویان کراوە نەبوون. چەندیان داخراو بوون. من حەزم دەکرد ڕۆژێك خۆی بە تەنیا بیانکاتەوە. بە هەرحاڵ من و ئەو دوو کەسی سەرسەخت و نەبڕاوە بووین. هەریەکەمان حەزمان لە زانینی نهێنیی ژیانی ئەوی تر هەبوو بۆیە بڕیارمان دا بەجیا ژیانی یەکدی بنووسینەوە. هەریەکەمان ئەو کارەمان کرد، ئێمە لە نەوەکانی ئەو سەردەمە بووین کە لە دەوری کۆمەڵێك نووسەر کۆ ببووینەوە، هەندێك جار پیاوێکی شانۆکاری پرچ درێژ هەبوو، کۆڕی شیعرخوێندنەوەی لە شاری قەڵا کۆنەکان ساز دەکرد. شیعری شاعیرە مەزنەکانی دەخوێندەوە. ئێمە پێکەوە لەگەڵ (شاپووری خەزان) دەچووین و گوێمان لێ دەگرت. هەندێك خوێندکاری پەیمانگا مۆسیقایان دەژەنی. ئەویش بە دەنگییکی زوڵاڵ شیعری دەخوێندەوە. ئێمە لە شیعر مەست دەبووین و دەگریاین، کاری زۆری دەکرد. ئەو سەردەمە شیعر زۆر بە بایەخ بوو، خوێندکارانی زانکۆ بە پۆل دەهاتن و خۆیان لە شیعردا دەشووشتەوە. لە ژێر نووری شیعردا دەگریان، ئەو سەردەمە من و (شاپوور) دوو هاوڕێ بووین لە ژیانێکی جیاوازدا دەژیاین تەواو ژیانێکی مەستانە بوو، پێکەوە چەندین جار شەڕابمان خاڵی دەکردەوە.

(شاپوور) هاتە ژوور بە حورمەتێکی زۆرەوە تەوقەی لەگەڵ مامۆستا (کاوە) کرد ئەو کوڕێکی کەمێك شەرمن بوو، زۆر شەرمنانە تەماشای مامۆستا (کاوە)ی دەکرد. ڕووی نەدەهات بە تەواوی سەیری ناوچاوانی بکات. هەر بۆیە بە سەرجووڵاندن گوێی لە مامۆستا

دەگرت، مامۆستا هەندێك شتی بەویش گوت. کاغەز و شتەکانی دانا و وتی: (کامەران و شاپوور هەردووکتان لە دامەزرێنەرانی ئەم پڕۆژە و ڕێخراوەدا بەردی بناغەن و ئەم کارە دەکەن). قسەکانی مامۆستا (کاوە) وەك فەرماندانێك وەها بوو، کە سەرهەنگێکی پۆلیس دەری دەکرد، بەڵام بەدەر نەبوو لە شێوە نەرمونیانییەکەی وەها جیاواز بێت، لە فەرماندانی سەروەرە حزبیەکانی مەکتەبە سیاسییەکان، هەر بۆیە ئێمە بە مەرجەکانی ڕازی بووین، پاش ئەوەی ئەو ئاماژەی بەوە دا کە لە داهاتوویەکی نزیکدا لەسەری کۆ دەبینەوە و هەرەمی ئیشکردنەکان جێبەجێ دەکەین، چیی نەمابوو بۆ بانگی ئێوارە. هەر بۆیە مامۆستا داوای خوداحافیزیی لێکردین و سوور بوو لەسەر ڕۆیشتن. هەرچەند ئێمە زۆرمان لێ کرد کە نەڕوات و ئێوارە میوانمان بێت، بەڵام گوتی، کاری زۆرە و هەر دەبێت بڕوات. بۆیە بە قادرمەکاندا لەگەڵی ڕۆیشتینە خوارەوە و ماڵئاوایمان لێ کرد. دواتر هاتینەوە و لەگەڵ (شاپوور) بڕیارمان دا تەواو بە سەلیقەیەکی زۆرەوە بابەتەکان و گەڵاڵەکان بخوێنینەوە و ڕاوێژی لەسەر بکەین. وامان کرد. داوی خواردنی نانی ئێوارە، تا درەنگانی شەو ئێمە خەریکی ڕاڤەکردنی بەرنامەکان بووین. دواجار گەیشتینە ئەنجام و هەندێك کاری باشمان لەسەر چەند پارچە پەڕەیەك کرد و بەردەوام بووین. بەڵێ بەم شێوەیە یەکەم کاری سەختمان لە ژیانماندا تاقی کردەوە، هەر ئەمەش وای کرد، لە کارکردندا خۆشی و ناخۆشیی زۆر ببینین، کە من دەرفەتم نییە باسی بکەم و ڕۆژێك بە (شاپوور)م گوت، ناخۆشییەکان ئەرکی تۆیە. کۆیان بکەرەوە، من دۆسیە و ئەرشیفی دیکەم هەیە. ڕۆژێك دەکەوێتە بەر دەستی تۆ.

## ١٤

## بەهرۆز چاوڕەش و بادە سلێمان لە یەکەم یەکترناسینیاندا

## (چیرۆکی چاڵەکانی مەرگ)

ڕەنگە زۆرێك لە ئێوە لە سەرەتای چیرۆکەکەدا ناوی (بەهرۆز چاوڕەش) تان بیستبێت، ئەو کوڕەی چاوەکانی گەش و گەورە بوون، کە کچان لە تیشکی نیگای چاوە گەورەکانیدا دیل دەبوون. ئەو خەڵکی شاری نەوت بوو، شارێکی دەوڵەمەند، بەڵام وێران. شارێك کە بە شەقامەکانیدا دەڕۆیت لە ئاسەواری گوناه و مردن و خوێن زیاتر، ئاوەدانییەك نابینین. شارێك هەموو دنیا ، عەرەب و ئینگلیز و کورد و تورك چاویان لە خێر و بێرە ڕۆزەکەی بڕیوە، بەڵام وەك کاولاشێك وەهایە و کەس خەمی لێ ناخوات. شارێك کە لەبەرەبەیانی مێژووەوە هەیە. بیرمە ڕۆژێك (کامەرانی وەنەوشە) وتی: (شاپوور مێژوونووسی کۆنی یۆنان (پلووتارخ) باسی ئەم شارەی کردووە. ئەو دەمە ناوی کورکور بووە، لە کۆندا شەڕێکی گەورە لەنێوان هێزەکانی داریوشی پاشای فارس و ئەسکەندەری گەورەی مەکدۆنی ڕووی داوە، لەناوچەیەك کە هەمیشە ئاگرێك بڵێسەی سەندوە. (پلووتارخ) بەو شوێنەی وتووە (کورکورا). دواتر لە زمانی زاگرۆسیدا هەندێك دەستکاری کراوە و بووە بە (کورکورك) و بە تێپەڕبوونی کات بووە بەو ناوە). سەیرە، شارێکی وەها بێ ناز لە وڵاتێکی شەڕاویدا هەبێت، کە لەسەر دەریای نەوتە و دەتوانێت دەیان سەدە میللەتە جیاوازەکان بەخێو بکات، بەڵام شارێکی خەماویی و گریاو و بێ ناز دەبینیت. (بەهرۆز) کوڕی دەشتە بێنازەکانی ئەو شارە بوو. لەگەڵ باوکێکی پیریدا لەوێ دەژیان، بەڵام خۆی خەریکی خوێندن بوو. باوکی ئەو دوای سەفەری (بەهرۆز) بۆ خوێندن لە پایتەخت، لەگەڵ چەند خزمێکی گەرمیانیی خۆیدا لە شاری (کورکورا) دەژیان. ئەوان لە شاڵاوەکانی ئەنفال بەجێ مابوون. ئەو کاتەی لە یەکێك لە گوندەکانی ناوچەی گەرمیان ژیابوون، شاڵاوی ئەنفال هەموو ناوچەکەیانی گرتبۆوە و هەموویان ئەنفال کرابوون. (بەهرۆز) پاشماوەی ئەو شاڵاوانە بوو کە هەمیشە چاوەڕوانی خوشکەکەی و برا و دایکی دەکرد. چاوەڕوانی گەڕانەوەیان لە مەرگ کە مەحاڵ بوو. من لە دەمی خۆیم بیست کە وتی: (شاپووری خەزان من منداڵ بووم، بەڵام بیرم دێت لەبەرچاومدا

خوشکەکەمیان لاقە کرد، لێی نەگەڕان تا مرد بە دە کەس فەسادیان کرد. تەمەنی چواردە ساڵ بوو، هەرگیز لە بیرم ناچیتەوە کە خوێن بە لاشەیدا دەهاتە خوار. دایکم ئەوەندە بۆی گریا لە هۆش خۆی چوو، بوورایەوە. براکەم، برا گەورەکەم کە تەمەنی شانزە ساڵ بوو ویستی بڕوات رایان بگرێت، لێیان دا. ئەو هەر ئەوەندە دەستی بەرز کردەوە و بۆکسێکی لە یەکێکیاندا بە فیشەك لەبەرچاوماندا گوللەبارانیان کرد.، خەمەکانم زۆر قووڵن (شاپووری خەزان) من لە رابردووی خۆم هەڵنایەم). ئەو رۆژەی کە بەهرۆز ئەم قسانەی بۆ من کرد، من بە تەنیا لەگەڵ ئەو لە باخچەی کۆلێژ دانیشتبووم زۆر گریام. هێندە گریام چاوەکانم بوونە گۆمی خوێن. بەهرۆز لە من پتر گریا. من هەولّم دەدا دڵخۆشییی بدەمەوە، بەڵام گریانی من و ئەو سنووری نەبوو، وەك هەور چۆن دەبارێت و زەوی تەڕ دەکات، ئاوەها زەویمان تەڕ دەکرد. فرمێسکەکانمان دەبوونە دەنکە مرواری و لەسەر زەوی دەبریسکانەوە و تیشکی رەنگاوڕەنگیان بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکردەوە. هەستم دەکرد چۆلەکەکان لەسەر چڵی درەختەکان بە ئاوازێکی جیاواز لە رۆژان دەگریان. بیرمە (بەهرۆز چاوڕەش) چاوەکانی دەریای خوێن بوون، بە گریانەوە دەیگوت: (شاپووری خەزان! مانگی نیسان مەرگی منە، من لە مانگی نیساندا مردووم. لە سەفەری دنیایەکی دیکەم، لەوێ بە دوای ئابڕووی خوشکەکەمدا دەگەڕێم. ئەوە کارێك نییە لە یادی بکەم، تاڵاوێك نییە شەڕاب و شەربەت رەوانی بکەن، هەرگیز لە یادی ناکەم.) من بە کوڵتر دەگریام. هەولّم دەدا دان بە خۆمدا بگرم، بەڵام نەمدەتوانی. مەرگی ئازیزان هەروا ئاسان لە یاد ناکرێت و لە بۆشاییەکانی هزردا ئاسەواری گەورە بەجێ دەهێڵن. من ئەو کوڕەم بەو شێوەیە ناسی. ئەویش هاوڕێیەکی بەئەمەك و هەست ناسك بوو بۆ ئێمە، لە دواییدا لە گرووپەکەماندا کاری کرد و گەیشتە دوا وێستگەی خۆی. لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ شاری (کورکورا) ئەوەی نەدەبوو روو بدات رووی دا. (بەهرۆز چاوڕەش) سەفەری ئەبەدییەتی خۆی بە شێوەیەکی تەواو عەجیب دەست پێ کرد. نەیتوانی بگەڕێتەوە، چونکە گەڕانەوەی ئەو نائاسایی دەبوو، دواجار ئەو بە شێوەیەك دەگەڕایەوە، کەلەسەری هەموو ئادەمیزادێك بۆ ئەو پێویست دەبوو. ئەو دەبوو لە کاتی گەڕانەوەیدا بە دوای کەللەسەرێکی گونجاودا بگەڕێت.

(بەهرۆز چاوڕەش)و باوکی لە پاشماوەی شاڵاوەکانی ئەنفال دەرچووبوون. وەك وتم بە شێوەیەکی زۆر سەرسووڕهێنەر رزگاریان بوو. دوای ئەوەی لە بیابانەکانی عەرعەر لە سنوورەکانی وڵاتی سعودییە، لە سنووری وڵاتە پیرۆزەکان و لانکەی پێغەمبەرە مەزنەکان گەمەیان پێ دەکرێت، تەنیا ژیانیان بۆ لم دەگێڕنەوە، تاکە هاوڕێیەك کە دوژمنیانە و دەبێت بە ناچاری خۆشییان بووین،

کە بریتییە لە لم. دواجار لم پێگەیەکی زۆر بەهێز لە مێژووی ئێمەدا دروست دەکات و وادەکات هەموو لە رەنگی زەرد و ئاڵتوونی رابمێنین. لم ئەو دەنکە مرواریییەیە کە ژیانی ئێمەی کوشت و دواجار پەیوەندیەکی ئەفسووناویی دیکەی لەگەڵدا بەستین. پەیمانێکی ئەبەدیی وەهای لەگەڵمان مۆر کرد کە تا کۆتایی دنیا بیپارێزین و سەدان چیرۆك و قەسیدەی لە بارەوە بۆ بهۆنینەوە. لم ئەو ماتریالە بوو، سەدای کپکراوی مردووەکانی ناو خاکی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە. هاواری هەزاران منداڵ و ژن و کیژی عازەبی تازە پێگەیشتوو و گەنج و پیری لەناو دەنکۆڵەکانی خۆیدا کرد بە سەمفۆنیا و سەدان چامە و وشەی سیحری لێ دروست کرد. هەزاران و سەدان هەزار روح باوەشیان کرد بە لمدا و بوونە تەپووتۆز هاواری لم و هاواری کوردە زیندەبەچاڵکراوەکان. بوو بە ئایەتی قورئان و لە زەمانەکانی دیکەدا لە ئاسمانەوە بە شێوەی دیکە و بە زمانی کوردی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دێتە خوار. من شەوێك خەونم بینی پاش ئەوەی راستییەکانی ئەنفالم لە دەمی (بەهرۆز چاوڕەش) بیست، ئەم خەونەم دی، دیتم روخساری فریشتەی وەحی پەیامێکی دیکە دەخوێنێتەوە بۆ مرۆڤایەتی و لە بری قورئان و سوورەتی ئەنفال سووڕەتی (کوردان)ی دەخوێندەوە، نەك (الاعراب). باسی کورد و ئەو ستەمانە دەکات کە رژێمە جیاوازەکانی دنیا زوڵمیان لێ دەکات. باسی سەروەریی مردووەکانی ئەنفال دەکات، باسی بیابان و لم، باسی بۆنی سووتانی جەستەی کوردان دەکات.

(بەهرۆز چاوڕەش) دەیگوت: (شاپووری خەزان، سەگە رەشەکانی بیابان چەندین لاشەیان لەژێر لمەوە دەردەهێنا و دەیانخوارد. منداڵیان پارچە پارچە دەکرد و دەیانخوارد. مەمکی ئافرەتیان لێ دەکردەوە و یارییان پێ دەکرد و پاشان دەیانمژی و دەیانخوارد. دڵی کوڕە گەنجەکانیان لە جەستەیان دەردەهێنا و دەیانخوارد، قاچی منداڵیان بە دوای خۆیاندا رادەکێشا. ریخۆڵەی پیاوە پیرەکانیان لە خۆیانەوە دەئاڵاند و دەیانقروسکاند. چاوی کیژە ئەسمەرەکانیان دەردەهێنا و بە چەمۆڵە پانیان دەکردەوە. خوێنیان دەخواردەوە.، براکەم بە چاوی خۆم بینیم سەربازەکان کیژێکی مردوویان فەساد دەکرد. کیژێك لە برسا مردبوو، بەڵام دوو سەرباز لاقەیان دەکرد. یەکێك لە پێشەوە یەکێکی تر لە دواوە لەگەڵی جووت بوون. یەکێکیان دەمی خستبۆ سنگی کیژە مردووەکە، ئەوەی تریان قەپی کردبوو بە ملیا. دیمەنی زۆر سامناکم لە بیابان بینی. هەزاران کوڕی هەرزەکارم دەبینی بە روتی لە بیاباندا راویان دەنان و دەیانگوت: دەبێت هەر رابکەن و بووەستن کوژراون. زۆربەیان هەر لە راکردندا دەکەوتن و دەمردن. هەزاران ژنی گەرمیانیی بە تەمەن لەناو پیسایی خۆیاندا نوقم دەبوون و دەمردن. هەزاران کچی جوان و شەڕمن و خوێن گەرمی ئەسمەری گەرمیانی بە روتی

لەبەرچاوی کەسوکاریان دار دەکرا بە عەورەتیاندا و پەردەی کچێنیان دەتەقێنرا. سەدانیان بەڕوتی دەخوران و دەبوونە پارووی چەوری سەربازە دڕندەکان. ئەوانەی دەمردن دەخرانە بەردەمی سەگە ڕەشە مرۆڤخۆرەکان). ڕۆژێك بوو من تەواو گوێم لە (بەهرۆز چاوڕەش) گرت بڕیارم دابوو هیچ وانەیەك نەخوێنم، چونکە تەنیا شتێك بوو رایدەکێشام بۆ ئازارەکانی خەڵکی گەرمیان و دەچوومە ناو ژیانیان زۆر گریام. زۆرم فرمێسکی سووڕ رشت. هەرگیز لە یادم ناچیتەوە یەکپارچە خەیاڵ بووم و چووبوومە ناو ئەو سیناریۆیەی (بەهرۆز) باسی دەکرد. تەنیا دانیشتبووین و گوێمان لە چیرۆکی نەهامەتییەکانی کورد دەگرت. من ئەو وێنانەم لە (بەهرۆز) وەردەگرت و لە مێشکمدا کۆگام دەکرد من توانایەکی باشم هەبوو لە کۆگاکردنی زانیاری و دیمەنی ڕۆژانەدا. دواتر دەهاتم لە دەفتەرێکی تایبەتدا دەمنووسینەوە، زۆر شتی بۆ باس کردم. کات دەڕۆیشت باسی ئەوەی بۆ کردم کە چۆن دوو ڕۆژ پاش ئەوەی خوشکەکەی و براکەی)، دەکوژن دایکی لە داخی ئەوان بەدەم گریانەوە بەلادا دەکەوێت و دەمرێت. ئەمیش بە منداڵی و بە تەنیا دەمێنێتەوە. بێ سەرپەرشت، چونکە باوکیان جیا کردۆتەوە و لەگەڵ پیاواندا دایان ناوە و ئەم منداڵ دەبێت و نازانێت چۆن بە باوکی رابگەیەنێت کەوا دایکی مردووە و ئەم تەنیایە. ئیدی ژیانێکی پڕ نەهامەتی دەژی. لەناو جەستەی مردوو و خوێن و مەرگدا، لەنێوان دڕندەی مرۆڤ و سەربازە پۆستاڵ لە پێکانی رژێمدا، کە ڕۆژانە بەکار دەهات بۆ شکاندنی پەراسوو و دەست و سەر و مەچەکی خەڵکی ئەنفالکراوی بێ تاوان. (بەهرۆز) دەیگوت: (شاپوور، بیرمە سەربازە عەرەبێکی لچ ئەستووری پێ پەتی، بەربەریی زەبەلاح پانتۆڵەکەی داکەند و یەك گالۆن میزی کرد بە گیانمدا، پاشان بە پۆستاڵە ڕەشە گەورەکانی چەندین شەقی تێی هەڵدام، من هێشتا حەوت ساڵ بووم، هەموو گیانمی شکاند، وەك تۆپ وا بووم لەمبەر بۆ ئەوبەر یاریی پێ دەکردم). (بەهرۆز چاوڕەش) چاوە ڕەشەکانی ببوون بە گۆمی خوێن. هەر دەگریا و هەنسکی هەڵدەکێشا و چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ من دەگێڕایەوە. من بە پەرۆشەوە گوێم بۆ دەگرت و دەستم دەخستە سەر دەستە ماندووەکانی و دەمگوت: (براکەم! من هەست دەکەم بەو ئازارانەی لە دەروونتدا بڵێسەی سەندووە. هەست بەو فرمێسکانەی چاوە ڕەشە سیحراوییەکانت دەکەم، دەزانم برینداریت و برینەکانت وەها زوو سارێژ نابن. رەنگە بۆ هەمیشە سارێژ نەبن. من نامەوێت دڵخۆشییت بدەمەوە. دواجار دڵدانەوە کارێکی زۆر شیاو نییە، ئێمە دەبێت بە مەنتیقی بیر لە دیاردە و ڕووداوەکان بکەینەوە.

کار بکەین بۆ چارەسەرکردنیان بە ڕێگای دیکەدا. من بە وتە ناتوانم دڵت تەواو خۆش بکەم، بەڵام کەسانێك هەن دەتوانن بە چەند شێوەیەك دەتوانن دڵخۆشت بکەن.) بە هەنسکەوە وەڵامی

دامەوە و وتی: (ئەوانەی بیانـەوێت دڵخۆشـم بکـەن لـە جنسـی بەشـەڕ نـین مەلایکـەتن، بـەڵام دڵخۆشکردنی من هێندە ئاسان نییە، ئەگەر چاوم لە دەسەڵات بێت دڵخۆشم بکات، ئەوا چـاوەڕێی خودا بکەم باشترە. ئەوەی لەم هەرێمە بە هیوای دەسەڵات بێت دڵخۆشی بکات، وەك ئەوە وایە بـە دوای تراویلکەدا رابکەین، چونکە بەرهەمی نییە و دەسەڵات و حزب و بـەرپرس و کاسەلێسـەکان تەنیا بۆ خۆیان کار دەکەن و گوێ بە قوربانیانی ئەنفال و کیمیا باران نادەن، بەڵام کەسێکی دیکـە هەیە دەتوانێ ژیانم کەمێك لە تاریکییەوە بخاتە رووناکی. تاریکییی ناخم ژیـانی پـڕ کـردووم لـە مەراق. بە رەنگ و رووخسار جیاوازم، بەڵام ناخم دەگری. رەنگە (بـادە سـلێمان) بتوانێـت فێـری ئەشقم بکات، ئەو تاکە کەسێکە سەرسامی کردووم و فێرم دەکات کە ژیـانم خـۆش بوویـت. مـن نەمدەزانی (بادە سلێمان) کێیە!؟ هەر بۆیە بەر لەوەی مـن بپرسـم کـە ئـەو کێیـە! خـۆی وتـی: (کچێکی جوانە و شاعیرێکی هەست ناسکە و دەنگ و سەدایەکی ناسك لە گەروویدایە و وتەکانی پڕن لە مۆسیقا و شیعر. بە شیعر قسە دەکات و بە شیعر باسی ژیان و دنیام بـۆ دەکـات. وێنـەی ژیانم بە شیعر بۆ بەیان دەکات، زۆر نابێت ناسیومە، تەنیا یەك هەفتەیـە، بـەڵام وا دەردەکـەوێت نزیکەی ساڵێکە دەیناسم، ئەو زۆر میهرەبانە). من حەزم نەکرد زۆر شتی دیکەی لێ بپرسم. حەزم دەکرد باسی رزگاربوونی خۆیم بۆ بکات لە بیابان و لە کۆماری لم و سنوورەکانی. حەزم دەکرد بـەر لەوەی باسی (بادە سلێمان) بکات، چیرۆکی بیابان تەواو بکات و پـێم بڵێـت چـۆن لەگـەڵ بـاوکی یەکیان گرتەوە و قوتار بوون. هەر بۆیە وتم: (بەهرۆز گیان بەر لەوەی باسی ناسینی (بادە سـلێمان) بکەیت، ئەوەم بۆ باس بکە چۆن لە بیابان قوتار بوون؟ چۆن کۆماری لمتان بڕی؟ ئەوە گرێیەکە حـەز دەکەم بزانم چۆن دەکرێتەوە؟) پاش ئەو هەمـوو گریان و فیغانە، زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێـوی و ئاوڕی بەلای مندا دایەوە و چاوی بڕییە چاوەکانم و بۆ ئیستێك لێم رامـا و پاشـان وتـی: (زۆر بـە مەینەتی رزگارمان بوو. تەنیا ئێمە رزگارمان بوو. باوکم پیاوێکی قارەمانـە. ئێسـتا پـیر بـووە و خەفەتی لە دەستچوونی خزم و کەسوکارم پەکیان خسـتووە. هاکـا مـرد. بـڕوا بکـە دەترسـم تـا دەگەڕێمەوە ئەو مردبێت. ئەو زۆر ئازایانە رزگاری بوو. هـەر ئـەویش منـی دۆزییـەوە و رزگـاری کردم. ئەو پیاوە مەردەی سەری خۆمی پێ دەبەخشم. ئەو شێرە کوردە، ئێستا چاوەکانی کـز بـووە و بە کووچەکانی شاردا خەم دەنووسێتەوە. بە هەر هۆکارێك بێت زانیی کە دایکـم مـردووە. دیـار بوو یەکێك لە زیندانییەکان ئەم هەواڵەی منی گەیاندبوو بە باوکم. پاش ئەوەی دەزانێـت مـن لـە کوێم، زۆر هەوڵ دەدات من ببینێت. رۆژێك هـەر هـەموومانیان لـە حەوشـەی زیندانەکـەدا کـۆ کردەوە. باوکم کە لە دوورەوە من دەبینێت، هەوڵ دەدات خۆیم لێ نزیك بکاتەوە. من بـەر لـەوەی

قسه بکەم بە زیندانێکی ناسراوی خۆمانم وتبوو کەوا دایکم مردووە. هەر ئەویش هەواڵەکەی بە باوکم گەیاندبوو. پاش ئەوەی لێی نزیك ببۆوە و پێی وتبوو، ئیدی باوکم ناتوانێت بگاتە من و دووبارە لە یەکمان دوور دەخەنەوە و هەریەکەمان دەنێرنە جێگایەك، من دەخەنە خانەی مێرمنداڵەکانەوە. ئەو شوێنە تایبەتەی زیندان تایبەت بە منداڵان و مێرمنداڵان، پیاوان بە جیا و ژنان بەجیا. دیارە کچە جوانەکان هەموو لە شوێنێکی تایبەتدا دادەنرێت و ئەوانەیان کە زۆر جوانن بەکار دەهێنرێت، بۆ کاری سێکسی خۆیان پاش ئەوەی لێیان تێر دەبن لە مزایەدەدا دەیانفرۆشن بە وڵاتانی عەرەب و دەخرێنە ناو تیاترۆکان و بە زۆرەملێ سێکسیان پێ دەکرێت. لە میسر و کوێت و سعودیە، لەژێر چاودێریی قورسدا بەزۆر ئەو کارەیان پێ دەکەن. من ئەم زانیاریانەم دواتر لە یەکێك لەو کیژانەوە وەدەستکەوت کە خۆی دەرباز ببوو. (شاپوور) گیان بەڕاستی کارەسات بوو. چی کرا، نازانم باسی چیت بۆ بکەم! رۆژی حەشر بوو. هەر لەو وێنە رووتانە دەچوو کە مایکل ئەنجیلۆ و لیوناردۆ داڤنشی و جاکۆب داڤیدس کێشاونی ئەها (کامەرانی وەنەوشە) باسی دەکردن. چیان لە کچە عازەبەکان نەکرد بە بەرچاومانەوە. لەناو لمدا لەژێر گەرمای لە رادەبەدەری بیاباندا لاقە کران. هاواری کچ و ئازارەکانیان بەردی دەتاواندەوە و ئاگری لە جەرگ بەردەدا. لێم مەپرسە من بەو منداڵییە چیم بینی! نەهامەتییم بینی مەرگم بینی، منداڵی لە خۆم گچکەترم دەبینی نەعەلی سەوزی دەخوارد بە خەیاڵی خواردنی خەیاری ئاودار. سەگە رەشەکانی بیابان هەر مردوویان دەکڕاندەوە. جانەوەرەکانی بیابان مار و مێروو و داڵ و قەلەڕەش کەلاکی هەزاران ژن و منداڵیان دەکڕاندەوە. کارەساتی وەها وەسف ناکرێت، نازانم وێنە و سیناریۆی ئەو وەحشەتە چۆن بۆ تۆ بەیان بکەم! چۆن؟، زۆر ترسناك بوو. دڕندەیی سەربازە جەللادەکانی عەرەب هەرگیز لە یادەوەریمدا ناسڕێتەوە. من ژیانم مەینەتە شاپوور گیان. هەموو رۆژێك کۆمەڵێك خەڵکیان دەبرد و لە چاڵی گەورە گەورەدا گوللەبارانیان دەکردن و پاشان بە شۆفڵ لمیان دەکرد بە سەریاندا. زۆرێك لەو کۆمەڵانە هەر بە زیندوویی لە گۆڕ دەنران. یەکێك لەو کۆمەڵانە بووین خراینە نێو چاڵێکەوە. بە شەق هەڵیان دەداینە ناو چاڵەکان. چاڵێکی گەورەی جەهەنەمی، گەورەترین چاڵی دنیا لە ژیانمدا چاڵی وەهام نەدیبوو. گەورەترین چاڵێك بوو لە ژیانمدا دیبێتم. لە منداڵییدا چاڵی گچکەم دیبوو، بەڵام ئەمە شای چاڵ بوو. زۆر گەورە و ترسناك! بە هەزاران مرۆڤی شێوە پەپوولەیان بە شەق هەڵدەدایە ناوی من و باوکم دووان لەوان بووین. لە هەموو لایەکەوە گوللەباران دەکراین. من هەستم نەکرد هیچ گوللەیەکم بەرکەوتبێت. نازانم قەڵغانی چ فریشتەیەك منی لە گوللە و فیشەك پاراست؟

من نەپێکرام، بەڵام خلتانی خوێنی هاوزمانەکانی خۆم بووم و وەك پێکراوێك دەبینرام. لە دوورا باوکم دەبینی ئەویش خەڵتانی خوێن بوو. مردوو بەسەر یەکدا دەکەوتن. چاڵی مەرگ وەسف ناکرێت (شاپوور). ئەوە چاڵی مەرگ بوو. دواتر چیرۆکێکم نووسی بە ناوی (چاڵە گەورەکانی مەرگ) رۆژێك پیشانتی دەدەم، بەڵام هەرچی دەکەم حەز ناکەم بڵاوی بکەمەوە. دواتر خەوی مەرگ و خوێنی دروست کرد. رەنگی سووری خوێن و زەردیی لم و تێکەڵبوونیان لە خشتی قاوەیی دەچوو، لە قوری پەیکەرتاشەکان دەچوو، هەستم دەکرد لەشم قورس دەبوو. سێ چوار تەرم بەسەر مندا کەوتبوون. وردە وردە گڵ دەکەوتە سەرمان و هەناسەم قورس دەبوو. هیچ تروسکەیەکی رووناکی نەما. دەمە و ئێوارەیەکی سامناك بوو. وردە وردە تیشکی باریکی رووناکی نەدەما و بزر دەبوو. نەمزانی دوا ساتەکان چی رووی دا، بەڵام یەك پارچە تاریکی بووین. جووڵەم لەبەر برا. چەندم دەکرد زۆر ئەستەم بوو بزاوت بە خۆم بدەم. چەند جارێك تەکانم بە خۆم دا و نەمتوانی. پاش کەمێك دووبارە دەستم کرد بە جووڵە و چەند پەنجەیەك جووڵام. بەرەو سەر هەستم دەکرد کەسێك یان شتێك گڵەکە لە سەرەوە دەجووڵێنێت، تا دەهات لەشم سووکتر دەبوو. تا یەکەم گوورزە رووناکییم بینی، دەستییك گرتمی و رایکێشام و لەناو گڵەکە دەریهێنام. نازانم چ دەستییك بوو. چاوم پڕ بوو لە خۆڵ. تەواو هیچم نەدەبینی. کەمێك کۆکیم. هەناسەم سوار بوو. دەمم پڕ بوو لە لم. تەماشام کرد و وەك نێچیرێکی هەڵاتوو لە دەست پڵنگێك هەناسە سوار و داماو، روانیم. باوکمم بینی لە من خراپتر یەك پارچە لم بوو. دەستی گرتبووم. نەمدەتوانی قسە بکەم. تاریکییەکی خەست خەست چوار دەوری دابووین، بەڵام رووناکییەکی کەم لە ئاسۆوە دیار بوو. بەس بوو بۆ ئەوەی هەموو شتێك لە یەك جیا بکەمەوە. وەڕینی سەگە رەشەکانی بیابان و قروسکە قروسکیان ترسی خستبووە دڵمەوە. لە دڵی خۆمدا دەموت، ئێستا دەخورێین و دەبینە پارووی چەوری سەگەل، رزگاربوونمان معجیزە بوو. رووداوێکی سەیر بوو. تەنیا من و باوکم بە گوللە نەپێکراین. من نازانم خودا خۆی قەڵغانی لەبەر کردین یان فریشتەکانی خۆی بوونە دیوار و گوللە کانیان لە سنگی خۆیاندا تواندەوە؟ نازانم بۆ...؟ لەبەر ئەوەی من ببمە بەڵگەی ئەو چاڵە گەورانەی مەرگ، نازانم خودا منی هێشتەوە بۆ خەمخواردن یان بۆ کۆتایی یارییەکان؟ من گەواهیدەری راستییەکانم. پارچەیەك رووناکی ئێمەی لە ژێر لم رزگار کرد. باوکم دەیگوت: (بەهرۆز، مرۆڤێکی ریشدرێژی نوورانی پارچەیەك لە رووناکی لە ژێر لم دەستی گرتم و دەریهێنام). دواتر بە هەردووکیان منیان دەرهێناوە. ئیدی ئەو فریشتە نورانییە بەرەو ئاسۆ رۆیشتووە و بزر بووە. ئەمە خورافیات نییە (شاپوور)، بڕوا بکە. زۆر سەیر دەرباز بووین. هەر ئەو دەلیلە چەند

جارێك هاتەوە ڕێمان تا سنوورەكانمان بڕی، لە پێشمانەوە دەردەكەوت و بە گۆچانێكی ئەڵماس ڕێگەی نیشان دەداین. دەلیلێكی ڕۆشن بوو، یەك پارچە نوور بوو. لە دوای خۆی بریسكەی بە جێ دەهێشت، جێ پێی پڕ دەبوون لە دەنكە زەنگیانەی شووشەیی ڕۆشن. لە دووڕا لە دوو هێڵی ڕووناكی دەچوون. بەو شێوەیە ڕێگاكانی پێشان داین. وەك ڕێنیشاندەر و ڕێبەر نەخشەیەكی سیحریی بۆ كێشاین. دوو هێڵی ڕووناكیی درێژ. ئێمەیش بە جێگا پێیەكانیدا دەڕۆیشتین بە شێوەیەك هێڵكاری بۆ كێشابووین لەو سەفەرە درێژەدا هەستمان بە هیچ بوونەوەر و سەربازێك، پیاوێك، بیابانگەڕێك نەكرد. ڕێگایەكی نهێنیی بۆ كێشاین، ئێمەش هەر دەڕۆیشتین و شەوگارمان شەق دەكرد و بەرزایی و نشیو و ڕووبار و سەحرا و زەویی وشك و بەیار و سەوزایی و باخی خورما و چەممان دەبڕی. بەسەر ئاودا دەڕۆیشتین. بریسكەی پێیەكانی ئەو فریشتەیە وەك پرد وابوو. نقومی ئاو نەدەبووین. بەرگێكی كۆنی لەبەردا بوو. لە جلی مرۆڤی سەردەمە كۆنەكان دەچوو. جلێكی سپی بە ڕووناكی ڕووپۆشكراو، ردێنێكی درێژ تا سەر كەمەر، وەك پەمووی سپی. باڵایەكی بەرز، عاسایەكی ئەڵماسی بریسكەدار لە دووڕا ئاماژەی بەردەوامی بۆ دەكردین. هێزێكی وەهای پێدابووین هەستمان بە ماندوویی نەدەكرد. باوكم دەستی منی گرتبوو. بە شوێن دوو هێڵی ڕووناكییدا دەڕۆیشتین. دوو مرۆڤی خەمناكی لە مردن گەڕاوە، دوو مرۆڤ لە چاڵە گەورەكانی مەرگەوە بە كۆمەڵێك ئاسەوار و بەڵگەی مردنەوە بەرەو باكوور دەكشاین. ئەو فریشتەیە وەك نەیزەك دەكشا و ئێمەش بە دوای ئەودا بەردەوام بووین دەهاتین خەمناك و بێ داد و بێ سەروا ڕەوتمان دەكرد و دەبزواین بە خێراییەكی سەیر و نا ئاسایی دەڕۆیشتین و سنوور و جوگرافیای جیاوازمان دەبڕی كات شەو بوو دوور و نزیك فریشتەكە لە پێشمانەوە بە وێنەی ئەسپییكی سپی یاڵ شۆڕی ئەوروپی دەڕۆیشت، بە خێراییەكی زۆر ئێمەش لەسەر هێڵی جێپێكانی دەڕۆیشتین. ئیقلیم و ناوچەی جیاوازمان بڕی. باخی خورما و هەنار و سێو و پرتەقاڵمان دەبڕی. ئاومان دەبڕی دەشت و چیا و گردەكانمان دەبڕی دوای ماوەیەكی زۆر لە هەڵاتنی چەند ڕۆژی، نزیك دەمەوە بەیانی بوو ڕەنگی ئاسمان هێدی هێدی ڕوون دەبۆوە. گەیشتینە خاڵێك، زەوی وا دەگریا دەتگوت باڵندەیەكە و چەقۆی لەسەر گەرووی دانراوە. درەختەكانی شینیان دەگێڕا، كانیاوەكان هاژەی ماتەمیان دەرووژاند. دواجار (شاپوور)ی برام ئەو زەمینە گەرمیان بوو. زەوییەكی گریاو و شەهید و بێ سەروا و خەماویی. ناوچەكانی خۆمان بوو. گوندەكەمان ورتەی لێنەدەهات. ڕووناكیی چرایەكی تێدا دیار نەبوو. جاشەكانی حوكمەت و سەربازە دڕندەكان ئاژەڵ و مریشك و پەلەوەرەكانیانی هەموو تاڵان كردبوو. ئێمە دوو بوونەوەری ماندوو بووین ئاخر گەڕانەوە لە مەرگ

لەناو چاڵە لمەکان هەروا ئاسان نەبوو). دەمبینی، (بەهرۆز) کەمێك رادەماو سەیری زەوی دەکرد پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و... بەردەوامییدا بە قسەکانی دەیوت: (هاوڕێم دواتر ئەوشەوە هەر چۆنێك بوو لە گوندەکەمان ماینەوە، بەرەبەیان لە کانییەکەی گوند لەگەڵ باوکم خۆمان لە خۆڵ و خاکی سەرزەمینی مەرگ پاك کردەوە. لە دووررا لەسەر بەرزاییەکی رۆژهەڵاتی گوند کەسێك سپی دەچۆوە، بە دەنگییکی نەعرەتە ئاسا (هاواری دەکرد... من... لەناو چاڵەکانی مەرگ ئێوەم دەرهێنا من لە سەفەری ئاسمان بووم لەبەرزاییی ئاسمانەکانەوە چاوم لێ بوو، من تەنیا نەبووم کە ئێوەم رزگار کرد هەزاران مەلەکوتم لەگەڵ بوو. لە ئاسمانەوە کارەساتەکانم دەبینی، زانیم ئێوە نەپێکراون من ناوم (حەکیمی رووناکی)یە. من لەسەر چینکەکانی ئاسمان دادەنیشتم، بەڵام نەمانتوانی رێگە لەو کوشتارە دەستەجەمعیە بگرین، چونکە ئەوە فەرمان بوو دەبوو بکرێت، بڕۆن... بڕۆن بەرەو شاری نەوت لەوێ بژین. هاوڕێکانم سەردەمانێکی دیکە دێمەوە بۆ لاتان کارم زۆرە و دەڕۆم. خەڵکی دیکە پێویستیان بە منە... ماڵئاوا) بەڵێ (شاپوور) بەو شێوەیە بزر بوو. ئیدی من و باوکم ملی رێمان گرت و بە رێگای خۆڵ و گرد و چیادا گەیشتینە سەر شەقامێکی قیر لەوێ دەستمان لە ماشێنێك راگرت، دەبوو کەس نەمان بینێ. سەربازەکانی رژێم بیانزانیایە ئێمە لە چاڵەکانی مەرگ دەرباز بووین، دەیان کردین بە قیمە، چونکە من هەموو ناوچەکانم لە زاکیرەدا خەزن کردووە، لە نزیك ئەو جێگایەی ئێمەیان تیا زیندەبەچاڵ کرد، مێرگێك هەبوو چەند کیلۆمەترێك لەولاترەوە. من هەستێکی بەهێزم هەبوو بۆ ناسینەوەی جێگاکان نەخشەی ناوچەکانم لەبەرکردبوو سەربازەکان پێشیان گرتبام نەیاندەتوانی نەخشەکان لە مێشکمدا دەربهێنن من منداڵ بووم، بەڵام وریا بووم ئاسەواری مەرگ ون نابێت هەر دەدۆزێتەوە، بەهەر جۆرێك بێت دەبوو خۆمان بزر بکەین شاری نەوت (کورکورا) نزیك بوو لەناوچەکەمان لەوێ هەندێك خزم و ناسیاومان هەبوو خزمی باوەڕ پێکراو بە کۆمەکی ئەوان لە ژوورێکدا گیرساینەوە و ئارامان گرت) دووبارە لە قسەکردن وەستا شتەکان زۆر کتوپڕ بەسەرماندا دەڕۆیشتن، کەس نەهات بڵێ ئەوە هاوڕێیان چی دەکەن، من تووشی شۆك ببووم، نەمدەزانی چۆن لە شتەکان بگەم چۆن ئەو هەموو مەینەتییە لە زاکیرەمدا خەزن بکەم حەوسەڵەم نەمابوو، ماندوو بووم دەروونم ماندوو بوو، حەپەساو ماندوو رەنگ پەڕیوو سەیری (بەهرۆز)م دەکرد لە دڵی خۆمدا دەم گوت ( ئای نەگبەت من نەمزانیوە تۆ چ کانزایەکیت بە راستی مەزنیت لە هەمان کاتدا زۆریش نەگبەت و کلۆڵیت دوای ئەو هەموو خەم و کۆسپەی هاتە رێگات هێشتا کەس لە زامەکانتان تێ ناگات و یاری بەچارەنووستان دەکرێ،) هەستم کرد کاتی وانەکەم هاتووە، بەڵام دواجار ئەم وانەیە لەو وانەیەی

تر گرنگ تر بوو بەبێ ئەوەی وا خۆم دەربخەم کە کارم هەیە، بە (بەهرۆز)م گوت (براکەم... هەموو شتەکانم بۆ باس بکە من گوێگرێکی باشم) کەمێك زەردەخەنەی خەمگینی کرد و وتی (هەموو شتەکانت بۆ باس دەکەم، من هەموو چاڵەکانی مەرگ دەزانم، گەر نەمرم دوای رووخانی دیکتاتۆر و ئازادی پەیوەندی بە رێکخراوێکی مافی مرۆڤ یان رێخراوێکی جیهانییەوە دەکەم و هەموو ناوچەکانیان پیشان دەدەم) ئەو سوور بوو لەسەر ئاشکرا کردنی چاڵەکانی مەرگ، کەسێکی دڵگەرم بوو لە ژوورێکی پیس و پۆخڵی بێ خزمەت گوزاری یەکێك لە بەشە ناوخۆییەکانی شاردا دەژیا زۆر جار داوای گۆڕینی ژوورەکەی و بەشە ناوخۆییەکەی لە سەرۆکایەتی زانکۆ کردبوو چەند جارێك وتبووی (من کەسوکاری ئەنفالم، لە خێزانەکەمان تەنیا من و باوکێکی پیرم ماوین)، بەڵام بە شێوەیەکی سووك و بێ باکانە داواکارییەکەیان رەت کردبۆوە بە نەخێر وەڵامیان دابۆوە، ئەو هەندێك جار کەسێکی زۆر خەمگین بوو بە وتەی خۆی تاکە شتێکی خۆش لە ژیانیدا ناسینی (بادە سلێمان) بوو ئەو کچەی لە یەکێك لە وێستگەی پاسەکانی سەر جادەی (شەستی)دا لەبەردەم یەکێك لە کۆلێژەکان ناسیبووی تەنیا رووداوێك بوو بۆ یەکەم جار زەردەخەنەیەکی جوانی لەسەر روخساری نەخشاندبوو، دواتر، پەیوەندیەکی ناوازە و جوانیان لەنێواندا دروست ببوو، بەڵام ئەو پەیوەندیە ئەوینداریيە زۆر درێژەی نەکێشا ئیتر ژیان وەهایە، هیچ شتێك بەردەوامی تەواوی نییە رۆژێك هەموو شتە بزۆکەکان لە جووڵە دەکەون و گەردوون دەبێتەوە شتێکی وەستاو هەمیشە بزاوتن وەستانی بە دوادا دێت هیچ هێزێك نییە بتوانێت تا ئەبەد جووڵە دروست بکات هیچ یاسایەکی دنیایی و ئاسمانی تا بێ پایان بەردەوام نابێت دواجار وەستانی شتەکان کۆتایی بە سیستەمی ژیان و دروست کراوەکان دەهێنێت، خۆشەویستی هەرگیز بەردەوام نابێت رۆژێك دێت دەوەستێت و تەواو دەبێت، کاتێك (بەهرۆز چاوڕەش) بەهرۆزی کوڕی (عەزیز شوکری) گەرمیانی باسی خۆشەویستی بۆ دەکردم من لە چاویدا بریسکەیەکی ئەستێرەئاسام دەبینی دنیایەکی جیاوازم دەبینی ئیدی ئەو سەردەمە وەها بوو، پیاوە بلیمەتە راستگۆکان بە شێوەیەك لە شێوەکان دەبوونە هاوڕێی رووناکی و ئەستێرە و خۆر و گوورزە تیشك، دوو چاوی گەورەی رەشی قەترانی وەك دوو دەنکە ترێی گەورەی رەش قژێکی پڕی لوولی قەترانی دەموچاوێکی گەنمی زەردەخەنەیەکی تاریك و سامناك، بەڵام دوو چاوی ماندوو سوورو و سپیینەی چاوی بە ئاشکرا دڵۆپە خوێنی تێدا دیار بوو، دوو چاوی ماندوو لە سەیرکردن و بینینی دیمەنەکانی مردن و سیناریۆیەکانی کوشتن دەموچاوێکی ماندوو ریش و سمێڵێکی تەنکی رەش دیمەنی لە کوڕە تورکە جوانەکان دەچوو، بەڵام بەژنوباڵای لە ئەستێرەکانی سینەما دەچوو، کوڕێك بوو لە جەستە و بیرکردنەوەدا جوان بوو ناوازە

و سەرنجڕاکێش، لەو کوڕانە بوو کە چاوی وەك تلیسکۆب بە هەموو لایەکدا شتی دەبینی لەو سەردەمەوەی لەبەرچاویدا خوشکەکەیان لاقە کردبوو و دیمەنی مردنی دایکی و خەڵکانی دیکەی بینیبوو ئیدی سڵی لە بینینی هیچ نەدەکردەوە نیگاکانی گەلێك تیژ و دوور بین کردبوو، دەیگوت: (شاپووری برام زۆر شەوانەی تەنیایم لە بەشە ناوخۆییە پیس و چەپەڵەکەمدا دیمەنی بیابان دێتە بەرچاوم وا هەست دەکەم لە بیاباندا تەنیام و بە دوای تۆپێکی خەیاڵی بریسکەداردا دەگەڕێم بە دوای رووناکی روحی خۆم و مرۆڤە کوژراوەکاندا دەگەڕێم) ئەو هەمیشە مەرگی بەلاوە ئاسایی بوو هەر بۆیە زۆر جار دەیگوت: (مردن شتێك نییە من لێی بترسم، بەڵام تەنیا لە جۆری مردن دەترسم، مردن هەیە دەتکات بە پاڵەوان، بەڵام مردن هەیە دەتکات بە جەللاد و خوێنمژ) من نەم دەزانی مەبەستی لەو رستەیە چییە، بەڵام روون و ئاشکرا لە هەموو سیفەتێکی ژیانی خۆی ناڕازی بوو، وەك وتم ئەو تەنیا دڵی بە (بادە سلێمان) دەکرایەوە، چونکە یەکەم جاری بوو لە ژیانیدا بە دەلاقەی ژیانێکی نوێ ئاشنا بێت تەواوی ژیانی لە بیرکردنەوە و خوێندنەوەی مێژوو لە ئەفسانەکاندا تەرخان کردبوو، یەکێك بوو لەو مرۆڤانەی شارەزای زۆری لە مێژووی کۆنی چاخەکانی سەرهەڵدانی ژیان و شەڕەکانی مێژووی روومانەکان و شەڕی عەباسییەکان و چەوساندنەوەی کۆیلەکان و شالاوی مەغۆل و تەتەر و شەڕی ئیسلام و جولەکە و فەتحی مەکە و خالیدی کوڕی وەلید و چەندانی تری مێژوو هەتا شەڕی جیهانی یەکەم و دووەم و ئەوانەی دیکە (کامەرانی وەنەوشە) کتێب گەلێکی زۆری دەدایە (بەهرۆز چاوڕەش) تا بیانخوێنێتەوە، باسی مێژووی بۆ دەکردم باسی ئەوەی دەکرد کە شەڕی ئەم جارە دنیا دەگۆڕێت، بەڵام وڵات گۆڕانێکی وەهای بەسەردا نایەت من هەڵوێستەیەکم دەکرد و دەمزانی کە نزیکەی دوو سەعاتە ئێمە قسە دەکەین ئەو کاتە (کامەران) و (سەهەند) و (ئاسمان خۆشناو) و (سەردار) و تەواوی هاوڕێیانمان لە تاقیگەی کۆلێژ خەریکی تاقیکردنەوەی هەندێك کانزا و شتی لەو بابەتە بوون کە دەبوو راپۆرتێك لەسەر جۆرێکی نوێ لە مادەی (ستیل) ئامادە بکەن و گەر کرا بڵاوی بکەنەوە وەك سیمینار و نمرەی لەسەر وەربگرن من رۆژێکی دیکە تاقیکردنەوەم هەبوو ئەو رۆژە هەر لە خۆمەوە تاقەت و توانای هیچم نەبوو، حەزم ئەکرد لەسەر ئەو کورسییە لەگەڵ (بەهرۆز چاوڕەش) دانیشم و باسی ژیان و رووداوەکانی دنیا بکەین دەمزانی ئەو بەدەر لەوەی (ئەندازیاری کارەبا) دەخوێنێت شارەزایەکی باشی بوواری مێژوو سیاسەتیشە، بەڵام بەدەر لە باسی (چاڵەکانی مەرگ) باسی (بادە سلێمان)ی بۆ کردم ئێمە چەند کەسێك بووین هاوڕێ بووین پەیمانمان دابوو کە هیچ لەیەك نەشارینەوە و هەموو راستییەك لەلای یەك یەك ئاشکرا بکەین دەستم برد دەستەکانیم گرد زۆر

سارد بوون بە راستی لە دەستی مردوویەكی جوولاَو دەچوو وتم (بەهرۆزی بیابان ئەی كوڕی چاڵەكانی مردن، ئەی ئەوەی سلْ لە لم و خوێن و مەرگ و شۆفلْ و حەفارە و گوللە و سەرباز و پۆستاڵی رەش و سەگ و تەلی دڕكاوی ناكەیتەوە ئەی ئەوەی تۆش كوڕی رووناكییت، تۆ لە دوای مەرگ بڕوات بە ژیانەوە و خۆشەویستی هەیە ئایا مێژوو لە ژیانی تۆدا دەگاتە كوێی شتەكان؟ ) هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشا و دەستییكی بە چەناگەیدا هێنا و وتی (باوەڕم نەبوو، بەلاَم هەست دەكەم باوەڕم هەیە دووبارە بژیم و لەودا خۆم بدۆزمەوە ئاخر ئەو ژیانی من دەگۆڕێت باسی ئەستێرەكانم بۆ دەكات باسی گوڵ و باخ و باسی كەناری و چۆلەكەی رەنگاوڕەنگم بۆ دەكات، پاسارییەكان و باڵندەكان لەلای ئەو جیاوازتر دەفڕن، خۆشەویستی لە دیدی ئەودا بریتییە لە گەڕانەوە بۆ ئاسمان، ئەو لەگەڵ منێكی گەڕاوە لە مەرگ تەبایە و لە گوڵ و لە گەلاَدا تەژی كردوم بە ئەشق) وچانێكی داو زەردەخەنەیەكی كرد بەفرسەتم زانی وتم (بەهرۆز چاوڕەش ئەو كێیە؟) ئاوڕی دایەوە و ددانە سپییەكانی دەركەوتن و وتی (بەڵێ ئەو...) تەواو لە چاوی رامامم وتم (باسی ئەوم بۆ بكە بادە كێیە؟، چۆن ئەوت ناسی، ئەو كێیە؟ چۆن توانی لە ژیانتدا دەست بۆ شتە مردووەكان ببات؟ چۆن تۆی تووشی كامەرانی كردووە؟ ) خەریك بوو دەیویست وەلاَم بداتەوە، بەلاَم دوو دڵۆپ فرمێسكی یاقووتی لە چاوەكانیدا بە ئەسپایی بە روومەتە گەشەكەیدا هاتنە خوار و بە لێواری سمێڵە تەنكەكەیدا بلاَو بوونەوە دەستی نەبرد چاوی بسڕێت كەمێك هەناسەی هەڵكێشا و هەندێك لێم نزیك بۆیەوە و دەستی خستە سەر دەستم و ویستی قسە بكات نەیتوانی لەپڕدایە پڕمەی گریان گریانێكی بە كوڵ نازانم بۆچی وا دەگریا لەناو زاكیرەیدا نەبووم لە هەستەكانی نەدەگەیشتم، ئەگەر مرۆڤ بە راستی بیەوێت قسە بكات هەمیشە شتێك بەربەستێك زمانی دەگرێت و لە جووڵەی دەخات لەو كاتەدا زوبان وەك بە چەسپ بە مەلاَشوتەوە نووسابێت وەهایە ناتوانیت هیچ بڵێیت ئەوە ئەوپەڕی راستگۆییە مرۆڤ لەبەردەم ئەشقی راست و حەقی راستی خۆیدا هەمیشە لاڵ و بێ زمان دەردەكەوێت ئەوە ئەو سیفەتەیە لە مرۆڤی پاك و هەست ناسكدا هەیە، بەلاَم درۆزنەكان و فێڵ زانەكان هەمیشە خاوەنی زوبانێكی بزۆكی باشن كە بە هەموو ئاڕاستەیەك جووڵەی خۆی دەكات، بەلاَم لەپڕ وەستانی (بەهرۆز) لە ئاخاوتن نائاسایی بوو رەنگی گۆڕا و نیگای بە هەزار شێوە لێك دەدرایەوە لە دڵی خۆمدا دەمگوت: (گرفتە... بە راستی گرفتە) من دەمزانی كە ماوەی مانگێك دەبوو (بەهرۆز) دیار نەبوو دواتر لە چەند هاوڕێیەكم بیستبوو كەوا بە سەفەرێكی پێویست گەڕاوەتەوە بۆ شاری منداڵی بۆ لای باوكی، چونكە بە گوتەی هاوڕێكانی هاو پۆلەكانی باوكی ناساغ بووە و داوای كردووە كە (بەهرۆز)

بگەڕێتەوە نەبادا بمرێت و دواجار کوڕەکەی نەبینێت، من ئەوەم دەزانی زانیم خەمی قووڵی بەهرۆز نەخۆشی باوکیەتی زانیم بە مردنی باوکی تەنیایی باڵ بەسەر (بەهرۆز)دا دەکێشێت، تاکە شتێك کە دڵی پێ خۆش بوو ئێمە و ئەو کچە بوو، ئەو کچەی کە هەفتەیەك دەبوو ناسی بووی، ئەو کچە شاعیرەی لە ماوەیەکی کورتدا ژیانی (بەهرۆز)ی تەژی کرد بە شیعر و هۆنراوە، بەڵام ماوەیەکی کورت بوو کورت زۆر کورت.

(بەهرۆز) بەم شێوەیە بۆمی باس کرد، بە زەردەخەنەیەکی خەمگینەوە کە خاڵی نەبوو لە حوزن و ماتەمی قووڵی ژیان هەناسەیەکی قووڵی پڕ بە سیەکانی هەڵکێشا و وتی (لە بەشە ناوخۆییەکەمان هاتمە دەر ئەو رۆژە زۆر جوان خۆم گۆڕی بوو، (شاپوور) خۆت دەزانی بەهار ئاوو هەوایەکی خۆشی هەیە ئەگەرچی من هەمیشە دڵتەنگم، بەڵام زۆر کەس دەڵێن: (بەهرۆز) زۆر دەم بە پێکەنینە، لە راستییدا وایە، کراسێکی پەمەیی کاڵم لەبەر کردبوو لەگەڵ هێلەك و پانتۆڵێکی رەساسی قوماش، بۆنی عەترێکی ئەجنەبی ناوازەم لە خۆم دابوو قۆنەرەکانم بریقەیان دەهات تازە بۆیاخم کردبوو پرچم بە کرێمێکی کەمێك چەور تاڵ تاڵ کردبوو لەگەڵ شێی تەڕی ئاودا بەکارم هێنابوو لیڤێکسە رەشەکەم گرتبوو بە دەستمەوە سمێڵ و ریشم بە مەکینە سفر کردبوو، بەڵام کەمێك زبر دیار بوو رەنگی کەمێك رەشی بە دەموچاومدا بوو لەو جۆرە بوو کە کچان حەزیان لێیەتی ئەزانی (شاپوور) زۆر لە کچان حەز ناکەن کوڕ سمێڵ و ریش بتاشێت حەز دەکەن کەمێك زبری هەبێت و ناسکی ئەوان بژاکێنێت، بە هەرحاڵ لە بەشی ناوخۆیی هاتمە دەر بە کۆڵانە باریکەکەی بەردەم بەشە ناوخۆیدا بەرێ کەوتم بۆسەر جادەی شەستی تا لەوێ سوار پاس بم و بێم بۆ کۆلێژ بە دەم خۆمەوە گۆرانیم دەگوت تا گەیشتمە ویسگەی پاسەکان لەوێ کەمێك وەستام چەند کەسێك لەوێ وەستا بوون، لەو کاتەدا پاسێکی گەورە هات دەرگاکانی کرانەوە و خەڵك بە پرتاو سوار پاس دەبوون زۆر بە ئەسپایی سوار پاس بووم تەماشام کرد، زۆربەی جێگاکان گیراون لە ریزی ئەوبەر تەماشام کرد کچێك دانیشتووە و کورسییەکەی تەنیشتی چۆڵە و کەسی لەسەر دانەنیشتووە هەندێك کور هەبوون بە پێوە وەستابوون، بەڵام وەك شەرمێکی کوڕانە روویان نەدەهات بچنە تەنیشتی دابنیشن کە تەماشام کرد زۆر بە سیحراوییانە نیگام بۆ دەکات بۆ وچانێك چاوە رەشەکانی لە چاوم نەترووکاند وام هەست کرد دەم ناسێت، بەڵام وانە بوو، هەستم کرد بە نیگای چاو بانگم دەکات، وەڵا منیش بێ شەرم و شڵەژان راست چووم لە تەنیشتیەوە دانیشتم دەستم برد لە گیرفانم جزدانەکەم دەرهێنا و پارەی پاسەکەم دەرهێنا هەتا پارەکانم بژارد جزدانەکەم لەسەر کوشنەکە لەناو لینگمدا بەجێ هێشت کەمێك پاسەکە رۆی پاشان بیرم کەوتەوە

کە دەبێت بەر لە کاتژمێر نۆی بەیانی بڕۆمە سەرۆکایەتی زانکۆ و لەوێ هەندێك کاری تایبەت بە بەشە ناوخۆییەکەم هەبوو دەبوو جێبەجێی بکەم لە دڵی خۆمدا وتم دەڕۆم کارەکان تەواو دەکەم و پاشان دەچم بۆ کۆلێژ و وانەکانم وەردەگرم ئەوە بوو لە حەیبەتی ئەوەی دوانەکەوم هاوارم کرد کاکە دابەزین هەیە، کیژەکە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد هەتا دابەزیم تەماشای دەکردم لەسەر شۆستەکەش کەمێك سەیری کردم و پێکەنی. وەڵا برا چوومە ناو پرسگەی سەرۆکایەتیی زانکۆ لەوێ داوای پێناسی قوتابیان لێکردم کە دەستم کرد بە گیرفانی دواوەی پانتۆڵەکەمدا جزدانم پێ نەبوو پاشان بیرم کەوتەوە کەوا لێم کەوتووە زۆر پەشۆکانم پارە و هەوییە و ژمارە تەلەفۆن و وێنەیەکی خانەوادەکەم و وێنەیەکی منداڵی خۆم و هەندێك ئەدرێس و ناونیشانی گرنگی نووسەران و هەندێك کۆمپانیای تێدا بوو زۆر خەمم بوو گرنگ پارەکە نەبوو (شاپوور) گرنگ شتەکانی تر بوو نەمدەزانی چی بکەم دواتر بیرم کەوتەوە کەوا لەسەر کوشنەکە بیرم چوە زانیم کە لەو کاتەی پارەم دەرهێناوە بیرم چووە جزدانەکەم بخەمەوە گیرفانم ئیدی تەواو بێ ئومێد بووم زۆر خەمبار و بێ تاقەت لە سەرۆکایەتی زانکۆ هاتمە دەرێ بەپێ ملی رێم گرت هاتم بۆ کۆلێژ هەر لە خەیاڵی جزدانەکەمدا بووم خەمی پێناس و شتەکانم بوو دەترسام بکەوێتە دەست کەسێکی پیاو خراپ و کاری نا شایستە بە پێناسەکەمەوە بکات (بەهرۆز) کەمێك پێکەنی و وتی (دواتر شتێکی زۆر سەیر رووی دا. لەو ماوەیەدا من بەهۆی تاقیکردنەوە و کاری تایبەتەوە نەم دەتوانی زوو زوو ئێوە ببینم تا شتەکانتان بۆ باس بکەم. رۆژێك دوای ئەوەی جزدانەکەم بزر کرد لەناو پۆلدا تەنیا مابووم، وانەکانم لەسەر بۆرد دەنووسیەوە، چونکە کەمێك دواکەوتم لە هاوڕێکانم داڵغەم رۆیشتبوو بیرم لە ونبوونی جزدانەکەم و سیحری چاوی ئەو کچە دەکردەوە کە لە تەنیشتم دانیشتبوو دەستم خستبووە ژێر چەناگەم و قووڵ قووڵ لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، پاشان لە دەنگییەك راچڵەکیم و بیستم کەسێك سڵاوم لێ دەکات و دەڵێت: (ئەم کاتەت باش کاك (بەهرۆز عەزیز شکوری) کە راچڵەکیم و بەلای دەرگاکەدا ئاوڕم دایەوە وەخت بوو لە عەزرەتدا ببوورێمەوە، ئاهێکم کرد و تەماشام کرد هەمان کچە کە ئەو رۆژە لە پاسەکەدا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو لەبەردەممدا وەستاوە، کە بە قامەتیدا روانیم وەخت بوو بمرم کچێکی باڵا بەرز پانتۆڵێکی رەشی شارستۆن، بەدییەکی شینی تۆخ پرچێکی رەشی خاوی درێژ، دوو چاوی رەشی مامناوەند و تەڕ لێوێکی گەورەی ئاڵ، پێستێکی سپی، دوو برۆی باریکی تەواو کەوانەیی، زەردەخەنەیەکی هێمن و ناو قەدێکی باریك و بەدەنێکی پڕ. بڕوا بکە (شاپوور) یەکسەر لە شوێنی خۆم هەستام و دەستم گرد بە دەممەوە بۆ چرکەیەك زیاتر هیچم بۆ نەوترا دواتر وەڵامی سڵاوەکەیم دایەوە و وتم:

(سەرچاوەکانم هاتی خانمی بەڕێز... دەتوانم چۆن خزمەتت بکەم)، بە پێکەنینەوە دەستی کرد بە جانتا رەشەکەیدا و جزدانەکەی دایە دەستم و وتی: (پاش ئەوەی ئەو رۆژە پاسەکە تێپەڕی ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد جزدانێك لەسەر کوشنەکە کەوتووە پاسەکە زۆر تێپەڕیبوو نەدەکرا بگەڕێمەوە، بەڵام کە هەڵم گرت و پێناسەکەتم تێدا بینی زانیم هی بەڕێزتە و بڕیارم دا بۆتی بهێنمەوە، ئەوەتا دەتوانی تەماشای بکەی)، لە تەریقیدا رووم نەهات هیچ تەماشای بکەم و بە پێکەنینەوە وتم زۆر سپاس بۆ ئەو دەستپاکی و ئەمەکەی بەڕێزتان زۆر زۆر سپاسم کرد، ئەو بە پێکەنینەوە وتی (کاك (بەهرۆز) من کارێکی وەهام نەکردووە شایەنی ئەو هەموو سپاسە بێت بگرە ئەوە ئەرکی سەرشانمە)، (شاپوور) بە شێوەیەك قسەی دەکرد دڵم خەریك بوو دەوەستا سەدایەکی ناسکی پێوە بوو بڕوا بکە لە دەنگی مرۆڤی ئاسایی نەدەچوو، هەر سەیری چاوی دەکردم و زەردەخەنەی دەکرد دەمودەست وەرەقە و شتەکانم کۆکردەوە و وتم (خانم بەڕێزت ناوت چییە؟) من نات ناسم زۆر بەڕێزەوە پرسیارم لێ کرد لە وەڵامدا سەری داخست و دەستییکی بە پرچیدا هێنا و وتی (ناوم (بادە سلێمان)ە قوتابیم لە کۆلێژی ئەدەبیات بەشی کوردی قۆناغی یەکەم، زۆر خۆشحاڵم بە ناسینت کاك بەهرۆز) لە وەڵامدا بە دەنگییکی نێرانەوە وتم: (من زۆر بەختەوەرم کە بەڕێزتانم ناسی هیوادارم ئەوە قبووڵ بکەن کە میوانم بن لە کافتریا بۆ خواردنەوەی قاوەیەك). دووبارە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: (بە خۆشحاڵییەوە قبووڵی دەکەم، بەڵام ناتوانم زۆر بمێنمەوە کارم زۆرە) پێکەوە هاتنە خوارەوە چووین بۆ یانەی کۆلێژ و قاوەمان خواردەوە و کەمێك قسەمان کرد ئەوە سەرەتای ناسینمان بوو براکەم، هەر لەو کاتەدا یەکێك لە دوورەوە هاواری کرد (شاپوور) فریاکەون لە تاقیگە ئاگر کەوتۆتەوە، (کامەران) و ئەوانیش لەوێن تەماشامان کرد (زمناکۆ یاسین) بوو، کە ئەویش هاو پۆلی خۆمان بوو هەر بۆیە من و (بەهرۆز) بە پرتاو رامان کرد و چووین بۆ تاقیگە کە گەیشتینە ئەوێ، بەداخەوە زۆر شت سووتابوو زۆر شت.

## ١٥

### ناوەندی ٢٠٠٦

سێ کەس بوون، لە بن دارێکی رووتەڵەی پـایزدا دانیشـتبوون، کـە هێـدی هێـدی گـەڵاکانی دەوەرین و دەکەوتنە بن دارەکە و با بە ورشە ورش بە ناو گۆڕەپانەکەدا بڵاوی دەکردنەوە. هەر ئـەو خەزانە یاری بە قژی ژاکاوی (وەنەوشە) دەکرد، دیمەنی ئەو گوڵە بچووکە وەنەوشەییە کـە دابـووی لە قژی زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو هەر ئەوە تەلیسـمی لـە سەرچـاوە جوانـەکانی (جیهـانگیر) درووست کردبوو کە تێر لە جوانییەکەی رابمێنێت، هاوڕێکەی (وەنەوشە) بـە شـەرمەوە تەماشـای ئەو دوو مرۆڤەی دەکرد، کە بە حەماسێکی زۆرەوە باسـیان لـە پێشـانگاکە دەکـرد، (وەنەوشـە) هەموو جارێك دووبارەی دەکردەوەو بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە سۆز و موحیبەتـەوە دەیگـوت: (بـە راستی ئەمڕۆ من سەرسامم بەوەی مرۆڤێك دەبینم جـوانی لـە پەنجـەکانی دەچـۆڕێت)، هەڵبەتـە (جیهانگیر) سەرسامانە لەو وشە شیعرییانەی (وەنەوشە) رامابوو، ئەو هەر لـە سـەرەتاوە ئاشـقی جوانی ئەم کچە باریکە لە قژ لوولە بوو کە لە تـەنوورەو بلـووزێکی هەناریـدا خـۆی نەخشـاندبوو باڵایەکی بەرز و لێوێکی پەمەیی و دوو چاوی عەرەبیانەی رەش وایان لە (جیهـانگیر) کردبـوو بـۆ یەکەم جار لە ژیانیدا هەست بە کزەی ئەشق بکات لە دڵیدا و چەندین جار موچڕکی کارەبائاسا بـە لەشیدا تێپەڕیبوو.

لەبەرانبەردا (وەنەوشە) هەروا ئاسان نەوەستابوو جوانی (جیهـانگیر) هیچـی وای لـە جـوانی (وەنەوشە) کەمتر نەبوو، بەڵام (وەنەوشە) ی زیرەك و فریشتەئاسا بەدەر لەوەی بە جوانی قامـەت و باڵای (جیهانگیر) سەرسام ببوو هەستی کردبوو، ئەو جوانییـەی بـە هونـەری راسـتەقینە نـاوی بردووە تەنیا لە روحی ئەم کوڕەدایە و لە کەسی دیکەدا نادۆزرێتەوە هەر بۆیە زۆر بـە خۆشـحاڵانە ماوەی کاتژمێرێك زیاتر لە بن ئەو دارە رووتەڵێەدا قسەیان لەسەر ژیانی تایبەتی خۆیان کردبوو.

ئەوەندە تەماشای قووڵایی چاوی یەکتریان کردبوو هەردووکیان وێنەی یەکتریان لـەناو قـووڵایی دڵی یەکتردا درووست کردبوو، هەر زوو چووبوونە ناو روحی یەکتر.

بریقەی چاوی هەردووکیان رێك لە بریسکەی ئەستێرە گەشە نزیکەکانی ئاسمان دەچوو لە شەوانی تاریك و سامالدا،

بەڵام چاوەکانی (وەنەوشە) کە تەڕتر و بریسکە دارتر لە چاوەکانی (جیهانگیر) رووناکییان لێوە دەردەچوو، لە دوو دەریا دەچوون دوو دەریای کۆن کۆن وەك دەریاکانی زەمانی زوو رەنگی بریسکەکان و هەڵچوونەکانی لە تۆفانی نووح دەچوون گەر زۆر لە چاوەکانی رابمایتایە وات هەست دەکرد لە بەندەرێکی گەورەی وڵاتی ئەسپانداین و سەدان کەشتی وەهمی دەبینران، کەشتی کریستاڵی بە سەرنشین و دەریاوانی کۆنەوە کە هەموویان سەریان بە دەسرۆ ئاوریشم پێچابوو هەموو هێلەکی چەرمی کورتیان لەبەردابوو، لەنگەری کەشتییەکانیان تووڕ دەدا و هاواریان لە یەکتر دەکرد.

دیمەنی دنیایەکی دیکە بوون، دنیایەکی بریقەدار سەرزەمینێکی وەنەوشەیی لە خەونێکی قووڵی ژیانەوەدا، ئیتر ئەم دوو گەنجە بریندارە لە زەمانی نزیك بوونەوەی رژانی خوێن و لە زەمانی کوژرانی جوانییەکانی مرۆڤدا بە خەیاڵ دەگەڕانەوە بۆ رابردوو. رابردووی ئەسیرە کۆنەکان و ژیانێکی نەمرتر و نەبڕاوە. هەڵبەتە دانیشتنیان لە ژێر درەختێکی رووتەڵەی باریکەڵەدا کە لە کەمەرییەوە بە لایەکدا خۆی شکاندبۆوە و بە ناز و عیشوەی کیژێکی سەرکانییەوە گۆزەئاسا وەستابوو، درەختێکی توێکڵ ئەستووری کەمێك رەشباو کە دواتر، ناوی لێنرا (درەختی ئەشق)! تەنانەت دوای خاپووربوونی ئەو هۆڵەش لە جەنگدا درەختەکە مایەوە و لە گەشە و گەورەبوونی خۆی نەکەوت، من دواجار چەند جارێك سەردانی ئەو درەختەم کردووە و بە خەیاڵ ئەو دوو ئاشقەم دروست دەکرد و تارماییەکانیانم دەبینی جێگا پێیەکانیان دەردەکەوتەوە، ورتە ورتی دەنگییان هێشتا لە هەوادا دەهات و دەچوو.

سەردەمانێکی درێژ ئەو درەختە مایەوە، بەڵام دوای چەندین ساڵ لە گۆڕانکاریی جیا جیا و گەمە و شەڕی جیاواز جیاواز، بەرپرسێکی پایە بڵندی حزب درەختەکەی لە بنا بڕییەوەو باخچەکەو هۆڵەکەشی تێکداو لە جێگایدا تەلارێکی گەورەی دە نهۆمی دروست کرد و کردی بە بارو ئوتێل و شەوان تا درەنگانی شەو قومارو کاری لەشفرۆشی و سۆزانی بازی تێدا دەکراو کۆمپانیایەك لە ئۆکرانیاو تورکیاو بەغداوە سۆزانی و لەشفرۆشی دەهێناو لە وێدا کاری لەشفرۆشیان دەکرد و دەبوونە خۆراکی بەرپرسەکان و سوڵتانە گەورەکانی سەردەمی دوای پرۆسەی ئازادی عێراق ئیدی ئوتێلی (پەری دەریا) ناوبانگێکی گەورەی پەیدا کرد و شەوانە تا بەیانی

شوێنی سەماو قومارو کاری سێکسی بەرپرسەکان بوو، ئـەو بەرپرسـەی لـە چـەند دەفتـەر دۆلار کەمتری پێ بووایە نەیدەتوانی بچیتە ژوورەوە.

دوای ئەوەی لە یەکێك لە کۆمپانیا گەورەکانی (پەنا کاروانی) دەستم لە کـارێکی پـڕ داهـات گیر بوو و پارەیەکی باشم مۆڵ کرد، شەوێك خۆم لەبەرگی کـوڕە دەوڵەمەنـدێکی حزبیـدا گـۆڕی و چوومە ناو نهێنییەکانی ئەو تەلارەوە، کـە ببـووە جێگـای پرسـیارو گفتوگـۆی خـەڵك و سـەدان زانیاریی گرنگم پەیداکرد کە لە کاتی خۆیدا دەیانخەمە روو، بە هەرحاڵ دانیشتنی بـن درەختەکـە سەرەتایەکی دیکەی گۆڕانکاریەکان و دروستبوونی زنجیرەی چیرۆکەکە بوون.

دوای بیست و حەوت ساڵ لەو دانیشتنە بە پرسـیار و سـۆراخ بـەو زانیاریانـەی کـە هـەمبوو توانیم هاوڕێکەی (وەنەوشە) بدۆزمەوە ئەو دەمە خاتوو (شەڕمن عەزیز) ژنێکـی کامـڵ بـوو بـە ناوی رۆژنامەنووسەوە خۆم دا لەقەڵەم و وام نیشان دا کە مـن جگـە لـە رۆژنامەنووسـی بـە دوای چیرۆکی ناوازەو تراژیدیاییدا دەگەڕێم و دەیکەم بە فیلم.

هەر بەو هۆیەوە زانیاریی زۆرم لە سەر ئەو ژوانەو کارەکتەری (وەنەوشە) و (جیهـانگیر) پەیـدا کرد، بە پرسیارو سۆراخ مامۆستا (شەڕمین)م لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاردا دۆزییەوە.

ڕۆژێکی باراناوی بوو بە چەترێکی گەورەو رینکۆتێکی رەساسیەوە لەگـەڵ جانتایـەکی رەشـی گەوردا خۆم کرد بە قوتابخانەی (مەم و زین)داو، لەنێوان راڕەوەکەدا وەستام و لە چـەند قوتابییـەکم پرسی ئەوانیش رووی مامۆستایان پیشاندام، بەر لـەوە (کامـەرانی وەنەوشـە) زوو چـەند جارێـك باسی ئەو مامۆستایەی بۆ کردبووم کە زۆر هاوڕێی دایکی بووە لە قۆناغەکانی گەنجیدا، ئیدی بـە پرسیار و سۆراخ توانیم مامۆستا بدۆزمەوە و چەند جارێـك دانیشـتنی لەگـەڵ بکـەم، مامۆسـتا (شەڕمین) لە ژوورەکەی خۆی لە سەر مێزێکی تەختە خەریکی خوێندنەوەی کتێبێك بوو.

سلاوم لێ کرد و چەترەکەم داناو سەرەتا خۆمم پێناساند، مامۆستا حەپەساو وای دەزانـی مـن لە یەکێك لە رێکخراوەکانی ژنانەوە هاتووم، چونکە دوا جار خۆی زۆر شتی تایبەتی لە سەر ژیانی خۆی بۆ باسکردم دیمەنی ژێر ملی مامۆستا (شەڕمین) زۆر سەرنجی راکێشام، بەڵام رووم نـەدەهات تەواو سەرنجی بدەم سووتابوو وەك لاستیك بەسەر یەکدا توابووەوە، سەرەتا وتـی: (لـە رێکخـراوی داکۆکی لە ژنانەوە هاتووی یان چی؟)

بە شەڕمەوە وتم (من سینەماکارم و رۆژنامەنووسـم) لـە راسـتییدا سـینەماکار نـەبووم، بـەڵام خولیای سینەمام هەبوو زەردەخەنەیەکی کرد و وتی (سینەماکار؟ سینەماکاریت ئەی کارت بـە مـن چییە؟)

وتم (کارێکی گرنگم هەیە مــن بــە دوای چــیرۆکی تراژیــدیا و خــەمناك و راســتییدا دەگەڕێم جەنابتان چیرۆکی لەو شێوەیەتان لە لا هەیە و ئێوە چیرۆکێك دەزانن کە من بە پەرۆشەوە بە دوایدا دەگەڕێم).

کە من ئەم وتەیەم لە دەم هاتەدەر ئەو زۆر سەیر دەموچاوی گۆڕا هەڵبەتە وای زانیوە من چیرۆکی تایبەتی ژیانی ئەوم دەوێت ئەو رووداوە ناخۆشانەی بە ســەری هــاتبوون، بــەڵام مــن ئەوەی گرنگ بوو لە لام کۆکردنەوەی زانیاری بوو لە ســەر پەیوەنــدیی ئــەو ســاڵانەی گــەنجی نێوان (جیهانگیر سەرحەد) و (وەنەوشە)، هەرچەندە (شەڕمین عەزیز) بۆ خۆی خاوەنی چیرۆك بوو واتە لە ژیاننامەی ئەودا رووداوێکی ناخۆش و لە بیر نەکراو هەبوو، کە وای لێکرد ژیانی بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا بگۆڕێت، نــەك ژیــانی بــەڵکو هــەموو جەســتەی رەشــپۆش بــوون و گۆڕانیان بەسەردا هات.

جەستەی مرۆڤ بەرگەی هەموو کاردانەوە دەرەکییەکان ناگرێت، چــونکە وەك گــوڵ وایــە چــۆن لەبەردەم هەندێك هێزدا چۆك دادەدات و دەوەرێت یان بــەژموردە دەبێــت و دەکەوێتــە ســەرزەمین جەستەی مرۆڤیش وەهایە ناسکە، زوو لەناو دەچێت، تەنیا ئەو بەشەی مرۆڤ لەناو ناچێت کە بــەر جەستە نییەو بۆ زەمەنێکی درێژ دەمێنێتەوە بگرە دوای مردنیش هەر هەست بە شتەکان دەکات، لەبەرزییەوە تەماشای دنیا دەکات.

(شەڕمین عەزیز) فەرمووی لێ کردم و وتی: (کاکە گیان، فەرمووو وەرە دابنیشــە بــزانم بەڕێزتان چیتان لە من دەوێت، مــن چــۆن دەتــوانم یارمــەتیتان بــدەم؟) زۆر بــەڕێزەوە داوای لێکردم مەبەستی خۆم روونبکەمەوە، دیار بوو منیش نەم دەویست زۆر بە شاراوەیی بئاخفم، هەر زوو دوای وچانێکی کورت چوومە ناو بازنەی دانیشتنەکەوە و باسی سەردەمانی تاریکی بەعسم کرد، لە دەموچاویا هەستم بە شێوە گریانێك دەکرد لە ناخەوە، هەر زوو زانیم تــەواو گێڕاومەتەوە بۆ رابردوو، بەڵام چۆن رابردوویەك پڕ لــە مەینــەتی و گریــان و حەســرەت، بــە جۆرێك بە شەرمەوە دانیشتم و هەردوو دەستم بە یەکەوە کۆ کردەوە و رووم کــردە مامۆســتا (شەڕمین عەزیز) و وتم: (مامۆستا گیان وەك لە سەرەتاوە وتم من بە دوای چیرۆکی رابردوودا دەگەڕێم هەندێك زانیاریم پێویستە کە دڵنیام تــەنیا تــۆ دەزانیــت لەبــەر ئــەوەی تــۆ تــەنیا رێگایەکیت کە بتوانیت هاوکاریم بکەی...)

بە جۆرە نیگایەکی کرژەوە تەماشای کردم و وتی (تۆ ســەرەتا نــاوت چــییە؟ ئەگــەر رۆژنامەنووسی یان ســینەماکاریت دەتوانیــت ناســنامەیەکم نیشــان بــدەیت؟) مــن بــە

پێکەنینەوە وتم: من ناوم (شاپوور سوبحان)ە، هەڵبەتە پێناسی تایبەتم نەهێناوە، لە یادم کردووە زۆر بە پەلە هاتووم).

لە وەڵامدا کەمێك تووڕە بوو دەنگی کەمێك بەرزکردەوە و وتی: (کێ دەڵێت تۆ سیخوڕی لایەنێك نیت؟ من ناتوانم بڕوات پێ بکەم، تۆ ویقار و جەماڵت لە پیاوانی حزب و دەسەڵاتدار دەچێت هیچ لە سینەماکار و ڕۆژنامەنووس ناچێت)، من نەمزانی بڵێم چی شتە کە زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو، لەو کاتەدا هیچ وشەیەکم بۆ نەهات بە ئاماژە دەری کردم دەستی بەرزکردەوە و وتی: (من هیچ وشەیەکم نییە بە تۆی بەڕێزی بڵێم دەتوانی بڕۆی) بە نائومێدی لە قوتابخانەکە هاتمە دەرەوە، بەڵام نەمتوانی بسرەوم هەربۆیە ڕۆشتم و بە نیازی دووبارە گەڕانەوەم پلانم دانا. هەرچۆنێك بێت زانیاریی سەردەمانی پەیوەندی نێوان (وەنەوشە) و (جیهانگیر سەرحەد) زۆر گرنگ بوون لە نووسراوەکاندا دەبوو پڕیان بکەمەوە ئەگەرچی وەنەوشە خۆی هەندێك شتی باسکردبوو، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت تەواوی شتە نهێنییەکانی پەیوەندیەکەی باس نەکردبوو، بەڵام بەو پێیەی زۆر هاوڕێی (شەڕمین عەزیز) ببوو ئەو لە تەواوی شتەکان ئاگادار ببوو، بۆیە من دەبوو ئەو بگرم و بەری نەدەم.

دوای ئەوەی مامۆستا (شەڕمین عەزیز) دەری کردم، ئارامم لەبەر بڕابوو، بە ڕێگادا دەڕۆیشتم و لە بیری دووبارە سەردانی ئەودا بووم، باران دەباری هەر بۆیە چەترە گەورەکەم هەڵداو بە شەقامەکانی پشت قوتابخانەی (مەم و زین) دا هێدی هێدی دەڕۆیشتم و باران بە پانتۆڵەکەمدا هەڵدەپرژا ریکۆتەکەم هەندێك تەڕ ببوو، هەرچەند چەترم هەڵدابوو، بەڵام باران بە ئاڕاستەی لاردا دەهاتە خوار. چەترەکەم تەواو کاری خۆی نەدەکرد، هەرچۆنێك بێت حەزم دەکرد لە ژێر باراندا پیاسە بکەم، چاوەڕوانی ئەوە نەبووم بە تاکسی یان پاس بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، پاش نیو کاتژمێر گەیشتمەوە گەڕەکەکەی خۆمان، بەڵام هەر لە بیری تەواوکردنی چیرۆکەکەدا بووم، هەندێك خۆشحاڵیش بووم، چونکە دەمتوانی جاری داهاتوو سەردانی مامۆستا (شەڕمین) بکەمەوە.

شەو داهات لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە تەماشای ئاسمانم دەکرد هەندێك هەور و هەندێك ساماڵ بوو، ئیدی باران بەو شێوەیە نەدەباری بیرم لە ڕۆژگارەکانی رابردوو دەکردەوە لەگەڵ بارینی هەر دڵۆپێك باراندا من بیرم لە ژیانی رابردوو دەکردەوە، لە زیهنی خۆمدا دەمگوت: (ئای خودایە دەبێت ئەو دوو ئاشقەی لە پەیکەرێکی بێ گیان و روح و بێ هەستەوە خۆشەویستییان شکۆفەی کرد، دەبێت چۆن ژیابن؟، ئایا ژیان لە کاتی جەنگدا یان ئەشق لە کاتی جەنگدا چی جۆرێك لە چێژی هەبووە؟)

لە بیری خۆمدا دیمەنەکانم دەهێناو وەك وێنەیەکی ڤیدیۆیی دەمکردە فیلم، دەمگـوت: دەبێـت لەو سەردەمەی خۆشەویستی قەدەغەو یاسـاغ بـووە، مرۆڤـەکان لـە ئەشـق هەڵـدەهاتن، دەبێـت (وەنەوشە) و (جیهانگیر سەرحەد) چۆن لێوەکانیان لە لێوی یەکتری خلیسکابێت؟ لـە ناکـاودا بـە خەیاڵدان دەپچڕام و دەچوومە سەر جێگاو دەنووستم، لە خەوندا دنیایەکی رەنگـاوڕەنگم دەبینـی، دنیایەکی هێمن دوور لە رەنگی جـەنگ و دنیایـەك پـڕ لـە ئـاوازی میوزیـك و گـۆرانی هەسـت ورووژێنەر، لەوێندەرێ ژیان بە جۆرێکی دیکە بـوو، روونـاکی دەهاتـە سەرچـاوم ئیـدی لـە خـەو رادەبووم و بە خەبەر دەهاتم و دەمبینی بەیانی داهـاتووە خـۆم ئامـادە دەکـرد بـۆ ئامـادەکردنی پلانێك تا دووبارە سەردانی مامۆستا (شەرمین) بکەم.

ئەو کاتەی سەرقاڵی چاککردنی ژوورەکەم بووم کە کتێب و دەفتـەرەکانم گـەلێك زۆر بـە سـەر یەکدا کەوتبوون، دواتر خۆم ئامادە کرد و بەرگێکی نوێم دەپۆشی ئـەم جـارە بڕیـارم دا، قـاتێکی قاوەیی و ریباتێکی بێجی و کراسێکی سپی لەبـەر بکـەم خـۆم لەبـەردەم ئاوێنـەدا قیـت و قـنج کردەوەو سلاوێکم لە خۆم کرد و پرچم شانە کرد و هەندێك کرێمم لە سەرم داو چەند تاڵێك لـە قـژم هێنایە سەر ناوچەوانم دواتر بە لامەوە جوان نەبوو بۆیە بەلای راستدا وەرم گێڕان و هەنـدێك لێـوی خۆم تەڕ کرد و ریباتەکەم برێك جوولاند و جانتاکەم گرتەوە بە دەستمەوە، کە ئامێرێکی ریکۆردەر و کامێرایەکی قیسمی کۆن و چەند پەڕەیـەك و پێنووسـێکی شـینی تێـدا بـوو بـە قادرمـەکانی ماڵەوەدا هاتمـە خـوار، دیـتم دایکـم لـە حەوشـە گەورەکـەی ماڵـەوەمان سـەرقاڵی گسـکدان و پاککردنەوەی حەوشەکە بوو کە بە هۆی باو بارانی تاو تاوی شەو پڕ ببوو لە گـەڵاو گـۆڵ و خـۆڵ و خاشاکی ئەو بارانەی کە یەك پارچە قوڕ ببوو.

قۆندەرەکانم بریسکەیان دەهات و لەبەر ئەوەی تەڕ نەبن بە پێ پارێز بە حەوشەکەدا رۆیشـتم و سلاوێکم لەدایکم کرد بەر لەوەی ئەو هیچ بڵێ وتم: (دایە گیان من نان ناخۆم هەندێك کاری گرنگم هەیە دەبێت جێبەجێیان بکەم).

من فێری جۆرێك لە ژیانی تەنیایی ببووم، چونکە ساڵانێکی زۆر بوو مـن لـە رۆژئـاوا دەژیـام دەمزانی بە باشی بە تەنیا بژیم و پشت بە خۆم ببەستم و کارەکانی خۆم ئەنجام بدەم، بـەڵام بێبـەش نەبووم لە سۆزی دایك هەمیشە بە مرۆڤێکی گەورەم دەبینی، ئەو چەند ساڵە من ژیـانێکی دیکـە دەژیام ئەوەی لە لام گرنگ بووە کۆکردنەوەو رێکخستنی ئەو هەموو رووداوگەلە بـووم کـە دەبـوو بیانکەمە سیناریۆ ئەگەرچی من کەسێکی پرۆفیشناڵ نـەبووم لـە سـینەمادا و رۆژنامەنووسـیش

نەبووم، بەڵام سەرو کارم لەگەڵ سینەمای رۆژئاوا و ئێرانیدا هەبوو، بە تایبەت چیرۆکە فیلمی تراژیدی و مێژوویی.

من هەندێك گرێبەستم لەگەڵ کۆمپانیایەکی فیلم سازیدا واژۆ کردبوو، کە کاریان ئەوە بوو فیلم بەرهەم بهێنن لە سەر ئەو کێشەو شەڕگەلەی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا روویان داوە بە تایبەت نەتەوەی کورد، ئەوان دەیانزانی کە ئێمە گەلێکین زۆرمان ستەم لێکراوە زۆر چەوساوە بووین، منیش ئەو ئەرکەم لە سەر شان بوو کە کار لە سەر ئەو دۆسیەیە بکەم کە ژیانی داگیر کردبووم و خۆم کارەکتەرێکی سەرەکی ناو رووداوەکان بووم هەمیشە سەرقاڵی کۆکردنەوە و نووسینەوەی رووداو و بەسەرهات و پێشهاتەکان بووم.

یەکێك لەو بەسەرهاتە گرنگانەی لەو ماوەیەدا کارم لەسەر دەکرد زانینی هەندێك راستی بوو سەبارەت بە ژیانی (وەنەوشەی مخۆل) و (جیهانگیر سەرحەد) ئەوەی کە گرنگ بوو و لە دەستنووسەکانی ناو (کتێبە وەنەوشەیەکەدا) نەبوو ژیان و سەرەتاکانی پەیوەندی نێوان ئەو دوو ئاشقە بوو کە تاکە کەسێك باش دەیزانی ئەویش (شەرمین عەزیز) بوو، هەر بۆیە لە مێشکمدا وێنەم بۆ ئەوە دەکێشا چۆن و بە چی شێوەیەك زانیاری لەو دەربهێنم، کاتژمێر هەشت و نیو بوو تاکسیەکم راگرتبوو داوام لێ کرد بمگەیەنێتە قوتابخانەی (مەم و زین)، کە دەکەوێتە گەڕەکی "نەوبەهار" لە باکووری شار و لەبەرزایدا نزیك لە شەقامە گەورە سەرەکییەکەی سنووری شار پاش نزیکەی بیست خولەك بە ناو قەرەباڵخی و ئاپۆڕەی ئۆتۆمبیلی هاووڵاتیان و فەرمانبەرانی دەوڵەتدا کە دەردەچوون بۆ سەر کارەکانیان خۆم گەیاندە بەردەم قوتابخانەکە و دابەزیم، ئەو رۆژە تاو و ساو بوو. کەمێك هەوریش دەهات و دەچوو، هەندێك جار دنیا کەمێك سێبەر و کەمێك هەتاو دەبوو واتە کەوەرۆژ بوو، لە دەرگای قوتابخانەوە چوومە ژوور و بە راڕەوەکەدا بە لای راستدا بەرەو ژووری مامۆستاکان رۆیشتم ئەو کاتە دەمێك بوو قوتابییەکان چووبوونە پۆلەکان و وانەیان دەخوێند، بە هێمنی لە دەرگای ژووری مامۆستاکانم دا تەنیا یەك مامۆستای پیاو لەوێ بوو سەرقاڵی هەندێك دەفتەر بوو رێکی دەخستن، سڵاوم لێ کردو لە مامۆستا (شەرمین عەزیز)م پرسی، لە وەڵامدا وتی ئەمڕۆ نەمبینیوە، دەیویست بزانێت داخۆ من کارم بە مامۆستا شیرین چییە من بەر لەوەی ئەو هیچ بڵێ تێم گەیاند کەوا من ناسراوی ئەوم هەندێك کاری تایبەتم پێیەتی، وا دیار بوو ئەو زۆر باش لە هەواڵی ئەوەی نەدەزانی بڕیارمدا چاوەڕێی بکەم، پاش تەواو بوونی وانەکە هەندێك لە مامۆستاکان گەڕانەوە بۆ ژوورەکەیان هەریەکە و بە شێوەیەك تەماشای ئەم گەنجەیان دەکرد، دەبێت کێ بێت بە نیگاکانیدا دیاربوو، هەرچاوم گێڕاو لەناویاندا هیچ

ئاسەوارێکی مامۆستا (شەڕمین عەزیز) م نەبینی لە یەکێك لە مامۆستا ژنەکانم پرسی کـە داخـۆ مامۆستا بۆ لێرە نییە، هەڵبەتە ئەو مامۆستایە نەیدەزانی کە من هاتووم بـۆ دیـداری مامۆسـتا (شەڕمین عـەزیز) وتی (کاکە گیان من نازانم بەڕێزت چی کارێکت بـە مامۆسـتا شـەڕمین هەیـە، بەڵام ئەو، مۆڵەتی وەرگرتووە بۆ ماوەی یەك مـانگ لەبـەر ئـەوەی بـۆ چارەسـەرکردنی هەنـدێك نەخۆشی سەفەر دەکات بۆ دەرەوەی وڵات)

کە وای گـوت، موچـڕکێك بـە گیانمـدا هـات و لـە ناخـەوە ورووژانـدمی، ئیـدی نەمدەزانی چۆن و بە چی شێوەیەك سۆراغی بکەم، لە ئەدرێسـی مامۆسـتام پرسـی و یەکێك لە مامۆستا هاوڕێکانی وتی

(تۆ ئەدرێسی ئەوت بۆ چییە؟ کاکە نازانی ئەوە کارێکی گونجاو نییە، کێ دەڵـێ تـۆ کـارێکی خراپـت بـەو نییـە؟) لـە وەڵامـدا زەردەخەنەیـەکم کـرد و وتم: (مـن لـە دەرەوەی وڵات هـاتووم سپاردەیەکم پێیە بۆ ئەو زۆر گرنگە تاکو بیدەمێ بەر لەوەی سەفەر بکات) بە هەر شێوەیەك بێـت ئەدرەسەکەیم پەیدا کرد. بە پرتاو لە قوتابخانە وەدەرکەوتم و تاکسـیەکم گـرت و رۆیشـتم بـۆ ئـەو ئەدرێسە، بەڵام زۆر درەنگ بوو گەیشتم، کاتێك کە گەیشتمە ماڵەکەی، کەس لەوێ نەبوو، چەندم لـە زەنـگ دا کەسـێك دەنگییـك سـەدایەك نـەبوو، تەنانـەت دراوسـێیەکیش چـییە نـەهات و سەرەداوێکم دەست نەکەوت، ئیدی بە نائومێدیەکی زۆرەوە بە خەمباری گەڕامەوە بۆ ماڵ.

ئیدی دەبوو چاوەڕێی بکەم تاکو دەگەڕێتەوە، چونکە سەفەری کـردووە بـۆ چارەسـەرکردن، لـە بیری خۆمدا دەترسام لەوەی لە کاتی نەشتەگەری و چارەسەری نەخۆشییەکەیدا گیان بدات و بمرێـت ئەو دەمە من دەبوو ئەو بەشە گرنگەی چیرۆکەکە بـە سـپییتی بـەجێ بهـێڵم، لـە راسـتییدا زۆر دەترسام.

مانگێکی شووم بوو، چونکە من کاری گرنگم هەبوو، کات نەدەڕۆیشـت و لـە شـوێنی خـۆی وەستابوو. وام هەست دەکـرد میلـی کاتـژمێرەکان لـە شـوێنێکدا وەسـتاون و بـەردەوام نـین لـە خولانەوە، شەو و رۆژم دەژمارد تاکو مامۆستا بگەڕێتەوە. هەر لەو ماوەیەدا دەبوو سـەفەر بکـەم بۆ ئەوروپا، بەڵام دوام خست نەبا کارەکان بەو شێوەیە نەبن کە خۆم دەمـەوێت یـاخود. ئیـدی بـە دیداری (شەڕمین عەزیز) ی بەتەمەن نەگەمەوە. من ساڵانێك بوو لـەو دنیایـە دابڕابـووم کـە لـە سەری بووم من دەبوو ببمە ئەندازیار، بەڵام وڵاتم بەجێ هێشت و سەفەری هەنـدەرانم کردبـوو، لـە بری ئەوەی برەو بە ئەندازیاری بدەم خوم دایە سینەماسازی و سیناریۆو فیلم سازی کورت و درێـژ، چەند کۆرسێکم خوێندو خۆم لەگەڵ کامێراو فیلم و سکریندا راهێنا، بوومـە دۆسـتی بـەردەوامی

هۆلّیود، هەمیشە چاودێری دەنگی فیلم و گۆشەی کامێراو ئەکشن و رووداو گەلە دراماتیکییەکانم دەکرد، هەر لەو مانگەدا چەندین جار سەردانی شارەکانی کوردستانم کرد و تەماشای زۆر دیمەنی دنیای ئەو کاتەم کرد زۆر گوندی کوردستانم بەسەرکردەوە تەنانەت سەردانی گوندەکانی شارباژێرم کرد، چوومە ناو ماڵە خاپوور کراوەکەی (مخۆل شەلەنگ) کە کەسێك نەببوو ئاوەدانی بکاتەوە، دیمەنی هەزاران جۆر ئینجانەی گوڵی وەنەوشەویم دی بە چیاکاندا سەرکەوتم و لە دووررا لەو پەڵە گەورانەم دەڕوانی کە سەرتاپا مۆریان دەنواند و هەموو گوڵی ساڵانی رابردوو بوون. لەو گوڵە سیحریانە بوون کە بەردەوام گەشەیان دەکرد، دنیایەکی زێڕین بوون ئەگەرچی ئاسەواری کاولکاری هێشتا بەو نزار و چیایانەوە دیار بوو، بەڵام بەهەشتییکی برینداربوو لە بەهەشتییك دەچوو دوای ساڵانێك لە ئازار هێدی هێدی سارێژ دەبوو.

لە دوا دوای مانگدا گەڕامەوە بۆ ماڵ، من لە گەڕیدەیەك دەچووم کە هەمیشە دایکم دەیگوت: (کوڕم تۆ لە کابرایەکی کۆڵ بە کۆڵ دەچیت، کە بە دوای شتێکدا دەگەڕێت دەستت ناکەوێت لە کەسێکی لانەواز و گەڕیدە دەچیت. تۆ ماندووی بۆ پشوو نادەی) لە راستییدا دایکم راستی دەگوت من لە گەلگامێش دەچووم ئەو بە دوای رووەکی نەمریدا گەڕابوو. منیش بە دوای رووداوگەلێکی زۆردا دەگەڕام کە هێدی هێدی لەو گەنجیەمدا سەروو ریشی سپی کردبووم، هەستم دەکرد عەیامێکی گەلێك دوورە من دەژیم و لە زەمەن بەجێ ماوم، ئیدی ژیانم ماندووی کردبووم لە بیری خۆمدا نەبووم تەماشام دەکرد خەریکم لە دنیا وێڵ دەبم.

بەیانییەکی کەمێك مامناوەند بوو، خۆم ئامادەکرد بۆ سۆراخی (شەرمین عەزیز) قاتێکی نیلی و کراسێکی سپییم لەبەر کردبوو جووتێك قۆنەرەی قاوەیی لەماعم کردە پێم و لە روخساری خۆمم روانی و جانتایەکم بە دەستتەوە گرت و بەرەو ماڵی مامۆستا (شەرمین عەزیز) بەرێ کەوتم، گەیشتمە ئەوێ و لە زەنگی دەرگام دا کەس وەڵامی نەدامەوە، ئەمجارەش زۆر نائومێد بووم و گەلێك ترسام وەفاتی کردبێت ئیتر وەهابوو.

زۆر کەس هەن لەبەردەم نەشتەگەری نوژدارە بێبەزەییەکاندا گیان دەسپێرن، پزیشك و نوژدارەکان کەسانی بێ هەست و سۆز و بێبەزەیین ئەوەندە ناو سکی مرۆڤ دەبینن وردە وردە خاڵی دەبنەوە لە میهرەبانی من گەلێك لەوان دەترسام، ناچار بڕیارم دا لە یەکێك لە دراوسێکانی (شەرمین عەزیز) بپرسم. ئەوە بوو لە دەرگای ماڵێکم داو ئافرەتێکی خرپنی دەم بە پێکەنین وەدەرکەوت، لە دیمەندا رەسەنایەتی کوردم دەبینی کە زۆر خانەدانن و رێزی کەسانی نەناسیاو

دەگرن. لە هەواڵی مامۆستا (شەڕمین عەزیز) م پرسی و لە وەڵامدا ئەوەی پێ وتم، کە گوایە هێشتا لە سەفەر نەگەڕاوەتەوە لەگەڵ کچەکەیدا ڕۆیشتووە، ئەمجارەش بە نائومێدی گەڕامەوە.

ئەمجارەیان تەواو بێزارو بێ هیوا بووم ئارەزووم نەبوو بگەڕێمەوە بۆ ماڵ، هەر بۆیە بە پیاسە کردن ملی ڕێگام گرت بەرەو باخچەیەك لەناوەندی شار و لەوێ لە بن دارێکی گەورەی تودا لەسەر کورسییەکی کۆنکریتی دانیشتم، بیرم لە دنیا دەکردەوە دیمەنی منداڵانی بێ سەرپەرشت و بۆیاخ چی منیان بەرەو ئەو دیوی نەهامەتی برد یەکێك لەو منداڵە بۆیاخچیانە هاتە بەردەمم و وتی: (خاڵە بۆیاخ ناکەی؟) بە سەر ئاماژەم دایە بەڵێ ئەگەرچی قۆنەرەکانم زۆر لەوە بریقەدارتر بوون کە بۆیاخی بکەم، بەڵام نەمدەتوانی دڵی منداڵییك بشکێنم و نائومێدی بکەم جووتێك نەعلی ئێرانی داپێم و لە پێم کردو ئەویش هێدی هێدی دەستی کرد بە بۆیاخ کردن سەر ڕوومەتەکانی هەمووی بۆیاخی ڕەش بوو پەنجەکانی لە ڕەژوو پیستر بوون سەر لێوی ڕەش بوو لە مریشکی ناو ئاگردان دەچوو، زۆر دڵم پڕ بوو، دەستم کرد بە گریان و فرمێسك لە چاوم دەهاتە خوار، نەمهێشت کە ببینێ دەگریم، دەگریام بۆ دنیای ڕەشی ئێمەو منداڵان و بۆ سەرەتاکانی بوونمان، بۆ نەهامەتی بۆ هەتیوەکانی شار و بۆ باخچەو شەقامە بێ نازەکانی وڵات بۆ گوندەکان بۆ گوندنشینە بێبەختە ماندووەکان، هەرچۆنێك بێت گریان بێ فایدە بوو جانتاکەم کردەوە و دەستم کرد بە نووسینی هەندێك تێبینی و سەرنج و یادگاری چەند خولەکێك تێپەڕی و منداڵە ڕوومەت ڕەشەکە قۆنەرەکانی خستە بەردەمم و وتی: (مامۆستا تەواوم کرد فەرمووو) نەعلەکانم لابردوو قۆنەرەکانم کردە پێم لە بریقەی قۆنەرەکانمدا خۆمم بینی روخسارێکی خوارو خێچ دنیایەکی بێ ناز بڕێك پارەم بە منداڵەکە داو وتم: (باقی پارەکە بۆ خۆت هەڵبگرە) کەمێکی دیکە دانیشتم و دواجار هەڵسام و بە شەقامە قیرەکەدا بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

ئەوە پیشەی من بوو کە ئێواران دادەهات و بەیانیان ڕۆژ دادەهات و من لەناو خولگەیەکدا دەسووڕامەوە لە کەسێکی سەرشێت و دێوانە دەچووم لە ڕاستییدا مانگێك ڕۆیشت و بەردەوام من دەڕۆیشتم بۆ قوتابخانەو ماڵی مامۆستا (شەڕمین عەزیز)، بەڵام ئاسەوارێك سەرەداوێك هەواڵێك نەبوو، لەوە دەچوو لەم هەسارەیەدا نەمابێت دوو مانگ ڕۆیشت و من گەڕام و هەواڵ نەبوو، هێدی هێدی کەشوهەوا بەرەو گەرمبوون دەچوو، ئەو دەمەی کە بۆ یەکەمین جار چووبووم بۆ لای (شەڕمین عەزیز) لەناوەڕاستی زستاندا بووین، بەڵام هەنووکە دنیا گەرم دادێت و لە کۆتاییەکانی بەهاردا بووین، من هیچ کات لەزەتم لە بەهار نەبینی بوو لە گوڵەکان بێ خەبەر بووم دوا جار ئەو

ئینجانە گوڵانەشم فەرامۆش کردبوو، کە (کامەرانی وەنەوشە) بە دیاری پێی دابووم، بەڵام دایکم ژنێك بوو سەرو کاری لەگەڵ گوڵ و ئینجانە بەخێوکردندا هەبوو، بەردەوام خزمەتی کردبوون.

من خودی خۆم لە وەرزی بەهاردا لەوپەڕی نامۆبووندا بووم بەردەوام کارەساتە ناخۆشەکان لە بەهاردا پەیدا دەبوون، بە درێژایی مێژوو کورد وەرزی بەهاری لێ بۆتە دێوەزمەو زۆرینەی کارەسات و ئاشووبەکان بەهاریان تەنیوە، دوای چوار مانگ و نیو بۆ جارێکی تر چوومەوە بۆماڵەکەی کاتێك لە زەنگم دا ئافرەتێکی قژ خورمایی و چاوڕەش دەرگاکەی کردەوە سەرەتا وام زانی ئیسپانییە لە ئیسپانییەکان دەچوو زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: (فەرموو، چۆن دەتوانم یارمەتیت بدەم؟) لە وەڵامدا کەمێك تاسام و وتم (خانمەکەم ئێرە ماڵی مامۆستا (شەڕمین عەزیز)ە، دووبارە پێکەنی و ددانە سپییەکانی دەرکەوتن و وتی (بەڵێ، بەڵێ ئێرەیە) بەر لەوەی من تەواوی بکەم کە بۆچی هاتووم دیار بوو کە ئەو دەیزانی من بۆچی هاتووم زۆر ژیرانە وتی: (تۆ سینەماکارو رۆژنامە نووسی ئەوەی بە دوای چیرۆك و شتی وادا دەگەڕێیت تا بیکەیتە بابەتی فیلمەکانت، ها، ها، ها، ها) زۆر سەیر بوو پێدەکەنی و دەخنایەوە من نەمتوانی هۆکاری پێکەنینەکەی بزانم، بەڵام هەر زوو زانیم کە کیژێکی رووخۆشەو کراوەیە.

لەو چرکەساتە کورتەدا لە روخساریدا زۆر شتم خوێندەوە، زانیم ئەم کیژە دەتوانێت کۆمەکم پێ بکات لە زۆر شتدا.

من بێ ئەوەی هیچ وشەیەکی دیکە بڵێم ئەو خانمە کە تەمەنی لە خۆم کەمێك گەورەتر بەدەردەکەوت وتی (بفەرموو بفەرموو وەرە ژوورەوە) منیش بێ سێ و دوو بە خۆم و جانتاکەی دەستم چوومە ژوورەوە بە چەند قادرمەیەکدا بە دوای ئەو کیژەدا سەرکەوتم، بۆنی عەترەکەی بەسەرمدا دەهات و دەیبزواندم، ئاشنایەتی لە مێژینەی من بۆ بۆنەکان و وای کردبوو هەموو جۆرەکانی بۆن و عەتر بناسمەوە.

ئەو لە قاتێکی بلووزو پانتۆڵی تەواو گەنجانەو تورکییدا بوو کە لەو ساڵانەی دوایدا لە شارەکانی کوردستاندا مۆدێل بوون، فەرمووی لێکردم بۆ هۆڵێکی گەورەی میوان و لەوێ پاش ئیستێك لە سەر قەنەفەیەکی گەورە و وەزیرانە دانیشتم، دەتگوت زمانم نییە تەنانەت یەك وشەشم بۆ نەدەهات من لە چاوەڕوانی هاتنی مامۆستا (شەڕمین عەزیز)دا بووم، بەڵام لە زیهنی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە کە داخۆ ئەم کیژە چۆن بەوە دەزانێت کە من کێم و چیم دەوێت چۆن بەوەی زانیوە کە من بە دوای چیرۆکدا دەگەڕێم؟، بەڵام وام هەست دەکرد (شەڕمین عەزیز) باس و خواستی منی کردووە کە زانیاریم لەو دەوێت، هەڵبەتە باسی منی کردووەو ویقارو جەماڵی منی

بۆ ئەو کیژە باس کردووە من نەمزانی ئەو کیژە چی مامۆستا (شەڕمین) دەکات؟ یان چی دەکات لە ماڵی ئەوان؟ دواتر لە بیری خۆمدا وتم رەنگە کچی خۆی بێت بەر لە ماوەیەك هاتبووم بۆ سۆراخی دراوسێیەکیان پێی وتبووم لەگەڵ کچەکەی سەفەری کردووە، وا دیار بوو کچی خۆی بێت، ئیدی پاش چرکەساتێکی کورت کچە جوانکیلەکە لە سەر سینییەکی ستیل پەرداخێك ئاوی بۆ هێنام هەمیشە پێدەکەنی و ددانەکانی دەردەکەوتن، چەند قومێك ئاوم خواردەوە بڕیارمدا قسە بکەم نەبادا بڵێ کەڕ و لاڵم وتم: (خاتوو شەڕمین عەزیز لە کوێیە؟) پاش هەناسە هەڵکێشانێك و تفەقوتدانێك وتم: (ئایا ئەو تەندروستی باشە؟) بە زەردەخەنەوە وتی (بەڵێ بەڵێ دایکم زۆر باشە ها ها ها ها ها ها) ئیتر زانیم کە کچی خۆیەتی لە راستییدا جوانییەکی بێ ئەندازە لە رووخسار و بەدەنیدا هەبوو کە من شەرمم دەکرد تەواو سەیری بکەم، بەڵام بەدەنی لە بلووری چرا دەچوو بەر لەوەی من بدوێمەوە ئەو وتی: (من ناوم (پەریهان)ە، ها ها ها، ها ها ها ها) منیش وتم (ناوێکی جوان و خۆشە ناوەکە لە تۆدا رەنگی داوەتەوە) دواتر وتی: (بەڕێزت ناوت چییە، ها ها ها ها) من وتم (ناوم "شاپوور سوبحان" ە) (هەندێك کەس شاپووری خەزانم پێ دەڵێن) زۆر بە روونی کرایەوەو وتی (ها ها ها ها ناوێکی جوانە، من زۆرم حەز لە سینەمایە لە منداڵییەوە تەماشای فیلم دەکەم فیلمە هندیەکانم هەموو بینیووە زۆریشم حەز لە فیلمی میسرییە، ها ها ها ها) لە سەدایدا دەنگییکی زۆر ناسك و هاژەیەکی تاڤگەئاسا دەبیسترا، لە چاوەکانیدا لە جووڵانەوەی لێوەکانیدا نۆتەی مۆسیقا دەبیسترا، لە نیگایدا جوانی بەدی دەکرا دوا جار لە ژیانمدا بۆ یەکەمین جار هەستم کرد خۆشحاڵم بە ئاخاوتن لەگەڵ کچێکی لەو شێوەیەدا.

پاش نزیکەی پێنج خولەك مامۆستا (شەڕمین عەزیز) بە ژوور کەوت لە دەرگای دا وا دیار بوو لە ژوورەوە خۆی گۆڕی بوو ئەم جارە رووی گرژ نەبوو، جوانییەکی کەمێك کامڵانەی هەبوو پاشان حەپەسام، چونکە هیچی لە (شەڕمین عەزیز)ەکەی یەکەمین جار نەدەچوو کە بینیم.

(پەریهان جەلال) دەرچووی کۆلێژی زمان بوو. شارەزاییەکی تەواوی لە زمانی ئینگلیزیدا هەبوو ئەو زیرەکترین خوێنکاری کۆلێژەکەیان بوو بوو، یەکەم بووەو هەلی خوێندنی بۆ رەخسابوو لە ولاتی ئینگلیستان ماستەری تەواو کردبوو زۆر نەبوو گەڕابووەوە بۆ کوردستان بڕیاری دابوو دابمەزرێت و لە زانکۆ خزمەت بکات و چاودێری دایکیشی بکات.

ئەو زمانزانێکی بێوێنە بوو وەك ئینگلیزەکان قسەی دەکرد جگە لەوەی زۆر بە ئەزموونبوو لە زمانی ئینگلیزی دا زمانی عەرەبی زۆر باش دەزانی، هەروەها زمانی هیندی باش فێر ببوو فێربوونی زمانە بیانییەکان دەگەڕایەوە بۆ ئەو زیرەکییە لە رادەبەدەرەی کە هەر لە منداڵییەوە ئاشقی فیلمی هیندی و فیلمی میسری بوو زۆر بە باشی هەموو ئەکتەرەکانی ناسیبوو.

کچێکی قژ خورمایی چاوڕەشی ئەسمەر بوو هەر لە ئیسپانییەکان دەچوو بالایەکی مامناوەندی هەبوو کولمەکانی بەرز و چڕ و کەمەرێکی باریك بالایەکی رێك بێ ئەندازە و بێ وەسف جوان بوو.

لە یەکەمین دانیشتنم لەگەڵی هەستێکی سەیر سەراپای داگیر کردبووم من هەستم بە خیانەت دەکرد ئەگەر ئەوم خۆشبوویستایە، چونکە (شەڕمین عەزیز) بە تراژیدیا هاتبوو و نەیدەزانی کە دانیشتن لەگەڵ کچەکەی دەکەم، من بە نیازی ئەشق و حەز لێکردنەوە لەگەڵ (پەریهان جەلال) دانەنیشتم، هەمیشە دەیگوت: کەوا حەزی زۆری لە دنیای سینەما هەیە و دەیەوێت بەشداری بکات، هەر ئەوە بوو وەك رووداوێکی نوێ هاتە ناو کۆی باسەکان.

بە زمانێکی شیرین لەگەڵم دەدوا هەمیشە پێدەکەنی لە پێکەنینەکەیدا دنیا بینییەکی دیکەم هەست پێ دەکرد، بە دزییەوە خۆی خزاندە ناو چیرۆکەکە.

کۆی رووداوەکان وەك چڵی درەختەکان بە ئاسماندا چووبوون هەریەکە و لە گرێیەکدا بەوی تر و بەوی دوای خۆی دەگەیشتەوە و دواجار هەموویان لە یەك رەگ ئاویان دەخواردەوە، (پەریهان جەلال) ئەو کچە روحسووکە بوو کە دەبوو ببێت بە (سینەماکار)، رەنگە ببێت یان نەبێت نازانم روون نییە من هەمیشە وەك سەرخۆشەکان قسەم دەکرد و لە نیهانی خۆمدا گینگڵم دەدا و بە هەوراز و نشێوی زۆر ئاسیدا سەردەکەوتم، دواجار دەخزامە ناو خەرەندەی بێ بن و هەزار بە هەزار هەندێ جاران لە بیابانی خەیاڵمدا دەشتی کاکی بە کاکیم تەی دەکرد.

هەمیشە دوو مرۆڤ لە تروسکەی چاوی یەکتردا رادەمێنن، درەختێك یان دارێك دەبێتە کەسی سێیەم چادریان بۆ دەکاتەوە. لە پارکە نیمچە گەورەکەی شاری بابانەکان بۆ یەکەمین جار لەگەڵی دانیشتم ئەو سەرسام بوو بە دنیایەك کە من لە لێوارەکەیدا بووم ، ئەو بە هاتنی منی بەرەو دەریاکە پەلکێش کرد و ئاشنای کردم بە گولاڵەکانی بنی دەریا هانی دام کە لەسەر پێیەکانم

بووەستم دەیویست ببێتە دارئاسا بۆم، یان دەبوو ببێتە گۆپاڵ، هەمیشە خەونم دەبینی پیشەی مـن وەهابوو کە لەگەڵ یەکێك بە گفتار دەهاتم دەچوومە خەیاڵی قووڵەوە، ئەو دەیگوت: (باسی دنیـای سینەمام بۆ بکە، بۆچی دەچیتە ناو ئەو دنیایە؟ تۆ کارت بە چیرۆك چـییە؟ ئایـا دایکـم چـیرۆکی گرنگی لە لایە تۆ بیکرِیت؟) ئەمانە ئەو پرسیارانە بوون کە لێی کردم، ئاخر پرسـیاری زۆر قـورس بوون، من بەو پرسیارانە کەوتمە گریان کە فرمێسکەکانی دەبینی بە بێ ئەوەی هیچ بڵێ لەگەڵ من دەکەوتە گریانەوە، گریان هاورِێیەکی بە ئەمەکی ئادەمییە ئەگەر گریان نەدەبوو، ئەم گـۆی زەویـە بە کاری ژیان نەدەهات.

گریان ناخی بوونەوەرەکان پاك دەکاتەوە زەوی دەگری ئاسمان دەگری درەختەکان دەگـرین، گیـاو گوڵ و چۆلەکەو تەنانەت شێرو پڵنگەکانیش دەگرین، هەموو کەسـێك کـە دەبێتـە درِنـدەو بکـوژ رۆژێك لە رۆژان دەگری، گریان خۆشە ئەگەر گریان نەدەبوو هەست و سـۆزو بەخشـندەیی نـەدەبوو مرۆڤایەتی بە گریان هاتووە، من رێگری لە گریانی کەس ناکەم، (پـەریهان کوێسـتانی) وەك مـن دەگریا، پاشان چاوی خۆی سرِی و وتی(شاپوور بـۆ دەگریـت؟) ئـاخر دەبـوو بگـریم گریـان ژیـانی نووسیمەوە کەمێك هێمن بوومەوەو وتم (ئەو چیرۆکەی من لەدایکتی دەکرِمەوە دەمگریەنێ ئەگەر تۆش بزانیت دڵنیام زۆر زۆر بێ شوومار دەگریت) بە نیگایەکی خەمگینـەوە وتـی: (ئـەو چـیرۆکە چییە؟) وتم (دایکت بۆی باس نەکرد ویت؟) وتی (نەخێر نازانم، شتێکی وەهـا نـازانم) وتم (پـرِ لـە حەسرەت و داخ و ئاشووبە ئای لەو چیرۆکانە!) ژیان رۆیشت و هات و دێـت دیـاردە گـەلی سـەیر دروست دەکات کاریگەری ئەو رووداوانە هێندە جەرگ برِن من بە شێوەیەك دەمبینـی ئـەویش بـە شێوەیەکی دیکە هەر مرۆڤەو بە شێوەیەك لە کۆی شتەکانی مێژوو تێدەگات.

بەڵام وا دیار بوو (شەرِمین عەزیز) لە لای کچە تاقانەکەی هیچی باس نەکردبوو دواجار خودی خۆی لە ژیانیدا هێندەی کوێرەوەری وەپێش هاتبوو لە بیری ئەوەدا نەبووبوو بـۆ (پـەریهان)ی بـاس بکات، هەڵبەتە ئەو جارەی کـە چـووم بـۆ دیـداری (شـەرِمین عـەزیز) بـرواری وا نەرِەخسـا کـە (پەریهان) بە رووداوەکان بزانێت، ئەو بـە کـارێکی گـرنگ لـە مـاڵ دەرچـوو وەك وتم دەیویسـت دابمەزرێت وەك مامۆستای وانەبێژی ئینگلیزی ئیدی مـن لەگـەڵ (شـەرِمین عـەزیز) بـە گفتوگـۆ هاتبووم، هەر بۆیە (پەریهان) گوێ بیستی هیچ نەبوو لە وتەکانی نێوان من و دایکی.

لە سەرەتای چوونیان بۆ هەندەران بۆ چارەسەری پزیشکی و نـوژداری سـەرە داوێکـی بـە سانایی لەبارەی من بۆ کچەکەی باس کردبوو، بەوەی من چووم بـۆ لای بـۆ زانینـی چـیرۆکی سەیر و سەمەرەو تراژیدی ئامێز هەڵبەتە (شەرِمین عەزیز) بە هیچ شێوەیەك نەیـدەزانی کـە

من داوای باسی ڕووداوی ساڵانێکی پێشووتری لێ دەکەم داوای ڕووداوێکی لێدەکەم کە بیست و حەوت ساڵ لەمەو بەر ڕوویان دابوو، بەڵام چونکە کچەکەی تامەزرۆی سینەماو سینەماکاران ببوو بە وێنا وەسفی منی بۆ کچەکەی کردبوو هەر بۆیە کە یەکەمین جار دەرگای لێ کردمەوە دەمودەست منی ناسیبۆوە.

دانیشتنی یەکەمی من و (پەریهان جەلال) یەك کاتژمێری خایاند من هەندێك شتم بۆ باس کرد، کە نەدەبوو باسی بکەم، باسی هاوڕێیەتی مێژینەی (شەڕمین عەزیز) و (وەنەوشە)م بۆ کرد باسی کوڕێکم بۆ کرد کە جیاواز بوو بوویر بوو ئازا بوو بە ناوی (کامەرانی وەنەوشە) باسی (سەهەندی بایز ئاغا) و (ئاسمان خۆشناو) و (ئارووین ئیسحاق) و (بەهرۆز چاوڕەش)م بۆ کرد باسی (کاوە میرخاس) و گرووپی (دەستەسڕ بەدەستەکان)م بۆ کرد، بەڵام هەموویان بە کورتی هەڵبەتە ئەوم تووشی شۆك کرد، ئەو هەر پاش ماوەیەك دانیشتن خێرا خواحافیزی لێ کردم و ڕۆیشت، تاکو دوو هەفتە نە تەلەفۆنێك کرا نە هەواڵێکیشم لە بارەیەوە بیست.

زۆر سەیر لە جێگەی خۆم هەستام و تاسام، بە ڕاستی مامۆستا (شەڕمین عەزیز) کە لە دەرگای دواوە هاتە ناو هۆڵی دانیشتنەکە بە ڕوویەکی خۆشەوە هیچ لە (شەڕمین عەزیز)ەکەی یەکەمین جار نەدەچوو، بەڵام هەندێك ئاسەواری هەبوو بەوەدا ناسیمەوە، دیمەنی چاوو بڕۆی نەگۆڕابوو، بەڵام ئاسەواری سووتاوی و برینداری بە ڕوخسار و دەستوگیانییەوە نەمابوو.

بە دەنگییکی کەمێك نزم فەرمووی لێکردم کە دابنیشم، بە ئەسپایی هات و لەبەرانبەرم دانیشت، مەکسیەکی شینی کوودەری لەبەردابوو، دیمەنی پیری تەواو لە جەستەیدا دەرنەکەوتبوو، پاش وچانێك و کەمێك زەردەخەنەی نێوان هەردووکمان من لە هەواڵی تەندروستی ئەوم پرسی پێم گوت کەوا ماوەیەکی زۆرە من بەردەوام لە سۆراخی تۆدا بووم و هەواڵێکم دەست نەکەوتووە، لە وەڵامدا وتی: (تەندروستیم باشەو هەست بە ئارامی دەکەم)، وا دیار بوو من نەمدەویست لە یەکەمین دانیشتنم لەگەڵی هەموو ڕووداوەکان بزانم، بەڵام چوونەکەم وای دەخواست سەرەتا هەندێ شت بزانم و دواتر بە چەند سەردانێك تێکڕای ڕووداوەکانم بۆ بەیان بکات.

ئەوەی لە لای من گرنگ بوو پەیوەندی نێوان (وەنەوشە) و (جیهانگیر سەرحەد) بوو کە چۆن یەکتریان ناسی و ماوەی سێ ساڵ خۆشەویستی چۆن بووە؟ من سەرەتای یەکترناسینەکەم دەزانی، بەڵام هەندێك وێنەو دیدار لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا ڕوویان دابوو، کە پەیوەندیەکەی گەرموگوڕ کردبوو، من بێ خەبەر بووم لێیان و نەمدەزانی و دەبوو بیان زانم، چونکە دوو هاوڕێی زۆر نزیك لە

یەکتر بە نهێنییەکانی ژیانی یەکتر دەزانن ئەگەرچی ئەو رووداوانەی کە بە سەر ژیانی (شەرمین عەزیز) دا هاتبوون کەم نەبوون، بۆ سڕینەوەی هەموو دیمەنە کۆنەکان، بەڵام دەبوو هەندێك شتی لەبیرمابێت دواتر بە ئەمانەتەوە زۆر شتی لەربارەی ژیانی خۆی بۆ باس کردم.

یەکسەر چوومە ناو باسەکەوەو ئەوەم پێ گوت کە دەبوو پێی بڵێم، لە سەرەتا هەندێك راماو گوتی (ئای لەو رۆژگارە سەیرانە!)، بەڵام بەر لە وەڵام دانەوەی وتی (تۆ چۆن دەزانیت ئێمە هاوڕێی کۆنی یەکتر بووین؟) ئەم باسە لە لای من گرنگ بوو وتی (بۆچی ئەم رووداوانەت دەوێ، تۆ چی ئەو خێزانەی؟) من دەبوو راستگۆبم تێمگەیاند کە من هاوڕێی کوڕەکەی (وەنەوشە) (کامەرانی وەنەوشە)م ئەو کوڕەی کە بەگەنجی مرد و ژیانی درێژە پێنەدا، کە ئەم شتانەی لە زمانی منەوە بیست دەمودەست گریا فرمێسك بە روومەتیدا هاتە خوار بە روخساری تازە نەشتەرگەری کراویدا هاتە خوار، بە شێوەیەك نەشتەگەری کرابوو، کە زۆر جوان ببوو، بەڵام گریا زۆر گریا.

پاش نزیکەی دە خولەك لە گریان من هەر تەماشام دەکرد، لەو سەردەمەی کوردستاندا یان بە درێژایی مێژوو کورد بە هۆی هەموو نەهامەتییەکانەوە هەموومانی فێری گریان و سۆز کردبوو، بەڵام بەدەر نەبووین لە روحی شەڕاشۆیی و توندوتیژی و توندڕەوی، هەموومان بە شێوەیەك رەق و بە شێوەیەك نەرم بووین، دوای کۆتا هەنسکەکانی وتی: (وەنەوشە هاوڕێیەکی زۆر نزیکم بوو یان وەك خوشکی خۆم تەماشام دەکرد، زانیم کە مردووە نزیکەی بیست و پێنج ساڵێك لەمەوبەر گیانی سپارد ئەو هەواڵەم زانی گازی کیمیایی کوشتوویەتی، ئەو لە زاکیرەمدا چەسپاوەو هەرگیز لە یادم ناچیتەوە، دەشمزانی کوڕێکی بووە، بەڵام ئیتر لەوەو دوا من هیچ هەواڵێکم لە بارەیەوە نەزانیوە، ئای خوایە گیان ئەم رووداوانە بۆچی هاتن؟) من کە یەکەمین جار لە قوتابخانەکە ئەوم بینی نەمزانی، کە (شەرمین عەزیز) بەم شێوەیەی ئێستا میهرەبانە، سەرەتا بە کەسێکی تووڕە و رەقم دەهاتە بەر چاو، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە وا نییە و زۆر میهرەبانە.

ئەو وتی (لەبەر ئەوەی تۆ گرنگی بەو رووداوانە دەدەی و سوێندم بۆ بخۆ کە راستگۆ و بە ئەمەك بیت ئەوا من زۆر شتت بۆ باس دەکەم، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی کە لە نووسینەکانتدا هەیەو دەتەوێ بیانکەیتە فیلم).

زۆر بەو وتانەی ئاسوودە بووم هەر بۆیە بەڵێن و سوێندم بۆ خوارد کە بە ئەمەك و دڵسۆز بم لە راستییدا من لە ژیانمدا فێری خیانەت و ناپاکی و درۆ و شتگەلی خراپ نەببووم ئەو ساڵانەی کە

لەگەڵ (کامەران) هاوڕێ بووم فێری ئەوە ببووم کە خەڵکم خۆش بوویت و هاوکار و دڵسۆزی هەموان و وڵاتەکەم بم هەمیشە لە بیری یارمەتیدانی هەژاراندا بووم.

بەڵام دەبوو سوێند بۆ (شەڕمین عەزیز) بخۆم، ئەوەبوو ئەویش پاش دڵتەنگیەکی زۆر، پاش تێپەڕینی کاتژمێرێك یان زیاتر، باسی یەکەمین ناسینی ئەو دوو ئاشقەی بۆ کردم، باسی پێشانگاکە و پەیکەرە سەرنجڕاکێشەکەی بۆ کردم ئەو ناوی پەیکەر و شێوەکەی بە تەواوی لە بیر نەمابوو، زوو زوو رادەوەستا و ئینجا دەستی پێدەکردەوە، باسی ئەوەی کرد کە لە یەکەمین دیمەنی بینینی پەیکەرەکە (وەنەوشە) لەهۆش خۆی چووە و ئەوەندە سەرنجی پەیکەرەکەی دابوو، هەستی بە گێژ بوون و دابەزینی فشاری خوێن کردبوو، دوا جار بڕیاری کڕینی ئەو پەیکەرە سەرنجڕاکێشەی دابوو، بەڵام پاش ئەوەی خاوەنەکەی (جیهانگیر سەرحەد) وتبووی کە گوایە بۆ فرۆشتنەوە نییە، ئەویش پێداگریی کردبوو، ئیتر لەوەوە یەکتریان ناسی بوو، دواتر لە بن درەختێکی گەورەی حەوشەی هۆڵەکەدا دانیشتبوون و یەکەمین یەکترناسین بەو شێوەیە بوو، دواتر بۆ چەندین جار (جیهانگیر سەرحەد) لە شاری (سێوان)ەوە هاتبوو بۆ ژوانی (وەنەوشە) و نزیکەی سێ ساڵ پەیوەندی خۆشەویستی دروست ببوو، ئەو دەیگوت: (لە رادەبەدەر یەکتریان خۆشویستووە روحیان بە بێ یەکتر نەدەسرەوت) هەر لەو ساڵانەدا بە چەندین ناسۆرو ناخۆشییدا تێپەڕیون و کێشە گەلی زۆر پێشیان هاتووە، (شەڕمین عەزیز) دوورو نزیك لە زۆربەی شتەکانیان ئاگادار بووە، چونکە (وەنەوشە) زۆر شتی بۆ هاوڕێ خۆشەویستەکەی باس کردبوو تەنانەت باسی ئەوەی کرد کە لە لایەن رژێمەوە سووکایەتیان پێ کراوەو (جیهانگیر سەرحەد) تووشی لێدانی زۆر بۆتەوە، ئەو ساڵانە سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵێك رووداوی تراژیدی بوون کە ئاسەواری بۆ هەمیشە لە سەر خەڵکی کوردستان نابڕێتەوە.

(شەڕمین عەزیز) باسی ئەوەی کرد کە لە سەردەمی گەنجیاندا دوو کچۆڵەی هەرە ناسك و نازداری شار بوون کە لە پەیمانگا دەیانخوێند تاکو ببنە مامۆستا زۆر چاویان لەسەر بووە، هەمیشە لە ئاهەنگەکاندا خەڵکانێکی زۆر سەرنجیان داون، لەو سەردەمەیشدا رژێمی بەعس و چڵکاو خۆرەکانی لەوپەڕی داوێنپیسیدا دەبن و هەمیشە دەیانەوێ ئاسکی ئەوها جوان بە هەر شێوەیەك بێت راو بکەن، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی (شەڕمین عەزیز) ژیانی لێ دەشێوێت.

رۆژێك (جیهانگیر سەرحەد) لە شاری (سێوان)ەوە دێت بۆ ژوانی (وەنەوشە) دوای یەکتر بینینیان بڕیار دەدەن پێکەوە بڕۆنە یەکێك لە سەیرانگاکان بۆ بەسەر بردنی چەند کاتێکی خۆش، بەڵام رژێم ئەوانەی بەرژەوەندییانە بەوەوە گرێ داوە و لە هەموو سەردەمانێکی مرۆڤایەتیدا

بوونیان هەیەو هەمیشە درووست دەبن، ئەوانەی بە خۆشی هاولاّتیانی ئەم شارە پەست دەبن و هەمیشە لە هەولّی سەرکوت کردنی خەلّکدا دەبن، بە بیانووی ئەوەی کە (جیهانگیر سەرحەد) لە شارێکی دیکەوە هاتووە و کاری سیخوڕی بۆ پێشمەرگە دەکات، دەسگیری دەکەن، ئیدی بۆ ماوەی نزیکەی شەش مانگ بێ سەرو شوێن دەبێت پاش لێدانی زۆرو چەوساندنەوە و داخ کردن و لێدانی کارەباو هەزاران جۆری سزادان، هیچ بەلّگەیەك نادۆزنەوە بۆ مانەوەی لە زیندان بۆیە ئازاد دەکرێت، بەلاّم ئازاری زیندان و لێدان هیچ هیوایەك ناکوژێت بۆ کوژانەوەی خۆشەویستی بۆ کورد و (وەنەوشە) و هونەرەکەی دوای ئازادکردنی چەند پەیکەرێك لەبەرد دادەتاشێ، کە هەموویان ئاماژە بە ئازارەکانی زیندان دەکەن، ئەو دەیەوێت لە رێگەی هونەری هەلّکۆلّین و پەیکەر تاشی و سیرامیکەوە ئازارو ناسۆری نەتەوەیەك بەیان بکات، بەلاّم هەر زوو رژێم جارێکی دیکە دیلی دەکەن تاکو روحی ئافراندن لەم مرۆڤەدا بکوژن، بەلاّم هەولّ و تەقالای (وەنەوشە) بۆ سۆراخ کردنی بێ ئاکام دەبێت، گەڕانی (محۆل شەلەنگ) و کۆکردنەوەی زانیارییەکان بە ئەنجام ناگات، لە زۆرێك لە گەڕانەکاندا سەرانی رژێم سووکایەتی بە (وەنەوشە) دەکەن زۆرێك لەوان بە چاوی تەماعی ناموسەوە تەماشای دەکەن و هەولّی ئەوە دەدەن لێی نزیك ببنەوە، بەلاّم جوامێری و سەربلّندی (وەنەوشە) چۆك بە هەموو ئەو هەولاّنە دەدات.

(جیهانگیر) ناخۆشترین رۆژەکانی ژیانی لە زیندانە ترسێنەرەکاندا بەسەر دەبات لە تاریکییدا بە جرج و مشك و خشۆکەکان ئاشنا دەبێت بە دنیایەکدا گووزەر دەکات لە دنیای ژێرەوەی ئادەمیزاد دەچێت بۆ ماوەی هەشت مانگی دیکە رووناکی بە چاو نابینێت لە زولّمەتی دۆزەخدا هەزاران وێنە دێنە بەرچاوی وەك مرۆڤی کۆنی نیاندەرتالّ ریش و قژی دێتە خوار و لاواز دەبێت، لە سەردەمێکی وەهادا کە هونەر دەبێتە سەرمایەی مەرگ و بە دنیای ژێرەوەت ئاشنا دەکات هەمیشە لە تاریکییدا بۆشاییەك دێتە پێش بۆ سەرهەلّدانی رووناکی ئیدی تاریکی خۆی لەبەردەم تەنیا تروسکەیەکی بچووکیشدا ناگرێت، دواجار چاوەکانی (جیهانگیر) ململانێ لەگەلّ تاریکییدا دەکات جەنگی تاریکی بە سەر رووناکییدا لەوە زیاتر درێژە ناکێشێت، لە لایەن یەکێك لە ئەفسەرە گەورەکانی رژێمەوە کە یەك گەردیلە سۆز لە دلّێدا چەکەرە دەکات داوای دروستکردنی پەیکەرێکی لێ دەکرێت لەبەرد، هەلّبەتە بە بێ کەرەستەو ئامێری تایبەت کارێکی وەها وەبەرهەم نایەت ئەو ئەفسەرە لە خۆشەویستییدا دەبێت لەگەلّ ئافرەتێکی عەرەب کە وێنەکەی لە گیرفانی ئەفسەرەکەدایەو بە تواناکانی هونەرمەند دەزانێت لە (جیهانگیر سەرحەد) رادەبینێت کە

پەیکەرێکی لەبەرد بۆ دروست بکات تا بیکاتە دیاری بۆ خۆشەویستەکەی ئیدی بە (جیهانگیر سەرحەد) دەڵێت کەوا هەرشتێك پێویستە داوا بکە تا بۆت بهێنم بۆ ئەنجام گەیاندنی پەیکەرەکە.

تەنیا بزمارێکی پۆلا لە تاریکییدا دەرگای رووناکی لە (جیهانگیر) دەکاتەوە، بۆ دووبارە ژیانەوە، ئەو لەو ماوەیەی لە زینداندا بوو بە بزمارێکی پۆلا لە سەر دیوارەکان شەوان نەخش و نیگاری ناوازەی کێشاوە کە لە هەڵکۆڵینی سەردەمی فیرعەونەکان و هەرەمەکان دەچێت، بەڵام لە تەکنیکدا نەك لە فۆرمدا، ئەوان شتگەلی سەردەمی خۆیان لە سەر دیوارەکانی پەرستگاو هەرەمەکان وێنا کردووە، ئەویش وەك هونەرمەندێکی کۆیلە وێنای خۆشەویستی و ئازاری گەلێکی لە سەر دیوارەکان نەخش کردووە.

لە کاتی هاتنی ئەفسەرەکەدا کە پیاوێکی بە هەیبەتی رەشتاڵەی گەورە بوو لە سەر دیوارەکان وێنەکان دەبینێت و دەزانێت کە ئەمانە کاری (جیهانگیر) هەر بۆیە یەك تۆز هەستی جوانی لە روحی ئەفسەرە پایە بڵندەکەدا دەبێت، هەر مرۆڤێك حەزی لە جوانی و مۆسیقا و وێنە و هونەر و ئەدەب کرد دەگمەنە دڕندەیان لێ دەربچێت دواجار مرۆڤی وەها رووناکی لە ناخیدا گەشە دەکات.

داوا لە (جیهانگیر) دەکات پەیکەرێکی لەبەرد بۆ دروست بکات کە وەك وێنەکەی گیرفانی بێت ئەو ئافرەتە عەرەبە رەش ئەسمەرەی خۆشەویستی ئەفسەرەکە دەبێت، (جیهانگیر) کە زۆر لەوە لاوازتر دەردەکەوێت بتوانێت ئەو کارە زوو تەواو بکات بەرانبەر بە ئازادی خۆی بەڵێنی کارەکە بە ئەفسەرەکە دەدات، زۆرجار بەهرەو هونەر مرۆڤ لە گێژا و مەرگ رزگار دەکەن، هەندێك شتی تایبەت هەیە بۆ کارەکانی دەبێت ئەفسەرەکە بۆی پەیدا بکات وەك کەرەستەی هەڵکۆڵین و چەکوشوپواز و قەڵەم و چەندین شتی تری وەك فڵچەی نەرم و زبرو چی و چی.

لەگەڵ چەند دانە لەبەردی تایبەت بە ئیشەکە، لە ژێر رووناکی هۆڵێکی داخراودا (جیهانگیر)ی لاوازو ریش هاتوو دەست بە کار دەکات شەو و رۆژ، لە ژێر نووری گڵۆپێکی زەردی گەورەدا لەسەر مێزێکی تەختە دەست بە شکاندنی بەرد دەکات، پاش ماندووبوونێکی زۆرو تێڕامان لە وێنەکە شێوەیەکی راستەقینەی وێنەکە دێنێتە ئاراوە بە شێوەی سێ دووری نەك وەك وێنەکە دوو دووری هەبووە، بەردەوام ئەفسەرەکە سەردانی دەکات، بەڵام لە دوا دوای ئیشەکەدا چەکوشێکی پێدا دەکێشێت و لەناوەڕاستدا دەبێت بەدوو کەرتەوە.

بە بینینی ئەوە ئەفسەرەکە شێتگیر دەبێت، بەڵام ناتوانێت (جیهانگیر) بکوژێت هەر بۆیە (جیهانگیر) لە سەر بەردی دووەم دەست دەکات بە کارکردن بە دوو مانگ و شەونخونی زۆرو ماندووبوون و بوورانەوە پەیکەرەکە تەواو دەکات، ئەفسەرەکە خۆشحاڵ دەبێت و (جیهانگیر)

ئازادی دەباتەوە، بەرەو رووناکی دێتە دەرو بە (وەنەوشە) دەگاتەوە، ئیدی (وەنەوشـە) بـاوەش بـۆ خۆشەویستی (جیهانگیر) دەکاتەوە.

(شەرمین عەزیز) زۆرێك لەو رووداوانەی لە یاد مابوو، تەنانـەت باسـی ئـەوەی کـرد کـە لـە سەرەتای سـاڵی هەشـتاکاندا لەوپـەڕی جوانیـدا لـە تەمـەنی بیسـت و سـێ سـاڵیدا مێـرد بـە دڵخوازەکەی خۆی دەکات دوای ساڵێك لە شوکردنەکەی (پـەریهان جـەلال)، سـاڵی ١٩٨١ دێتـە دنیاوە، بەڵام بە حوکمی ئەوەی شەوێك دوو هاوڕێی مێردەکەی لە چیاوە دێـن و لـە مـاڵی ئـەودا دەمێننەوە جاسووس و سیخوڕەکانی رژێم بەوە دەزانن و لە تاریکایی نیوەی شەودا ئاگر لە ماڵیـان بەر دەدەن و (شەرمین عەزیز) و منداڵە ساواکەی لەگەڵ هاوڕێی مێردەکەی بە برینداری لە پشـتی ماڵەکەیانەوە هەڵدێن و بەرەو چیا دەڕۆن و مێردەکەیی و هاوڕێکەی تری لە ماڵەکەدا دەسووتێن و دەمرن، ئیدی (شەرمین) و (وەنەوشە) لـە یـەکتری ون دەبـن، ئـەو کاتـە (وەنەوشـە) مێـردی بـە (جیهانگیر) کردبوو و بەرەو شاری (سێوان) سەفەری کردبوو.

دوای ئەوەی (جیهانگیر) و (وەنەوشە) بە یەکتری شـاد بوونـەوە، هـەر زوو (جیهـانگیر) داوای هاوسەرگیری لە (وەنەوشە) کردو، داخوازی لە باوکی (وەنەوشە) کـرد و مێـردی بـە (جیهـانگیر) کرد، ئەو دەمە (وەنەوشە) ببوو بە مامۆسـتا، ئەگەرچـی (مـەحموود شـەلەنگ) و (دولبـەر داود غولام) تەنیا کچێکیان هەبوو زۆر نازدار و خۆشەویست بوو بە گریانەوە سپاردیان بە (جیهـانگیر)، داوایان لێ کرد بوو کە ئەو کچە لە ئەستۆی ئەودایە، باوکی (وەنەوشـە) وتبـووی (کوڕەکـەم ئـەم کچەم بە تۆ بەخشی ئەگەرچی ئەو پارچەیەکە لـە روحـی ئێمـە دەبێـت تـۆش وەك روحـی خـۆت بیپارێزیت) (جیهانگیر) هێندە شێتانەو دەروویشانە ئاشقی (وەنەوشـە) ببـوو، لـە نیهـانی خۆیـدا رۆژێك بە خەیاڵییدا نەهاتبوو دەست لە ئەشقەکەی هەڵگرێت، بەڵام هـیچ هێزێـك نییـە بتوانێـت لەبەردەم داهاتوودا بووەستێت، کە زەمەن دەڕوات چەندین رووداو و پێشـهاتی سـەیر دێنـە پـێش لەدەستی مرۆڤدا نییە و ناکرێت بگەڕێنرێتەوە، هەڵبەتە پەیوەندیـە کەماڵیەکـەی نێوانیـان زۆر لـەوە کورتتر بوو بپێورێت، بەڵام بەرهەمێکی هـەبوو (جیهـانگیر) نزیکـەی سـێ سـاڵ لـە خۆشەویسـتی (وەنەوشە)دا بوو، بەڵام لە هاوسەریدا کەمتر لە ساڵێك، (جیهانگیر) سەفەرێکی بە زەمەندا کـرد بـزر بوو، لە جەنگدا بزر بوو نەگەڕایەوە. ئەو دەمەی ئەوان دەیانویست لە روحیاندا چرایەك هەڵبکـەن تـا ئەبەد نەکوژێتەوە، چرایان هەڵکرد و چراکە نەکوژایەوە دەسـتاو دەسـتی کـرد و بـوو بـە ئەفسـانە و داستانگەلی سەیر و کارەساتبار.

(وەنەوشە) لە سەرەمەرگدا کتێبێکی بەرگ وەنەوشەیی و منداڵییکی بە (جانۆ سەرحەد) بەخشی و تکای لێکرد بیان پارێزێت، روحەکان بەرز دەبنەوە و لە بڵندایی ئاسمان دا لە بەهەشتدا جێگایـەك بـۆ خۆیان دەبیننەوە.

ڕووداوەکان زۆر مەزنتر بوون کە لە دێڕەکانی کتێبدا جێگایان بۆ نادۆزرێتـەوە (شـەڕمین عـەزیز) هەموو شتەکانی مێژووی رابردووی بەبیر نەمابوو، زاکیرەی بۆ من خاڵی دەکردەوە دواتـر، لـە جـاری یەکەمدا لە یەکەمین دانیشتندا هەندێك لە رووداوەکانی بۆ بەیان کردم، منیش لـە سـەر کاسـێتێکی ریکۆردەر تۆمارم کرد ئەو بۆم دەدواو منیش پرسیارم لێ دەکرد، لە راسـتییدا لـە رێپۆرتـاژ و دیمانـە دەچوو کە رۆژنامەنووسەکان دەیانکرد و دواجار وشە دەنگییەکانیان تۆمار دەکردەوە لە سەر کاغـەزو پێیان دەووت (پاکنووسمان کردووە) منیش هەمان رۆڵم دەبینی، لە جارەکانی تردا کە دەچـوومەوە بـۆ ماڵی (شەڕمین عەزیز) وردە وردە تەواوی رووداوەکانی رابردووی بۆ دەوتمەوە سەرەنجام چەندین بەڵگەی باشم دەستکەوت و کەلێنەکانم پێ پڕ کردەوە.

(جەلال کوێستانی) یان روونتر (جەلال خوارەحم) کە بـە (جـەلال کوێسـتانی) ناسـرابوو نازنـاوی سەردەمی خەباتی رزگاری خوازی کورد بوو، ئەو پیاوەی لە ژێرەوە لە شانەکانی ناو شاردا کاری دەکرد بۆ شۆڕش و نامەو بەڵگەو هەواڵەکانی ناو شاری دەگەیاندە چیا و نامە و پەیامەکانی چـیای بـە نـاو شاردا بلاو دەکردەوە، پیاوێکی بە ویقاری جەماڵ جوان، پیاوێکی هەیکەلی بوو، فەرمانبـەر بـوو لـە یەکێك لەبەرێوەبەرایەتیەکانی ئەوسای ناو شاروو لە ژێرەوەڕا کاری بۆ خەباتی تـازەی کـورد دەکـرد و داڵدەی هاوڕێیانی شاخی لە ماڵەکەیدا دەدا هەمیشە وتبووی (نیشتمانێك بەو گەورەو مەزنییە لایەقی ئەوەیە بەندە بچووکەکانی وەك ئێمە ببینە فیدای) فیـداکاری ئـەو بـە برینـداربوون و سـووتاندنی تـا توانەوەو بوون بە خەڵووز کۆتایی هات تەنانەت پارچە زەوییەکیش نەبوو ببێتە لانکەی هەرزوو روحـی ئاوا بوو جەستەشی بوو بە خۆڵ و تۆزی ناو کەلاوەکان.

ئەوە روحی بەرزەفڕی (جەلال کوێستانی) بوو کـە بـەرگری لـە شـەڕەفی خـۆیی و شـەڕەفی دوو هاوڕێکەی دیکەی دەکرد، بەڵام لەو دوو هاوڕێ دێرینەی کە لە شاخەوە هاتبوون یەکێکیان لەگەڵی بە شەڕەفەوە شەهید بوو، شەهید ئەو وشە پڕ لە پیرۆزییە بوو کە لە کولتووری ئێمەدا بەرز دەنرخێنـدرا، بەڵام روحی زۆر لەو شەهیدانەی بە درێژایی مێژوو خوێنی خۆیان بە سەر زەوییە پیرۆزەکەدا رژاندبوو بە هەدەر چوو، ئەوان بوونە سنبوولی رزگاری بۆ هەزاران کەمتیاری شەویلگە بـەهێزی دوای ئـەوان کـە دەمیان لە جەستەی خەڵك گیر کرد و بۆ زەمانێکی دیکە تێرنەدەبوون و شەوو رۆژ جەستەی خـەڵك و شەهیدو منداڵ و پیرو و ژن و کچی جوانکیلەیان دەخوارد دەمیان لە پارەو سامانێکی زۆر گیر کـرد و

بوونە خاوەنی سەدان کۆمپانیا و ڤێللاو کۆشکی گەورە و باخ و باخاتی گەشتیاری و سەردەمانێکی زۆر وەك فیرعەونەکان ژیان.

لە دوای یەکەمین دانیشتنم لە مالّی (شەرمین عــەزیز) زۆر رووداوی رابــردووم چــنگ کــەوت زۆر ژیرانە هەموو رووداوەکانی رابردووم لە سەر کاسێتەکە گواستەوە بۆ ســەر کاغــەز و بــە دەســتنووس هەمووم پاکتاو کرد و کارم لە سەر کرد تا لەگەڵ رووداوەکانی دیکەدا بە یەکیانەوە ببەستمەوە ئیــدی من وەك هاورێی ئەو خانەوادەیەم لێهات و هەر زوو ئاشنابووم پێیان، دوای دوو هەفتــە لــە یەکــەمین دانیشتنم لەگەڵ (پەریهان جەلال) تەلەفونێکم بۆ کرا، کیژێکی دەنگ ناسك سلاّوی لێ کردم و یەکسەر مەزەندەی ئەوەم کرد کە (پەریهان جەلال) بێت هەر ئەو بوو، بە دەنگییکی نزم و ناسك، بەلاّم بە بــێ پێکەنین هەوالّی کارەکانی لێ پرسیم و دەستخۆشی لێ کردم دوای چاك و چۆنیکردن وتی (شاپوور من تەنیا بۆ هەوالّپرسین تەلەفۆنم بۆ کردوی، چونکە هەوالّم نەدەزانیت).

من سپاسی پەرۆشی ئەوم کرد و ئاماژەم بەوەدا کە سەرقالّی کاری تایبەتم، دەبوو لــەو ماوەیــەدا کاروبارەکانم رێك بخەم و سەفەرێك بۆ ئەوروپا ئەنجام بدەم، چونکە لەوێ کۆمەلێك گەلاّڵە هەبوو دەبوو کاری لەسەر بکەم، بەلاّم پرۆژەکەشم لە کوردستان بەرەو پێش ببەم، هەرچۆنێك بێت زۆر ماندوو بــووم ئەگەرچی زۆر شەو نەدەنووستم، بەلاّم کارەکانم زۆر کەڵەکە ببوون.

پاش ئەوەی سەفەری ئەوروپام کرد و ماوەی مانگێك لەوێ بووم کارەکــانی ئــەوێم راپەڕانــدو بــە ئەنجامم گەیاندن گەڕامەوە لەو ماوەیەدا بە هیچ شێوەیەك نەکاتم هەبوو تەماشای ئینتەرنێت بکــەم و هەوالّی کوردستانم نەدەزانی بە هەموو شێوەیەك پەیوەندیم بە هیچ کەسێکەو نەکرد لە کوردستان دواتر گەڕامەوە و کوردستان ئامێزی بۆ کردمەوە، لە راستییدا هیچ ولاّتێك وەك کوردستان بریندار نەبوو ئەو ولاّتێك بوو ئامێزی بۆ هەموو کەس دەکردەوە پنتێکی ئەم گۆی زەویە بوو لــەوانی دیکــە نەدەچــوو، هەمیشە کە دەگەڕامەوە تێر بۆی دەگریام ولاّتێك بوو بریندارو نەخۆش بە چەندین شــەڕو کاولکاریــدا هاتبوو سەرەنجام کۆمەلێك کاپتن بەڕێوەیان دەبرد کە هەموویان نەزانانە لەنگــەریان لــەناو کۆمــەلێك کێشمەکێشی سەیرو سەمەرەی ناوخۆیدا کردبوو، بازیان دەدا بەرەو گەرووی دڕنــدەکانی دەریــا بــەرەو خەرەندە هەزار بەهەزارەکانی فەوتان بەرەو قوولاّیی دۆزەخ، ژیان وای لێهاتبوو ناخۆش و پڕ لە ناسۆرو زامداری و تۆفان، دواجار ولاّت لە بیابانێك دەچوو تینوو بە ئاوی ژیانەوە.

لە شــەوێکی هــێمن و بێدەنگــدا لــە فرۆکەخانــە دابــەزیم، شــار خــامۆش تروســکەی گڵــۆپ و رووناکییەکانی شار کەم ، کەمتر لە روحە شادەکانی شار، بەرەو ماڵ بەرێ کەوتم ماندوو مانــدوو لــە دەرگای مالّم داو باوك و دایکە پیرەکەم و براکەم بەدەرکەوتن. هەمیشە باوەشیان بۆ من والاّ بوو، بەلاّم

تەواو خەمبار بوون بەو ژیانە دێوانەئاسایەم و دەیانزانی لە لێواری مەرگدا گینگڵ دەدەم. هەردەم دەیان وت (وازبێنە بۆ تاوێك بسرەوە) من لەوە سەرسەختترو سەرکەشتر بووم کۆڵ بدەم بە ئاسـکێکی چـیای عەجول دەچووم کە لەمبەر بۆ ئەوبەری بەردەلانەکان بازم دەداو هەندێك جار لـە مـردن دەگەڕامـەوە. ماوەی دوو رۆژ یەك تەختە نووستم و لە ماڵ نەهاتمە دەر ئەو دەم سیخوڕەکانی دەسەڵات راپۆرتیان لە سەر هەموو شتێك دەنووسی تەنانەت دەبوو بزانن لە رۆژێکدا چەند لیتر ئاو دەخۆیتەوە، وردو درشـت کارەکانی منیان تۆمار دەکرد.

لە یەکەمین دیدارم لەگەڵ (شەڕمین عەزیز) لە ماڵی خۆی سوێندم بۆ خواردبوو کە بە ئەمانەتـەوە مامەڵە لەگەڵ رووداوەکان بکەم، دەبوو پەیمانی خۆم بپارێزم، بۆ بەیانییەکەی زەنگـم بـۆ لێـدان و لـە هەواڵی خۆیی و کچەکەی (پەریهان)م پرسی وەڵامی دامەوە و لەربارەی من پرسیاری ئەوەی کرد کە بۆ نادیارم لەو ماوەیەدا لە کوێ بووم، بەوم وت کە لە سەفەر بووم لە ئـەوروپا و هەنـدێك کـاری گـرنگم هەبووە، بانگێشتی کردم بۆ نانخواردنی ئێوارە لە ماڵی خۆیان، دەبوو بچـم، چـونکە لـە دوا دیـداردا هەموو رووداوەکانی بۆ بەیان نەکردبووم.

کە ئێوارە داهات بەر لە بانگی ئێوارە لە ماڵ هاتمە دەر بە سواری تەکسیەك بەرەو ماڵیـان بـەڕێ کەوتم. ئێوارەیەکی گەرمی هاوین بوو. بە کراس و پانتۆڵێکی رەشەوە کە لە چەند سـاڵی رابـردووەوە زۆربەی کاتەکان لەبەرم دەکرد واتە رەنگی رەش ببوو بە هاوڕێم و بۆ هەمیشە خۆشم دەویست لەبەردەم ماڵیان دابەزیم و لە زەنگم دا پاش چەند چرکەساتێك خانمی (شەڕمین عەزیز) دەرگای کردەوە، سـڵاوم لێ کرد و فەرمووی لێ کردم چوومە ژوور. گەلێك گەرمام بوو پەرداخێك ئـاوی سـاردی بـۆ هێنـام خواردمەوە. چاوم دەگێڕا (پەریهان) لەوێ نەبوو دیارنـەبوو دەنگـی نەدەبیسـترا، هەڵبەتـە مامۆسـتا (شەڕمین عەزیز) بە تەنیا دەژیا، من سەرەتا پرسیاری ئەوم کرد بۆچی تەنیا دەژی ئەو رایگەیانـد کـە کەسوکاری زۆربەیان لە ئەوروپا دەژین، زۆربەشیان مردن و لە ژیاندا نەماون و هەندێکیان ئەنفال کراون. من نەمتوانی هەواڵی (پەریهان)بپرسم من و (شەڕمین عەزیز) لە سەر ئێوارە خوانێکی گەورە کە دەبوو بۆ چەند کەسـێك ئامـادە بکرێـت دانیشـتین. چـەندین خـواردنی خـۆش و رۆژهـەڵاتی و ئـەوروپی ئامادەکرابوو، من زۆر خۆرێکی بێوێنە نەبووم، نانم خوارد بە پێی پێویست پاش درەنگانێکی شەو دوای ئەوەی زۆرمان قسە کرد لە سەر زۆر بابەت و زۆر شتی دیکەی بـۆ بـاس کـردم، مـن تـەواو تاسـام، دەموچاوم ئارەقی دەکرد بەوپەڕی ماندووییەوە هەستام و ماڵئاوایم کرد لە کاتی هاتنـە خـوارەوەم بـە قادرمەکاندا دەرگام کردەوە و (شەڕمین عەزیز) وەك نەریتێکی کوردەواریانە تا بەردەرگا لەگەڵم هـات بۆ خواحافیزی.

لەو ساتەدا ئۆتۆمبیلێکی جۆری مارسیدسی رەش لەبەردەم دەرگاکەیان وەستاو رووناکی لایتەکان تەواو ئەو ناوەی رووناك کردبۆوە، (پەریهان جەلال) دابەزی و کـورێکی رەشـتاڵەی چـاکەت و پـانتۆڵ لەبەری باڵا مامناوەند دابەزی لەگەڵیدا، کورەکە بە ویقاریدا لە کوڕی بەرپرسەکان دەچوو. سڵاوی لـە (شەرمین عەزیز) کرد. (پەریهان جەلال) کە ماوەیەك بوو نەمبینیبوو، رووی بـە لای منـدا وەرگێـڕاو بەرەو پێشم هات و تەوقەی لەگەڵ کردم داوای بەخشـینی کـرد کـە لەبـەر زۆری کاروبـاری تایبـەتی نەیتوانیوە ئێوارە لە میوانداریکردنمدا ئامادەبێت، کوڕە قات رەشەکە کراسێکی سپیپی لەبەردا بـوو، لەگەڵ بۆینباخێکی رەش بە بەرگەکانیدا دیاربوو، کە لە بۆنەیەکی فەرمی بووە. تەماشای منی دەکرد یەکسەر لە نیگاکانیدا هەندێك رق و کینەم بەدی کرد، کە بەرەو رووم دەری دەبڕی، بە سـارد و سـڕی سڵاوی لێکردم، چونکە (پەریهان جەلال) بەیەکتری ناساندین، ناوی (پەنا کاروانی) بوو. لە چاوەکانیدا بریسکەی ئاگرێکی نەخوازراوم بە پێش چاو کەوت. بە بـێ ئـەوەی هـیچ وشـەیەکی تـر بڵێـت مـن ماڵئاواییم کرد. بە خەمێکی قووڵ و برینێکی سارێژ نەبووەوە هاتمەوە بۆ ماڵ. ئەو شەوە لـە ئـازار و هەژانی دەروونیدا چاوم بە خەو نەکەوت و تا بەیانی بیرم لە رابردوو، ئـەو هـەموو رووداوە ناخۆشـانە کردەوە. (شەرمین عەزیز) باسی راکردنیان بەرەو چیای بۆ کردم باسی ئەوەی کرد کە هاوڕێی مێردەکەی (محەرەم هەڵۆ) بە برینداری خۆیی و منداڵەکەی بەرەو چیا دەبات بە حـوکمی ئـەوەی مـاڵی (جـەلال کوێستانی) نزیك دەبێت لە شەقامێکی گەورەی بازنەیی کە چواردەوری شاری داوە، هـەر زوو لـەوێوە دزە دەکەنە دەرەوەی سـنووری شـار و بـەرەو چـیا هەڵدەکشـێن و لـەوێوە بـە سـواری وڵاخ دەگەنـە سەرکردایەتیی ئەوکاتەی شۆڕش. (شەرمین عەزیز) و (پەریهان) ی کچە بچووکی سەلامەت دەبن لـە چیا. (محەرەم هەڵۆ) کە دوو چاوی وەك هەڵۆی هەیە تیژ تیژ هەموو چیاکان دەپشکنێت، بە ئەمانەتەوە دەربازیان دەکات، بەڵام ئاسەواری (جەلال کوێسـتانی) و هاوڕێکـەی دیکـەی سـووتاندن و بـوون بـە خۆڵەمێش دەبێت.

## ١٦

## "نیسانی ٢٠٠٤"

دوای مەرگی (سەهەند بایز ئاغا) و (ئاسمان خۆشناو مینا) مـن و (کامـەرانی وەنەوشـە) زۆر خەمباربووین، بە شێوەیەك زۆرێك لە حەزو هیواکانمـان لەگـەڵ ئـەو دوو هـاوڕێ بـە ئەمەکـەمان سەفەریان کرد، (ئاسمان مینا) لە سەرەتای پڕکردنەوەی فۆرمی خوێندنەوە ئەشقی (سەهەند) ببوو، بەڵام بە شێوەیەکی روون (سەهەند) بەوەی نەزانیبی بوو تەنیا هەستی کردبـوو کـە رەنگـە خۆشـی بوویت، ئەو هیچ کات رووی نەدابوویە تاکو (ئاسمان خۆشناو) تەواوی خۆشەویستی خۆی بـۆ بـەیان بکات، بەر لەوەی (سەهەند) ئەوی خۆش بوویت کەسـێکی تـر دیلـی کردبـوو، دنیـا سـەیرە تـۆ کەسێکت خۆش نەوێت و ئەو تۆی خۆش بوویت ئەم کارەساتە زۆر شووم بوو، ژیان وایە مەرج نییە ئەوەی حەز لە گرتنی هەور بکات بتوانێت بفڕێت یان لە سەر هەورەکان ماڵ بکات، ئەوی حەز لـە تاڤگە بکات بتوانێت بە ناویدا سەفەر بۆ ئەودیوی شتەکان بکـات، (ئاسمـان خۆشـناو) ژیـانی لـە دژوارییەوە هاتبوو بە وتەی کوردەواری ئەو باوکی دیار نەبوو دایکی ژنێك بوو پارچەپارچە کرابوو. ئاسەواری بکوژو کوژراو دیار نەبوو. خوێن لە سەراپای وڵات دەتکا. بـۆنی ئادەمییـە مردووەکـان زیندووەکانی هەراسان کردبوو، لە جەنگـەلێکی شـووم دەچـوو کـە دڕندەگـەلێکی زۆر سـەروەری دەکەن. دوای ئەو هەموو مەرگەساتە کە روویان دەدا مانەوەمان لەم شارەدا نەشیاو و قیزەونبـوو، هەر بۆیە لەگەڵ (کامەران)پلانی دوورکەوتنەوەمان دانا، بەڵام پلانەکەمان هەروا زوو بەدەسـتتەوە نەهات. هەردووکمان دەمـانزانی ژیـان لـەم پنتـەی سـەرزەمین نەشـیاو و نـاخۆش دەبێـت. ئـەو سەردەمەی کە کتێبمان لە بازنـەی خوێندنـەوەدا دادەنـا، هـەموو ئەنـدامانی بازنەکـە وردە وردە ئاستی وەعیان بەرز دەبۆوە لە (کامەران) بۆ من بۆ (سەهەند) بۆ (ئاسمـان خۆشـناو) بـۆ (سـەردار بێخەو) کە ئەو تا بەیانی نەدەخـەوت و سەرچـاوەکانی دەخوێنـدەوە، بـۆ (نیلوفـەر حوسـنی) بـۆ ئەندامانی تری بازنەکە کتێبەکە دەگوازرایەوە هەریەکەو چەند دێڕێك فێر دەبوون و لە کۆتاییدا لـە کتێبخانە کۆدەبووینەوە و راوێژمان لە سەر ناوەرۆکەکانی دەکرد.

(کامەرانی وەنەوشە) دەیویست رێبەری کۆمەڵێك بکات بەرەو خۆریان ببات و سڵ لە گـەرمی و توانەوەی نەکەن، سەروەری بۆ ئەوان بە رەوا دەزانی، بەڵام رۆژ بە رۆژ بازنەکەمان کـەمی دەکـرد

یەکێك دەمرد یەکێك دەخنکا، یەکێك دەسووتا، یەکێك دەکوژرا، بازنەی گەورەی سەدان کەس لە وڵاتێکی پڕ ئاژاوە و شێواودا بەرەو لاوازی دەچوو.

مامۆستا (کاوە میرخاس) لە گەڕەکی گاورەکان لە باخێکدا ڤێللایەکی پەمەیی هەبوو هەمیشە بانگێشتی دەکردین لەوێ لەسەر دنیا دەدواین بە چوونمان بۆ ئەوێ هەمیشە ئاسوودە دەبووین، بەڵام مەرگی (سەهەند بایز) و (ئاسمان خۆشناو مینا) بڕستیان لێ بڕین، هەمیشە بە گریان ژیانمان بەڕێ دەکرد، (کامەران) خەریك بوو دەکەوتە ناو ئەشقی (دلارام میهرداد کاکەوەیس) ئەگەرچی (کامەران) بە ویستی خۆی نەبوو، بەڵام ئەو جوانییە دژوارەی (دلارام) ئەوی بەرەوخۆی پەلکێش دەکرد، خۆیشی دەیزانی کە عیشقێکی دژوار و ئەستەمە.

دوای دوو هەفتە لە مەرگی (سەهەند بایز) و یەك هەفتە لە مەرگی (ئاسمان مینا) لەلایەن پۆلیسەوە من و (کامەران) بانگ کراین بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆکاری مردنی (سەهەند). ئەفسەرێکی ڕەشتاڵەی سمێڵ زلی دەنگ گڕ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵمان یەك یەك و بۆ ماوەیەکی درێژ، لە راستییدا ئێمە هیچ دەستییکمان لە مردنی ئەودا نەبوو، بەڵام بەو وتانەی دامان بە پۆلیس ئەوەمان روونکردەوە کە (سەهەند بایز) نە دوژمنایەتی لەگەڵ کەس هەبووە نە کەسیش گلەیی لێی هەبووە، ئەو کوڕێکی دەنگخۆش و ناوازەی ئەم شارە بووە دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ئەوەمان بەیان کرد کە (سەهەند) تازە لە پەیوەندی خۆشەویستییدا بووە لەگەڵ کچە مەسیحییەك بە ناوی (ئاروین ئیسحاق) لە کۆلێژی ئەدەبیات لەو کاتەدا کە من ئەو رستەیەم وت، کاکی ئەفسەر بە وردبینییەکی زۆرەوە گوێی بۆ گرتم و دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەی زیاتر. ئێمە راستیی شتەکانی ترمان نەدەزانی، بەڵام بە وتەی خۆی جارێك (سەهەند) باسی کوڕێکی ریشنی چاو زەقی بۆ کردبووین کە لە کاتی یەکترناسینی (ئاروین ئیسحاق) و خۆیدا چاودێری ئەوی کردووە واتە (سەهەند بایز) .

لەو ماوەیەدا من رۆژێك چووم بۆ لای باوکی (سەهەند) و ئەوەم تێگەیاند کە (سەهەند) کچێکی خۆش ویستووە مەسیحی بووە، بەڵام (بایز محەمەد) بڕوای پێنەکردم دواتر من هاوکاری پۆلیسم کرد بۆ دۆزینەوەی ئەو کەسە نەناسراوە لە رێگەی (شالاو ئیحسان) هاوڕێی (سەهەند) لە دوای سۆراخ (شالاو ئیحسان) وتی: (من ئەو دەموچاوە دەناسمەوە کە تەماشای سەهەندی کردووە) لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر زانرا ئەم کوڕە سیخوڕی باوکی (ئاروین ئیسحاق) بووە بەوپێیەی (ئیسحاق سلێوە) چەندین یانەی شەوانەو باری خواردنەوەو ئوتێلی پێنج ئەستێرەی هەبووە سیخوڕو بەکرێ گیراوی زۆری هەبووە بۆ پاراستنی سەروەرییەکانی، ئەو هەمیشە دژی

هاوسەرگیری مەسیحی و موسوڵمان بووە زۆر خۆشی لە موسوڵمانەکان نەهاتووە لە دواجاردا ئەم کوڕە بەکرێ دەگرێت تا چاودێری (ئاروووین)ی کچی بکات لە کۆلێژەکەدا بزانێت چی دەکات و چی ناکات، تەواوی هەڵسوکەوتەکانی بۆ تۆمار بکات و باوکی ئاگادار بکاتەوە لە ئێوارەیەکی درەنگدا هەر ئەو کوڕە لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە شوێنێکدا (سەهەند) دەگرن و دەیبەنە لای باوکی (ئاروووین) و ئەویش تکای لێ دەکات کە واز لە کچەکەی بهێنێت دەنا زەرەری قورس دەکات. (سەهەند) لەوە سەرسەختتر دەبێت بترسێت و کۆڵ نادات زوو زوو سەردانی (ئاروووین) دەکات و یەکترناسینەکەیان پەرە دەسێنێت تا ئەو کاتەی بەیەکەوە دەچنە دەرەوەی شارو پیاسە دەکەن، ئیدی (سەهەند) ئاشقی (ئاروووین) دەبێت و (ئاروووین)یش بە هەمان جۆر دەبنە دوو ئاشقی سەرسەختی یەکتر و ماوەیەکی کورت لە ئەشقی یەکتردا دەبن.

بەڵام ئەم ڕووداوانەی ژیانی خۆی بە تەواوی بۆ ئێمە باس ناکات، هەروەها لەو ماوەیەدا وردە وردە (سەهەند) گۆشەگیر دەبێت و کەمتر لەگەڵمان دەدوێت و سەردانەکانی کەم دەکاتەوە ئەو لەکاتی چوونە دەرەوەیان بەرەو بەرزاییەکانی باکووری شار لەگەڵ (ئاروووین ئیسحاق) دەخەوێت و کچێنی و پاکیزەیی (ئاروووین ئیسحاق) لادەبات و سکی پڕ دەکات، دەشزانێ کە کارێکی دژواری کردووە، دەشزانێ کە بەیەك ناگەن، ئیدی کارەساتەکان لەوێوە چەکەرە دەکەن و ناخۆشی باڵ بەسەر ژیانیدا دەکێشێت.

هەرگیز لە بیری ئەوەدا نەبووم وەها کارێك بقەومێت من و (کامەرانی وەنەوشە) زۆر لەوە بێ ئاگاتر بووین درك بە هاوکێشە ئاڵۆزەکانی (سەهەند بایز ئاغا) بکەین کۆد و شیفرە ئاڵۆزەکانی ژیانی (سەهەند) زۆر لە کۆدە نهێنییەکانی (داڤنچی) ئاڵۆزتر بووە. جووڵەی دنیا زۆر خۆش نەبوو، سەردەمی مەرگ بوو تازە وڵات لە دیکتاتۆرێکی خوێنمژ رزگاری ببوو، هێزەکانی وڵات و خەباتکاران هەریەکەو لە مەرامی دەسەڵاتدا بوون کە کەوتبوونە ململانێیەکی دژوارەوە کەس لە بیری گەلدا نەبوو هەموو لە گیرفانیان دەڕوانی مۆزەخانەکان و زۆربەی زانکۆکانی باشوور و ناوەڕاستی وڵات تاڵان کران. زۆرینەی شوێنەوارە دێرینەکان لە دەستی چەتە دزەکانی وڵاتدا ئاودیوی ئێران کران، وڵات لە لێواری خەرەندەیەکی بێبندا لە چەپۆکاندا بوو، کە بکەوێت و بۆ هەمیشە هەناسە نەداتەوە.

لە ڕێگەی چەند کەسێکی هاوڕێمانەوە کە ئەرکمان پاراستنی وڵات بوو خۆمان بە خەمخۆرری دەزانی دەستمان کرد بە پەیدا کردنەوەی ئاسەوارەکان، ئاخر خەباتی ئێمە جیاوازتر بوو، ئێمە لە سڕینەوەی نووسرا و مانشێتە قیزەونەکانی سەر دەرگای ئاودەستی مزگەوتەکانەوە دەستمان پێ

کرد، که ڕۆژانــه خــەڵکانێکی کاڵفــام دەیاننووســی ئــەرکی ئێمــە جــوانکردنی ســیمای ئینســانە نەخۆشەکانی ئەم دەڤەرە بوو، ڕۆژانە بەر لە هەڵایسانی شـەڕە خوێناویـەکانی تیرۆرسـتان بـەر لـە سەربڕینی ڕۆژنامەنووسە بیانی و خۆماڵییەکان دەستمان دەکرد بەکار، ئەو دەمەی هێشـتا سـکی (ئارووین) تەواو بەرز نەببووەوە.

دەگەڕاین مامۆستا (کاوە میرخاس) لەگەڵماندا کۆمەکی دەکرد، ئێمە لـە مەیـدانێکی دژوارو خوێناویدا دەگەڕاین، ڕۆژانە دەیەها تەقینەوە دەبوو، تەمێکی زەردی نەخۆش باڵی بە سـەر وڵاتـدا دەکێشا، وڵات لە پرتەقاڵێکی گەنیوی نەخۆش دەچوو بۆنی کەلاکی مردوو، مرۆڤی سووتاو دەست و قاچی پەڕیو، لە هەموو کووچە و کۆڵانێکی وڵات دەهات، دیمەنی سەربازی زۆرو چـەك بەدەسـت لە هەموو شوێنێك دەبینرا، ئاخر ژیان لەوەها وڵاتێکدا دەبێت مانای چی بێت؟ دەبێت تامی ژیـان وەها گەنیو بێت.

چـەندین پارچـەی ئاســەواری حـامورابی و سـۆمەریەکان و ئەسـکەندەری مەکـدۆنی، دراوی سەردەمی خەلافەتی عەباسییەکان و ئەمەویەکان پارچە بەردی کۆنی پەرتووکاو بەخـەتی بزمـاری لە سەریان هەڵکۆردرا بوو خشتی قوڕینی خەتدار و چەندین جۆر لـە گـۆزەو گڵکـاری و چـەرخەی سەردەمانی دیرۆکمان لە لای خۆمان لـە ژوورێکـدا کـۆ کـردەوە بەمەبەسـتی گەڕاندنـەوەیان بـۆ دەوڵەت، بەڵام هەر زوو لە لایەن سیخوڕەکانی دەسەڵات و بەرپرسە سوڵتان شێوەکان خراینـە ژێـر چاودێری وردەوە، بەو پێیەی بازرگانی بە کەلەپووری وڵاتەوە دەکەین گیراین و خراینە ژێـر ڕەحمـی شەلاقی جەللادەکانەوە، پێستی پشتمانیان هاڕی بەری پێیەکانیان خـەڵتانی خـوێن کـردین. لـەو هەڵمەتەدا تەنیا من و (کامەران) بەرکەوتین هەموو سەلامەت دەرچوون، ئاسـەوارەکان لـە لایـەن بەرپرسێکی گەورەی شارەوە بزرکران، ساڵانێکی دواتر زانیم نەگەڕێندراونەتەوە. هـەر بـۆ زانیـاری تەواوی مۆزەخانەکانی وڵات گەڕام و هیچ کام لەو پارچانەم نەدۆزیەوە زوو زانیم کـە بەرپرسـە ڕەزا قورسەکە هەموویانی فرۆشتووە چەندەها ملیۆن دۆلاری پاشـەکەوت کـردووە. بەڕاسـتی ناشـیرین ترین ئادەمیزادەکانی مێژوو بەرپرسەکانی حزب بوون سەدان جۆر لەو مشەخۆرانە کوتبوونە گیـانی وڵات و خێر و بێریان بەتاڵان دەبرد.

مرۆڤ دڕەندەترین بوونەوەری سەر ئەم هەسارەیەیە سـەیری مـرۆڤ بکـەن، مـرۆڤ چـی کـردووە هەموو سەروەرییەکان بە خوێن نووسراونەتەوە لە جەنگە یەك لەدوای یەکەکاندا بە هـەزاران و بـە ملیۆنەها خەڵك بە چەکە جۆراو جۆرەکان کوژراون، ئەوەی مرۆڤ دەیکات جگە لـە گەمـەکردنێکی هەزەلی بە خوێن هیچی تر نییە.

پاش ماوەیەك ئێمە بە هیچ شێوەیەك (ئاروین ئیسحاق) مان نەبینییەوە، بۆ هەمیشە بزر بوو دواتر زانیم کە باوکی بە زۆر بە کوڕێکی مەسیحی داوە بەشو ئەگەرچی سکی لە (سەهەند) هەبوو منداڵییکی نیوە موسوڵمان و نیوە مەسیحی لە سکیدا بوو، بەڵام (ئیسحاق سلێوە) بەرەو ئەوروپا ڕەوانەی کردوون، کوڕی مەسیحییش بەوەی نەزانیوە کە (ئاروین) دووگیانە و لە ژێرەوەڕا بووە بە موسوڵمان، ئەو هەموو ژیانی خۆی بە فیدای (سەهەند بایز ئاغا) کردبوو ئەو دەمانەی لە دەرەوەی شار گۆرانی ڕەسەنی بۆ چڕی بوو، ئەو لە ژێر کاریگەرییەکی زۆردا کڕنۆشی ئەشقی بۆ (سەهەند) و خودای سەهەند بردبوو.

ئەو لەوێ را فێری ئەوەی کردبوو کە ئەشق هەموو سنووره دروستکراوەکان دەشکێنێت ئەم جارەیان (شێخی سەنعان) بۆ کچی گاور لە ئیسلام وەرنەگەڕابوو، بەڵکو کچە گاورێك بە جوانی سەدای کوڕە ئیسلامێك موسوڵمان ببوو، لەو ماوەیەی کەکەمتر (سەهەند) دەبینرا ئەو هەمیشە بەردەوام بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی (ئاروین) ی بەرەو دەرەوەی شار بردبوو، دژایەتیی ئەخلاقی ئەو سەردەمەیان کردبوو، هەڵبەتە ئەوان ویستوویانە تابۆکان بشکێنن بە بڕوای ئەوان شتێك نەببوو بە ناوی یاساخ، لە لەنگەری هەموو یاساغەکان کەناریان گرتبوو بە سەدان نشێوو هەردوو دۆڵی قورسدا گووزەریان کردبوو.

ڕاکردن سەراپای دنیای ئێمەی تەنیبوو، دەبوو هەموو لە شتەکانی دەوروبەرمان هەڵبێین، ڕاکردن جوانترین گەمەیەك بوو دەبوو بەرجەستەی بکەین.

ئەو چرایانەی ئەوان لە روحیاندا دایانگیرساند وا بە سانایی نەدەکوژایەوە سەفەریان کرد بەرەو قوولایی وجوود بەرەو دنیایەکی دیکە، من و (کامەران وەنەوشە) بەرگەی ئەو هەموو ناخۆشییانەمان نەدەگرت، من کابرایەك بووم تامەزرۆی ئەشق و ئەشقبازی نەبووم، دڵنیا نەبووم لەوەی کە رۆژێك بێت کەسێکم خۆشم بوویت، زۆر جار لە نزیکەوە تەماشای تەواوی گۆڕانکاریەکانم دەکرد، تەماشای شانۆگەری وڵاتم دەکرد لە سەر جادەکان لە تەلەفزیۆنەکانەوە. دنیا بەرەو گۆڕانکاری دەچوو، تامەزرۆی رووداوگەلی زۆر بووم دواجار هەر خۆم لەناو حەقیقەتێکدا بووم هەر خۆم سەرم لێ دەردەکرد.

بە بیرم دێت هەر لە منداڵییەوە تامەزرۆی زانینی هەموو شتێکی دنیا بووم، پرسیاری هەراسانکەرم لەدایکم و باوکم و مامۆستاو خەڵك و خزمانم دەکرد، بەردەوام گوێچکەکانم وەك هی مشك سووك و ئاسان بوون بۆ گوێ گرتن، هەمیشە گوێ قوڵاخ دەوەستام و لە دنیا رادەمام، تەماشاکەرێکی سەرسەختی تەلەفیزیۆن و فیلمە بیانی و هندیەکان بووم کە ئەو سەردەمانە باو

بوون، زۆر جار خۆم وەك تەڕەزان دەگۆڕی و لە حەوشە گەورەکەی ناو ماڵمان کە پڕ بـوون لـە دارو درەخت، وەك مەیموون لەمبەر بۆ ئەوبەر خۆم توورِ دەداو بە پەت و دارو بـەرد یـاریم دەکـرد، لـەم سەردەمەی گەورەیی و پیاوەتیشمدا ئەم رەفتارەم بە شێوەی دیکە گواسـتۆتەوە بـۆ خـودی خـۆم، هەمیشە لە ناخی مرۆڤی رۆژهەڵاتی وەك ئێمەدا، سوارچاك گەلی سەیروسەمەرە هەیەو هەریەکەو بە شێوەیەك حەز بە خۆ دەرخستن دەکات، ئیدی مۆدێلی ژیان لە وڵاتی ئێمەدا بـەو چەشـنە بـوو، بەڵام بێبەش نەبووم لەو جوانییەی لەو هاوڕێیانەوە فێری بووم. هەمیشە لە گیرفانەکانمەوە رووناکی بە شێوەی گوورزە دێتە دەر.

ئەو گەمە سیاسیانەی لەو سەردەمەدا دەکران جێگای تێڕامانی من بـوون وەك تەماشـاکەرێك بە پەرۆشەوە ئاگادارییان دەبووم، بەڵام رۆژ بە رۆژ بێزارو بێ تواناتر دەبـووم. (کامـەران) کـەناری گرتبوو، ئەویش خەریك بوو لە ئەشقی (دڵارام میهرداد) دا تەژی ببوو. (دڵارام) یـەکێك بـوو لـەو چوار کچەی کە هەمیشە بەیەکەوە بە ئاوازی پەپوولە دەهـاتن و دەچـوون و هەریەکـەیان دەسـتە سرِێکیان بەدەستتەوە بوو پێیان دەوتن گرووپی دەستەسرِ بەدەسـتەکان، چـوار کـچ لـە جنسـێکی جیاواز سیحراوی بوون هەمیشە لە کاتی رۆیشتندا پەپوولەیان بە چوار دەوردا دەسـووڕایەوە و بـە سەر سنگیانەوە دەنیشتنەوە.

دوای ئەوەی بە فـەرمانی (ئیسـحاق سـلێوە) بەشـو دەدرێـت (ئـاروین) بـە خـۆیی و سـکە دومانگیەکەیەوە بە گریانێکی بێشوومارەوە، رەوانەی ئـەوروپا دەکرێـت و بـاوکی بـە مێردەکـەی دەڵێت کەوا باش ئاگاداری بێت و نەهێڵێت بە تەنیا سەفەر بکات و لێی دوور نەکەوێتەوە ئیتر بـۆ هەمیشە بزربوون سەرەتا بەرەو ئیتالیا چوون دواتر لەوێوە بـەرەو ئـەمریکا و بـۆ هەمیشـە تـەنیا هەواڵێك چییە بەدەستم نەدەگەیشت، من زۆر هەوڵمدا سەرەداوێك لەبارەی (ئاروین ئیسـحاق)ەوە بزانم، بەڵام بێ ئاکام مامەوە، هەر بۆیە ئەو مەسەلەیەم لەیاد کرد. من لە دوای مـەرگی نـاوادەی (سەهەند) چاوەڕوانی لەدایك بوونەوەی (سەهەند) ێکی دیکەدا بووم. لە نیهانی خۆمدا دەمگـوت: سەردەمێك دێت سەهەندێکی دیکە لە سووچێکی ئەم هەسارەیەوە بەرپا دەبێتەوە، بەڵام نازانرێـت داخۆ دێت یان نا بەو شێوەیە کە من چووبووم بۆ لای (بایز ئاغا)و باسی ئەو کچە مەسیحییەم بـۆ کردبوو کە لە ئەشقی کوڕەکەیدا بوو، سەرەتا باوەڕی پێ نەکردم دواتـر دوای زانینـی راپۆرتـەکانی ئەفسەران و دەزگاکانی پۆلیس راستی رووداوەکەی بـۆ روونبـووەوە کـە هۆکـاری خۆکوشـتنەکەی (سەهەند) دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو (کچـە مەسـیحیی)ـــیەی دڵخـوازی بـوو دنیـا بەسـەر خۆیـدا دەڕووخێنێت.

پڕ بە دنیا هاوار دەکات (کوشتنی ئەو خاچ پەرستانە غەزایە) هەر لەو دەمەوە (بایز ئاغا) بەو پێیەی دەسەلاتدارێکی گەورە دەبێت و سەرۆکی عەشیرەتێکی گەورەی ناوچەکەیە بە سەدان چەکدار کۆدەکاتەوەو هەڵدەکوتێتە سەر شارۆچکەی گاورەکان و دەیان ماڵ و ئوتێل و باخچەی (ئیسحاق سلێوە) دەسووتێنێت، بەڵام لەو کاتەدا (ئیسحاق) لە سەفەری یەکێك لە وڵاتەکانی کەنداو دەبێت، هەر کە ئەم هەواڵە دەزانێت هەر زوو دەگەڕێتەوەو ئاگری شەڕو پریشکی شەڕ سەراپای شار دەتەنێت و باوکی (سەهەند) زۆر قین لە دڵ دەبێت و هەر بۆیە رەحم بە هیچیان ناکات هەرزوو چەندیان لێ دەکوژێت، ئاگری شەڕ لە چاوە گەورەکانیدا دەبریسکێتەوە. ئەو دەمەش وڵات لە ئاژاوەیەکی گەورەدا دەبێت و هەر زوو تیرۆرستان ئەو هەلە دەقۆزنەوەو دەست دەکەن بە تەقینەوە رۆژانە چەندین ماشین و ئۆتۆمبیل لە شوێنە گشتی و بازاڕەکاندا دەتەقێننەوە، کارەکە لە کۆنترۆڵ دەردەچێت و ئەو ئاگرە هەروا ئاسان خامۆش ناکرێت و نە پۆلیس و نە حکوومەت بۆیان کۆنترۆڵ ناکرێت، باوکی (سەهەند) (بایز ئاغا) سوێند دەخوات کە بە دەستەکانی خۆی (ئیسحاق سلێوە) بکوژێت، هەڵبەتە ئێمەش لەو ناو بەرداشە گەروورەیەی شەڕدا هەروا بێ هەلامەت دەرباز نەبووین، دەزانرا کە لە هاوڕێ نزیکەکانی (سەهەند) بووین رووبەرووی شەڕو لێدان بووینەوە هەر پاش ئەو کارەساتە ناخۆشانە بە دزییەوە شەوێك گەڕاینەوە بۆ شاری خۆمان و بڕیار نەبوو، بەشداری شەڕێك بکەین کە کاری ئێمە نەبوو، من بەرەو ماڵ و (کامەران)یش بۆ ماڵی پووری، بەو شێوەیەو بەردەوام من لە تەلەفزیۆنەوە تەماشای رووداوەکانم دەکرد. هەر بەو هۆیەوە خوێندن راگیراو باری نائاسایی بەسەر کوردستاندا سەپێنرا دەوڵەتانی ئەوروپاو پاپای فاتیکان بە فەرمی تەداخولیان کرد دوژمنایەتی نێوان (بایز ئاغا) و (ئیسحاق سلێوە) درێژەی کێشا و هەریەکەیان لە بیری مەرگی ئەوی تردا بوو.

دوای دوو هەفتە لەباری نائاسایی، ئاسایی بوونەوەی رەوشەکەو کرانەوەی خوێندن، گەڕاینەوە بەرەو پایتەخت و درێژەمان بە وانەکانمان دەدا. ئەو کاتە دوو لە هاوڕێ دێرینەکانمان بەجێیان هێشتبووین، هێشتا ئاسەواریان لە شاردا دیار مابوو، مامۆستا (کاوە میرخاس) و (فەرەج سەبعاوی) درێژەیان بە دەرسەکان دەدایەوە. مامۆستا (کاوە میرخاس) زۆر دژواروو داڕووخاو دیاربوو، وەکو جاران نەبوو نەیدەتوانی باسی هیچ بکات هەر یەك لە من و (کامەرانی وەنەوشە) خەمبارتر لەوەی وەسف بکرێت لە دوو پارچە قوماشی رەش دەچووین کە تروسکایی لە دەموچاوماندا بەدی نەدەکرا، زریانێکی تێروتەسەل بوو. هات و لەگەڵ خۆی دنیای سەراوبن کرد. لە رۆژی هەینی سەردانی گۆڕستانمان کرد کاتێك کە چووین، گوڵەکان سەراپای گۆڕستانیان

تەنیبوو لەبەر پەڕەی گوڵ و بۆنی گوڵە وەنەوشەییەکان جێگایەك بۆ پێدانان نەمابوو بە تەواوی گۆڕەکان شارابوونەوە دەمبینی (کامەرانی وەنەوشە) بە کوڵ دەگریاو فرمێسکی یاقووتی لە چاوەکانی دەکەوتنە خوارو بەسەر گوڵەکان دەکەوتن و دەبوون بە سەدان پرژەی وردترو وردتر.

نە گۆڕێك دیار بوو بە ناوی (ئاسمان مینا) و نە گۆڕێك بە ناوی (سەهەند بایز). هەموو گۆڕەکان وێك دەچوون و لە شەپۆلی گوڵدا غەرق ببوون. دەمبینی پەپوولەی رەش بەسەر گۆڕستاندا دەسووڕانەوە بە شەپۆل دەهاتن و دەچوون لە دوورەوەڕا لە دەوار دەچوون دەوارێکی کون کون.

ئای لەو رۆژگارە سەیرە دەستم لە گیرفانەکانم وەردەدا و رووناکیی وجوودی نەبوو. (کامەران) ئاماژەی دەکرد و وردە وردە دەڕۆیشتین و بە ئەسپایی هەنگاومان دەناو نەماندەتوانی پێ لە گوڵە سیحراویەکان بنێین. دەڕۆیشتین و دیمەنی شار لە پرسەخانەیەکی ساردوسڕ دەچوو. لەپرسەخانە دەچوو، لە شووشەی وردوخاش دەچوو.

## ١٧

له نەخۆشخانە پشكنین و كاروباری بۆ كرا و چارەسەر كرا، بەڵام بە راستی ئەو پێستە ناسكە جوانەی دەستی راست و كەمێك لە پشتی و باسكی زۆر سووتابوون. زۆر بەداخ بووم بۆی، لەو كاتەدا ئەو لەسەر قەرەوێڵەیەكی رەق و تەقی نەخۆشخانە بە كۆمەڵێك برینپێچ و كرێمی تایبەتی شوێنە سووتاوەكانی لەشی پێچرابوو. ئەگریا لە ئازاری سووتاندا ناڵە ناڵ لە سنگییەوە دەهات من وام هەست دەكرد لە ناخەوە سووتاوم زۆر بەداخ بووم بۆی، نەك من بەڵكو (بەهرۆز چاوڕەش) و (سەردار بێخەو) و مامۆستا (كاوە میرخاس) و (زەینەب) و زۆر لە هاوڕێكانمان، (كامەرانی وەنەوشە) زۆر دەگریا و ئازاری سووتانی زۆر زۆر بوو. بە ورتەورت دەیگوت: (شاپوور زۆر لە ئاگری دۆزەخ دەچێت، ئاگر هەر ئاگرەو هەموو شتێكی نەرم و ناسك دەسووتێنێت) منیش دەمگوت: (ئارام بگرە هاوڕێم ئارام بگرە، سەلامەت دەبیت) ئەو كاتەی من لە گفتوگۆیەكی قووڵدا رۆچووبووم لەگەڵ (بەهرۆز چاوڕەش) كە دانیشتبووین و سەربووردەی ژیانی منداڵیی خۆی بۆ بەیان كردبووم. لەو كاتەدا (زمناكۆ یاسین) هاواری ئەوەی بۆ هێنابووین كەوا تاقیگە سووتاوە و هاوڕێیانیشمان لەوێن، بە هۆی شۆڕتی كارەباو لە یەكێك لە فڕنەكانەوە ئاگر دزەی كردبوو و هەندێك بتڵی گازی هایدرۆجین ئاگریان گرتبوو. لە ئاكامدا زۆر زەرەرو زیان بە تاقیگەكە كەوتبوو، (كامەرانی وەنەوشە) بە ئاگر سووتابوو، سووتانەنەكەی ئەوەندە نەبوو ژیان لەدەست بدات، بەڵام دواجار دەستی سووتابوو كە دەبوو بە نەنگی و دیار دەبوو، بەڵام روخساری بشسووتایە روحی زۆر جوان و جاویدان بوو، ماتەمێكی ناخۆش بوو دنیام لەلا تاڵ ببوو. ئەو بەهۆی ئازارەوە پشووی وەرگرت و گەڕایەوە بۆ شاری خۆیی و بۆ ماڵی پووری، بەڵام تەنیا دەبووم و هەمیشە تەنیاتر دەبووم لەبەردێكی بێنازی كەنار دەریایەك بە پاساریەكی بریندار دەچووم هەمیشە لە گیانەڵادا بووم.

دەبوو من ئینجانە گوڵەكانی (كامەران) ئاو بدەم خزمەتیان بكەم وەك چۆن باوكێك خزمەتی منداڵەكانی دەكات، وەك چۆن هەنگێك، مێروولەیەك ئیش دەكات، هەر وام دەكرد. لە (كامەران)ەوە فێری ئەوە بووم چالاك بم. هەمیشە تێبكۆشم و رەنج بدەم بۆ گەیشتن بە هەموو شتە

بەدەست نەگەیشتووەکان، لەو ماوەیەی ئەو سەفەری کردبوو، من زۆربەی کات سەرقاڵی خوێندنەوە بووم لەو سەدان کتێبەی لە ژێر قەرەوێڵەکەی کامەراندا بوون. دەرگای سەدان داستان و مێژووی فارس و رۆم و عوسمانییەکان و چەندین کتێبی بەنرخی دنیا بەسەرهاتی چەندین نووسەری دنیا، هەمیشە بیرم لەو خۆکوشتنە سەیرەی (فیرجینا ولف)ی رۆماننووسی ئینگلیز دەهات، ئەو ژنەی گیرفانەکانی پڕ کرد لەبەردو خۆی دا بەدەم رووبارەوە و نوقوم بوو. سەرکێشیەکانی (ئارتۆر رامبۆ) بۆ بیابان و خۆ نوقمکردنی لە لمدا لەو شاعیرەی ناوازەترین دەقە شیعرییەکانی خۆی لە ئەوروپادا نووسی و شۆڕشێکی تریان بەرپا کرد و بەڵام کەسێکی هۆمۆسێکسوەڵ بوو.

چەندین دەستنووس و چارچە شیعری (کامەران)م خوێندەوە کە بە رەشبینانە لە دنیایان دەڕوانی فەزایەکی سەیری هەبوو. دواجار بۆم دەرکەوت کە ئەو کوڕێکە جیاوازە و دنیابینیی خۆی هەیە و ئەم کۆمەڵگا شوومە شوێنی ئەو نییە، نەگبەتی لەوەدا بوو کە کورد بوو، دەنا بلیمەتترین داهێنانەکانی خۆی دەکرد. چەندین دیزاینی ساروخ و رۆبۆت و کەشتیی ئاسمانی و ژێر دەریایی لەناو نووسراوەکانیدا هەبوون، کە دیار بوو کاری لەسەر کردبوون.

لە راستییدا گرووپێك لە کوڕ و کچی داهێنەر لەو سەردەمەدا هاوڕێم بوون، کە هەریەکە و بە شێوەیەك زیرەك بوون، شارەزایی (بەهرۆز چاوڕەش) لە مێژوودا سەرسامی کردبووم. هەر ئەوە وای کرد، کە دەیویست کار لە سەر کەیسی ئەنفال و مێژووی تاڵی کورد بکات، لەو ماوەیەی (کامەران) گەڕابۆوە. دوو جاری دیکە (بەهرۆز چاوڕەش)م بینییەوە، کە بە پەرۆشەوە دەهات بۆ لام و ماچی دەکردم.

هەمیشە باسی (بادە سلێمان)ی بۆ دەکردم دەیگوت: (هێندە شاعیرانە لەگەڵم دەدوێت لە ئەنجامدا ناتوانم بە وشە وەڵامی بدەمەوە هەر بۆیە دەمەوێت ماچی بکەم و هەناسەکانی هەڵبمژم).

لەو ماو کورتەی یەکترناسینیاندا بەڵێنی هاوسەرگیریان بە یەکتردا بوو، ئەگەرچی (بەهرۆز) بەوی راگەیاندبوو کەوا ئەو لەگەڵ باوکێکی پیری دەژی، بەڵام (بادە سلێمان) بەوی وتبوو کەوا بۆ ناو ئاگر لەگەڵی دێت. (بادە) کچی پیاوێکی تا رادەیەك هەژاری شار بوو، کە باوکی فەرمانبەرێکی سادەی دەوڵەت بوو، لە خانوویەکی کۆنی گەڕەکێکی هەژارنشیندا دەژیان.

(بەهرۆز چاوڕەش) لە دوا جاردا هات بۆ لام بە منی وت: (شاپوور ئاگات لە خۆت بێت بارودۆخ و هەلومەرجی وڵات زۆر نائارامە) راستی دەکرد، لەو ماوەیەدا بۆ ساڵانێکی زۆر دواتریش بارودۆخ زۆر نائارام بوو لێرەو لەوێ بزوتنەوە تەکفیریەکان و تیرۆرستان کاری تەقینەوە و

کوشتنیان ئەنجام دەدا، چەندین کەسیان گـرت و بـە بـەر چـاوی کامێراکـانی جیهانـەوە سـەریان دەبڕین، هەموو دنیا وەك دڕندە تەماشـای هاوڵاتیـانی عیراقیـان دەکـرد. هـەروا لـەو ماوەیـەدا گەورەترین تەقینەوە لە شاردا کراو سەدان مرۆڤ و ئەندامانی حزب و کەسانی دیکە بوونە قوربانی. جەژن و شادی دوو شت بوون خەڵکی ئەم هەرێمە لێی بێ بەش بوون، خەڵك تـۆقی بـوون هـەموو گەنجانی وڵات لە بیری ئەوەدا بوون بەرەو بەهەشتەکانی رۆژئاوا کۆچ بکـەن بەڕاسـتی هـەرێمێکی مردوومان هەبوو هەمیشـە دەمانویسـت لـەم هـەرێمی مردووانـە رابکـەین، هـەموو کووچـە و کۆڵانێکی ئەم وڵاتە بۆنی مەرگ و هەناسەی ئەهریمەنەکانی لێ دەهات. بـۆنی شـەهوەتی پیـاوانی بێ کەماڵ و سوڵتانە زۆر خۆرەکان و ناپاکەکانی لێدەهات، بەردەوام هەستم دەکرد هەناسـەم سـوار بووە خەریك بووم لەبەرگی خۆم دەهاتمە دەر، دەمزانی ژیانی لەو چەشنە جگـە لـە دۆڕانـدن و خـۆ بەکەم زانین هیچی تر نییە. لەو ماوەیەدا هەستم بە تەنیاییەکی تاقـەتبڕ دەکـرد، کەسـێك نـەبوو لەگەڵی قسە بکەم.

شەوان زۆربـەی کـات تەماشـای تەلـەفزیۆنم دەکـرد و جگـە لـە کوشـتار و درۆو دەلەسـەی سەرۆکەکان و مەرگی خەڵکی بێتاوان هیچی دیکە نەبوو، هەندێك جاران سـەرقاڵی تەماشـاکردنی یاریی تۆپی پێی یانەکانی ئەوروپام دەبووم، دەمبینـی خـەڵکی ئـەوێ وەرزش دەکـەن پێدەکـەنن، بەڵام ئێمە شەڕ دەکەین دەکوژین دەمرین بۆنی هەناسەی دۆزەخ و هەڵمی کوژراوەکان هەڵدەمژین.

دواجار رۆژێك (کامەرانی وەنەوشە) گەڕایەوە، لەوپەڕی تەنیایی رزگاری کردم ئەو تەندروسـتی زۆر باش بوو ئاسەواری سووتاوی بە دەستییەوە مابوو، بەڵام بـاش بـوو باوەشـم پێـدا کـرد و تێـر گریام، ئەویش لەگەڵم گریا.

بۆنی گوڵە وەنەوشەییەکانی بە ناو روحمدا رۆچوو، هەستم بـە ئارامییـەکی گـەورە کـرد هـەر ئەوەش بوو من بەردەوام حەزم دەکرد بە دوای ئارامییدا بگەڕێم.

کاتێك (کامەران) گەڕایەوە چەند رۆژێك بوو (بـەهرۆز چـاوڕەش) بـە هەنـدێك کـاری گـرنگ سەردانی شاری خۆی کردبوو ئەو شارەی کە دنیا چاوی لە زەویەکانی بڕیبـوو بـە ئـەڵماس و تـەڵا نەدەخەملێندرا.

کە سەردانی کۆلێژمان دەکرد بەردەوام چوار کچەکەمان دەبینی بە بەرگی پەمەییـەوە، یـەکی یەك دەستەسڕی ئاوریشمی کچانەیان لە دەستەکانیان دەئالاند، پەپوولەگەلی زۆر بە چـواردەوریاندا دەسووڕانەوە. ئەو کاتە (دلارام میهرداد) زانیبـووی کـە (کامـەرانی وەنەوشـە) لـە سـوتمانەکەدا هەندێك لەشی سووتاوە بە بینینەوەی (کامەران) دیاربوو زۆر خۆشحاڵ بوو، (کامـەران) هەمیشـە

دەیگوت: (نازانم ڕەشەبای ئەم هەستە شێتەم بەرەو کوێ دەمبات)، دیاربوو شتێکی ناسروشتی لەناوچاوانی (دڵارام میهرداد) دا هەبوو، (کامەران)ی بەرەو لای خۆی پەلکێش دەکرد.

دوای یەك مانگ لە ڕۆیشتنەوەی (بەهرۆز چاوڕەش) دواجار (بادە سلێمان) هات بۆ سۆراخی، بەڵام هیچ هەواڵێکمان نەدەزانی، هەموو بە پەرۆش بووین بۆ گەڕانەوەی ئەو ڕۆژەی کە سەفەری کرد جانتایەکی بچکۆلە و کامێرایەکی فۆتۆگرافی پێ بوو، چاویلکەیەکی ڕەشی کردبووە چاوی لەگەڵ هێلەکێکی گیرفاندار. لە دیمەنیدا لە پەیامنێری گۆڤار و ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان دەچوو ماڵئاوایی لێکردبووم.

لەو دوو جارەی (بادە سلێمان) بۆ سۆراخی هات، لەگەڵم دوا لە چاوەکانیدا خەمێکی قووڵ دەبینرا هەستم دەکرد کارەساتێکی دیکە یەخەمان پێدەگرێت.

شەوێك لە کەناڵێکی عەرەبییەوە کە لەو ماوەیەدا خەڵکانێکی زۆر ئالوودەی ببوون و بە پەرۆشەوە تەماشای ڕووداوەکانی دنیایان لێدەکرد گرتەیەکی ڤیدیۆیی بڵاوکردەوە کە تێیدا چەند کەسێکی دەمامکداری جل ڕەش کەسێکیان بە جلی پرتەقاڵییەوە لەبەردەمیاندا دانابوو، توورەکەیەکی ڕەشیان کردبوو بە سەریدا. یەکێك لەو جەللادە دەمامك دارانە پارچە وەرەقەیەکی بە دەستتەوە بوو دەیخوێندەوە و دەیگوت: (پیاوی ئەمریکا) ئەوانی دیکەش یەکی شمشێرێکی گەورەیان بە دەستتەوە بوو، لە پشتەوەیان ئاڵایەکی ڕەش هەڵواسرابوو. پاش کەمێك توورەکەکەیان لە سەری بارمتەکە لاداو، یەکسەر من تووشی هەژان هاتم، سەیرم کرد، (بەهرۆز چاوڕەش) بوو، بە ڕاستی ناخۆشترین کاتێك بوو تا هەنووکە بینیبێتم، ئاخر ئەوەی بکەوتایەتە دەست تیرۆرستانی لەو جۆرە ڕزگاربوونی گەلێك زەحمەت بوو. دەنگۆی ئەو گرتە ڤیدیۆییە لە شاردا بڵاو بوویەوە هەموو خەڵك زانیان من و (کامەرانی وەنەوشە) زیاد لە خەڵك بە ئازار بووین. (بادە سلێمان) بە گریانەوە هات بۆ لامان و داوای یارمەتیی دەکرد. ئەو شەوەی گرتە ڤیدیۆییەکە پەخش کرا، تەلەفۆنێکی نەناسراو بۆ (بادە سلێمان) کرابوو، کە تیایدا تیرۆرستان لەبەرانبەر ئازادکردنی (بەهرۆز چاوڕەش)ـدا داوای چوارسەد هەزار دۆلاری ئەمریکیان کردبوو لە ماوەی دە ڕۆژدا.

لە ڕاستییدا من و (کامەران) بە هەموو توانای خۆمانەوە یەکی نزیکەی هەزار دۆلارمان هەبوو کە لە چاو ئەو پارەیەی کە داواکرابوو زۆر کەم بوو، بۆیە بڕیارماندا بە زووترین کات بە من و (کامەران) و (بادە) دەست بکەین بە کۆکردنەوەی پارە هەڵمەتێکمان کرد لەناو شارو کۆلێژەکاندا، بەڵام پارەکە زۆر زیاتر بوو لەوەی لە ماوەی دە ڕۆژدا پەیدای بکەین. مزگەوتەکان

ماڵەکان بازاڕەکانمان تەی کردبوو پارەکە کۆ نەدەبوویەوە، بۆیە بە نائومێدی سەردانی چەند بەرپرسێکی پایە بڵندی حزبمان کرد بە پێکەنینێکی ناشرینەوە دەریان کردین و دەیان وت، کە گوایا درۆ دەکەین. چەندین دەوڵەمەندی شار گەڕاین، بەڵام سوودی نەبوو. (بەهرۆز چاوڕەش) پاشماوەی ئەنفال و چاڵەکانی مەرگ بوو کەسوکاری هەموو لە ئەنفالدا زیندە بەچاڵ کرابوون، بەڵام ئەو پارەیە کۆنەبوویەوە بۆمان ناچار بڕیارمان دا هەوڵەکانمان چڕتر بکەینەوە.

من و (کامەرانی وەنەوشە) بۆ رزگارکردنی گیانی (بەهرۆز چاوڕەش) بڕیارماندا بەهەر شێوەیەك بێت پارەکە پەیدا بکەین، باوکی (بەهرۆز) زۆر لەوە هەژار و کەمدەستتر بوو، کە بتوانێت پارەکە پەیدا بکات زۆر گەڕاین نزیکەی سەد هەزار دۆلارمان پەیدا کرد، بەهەر شێوەیەك بوو (بادە سلێمان) بڕیاری دا خانووەکەی ماڵی خۆیان بفرۆشێت باوك و دایکی رێگریان نەکردبوو، خانوویەکی کۆنی هەژارانەیان هەبوو، فرۆشتیان بە پەنجا هەزار دۆلار، بەڵام بۆ تەواوکردنی تێکڕای پارەکە هێشتا دووسەد و پەنجا هەزار دۆلاری دیکە مابوو بڕیارمان دا تەلەفۆن بکەین بۆ ژمارە نەناسراوەکە، بەڵام ژمارەکە داخرابوو یەك رۆژ مابوو بۆ تەواوکردنی ماوەکە، تەلەفۆنێکی دیکە کرا بۆ (بادە سلێمان)، بەڵام من قسەم لەگەڵ کرد دەنگییکی گڕی عەرەبی تکام لێ کرد کە ئەو پارەیەمان بۆ کۆنابێتەوە تەنیا سەدو پەنجا هەزار دۆلارمان پەیدا کردووە، بەڵام رازی نەبوون زۆر گریام، بەڵام سوودی نەبوو، وتیان نابێ بە پۆلیس بڵێین دەنا یەکسەر سەری دەبڕین.

بەڵام وادیار بوو بەو پارەیەش قایل بن تەلەفۆنێکی دیکە کرا بە ژمارەیەکی دیکە ئێمە بە بێ ئەوەی زانیاری بە پۆلیس بدەین هەوڵمان دا من و (کامەرانی وەنەوشە) بەرەو ئەو ناونیشانە بڕۆین کە پێیان دابووین پارەکەمان لەگەڵ خۆمان بردوو بەرەو گوندێکی دوورە دەستی خوارو کە دەکەوتە ناوەراستی وڵات  بەڕێ کەوتین کە چەند دار خورمایەکی کەم نەبێت هیچ ئاسەواری سەوزایی پێوە دیار نەبوو دەشتێکی وشك و کاکی بە کاکی تەنانەت دەنگی چۆلەکەش نەدەبیسترا لە دوورەوە ئاسەواری ژوورێك کە بە بەردو قوڕ دروستکرابوو دیار بوو. لێی چووینە پێش، بەڵام زۆر دەترساین چەند کەسێکی دەمامکدار بەچەکەوە هاواریان کرد (کە لەوە زیاتر نزیك نەبینەوە) لە شوێنی خۆمان بە جانتایەك دۆلارەوە وەستاین، کە سەدوپەنجاهەزار دۆلاری تێدابوو یەکێکیان وتی: (جانتاکە بهێنە لە دووری سەد مەتر داینێ) من بە بێ ئەوەی سڵ بکەم لە مردن جانتاکەم هەڵگرت و چوومە پێشەوە دامنا ئەوانیش کەسێکیان هێنا لە نزیك جانتاکە بە جلی پرتەقاڵی و تورەکەیەکی رەش کە کرابووە سەری لەسەر چۆك دایان نا جانتا پارەکەیان برد و هەڵاتن. ئێمەش کاتێك توورەکەکە و پەتەکانی دەست و قاچیمان کردەوە. تەماشامان کرد ئەم کەسە (بەهرۆز

چاوڕەش) نییە دەمی بەسترا بوو، بەڵام کە دەمیمان کردەوە دیار بوو کەسێکی دیکە بـوو ئـەویش بە دیل گیرا بوو، ئەویش رای کرد و دەرباز بوو، ئـیتر پارەکـە رۆیشـت و (بەهرۆز)یشـمان دەسـت نەکەوتەوە. کابرای بارمتەش، هەڵات نەمانزانی داخۆ ئەمە سیناریۆی خۆیانە یـان ئـەمیش دیـل بوو لە لای ئەوان، بەڵام ئێمە لە شڵەژان و ترسدا نەمانتوانی کە هیچ بکەین و دواتر بە نائومێـدی گەڕاینەوە و پۆلیس بە پلانەکەی زانین و دەستبەجێ گیراین و خراینە ژێـر لێکۆڵینـەوە. هـەر لـەو ماوەیەدا جارێکی دیکە لە تەلەفزیۆن (بەهرۆز عەزیز شوکری) پێشان درابـوو، کـە لـە دیمـەنێکی قیزەوندا بەبەرچاوی دنیاوە بە شمشێر سەریان لە لاشەی جیاکربۆوە.

ئێمە زۆربەی پارەکانمان قەرز کردبوو خاوەن قەرزەکانیش لێمان خـۆش نـەدەبوون، خەڵك دەیان گوت لەو گرتە ڤیدیۆییەی (بەهرۆز) تێیدا سەر بڕاوە، دوای ئەوەی سەری لە لاشەی جیا دەکەنەوە، (بەهرۆز) هەڵساوە و بە بێ سەر چەند هەنگاوێك رۆیشتووە و پاشان بۆ هەمیشە کەوتۆتە سەر زەوی.

دوای یەك هەفتە لە یەکێك لـە لاڕێگاکـانی خـوارووی کوردسـتان لـە تورەکەیەکـدا لاشـەی (بەهرۆز چاوڕەش) بە پارچە پارچە کراوی لە لایەن چەند شوانێکەوە دەدۆزرێتەوەو رادەستی پۆلیس دەکرێت، ئێمەش بۆ ماوەی دوو مانگ لە زینداندا بە بێ لێپرسینەوە ماینەوە.

نـەمانتوانی (بەهرۆزچـاوڕەش) رزگـار بکـەین، نـە توانیشـمان پارەکـان بگەڕێنینـەوە ئێمـە دۆڕاندمان و باجەکەشی بە قورسی لە لایـەن ئێمـەوە درا، لـە لایـەن پۆلیسـەوە سـووکایەتییەکی زۆرمان پێکرا و لێمان درا، بەڵام ئێمە ئازاری جەستەمان بـە هـۆی مـەرگی (بـەهرۆز)ەوە لـەیاد کردبوو. ئەو دوو مانگەی لە زیندان بووین هەموو شەوێك تا بەیانی لەگـەڵ (کامـەران) دەگریـاین هێندە گریابووین چاوەکانمان لەبری فرمێسك خوێنیان لێ دەهاتەدەر، لەو ماوەیەدا هیچ هـەواڵکی دەرەوەمان نەدەزانی و بە تەواوی فەرامۆش کرابووین دیوارەکـان رێگـری هـەواڵ و زانیارییـەکانی دەرەوە و دنیایان لێ گرتبـووین، دواتـر بـۆ هەمیشـە (بـادە سـلێمان) شـوێنەواری دیـار نـەماو نەماندۆزییەوە نەمانزانی کە مردووە یان خۆی کوشـتووە یـان سـەفەری کـردووە. ئـەو رۆیشـت و ئێمەش لە لایـەن مامۆسـتا (کـاوە میرخـاس) ئـازاد کـراین و ئـەو کەفالـەتی کـردین، چـونکە دەسەڵاتێکی باشی هەبووە، زۆربەی بەرپرسەکانی حـزب و حکومـەتی دەناسـی ئـیتر لـەو رۆژەوە بڕیارمان دا بۆ هەمیشە جلی رەش لەبەر بکەین و نەگۆڕێین. ئازیزەکانمان هێدی هێدی بزر دەبـوون. هەر لەو کاتانەدا هەواڵی ئەوەمان بیست کە(عەزیز شوکری) مردووە ئـیتر بـۆ هەمیشـە چـیرۆکی چاڵەکانی مەرگ لەگەڵ ئەواندا ونبوون ، ونبوون، ونبوون.

## ١٨

## "ئۆردوگای کوندە پەپووەکان"

## (ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧)

لەسەر پارچە پلێتێکی گەورەی ئاسن بە خەتێکی گەورە نووسرابوو، (ئۆردوگای کوندەپەپۆکان) بە راستی ناوێکی ناشرین بوو، بە بەرزی لە سەر ستوونێکی ئاسن لەحیم کرابوو شورایەکی تەلبەندو دڕکاوی بە چواردەوری ئۆردوگاکەدا بە درێژی چەندین کیلۆمەتر کێشرابوو. دیمەنێکی قیزەونی هەبوو. دەنگی ئیڤا و جێبە عەسکەریەکان لە هەموو لایەکدا دەبیسترا. تەپوتۆزی تانك و زرێپۆشەکانی رژێم بە بەرزی چەند مەتر لە زەویەوە هەڵایسابوو، لە دووری هەر سەد مەترێك قولەیەکی بەرز دەبینرا لە راستییدا ئۆردوگا نەبوو وەك سەربازگەیەکی گەورە وەها بوو. خەڵکی چەندین گوندی ناوچە سنووریەکان لەوێدا مۆڵ کرابوون دیار بوو بە نەخشەو پلان بەر لە چەند ساڵێك ئەم ئۆردوگایە دروست کرابوو. هەموو ماڵێك خانوویەکی درابوویە و دەبوو لەناویدا بژین خەڵکی گوندەکەی (سوارۆ ئاغا) هەموو هێنرابوونە ئەوێ ماڵی (میهرداد کاکەوەیس) و (مەستی سوارۆ ئاغا) دەکەوتە ناوەندی شار، بە ژیانێکی ناخۆش دەستییان پێکرد، هەڵبەتە ناخۆشترین و دژوارترین شتێك لە دنیادا ئەوەیە کە بە زۆر بە خاڵێکەوە ببەسرێیتەوە کە خۆت ئارەزووی نەکەی بەڕاستی وەك زیندان وەها بوو، دیمەنی سەربازە سەوز پۆشەکان و تەقەکردنیان لەو هاولاتیانەی دەیانویست لە تەلبەندەکانەوە هەڵبێن دیمەنگەلی سامناك و خەیاڵپڕووکێن بوون، بۆنی کەلاکی مردوو ئێسقانی ئادەمیزاد بە تەلبەندەکانەوە، هەروەها خواردنیان لەلایەن داڵە گەورەکانەوە ئەوپەڕی زۆرداری بوو. (میهرداد) نەیدەتوانی تەحەمولی ئەو هەموو دیمەنە نەگریسانە بکات، هەمیشە هاواری دەکرد و خەریك بوو شێت دەبوو، (دڵارام)ی کچی تەمەنی سێ ساڵان دەبوو کە ئاشنا ببوو بەو ئۆردووگا چەپەڵە. دوور لە گوڵە جوانەکانی چیاو باخە گەورەکانی ترێ، دەگریا و فرمێسکی ئەڵماسی لە چاوە گەشەکانی دەهاتنە خوار. ژیانێکی ناخۆش بوو، هەراسان ببوون، نەبوونی ئاوی پاك و نانی پاك و نانی باش، شەوان قولە قولی سەگەکان کە دەچوونە سەر کەلاکی کوژراوەکان ترسی لە دڵی خەڵکی بێ دەسەڵاتدا چاندبوو. وزەی کارەبا بەکەمی هەبوو، هیچ

شوێنەوارێکی خۆشگووزەرانی لە ئۆردوگاکاندا نەبوو بۆ خەڵك ، جگـە لـەم ئۆردووگایـە چـەندانی دیکە دامەزران و خەڵکی راگوێزراوی گوندە خاپوور و کاولکراوەکانی کوردستانی تێدا مۆڵ کران.

بەبەر چاوی خەڵکـەوە سـەربازە عەرەبـە بێڕەحمـەکانی دیکتـاتۆر سـووکایەتیان بـە خـەڵکی ئۆردوگاکان دەکرد، دەستییان بۆ حەرامەکان دەبـردوو لاقـەی کچـە عازەبـە کوردەکانیـان دەکـرد ئۆردوگاکە بـۆنی شـەهوەتی پیـاوانی ئەسـتێرە و داڵ لەسـەر شـانی رژێمـی گرتبـوو، (میهـرداد کاکەوەیس)هەر زوو لەو ژیانە نامۆیە بێزار و وەڕس بوو خۆی و خێزانەکـەی بـەردەوام گۆشـەگیری ماڵەوە بوون، لەدوای چەند شەوێك لە جێگیر بوونیان لە تاریکـایی شـەوێکی درەنگـدا شـەڕێکی گـەورە رووی دا و هێزەکـانی پێشـمەرگە لـە سـنوورەکانی شـوورا تەلبەندەکـەوە گـوزرێکی تێروتەسەلیان لە دووژمن وەشاند و چەندین سەربازو پلەداری گەورەیان کوشت.

لە پاداشتی ئەو کردەوەیەدا رژێم بڕیاری لە سێدارەدانی چەندین گەنجی بێتاوانی دەرکرد و هـەر زوو هەموویان لە مەیدانە گەورەکەدا بە داردا کران. (میهرداد) لە رێگەی خزمێکی ئەفسـەرییەوە کاروباری بۆ ئەنجام دابوو، لە ئۆردووگاکە بردییە دەرەوە و لە شـارە گەورەکـەدا و لـە گـەڕەکێکی کۆنی ئەو شـارەدا خانوویـەکی کـڕی. ئیـدی لـەو ژیانـە نـاخۆش و دژوارەی (ئۆردوگـای کونـدە پەپووەکان) رزگاری بوو، دەستی دایە کار و کاسبی و دووکانێکی مافوور و بەڕەو فـەرش فرۆشـی دامەزراند کە لە ئێرانەوە مافووری دەهێناو لەوێدا دەیفرۆشت وردە وردە (دڵارام) گـەورەتر دەبـوو. ئەو دەمە ژیانیان بەرەو باشی دەچوو، هەستیان کرد لە شاردا هەناسەیەکی دیکە هەیـە بـۆ ژیـان، تا ڕادەیەکی زۆر شـار بـەرەو هێمنـی دەچـوو، بـەڵام ئـەوێش بـەدەر نـەبوو لـە هەڕەشـەو چـاو سووڕکردنەوەی رژێم، ژیان بەو شێوەیەی دەبوو ببێت بەردەوام بـوو (دڵارام) دەکەوتـە قسـەکردن و زمانی دەپرژا و گەورە دەبوو یاریی دەکرد و بۆ ژیان پێدەکەنی.

پێکەنینەکەی جیاوازترین سۆزی مۆسیقای تێدابوو لـە دەنگـی گمـەی کۆترەکـان دەچـوو بـە چەشنی پاساریەکان هەمیشە لە راکردندا بوو لەمبـەر بـۆ ئـەو بـەر، منـداڵی (دڵارام) سـەرەتای پەیدابوونی کێشەگەلی گەورە بوون بۆ وڵات و بۆ ژیان، ئەوان زۆرانبازیان لەگەڵ زەمەنێکدا دەکـرد کە مانای مرۆڤ و ژیان بەرەو نادیار هەنگاوی دەنا.

لێرەو لەوێ ژمارەی ئۆردوگاکان زیادیان دەکرد. ژمارەی سەربازی هەوەسباز و چاوسـووڕ زیـاد دەبوون. ئەو دەمەی یاساغ بۆ ناوی وشەی کوردستان بهێنرێت، خەباتگێڕان لە چیا بڵندەکان بـەرەو وڵاتی بەفر سەردەکەوتن، سەردەمێکی ترسناك بوو. (میهرداد کاکـەوەیس) لـە بـیری (حـەکیمی رووناکیی) دا بوو، هەمیشە هاوارو نزای بۆ خـودای بـاری تـەعالا دەکـرد و دەیگـوت: (خودایـە

حەكیم بپارێزە) لە جلوبەرگێكی كوردی مەیلەو خاكیدا فەرشەكانی هەڵدەواسی و لەسەر نەخشە تەورێزیەكان لێكدانەوەی جیاوازی دەكرد، دیمەنی سادەگەلی لە رەفتار و كردارەكانیدا دەبینرا. ئیدی (دڵارام) یەكەمین و دواهەمین منداڵیان بوو. لەدوای ئەو دووجاری دیكە (مەستی سوارۆ ئاغا) دووگیان دەبوو، بەڵام منداڵەكانی دەمردن و بۆی نەدەژیان. ئەوەش كردارێكی خودا كردە بوو، هەر خۆی دەیزانی چۆن هاوكێشەكان رابگرێت.

(دڵارام)ی تاقانە زیرەك و زیرەك تر دەبوو، ژیانی لەنێوان خانەوادەیەكی نیمچە دەوڵەمەند بەسەر كەوت، هێدی هێدی سنووری كار و كەسایەتی (میهرداد)زیاتر دەبوو، دەوڵەمەند دەبوو، هەر لەو چەند ساڵە نەهامەتییانەدا چەندین موڵك و زەوی گەورەی لە شاردا كڕی و خودا ژێوارێكی زۆری وەك تەرزە و باران بەسەردا رشت، سامانەكەی گەورە دەبوو، ئەو دەمە لە شاردا ناوبانگی پەیدا دەكردو رێزی زۆری لێدەگیرا.

ئەو لە خەونە مێژینەكەی دوورنەكەوتبۆوە و نزای دەكرد كیژەكەی ببێتە ئەندازیارێكی تەلارسازی بەهرەمەندو زەویە قەدەغەكراوەكان ئاوەدان بكاتەوە، بەڵام ئەو خەونە لەو دەمەدا دژوارو نەكردەبوو، چونكە هەموو زەوییەكان كاول و وێران و یاساغ بوون.

خۆ ئەو بەو پارە زۆرەی كە هەیبوو توانای هەبوو باشترین تەلارساز و میعمارەكانی ئێران بانگێشت بكات و كۆشكە گەورەكەی بۆ بنیاد بنێن، بەڵام ئەو سوێندی خواردبوو، كە دەبێت لە وەچەو نەژادی خۆی ئەندازیارێك پەیدا ببێت و ئەو خەونەی تەواو بكات خەونێكی پووچ و بێ ئاكام.

هەموو ئومێدی بە زیرەكی (دڵارام) بوو ئەو كیژە جوانكیلە رووخۆشەی كە لە روحێكی جوانی بەهەشتییەوە بە خەڵات بە (میهرداد) درابوو، لە پەنجەكانییەوە جوانی دەكەوتە خوار. (میهرداد) جگە لەوەی بە كاروباری بازرگانی مافوورو نەخشی دانسقەوە سەرقاڵ بوو. خەباتكارانی چیای پشت گوێ نەخستبوو لە ژێرەوەڕا لە رێگەی چەند كەسێكی شیاو و خاوەن ئەمانەت پارێزەوە زۆر جار هاوكاری ماددی رەوانەی چیا دەكرد. هەمیشە هەواڵ نێرێكی هەبوو، سۆراخی (حەكیمی رووناكی) بۆ دەكرد، بەڵام نە لەناو بەفر و نە لەناو چیاكاندا هەواڵێكی بەدەست نەدەكەوت، بەڵام دەیزانی كە (حەكیم) نامرێت و دەژی، بەڵێ راست بوو ئەو دەژیا و هەمیشە لەبەرگی جیاوازدا دەردەكەوتەوە.

ئەو سەردەمە كابرایەكی دزێو و پیاو كوژی گەورەی رژێم لە شاردا دەژیا بە ناوی (جومعە تكریتی) كابرایەك هیچ سۆزێك هیچ وشەیەكی مرۆڤانە لە گەروویدا نەبوو. بە خوێن نەبووایە

ئاسووده نەدەبوو و سوێندێکی نەگریسی خواردبوو، کە دەبێت هەموو ڕۆژێك خوێن ببینێت، لەناو شاردا خوێنی لاوانی دەڕشت و تێر نەدەبوو، ئەو سەردەمە هەموو شارەکانی کوردستان کارەکتەریکی دڕندەی لەو شیوەیەیان هەبوو،هەرووەك چۆن (حسە زیپکە) هەبوو، (جومعە تکریتی)ش هەبوو کە دڕندەترین کەسێك بوو مێژوو بە خۆیەوە بینیبوو هەمیشە لە کاتی دەرکەوتنیدا لە بازاڕو شوێنە گشتییە چەپەڵەکاندا خەڵك لێی هەڵدەهاتن و رایان دەکرد، ئیتر بە ئارەزووی خۆی سووکایەتی بە خەڵك دەکرد، ڕۆژی وا هەبوو بۆ کەیفی خۆی روومەتی گەنجانی بە چەقۆیەکی تیژ بریندار دەکردو زمانی لە خوێن دەداو وەك شێت هاواری دەکرد.

خودایە چی ڕۆژگارێکی پڕ لە ئاشووب بوو، مرۆڤ لە شوناسی خۆی هەڵدەهات روح لە جەستەکان رای دەکرد و بەرەو ئاسمان ئاوا دەبوو، فرمێسك دەچۆڕانەوە بۆ زەمین، گوڵەکان دەژاکان، کۆترەکان بە ڕۆژ خۆیان رەش دەکرد، پەپوولەکانی ماڵی (میهرداد) رەشتر دەبوون لە شەوە تاریکەکانی شار، بەڵام (دڵارام) بێ ئەوەی لە دنیا رابمێنێت شاگەشکە دەبوو پێ دەکەنی یاری لەگەڵ پەپوولەکان دەکرد.

ئەو کاتەی پاڵەوانی عەرەب پارێزەری دەروازەی خۆرهەڵات پەلاماری وڵاتێکی بچووکی دراوسێی خۆی دەداو وڵاتێکی تالآن دەکرد و ناوی لێ دەنا پارێزگای نۆزدەهەم و وڵاتی تالآن و کاول دەکرد، (دڵارام) تەمەنی شەش ساڵان بوو، وڵات لە لێواری هەندێك گۆڕانکاریدا بوون، خەباتکارانی کورد خۆیان بۆ راپەڕینێکی جەماوەری ئامادە دەکرد ئیدی رژێم لە دوایدا بوو. خۆی لە قەرەی وڵاتانی گەورەی ڕۆژئاوا دەداو ئەو سەردەمە گەردەلوولی بیابان هەڵی دەکرد و سەراپای سوپای رژێمی خاپوور دەکرد، هەزاران سەربازی بەزۆر نێردراوی عێراق لەو شاڵاوانەدا دەسووتان و بە ئاگرەوە رایان دەکرد، ئیدی دیکتاتۆر بە بڕنەوەکەی بەسەر خەڵکدا گوللەی دەتەقاند و ماسوولکەی خۆی نیشانی خەڵی داماو و زەلیلی وڵات دەدا.

دوای ساڵێك لە بەهاردا راپەڕین رووی دا و کورد شارەکانی خۆی لەدەست دامودەزگاکانی دیکتاتۆر پاك دەکردەوە ژیانێکی دیکە دەستیی پێکرد، هەر لەو ساڵەدا کۆڕەوی گەورە رووی دا، یەکێك لە کۆڕەوە گەورەکانی مێژوو وەك رەوی جوولەکەکانی جیهان، یان رەوی رواندابیەکان، کوردیش رەوی دەکرد بەیەك دەنگ دەمانگوت: (نا بۆ حوکمی تۆ ئەی گەورە نا بۆ تۆ... نا بۆ تۆ).

بەڕاستی نەتەوەی کورد بە زنجیرەیەکی ناخۆش لە رووداودا تێپەڕ بووە، دیمەنی کوژرانی هەزاران سەربازی رژێم لەناو دەزگاکانی ئەمن و ئاسایشدا وەك لیژنە دار لەسەر یەك هەڵدەچنران

دژوار بوو بۆنی مۆخی کاسەسەری بەرپرسە گەورەکانی رژێم بـۆنی سـووتانی لاشـەی سـەربازەکان ولاتی تەژی کردبوو لە بۆگەنی، دیمەنی سووتانی بیرە گەورەکانی نەوت ئاسمانی ولاتی پڕ کردبوو لە دووکەڵ و دنیا تاریك داهاتبوو ئەوە ناوی راپەڕین بوو، بەلاَم زۆری نەخایانـد کـۆڕەوێکی گـەورەی ملیۆنان کەس لە کوردستان رووی دا، وەك هەمیشە پەنامان بۆ ولاتانی دراوسێ برد بـۆ ئێـران بـۆ تورکییا، ئەوانیش سووکایەتی زۆریان بە خـەڵك دەکـرد کـولێرە و نـانی بـێ خـوێی ئێرانیـان لـە فڕۆکەکانەوە بۆ فڕێ دەدایـنە خوار و پاڵیان بە خەڵکەوە دەنا بۆ ناو قـوڕو چـڵپاو ئـای لـەو دیمەنـە بڕووسکە ئاسایانە.

سەردەمانێکی دیکە هات ژیان بەرەو خۆشی چوو، بەلاَم بەدەر نـەبوو لـە شـەڕو کوشـتن ئـەو دەمەی گەڕاینەوە حکومەتێکی خۆماڵیان درووست کرد شـەڕی براکـان سـەریان هەڵـدا و لەسـەر کورسییەکان شەڕی دیکە بەرپا بوو، خەڵکانی دیکە کوژران.

(دلاَرام) گەورە دەبوو دەچووە بەر خوێندن و ساڵەکانی خوێندنی بە ئەزموونی بەرزەوە دەبـڕی و پۆلەکانی بە نمرەی بەرزەوە بەسەر دەکردەوە، ئەو دەمە دەبووە جێگـای سەرسـووڕمانی خانـەوادەو مامۆستاکانی، لەگەڵ پەپوولەکاندا بە خوێندنگەکەیدا دەگەڕا، هەمیشە خاڵێکی مۆر هەندێ جار سوور و شین و چی و چی لەسەر ناوچەوانی دەردەکەوت کە دەرروونی (دلاَرام)ـیان تـەعبیر دەکـرد، لەبەرگی کچێکی جوانکیلەدا دەبووە سەرمەشقی بوویرەکان و گـەورە دەبـوو. (میهـرداد) ئـاواتی دەخواست کچەکەی بگاتە پلەیەکی بەرزی خوێندن لەگەڵ کێشمە کێشمی دنیا و ولاتدا درێژەی بـە کارەکانی دەداو بۆ یەکەمین جار سەردانی زێدی باپیرانی دەکردەوە بۆ سەرزەمینی مینەکان.

ئەو کاتەی (میهرداد کاکەوەیس) گەڕایەوە بۆ ئاوابییەکی بـاپیرانی سـەرەتای سـاڵی (١٩٩٢) بوو بە ماشینێکی لاندکرۆزەر لەگەڵ دوو خزمی خـۆی گەیشـتنە ناوچـە چیاییەکانی خۆیـان لـە دوورەوەرا ئاسەواری خانووە کۆنەکەی خۆیان دەبینێت لەسەر بەرزاییەك، هەروەها دیمـەنی کـاول و خاپوورکراوی گوند دەیخاتە گریان ، لە هەر سووچێکی گوندەکەیان دیمەنی وێرانە دەبینرێـت ئـەوان لە وەرزی زستاندا دەگەنەوە گوند دیمـەنی دار هـەرمێ رووتەڵـەکان، کـە سـەردەمانێك لـە سـەر سەکۆیەکی لە گڵ و بەرد دروستکراو لە بنیاندا دادەنیشت و بیری لە ژیان دەکردەوە. دەیخاتە بـیری ساڵانی رابردوو بەر لە هەشت ساڵ و لەم گوندەدا خەونێکی گەورەی لە مێشـکدا گەلاڵـە کردبـوو، لەگەڵ دوو ناسراوەکەیدا دەچنە ناوجەرگەی گوندەکە و سـەردانی ماڵـە وێرانەکـەی خـۆی دەکـات دەبینێت باخچە و گوڵەکان وشك هەلاتوون ئاسـەواری سـەدان ئینجانـەو کەلوپـەلی لـە دارو قـوڕ دروستکراو لە گوندەکەدا بەدەردەکەوێت، بەلاَم زووتر خۆی زانیبووی کە رژێم دوژمنێکی ئامـادەی

لە زەویەکاندا چاندبوو کە پێی دەوترا مین هەموو سەرزەمینەکان بە مین چێنرابوون تەنانەت گیاندارو کەروویشك و ڕێوی و بەرازو هەموو گیانداڕێکی دیکەی ناوچەکان توانای پەڕینەوەی ناوچەکانیان نەبوو هەزاران گیاندار پێکرابوون زۆرێك لە خەڵك و پێشمەرگەش بەدەر نەبوون، پارچەپارچە بوون و بوونە قوربانی ئای لەو دوژمنە سەرکێشەی لە زەویدا خۆی بۆ هەموو روحلەبەر و مەخلووقێك ئامادە کردبوو، ئەو کەسی نەدەناسی دوژمنی بێداری هەموو شتێك بوو، بەر لەوەی بچنە ناوچە مینڕێژکراوەکان چەند سەعاتێك لە گوندەکەدا مانەوە. ئەو جێگەیەی بڕیاری دابوو کۆشکەکەی تێدا دروست بکات دەکەوتە ناو باخێکی گەورە، بەڵام باخێکی وێران و بێ خزمەت و بێ خاوەن، داهات و کرێکاری زۆری دەویست بۆ چاککردنەوە، باخەوانی شارەزا دەبوو خزمەتی میوە و دار و درەختەکان بکات.

(میهرداد) بەرنامەڕێژی بۆ ئاوەدانکردنەوەی باخ و رەزەکانی خۆی دەکرد ئیدی وردە وردە خەڵکی ڕاگوێزراوی ئۆردوگاکان لەگەڵ گۆرانی (بەردێك دوو بەرد دیوارێك دیوارێك دوان ماڵێك ماڵێك دوان گوندێك) دەستییان بە گەڕانەوە دەکرد بۆ ناوچەکانی خۆیان هەر لەو ساڵانەدا سەدان ڕێکخراوی بیانی و ئەمریکی و ئەورووپی سەردانی کوردستانیان دەکرد و بارەگایان دادەمەزراند و یارمەتی خەڵکی گوندەکانیان دەدا لە دروستکردنی پڕۆژەی ئاو و مزگەوت و کابینەی خوێندنگاکان، هەروەها هەندێك لە ڕێکخراوەکان دەستییان بە پاککردنەوەی ناوچە مینڕێژکراوەکان کرد یەکێك لە هەرە وڵاتە پیسەکانی دنیا کوردستان بوو کە دوژمن لەناوچە چیاییەکان و سنووریەکان بە ملیۆنەها مینی لە ژێر زەویەکاندا شاردبۆوە، دەبوو خاکەکان پاك بکرێتەوە، لێرەولەوێ رۆژانە هەزاران کەس دەمردن و کەم ئەندام دەبوون زۆر کەس بێ دەست و قاچ و بێ چاو بوون، پاڵەوانێکی گەورە لاوێکی ئازا هەبوو، خۆی هەردوو قاچەکانی لە مین هەڵگرتنەوەدا لەدەست دابوو، بەڵام بە تەنیا زیاتر لە یەك ملیۆن مینی لەناوچە جیا جیاکانی کوردستان پووچەڵ کردبۆوە لە وڵاتانی ئاسیای رۆژهەڵاتەوە خەڵاتی تایبەتی پێدرا ناوی (شۆڕش ڤالمارا) بوو، خۆشەویستی ئەو بۆ مینەکان سەرنجڕاکێش بوو، ئەو لە ماڵەکەیدا پێشانگایەکی بچووکی بۆ سەدان جۆر لە مین کردبۆوە.

دوای ڕاپەڕین زۆربەی گوندکانی کوردستان هێدی هێدی پڕ بوونەوە لە دەنگی خەڵك لە دەنگی ژیان لە دەنگی مزگەوت و بانگ و دەنگی مانگا و بزن و مەڕو کە لە شیر و گوێدرێژ، ژیان لەبەرگێکی دیکەدا سەری هەڵدایەوە، دواجار لەدوای هەر وێرانەیەك ئاوەدانییەك دێتەوە لەدوای رووخانی هەر دیوارێك دیوارێکی دیکە بە پێوە رادەوەستێت کۆترەکان دەستییان بە

هێلکەکردن کرد و ئاسمان بە پاساریەکان ئاشنا بۆوە گوڵـەکان دەسـتییان بـە گەشـەکردن کـردەوە، ئەشق لە کانیاوەکانەوە سەری هەڵدایەوە حاجیەکان لە دەرگای مزگەوتەکانەوە کۆ بوونەوە.

نیوەڕۆیەکی گەرم بوو لە وەرزی هاویندا کاتێك (میهرداد کاکەوەیس) لەگەڵ (مەسـتی سـوارۆ ئاغا) سەرقاڵی خواردنەوەی چای بوون لە پڕ دەنگییکی بەرز بە ئاگای هێنانەوە دەنگییـك زۆر لـە مێژ بوو (میهرداد) چاوەڕوانی دەکرد، دەنگییـك سـەراپای ژیـانی گـۆڕی دەنگییکـی سـەیر کـە نزیکەی بیست و دوو ساڵ چاوەڕوانی دەکرد، ساڵانێکی زۆر بە شەڕو ئاشووبدا تێپەڕی بـوو، بـەڵام لەو دەمەدا بە گریانێکی خۆشییەوە (دڵارام میهرداد) خـۆی کـرد بـە ماڵـدا سـەراپای جەسـتەی پەپوولە بوو بەدەنگییکی گریاناویەوە هـاواری کـرد: (بابـە گیـان بابـە گیـان. مـن لـە کۆلێـژی ئەندازیاری وەرگیرام... من دەبم بە ئەندازیاری تەلارساز، بەڵێن دەدەم ئەو تـەلارەی خـەونی پێـوە دەبینیت لە بڵندترین شوێنی وەتەندا دروستی بکەم) ئیدی ئەو چرکەساتەی (میهرداد کاکـەوەیس) هەواڵەکەی بیست مەزەندە ناکرێت.

(میهرداد) بە شێوەیەك رووی گەش ببووەوە، هەرگیز لە ژیانیدا رووی نەدابوو، لە خۆشییدا بە کوڵ گریابوو، هەندێك جار مرۆڤ لە لێواری خۆشییەکاندا ئـەو خۆشـییانەی بـە هـەوراز و نشـێوی زۆردا دەیگەینێ دەتخاتە گریان، ئەو دەمە گریان جێگا بە پێکەنین لێژ دەکات و فرمێسکی شـادی باڵ بەسەر دنیایەك لە خۆشییدا دەکێشێت.

هەر هەمان رۆژ بۆ ئێوارە (میهـرداد کاکـەوەیس) دەڕواتـە بـازاڕو لـە هـەموو دووکانـەکانی شیرینی فرۆشتن خۆشترین جۆرەکانی پاقلاوە و برمە و شعریە دەکڕێت و بە سەر خزمـان و دراوسـێ و دۆستانیدا دەیبەخشێتەوە لەبەردەم هەندێك لـە مزگەوتەکانـدا بـە چـنگی گـەورە پـارە بەسـەر سواڵکەرو هەژارەکاندا دابەش دەکات لـە جـوانترین جۆرەکـانی گـوڵ ئینجانـەو چـەپك بـۆ کچـە تاقانەکەی دەکڕێت پێشکەشی دەکات (دڵارام) ئەو دەمە لە تەمەنی هەژدەساڵیدا دەبێت، خۆی بۆ ئەزموونێکی نوێ ئامادە دەکات، بە عیشوەو نازێکی زۆرەوە لەگـەڵ چـەند هاوڕێیـەکی دیکەیـدا دەست دەکەن بە کاروباری ناو نووسین و خۆ تۆمارکردن، بەڵام پەپوولەکان لە ئەو ناتۆرێن.

یەکەمین یەکتربینینی (دڵارام میهرداد) و (کامەرانی وەنەوشە) رۆژێك بوو کە بە سووتفەیەکی سەیر دەستی پێکرد باخچەیەکی بچووکی کۆتر و بایەکی لە ناکاو دیدارەکەی دروست کـرد، ئیـدی پەڕە کاغەزێك بە دەم باوە دێت و لەبەردەم پێیەکانی (کامەرانی وەنەوشە) دا دەکـەوێت دەمبینـی (کامەرانی وەنەوشە) پەڕە کاغەزەکەی هەڵدەگرتەوەو دەیبردەوە بۆ (دڵارام) ئەو دەمە مـن لەگـەڵ (کامەران) بووم دوو گەنج بووین لەبەرگی رەشدا وەك قەلەڕەشەکانی ئاسمـان (دڵارام) لەگـەڵ سـێ

هاوڕێیدا هەریەکەو دەستەسڕێکی پەمەییان بەدەستتەوە بوو، پەپوولەکان ناسروشتی بە دەوریاندا دەهاتن و دەچوون. (دڵارام) بە دوو چاوە هەنگوینییەکانی تێر لە گوڵە وەنەوشەییەکەی سەر سینگی (کامەران) ی دەڕوانی (دڵارام) لەگەڵ هەریەك لە (مەندانە) و(شابانوو) و (گوڵبانوو) دوو خوشکە بچووکەکە بوو، ئەوە یەکەمین بینینی سیحراوی نێوان ئەم دوو پاڵەوانە بوو.

ئەو دەمەی چاوەکانیان لەسەر یەکتر گیریان خوارد، هەستم کرد هێزێکی ناسروشتی بەرەو یەکتر کێشیان دەکات، هێزێکی گەورەو موگناتیزی وەها کە لە دەرەوەی کۆنترۆڵی ئادەمیزادەوەیە، شتەکان وەك سووتفە وەهابوون، وەك بەرنامە بۆ دارێژراو بوون لە پلانێکی گەردوونی دەچوون پلانێکی ئاسان، هەستم بە تێکەڵاوبوونی نیگاکانیان دەکرد، نیگاکانیان وەك گوورزە تیشکی سپی دەهاتن و دەچوون وەردەگەڕان، هێزێکی وەهمی لەنێوانیاندا بۆ چرکەساتێکی کورت دروست بوو، پەپوولەکان زۆر سەیر بە ئاسماندا دەفڕین، دیمەنی خاڵەکەی سەر تەوێڵی (دڵارام) سەیر بوو خاڵێك بوو هێندەی مووروویەکی شیلانە دەبوو خاڵێك ڕەنگەکەی چرکە بە چرکە دەگۆڕا سەرنجی ڕاکێشام و تووشی شۆکی کردم هەناسەم سواربووبوو، دەستی (کامەرانی وەنەوشە) م دەگرت و دەڕۆیشتین ئای لەو ڕۆژە، لەو وێنەیە هەرچی دەکەم لە یادی ناکەم هەمیشە وەك دێوەزمە لە خەونەکانمدا دووبارە دەبێتەوە، هەمیشە کۆمەڵێك پەپوولە دەبینم، دەڕۆیشتین و (کامەران) ئاوڕی دەدایەوە من (کامەران)م پەلکێش دەکردو وەك مەلێك بە دوای خۆمدا ڕامدەکێشا.

لەوەو بەر هیچ کات (کامەرانی وەنەوشە) باسی ئەشق و ئەڤینداری بۆ نەکردبووم تا ئەو دەمە وام هەست دەکرد (کامەران) حەز ناکات لەگەڵ ڕەگەزی مێینەدا ئاشنا بێ، بەڵام ئەو ڕۆژە زۆر جیاواز بوو، سەیرکردنی دنیایەك خوێندنەوەی پیشان دەدا.

دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ بەشی ناوخۆیی چەند جارێك سەردانی (کامەران)م کرد یەك تەختە بە جلە ڕەشەکانییەوە لەسەر قەرەوێڵە ئاسنەکەی پاڵ کەوتبوو دەستەکانی خستبووە ژێر سەری و سەیری بنمیچی ژوورەکەی دەکرد جووڵەی نەدەکرد، بەڵام سەرنجم لە لێوەکانی دەدا دەیبزواندو ورتە ورتی دەکرد وام دەزانی گۆرانی دەڵێت، بەڵام ئەو لەبەر خۆیەوە یان وڕێنەی دەکرد یان شیعری (مەحوی) دەخوێندەوە، ئیدی بەخەبەرم هێنا زۆر ناسروشتی دەدوا و دەیگوت: (زۆر جوان بوو جوانییەکی ئاسمانی ڕەنگە ئەم

جوانییە لە چاوی خەڵکی تردا جیاواز بێت، ڕەنگە کەسانێك هەبن بەجوانی ئەم ئافرەتە نەبینن، بەڵام لە لای من جوانە لە هاوشێوەی خۆم دەچێت لە تێڕامانوو نیگادا).

ئەو دەیگوت: (هەندێ جار لەبەردەم ئاوێنەدا کاتێك قژم شانەکردووە و خۆم جوان کردووە تارمایی ئەم کیژە لە پشتەوە بەرچاوم کەوتووە، دەیگوت: کە ئەمە وەك ئەفسانەی مەم و زین نییە، بەڵام ڕاستییەکی سەیرە خودا خۆی نەخشەی بۆ کێشاوە)، ئەو باسی چەند شتێکی دژواری بۆ من کرد کە لەو کاتەدا لە تەواوی ماناکانیان نەگەیشتم، بەڵام سەردەمێکی دواتر لە ڕاستییەکان گەیشتم، ئیدی هەمان ڕووداو لە ژیانی (دڵارام)یشدا دروست ببوو ئەویش چەندین جار لە ئاوێنەدا وێنەو تارمایی (کامەرانی وەنەوشە) ی لەلا دروست ببوو هەر بۆیە هەریەکەیان بە شێوەیەکی نادیار تەماشای یەکتریان کردبوو لە یەکەمین دیداردا، هیچ کام لەوان چاوەڕوانی سووتفەیەکی وەهایان نەکردبوو، لەهەمان شاردا هاوشێوەکان یەکتری ببیننەوە، نەخشەیەك بوو خودا خۆی لە مێژەوە وێنەی بۆ کێشابوو دەبوو بەو شێوەیە بێت.

چەندین جاری دیکە لە خەوندا لە خەونە دێوەزمەییەکانی (کامەران)دا دیاردەی سەیر دروست ببوو، دواتر لە ڕاستییدا لە ژێر نووری خۆردا بەهەمان شێوە یان کەمێك جیاوازتر ڕوویان دابۆوە، هەمیشە خەونی ئادەمیزاد لە کەش و ئەتمۆسفیرێکی کەمێك تاریکدا ڕوو دەدات لە خەوندا خۆر نییە تاریکایی پانتایی سێبەر باڵ بەسەر تەنەکاندا دەکێشێت وا دەکات شتەکان بە شێوەی خۆی نەبینێت.

ئەو جارەی کە (گرووپی دەستەسڕ بەدەستەکان)ـمان بینیووە بۆنێکی خەیاڵ بزوێنەر بۆنێکی خۆش بەهەشتی دنیای تەنیبوو ڕۆژێك بوو هەریەك لە من و (کامەران) حەپەساو تەماشای یەکترمان دەکرد و لە یەکترمان دەپرسی بۆن دێت بۆنێکی خۆش زۆر خۆشتر لە هەموو بۆنەکانی دنیا نە یاسەمین و نە سنەوبەری تەڕ و نە ڕێحانە بۆنی وەهایان نەبوو. کامەران دەیگوت: (شاپوور هەزاران جۆر بۆنم تاقیکردۆتەوە، بەڵام لە هیچ کام لەو بۆنانە ناچێت نە لە بۆنی ڕەفیف و نە لە بۆنی گوڵە دالیاو نە لە بۆنی مروە دەچێت)، بەڵام دواجار بۆنی چوار کچ بوو دەهات (گرووپی دەستەسڕ بەدەستەکان) بۆنی زوڵفی (دڵارام) بوو کە عەیارانە لەگەڵ پەپوولەکاندا سەمای دەکرد، پێدەکەنی ئەو دەمە ئەوان چوار کچ بوون لە یانەکەدا دانیشتبوون بۆ خواردنەوەی قاوە. ئێمەش ماندووی وانەکان بووین و لە پشوودان دەگەڕاین، چەند جارێکی دیکە بەو شێوەیە یەکترمان بینیوە لەهەموو جارەکاندا تروسکەی چاوەکانی (کامەران) و (دڵارام)

بەناو یەکتردا تێدەپەڕین و دەبوونە پردی وەهمی و نامەو شیفرەی گەردوونیان بۆ هەستەوەرەکانی یەکتر دەگواستەوەو ئاماژەو جووڵەی جیاواز کە لە زمانی سەرزەمینی نەدەچوون هەریەکەو مانایەکیان هەبوو بە پردی پەڕینەوە وەهمیەکەی نێوانیاندا دەگواسترانەوە، ئیدی وڵات لە لێواری گۆڕانکاریدا بوو، جەنگێکی خوێناوی بەرێوە بوو کە زۆر ئازیزمانی تێدا رۆیشت، خەڵك تاساو چاوەڕوانی لێدانی دیکتاتۆر و رووخاندنیان دەکرد، بەڵام دنیا خاڵی نەبوو لە ئەشق، ئەشق هەمیشە سەروەر بوو، ئاشق نەدەدۆڕا. ئەشقیش وەهم نەبوو. خەیاڵ و تراویلکە نەبوو واقیع بوو، ئەو دەمەی پەیکەری دیکتاتۆر رووخا دنیا گۆڕا ئاهەنگی گەورە گەورە لەسەر شەقام و باخچە و هۆڵ و یانەکاندا رێك دەخرا.

# ١٩

## (کەوتنی پەیکەری دیکتاتۆر)

## ئایاری ٢٠٠٣

ئاسمان تەژی ببوو بە هەوری رەشی بەهارو گرمەو نەعرەتەی هەورەکان ئاسمانی شاریان تەنیبوو، بە خوڕ دەبارین، ئەو دەمەی لە لایەن ئەمریکاوە لە عێراق درا خەڵکی کوردستان بۆ جارێکی دیکە رەویان کرد بۆ ناوچە چیایی و سنووریەکان لە ترسی وەشاندنی کیمیایی و چەکی ناوەکی. ئەوە رۆژێکی جیاواز بوو خەڵك لە چیاکان ئاگریان دەکردەوە، بەڵام ئێمە لەناو شاردا ماینەوە لە نزیکەوە لە سەر قەڵا بەرزەکەی شار لەگەڵ سەرۆکی هەرێم بووین کە ئاگرەکەی کردەوە، بەڵام شار چۆڵ ببوو، خەڵك لە مەرگ رایان دەکرد لە یەکەمین رۆژی بەهاردا بوو بەرەبەیان بوو لە کەناڵە ئاسمانییە عەرەبیەکانەوە راستەوخۆ رۆماڵی شەڕو لێدانەکانی رژێم دەکرا. یەکەمین مووشەك لە بەغدا درا ئیدی دەنگی کاتیۆشا و مووشەك و هەزاران جۆر چەکی دیکە وڵاتیان لە خەون راپەڕاند.

رووداوێکی سەیر بوو، هەموومان چاومدان لە تەلەفیزیۆنەکان بڕی بوو چاوەڕوانی لێدانی (سەدام)مان دەکرد.

ئەو پیاوەی یەکێك بوو لە هەرە خوێنمژترین پیاوە دڕندەکانی سەدەی بیستەم و ناوی چووە ناو زبڵدانی مێژووەوە، ئەو زبڵدانەی شوێنی خۆفرۆشان و پیاو کوژان و دڕندەکانە، ئاخر مێژوو دوو دەرگای هەیە، یەکێکیان دەرگای سەر بڵندەکانە، کە چوونە ناوی دنیایەکی دیکەیان هەیەو بە سەر بەرزی دەمێننەوەو بۆ هەمیشە تێیدا دەمێنێتەوە، دەرگاکەی تر دەرگای سەر شۆڕەکانە و کە چوونە ناوی ئیدی بۆ هەمیشە ناتوانن بێنە دەرەوە و بۆ کۆتایی لەوێ دەبن و لەگەڵ ناوچاوان و تەوێڵ رەشەکانی مێژوودا دەمێننەوە. هەردوو دنیاکە پڕن لە ئادەمیزاد، هەریەکەیان بە شێوەیەك لە لاپەڕەکاندا تۆماردەکرێت، من و (کامەرانی وەنەوشە) لە نزیکەوە لەناو شاردا ماینەوەو پاسەوانیمان لە بازاڕو دووکانەکانی ئەو ناوچەیە دەکرد کە باڵەخانەکەمانی تێدا بوو، ئیدی شار چۆڵ و هۆڵ هەریەکەمان ئامادە بووین پارێزگاری لە چەند ریزێك دووکان و باڵەخانە بکەین نەبادا شاڵاوی تاڵانی سەرهەڵبدات. لەوەوبەر بە چەند رۆژێك لە لایەن دۆستێکی نزیکەوە کە لەناو

یەکێك لە حزبە کوردیەکاندا دەستی دەڕۆیشت دوو دەمانچەی میکارۆفم دەستکەوت لەگەڵ چەند شانەیەك فیشەك لە راستییدا ئێمە تەنیا لە فیلمەکاندا دەمانچەمان بینیبوو

کە چۆن بەکاردەهێنرێت، بەڵام ئەو دۆستەم فێری بەکارهێنانی کردبووم منیش (کامەرانی وەنەوشە)م فێرکردبوو، لە ژێر چاکەتەکانمانەوە دەمانچەکانمان حەشار داو وەك حەس حەس لەناو بازاڕەکاندا دەسووڕاینەوە کاری ئێمە پارێزگاری کردن بوو. (کامەران) هەمیشە دەیگوت: (گرنگ نییە من چۆن دەژیم گرنگە کە خەڵك خۆش بژی) زۆر لە دووکاندارەکانی ناو بازاڕ لە ترسی ژیانی خۆیان نەیانتوانی بوو هەموو کەلوپەل و شمەك و کەرەستەکانیان لەگەڵ خۆیان بیبەن.

چەندین رۆژو شەو ئێمە بە نۆرە دەنووستین و پاسەوانیمان لە باڵەخانە و بازاڕەکان دەکرد، هەرکات من دەخەوتم (کامەران) چاودێری دەرەوەی دەکرد، هەرکات (کامەران) دەخەوت من چاودێری بازاڕەکانم دەکرد، چونکە زۆرینەوەی خەڵکی ناوچەکە دۆست و برادەرمان بوون. یەکێك لەوان (هەندرێن کەمالیات) بوو کە هاوڕێیەکی ئازیزمان بوو دووکانەکەی بە کەلوپەلەوە بەجێهێشت بوو، هەر چۆنێك بێت لێرەو لەوێ شارو شارۆچکەکانی باشووری عێراق لە هێزەکانی دیکتاتۆر پاك دەکرایەوە، سەرەنجام دوای مانگێك و چەند رۆژێك پەیکەری دیکتاتۆر لە پایتەخت لە لایەن هاوڵاتیانی دڵپڕ لە زام رووخێنرا لەگەڵ کەوتنی پەیکەرەکە ئیدی رژێم بەرەو زبڵدانی مێژوو سەفەری کرد، هێزەکانی ئەمریکا و رۆژئاوا، هەموو سەکۆ مووشەکیەکانی رژێمیان تێك شکاندبوو، هەر بۆیە هێدی هێدی خەڵك بۆ شارەکان گەڕانەوەو ژیانی ئاسایی دەستی پێکردەوە ئەو دەمە بۆ ماوەی مانگێك بوو خوێندن لە سەراپای وڵاتدا راگیرابوو.

خەڵك بە خۆشحاڵییەوە بە پێکەنینەوە بە بازاڕ و کۆڵانەکانی شاردا دەسووڕانەوە دیمەنی کۆبوونەوەی پیاوە بەتەمەنەکان لە چایخانەکاندا، کە باسی شەڕو رووخانی دیکتاتۆریان دەکرد زۆر سەرنجڕاکێش بوون، لە باخچەکاندا خەڵك ئاهەنگی دەگێڕا لە هەموو کۆلێژەکاندا خوێندن دەستی پێکردەوە، ئامادەکاری بۆ ئاهەنگی خۆشی دەکرا بە بۆنەی کەوتنی رژێم، رۆژێك دەمەو ئێوارە من و (کامەرانی وەنەوشە) و (سەهەندی بایز ئاغا) بە ئۆتۆمبیلەکەی چوونە پارکی گەورە و لەوێ لەسەر دنیا قسەمان دەکرد (سەهەندی بایز ئاغا) چەندین گۆرانی (مەزهەری خالقی) بۆ گوتین و سەدان کەس لە گەشتیاران چەپلەیان بۆ دەکێشاین تا درەنگانی شەو قسەمان کرد و باسی دنیامان دەکرد. باسی زۆر شتمان کرد، (سەهەندی بایز ئاغا) باسی خۆشەویستی خۆی لەگەڵ (ئاروین ئیسحاق سلێوە) ی کرد ئەو کیژە مەسیحییەی لە شارۆچکەی گاورەکان دەژیا، باسی ئاهەنگی کۆلێژی ئەدەبیاتی بۆ کردین بە بۆنەی ئازادکردنی وڵات.

پاش چەند رۆژێك لە کۆلێژی ئەندازیاری ئاهەنگێکی گەورە ساز کـرا و چـەند گۆرانیبێـژێکی میلی پایتەخت بانگێشت کران و چەندین گۆرانی تێدا وتـرا شـایی و هەڵپەڕکێیـەکی گـەرم کـرا. رۆژێکی خۆش و پرشنگدار بوو لە ژیانی هەمووومان سەرەتایەکی نوێش بۆ (کامـەرانی وەنەوشـە) ئەو بەو دڵخوازەی خۆی گەیشت کە ماوەیەك بوو پردی وەهمی ئەشق لەنێوانیاندا دروست ببوو لـە گەرمەی هەڵپەڕکێی کوردەواریـدا کیـژێکی دەسـت نـەرمی ناسـکۆڵە، دەسـتەکانی (کامـەرانی وەنەوشە)ی گرت و هاتە ریزی هەڵپەڕکێکەوە. من لە دووررا چاودێریم دەکرد. بە هەستی خۆم کـە لە منداڵییەوە لەگەڵم بووە کە لە دوورەوە دەمتوانی هەموو دەم و لێو جووڵانـدنێك وەربگێـڕم بـۆ وتووویژ زانیم کە بە کامەرانی دەگوت: (ئای لەو بۆنە خۆشە لەو گوڵەی سەر سنگت دێت).

یەکەمین وشەی لەگەڵ (کامەرانی وەنەوشە) وتی ئەوە بوو، (ئای خوایە لەو بۆنە سـەیرەی کـە لە سەر سنگت دێت) من بە سەیرکردنی بۆ گوڵەکە و ئاماژەی لێو جووڵاندنەکەی هـەر هـەموویم وەرگێڕا بۆ رستەی زمانەوانی.

من نەریتم بوو لـە دوورەوە تەماشـام دەکـرد زۆر حـەزم لـە هەڵپـەڕین نـەدەکرد، دەمبینـی دەستەکانی توند دەکرد لە دەستی (کامەرانی وەنەوشـە) و جـار جـار قسـەی لەگـەڵ (کامـەران) دەکرد، بەڵام (کامەران) زۆر کـەمتر قسـەی دەکـرد (دڵارام) زۆر سـەیر پێدەکـەنی و هەڵدەپـەڕی گۆرانی و میوزیك هۆڵەکەیان دەلەرزاندەوە لەولا تر دەمبینی (مەندانە) و (شابانوو) و (گوڵبـانوو) پێکەوە لەگەڵ چەند کوڕو کچێکی دیکە هەڵدەپەڕین و بە دەستەسڕە پەمەییـەکانیان سەرچـۆپیان دەگرت، (سەردار بێخەو) دەستی بەر دەداو سووڕی دەدا (زەینەب) و (بەهرۆز چاوڕەش) و تـەواوی هاوڕێکانمان هەڵدەپەڕین رۆژێکی مێژوویی بوو. لە دوور ترەوە ئاڵای کوردستانم دەبینی بـە دەسـت سەرچۆپی کێشانەوە بە ئاسماندا دەشنایەوە، ئەو ئاڵایەی ناسنامەی وڵاتێکـەو شـوێنی نییـە، ئـەو ئاڵایەی پێشەوا (قازی محەمەد) بەرزی راگرت و تا هەنووکە تەنیا لە کوردستاندا کاری پێـدەکرێت و لە دنیادا نەناسراوە.

ئەو رۆژە (دڵارام) دەسـتییك جلـی کـوردی سـووڕی لەبـەردابوو، هـەروەها سـێ هاوڕێکـەی دیکەشی بە هەمان شێوە بوون هەریەك لە من و (کامەران) چاکەت و پانتۆڵی رەشمان لەبەردا بوو، بەڵام زۆرینـەی خوێنکـاران جلـی کوردیـان لەبـەردا بـوو، لـە راسـتییدا ئێمـە زۆر حـەزمان بـە لاساییکردنەوە نەدەکرد دواتر هەڵوێستی کوردایەتی بە جلوبەرگەوە نەدەبەسترایەوە. گـرنگ ئـەوە بوو هەموو خۆشحاڵ بووین لە هەمووان بـە پەرۆشـتر (کامـەران) و (بـەهرۆز) بـوون کـە دوو لـە

پاشماوەکانی کیمیاباران و ئەنفال بوون دوو کەس لە تراژیدیاوە هاتبوون، ئاخر کـەم نییـە دوژمنـی خۆت ببینیت بکەوێت، دوژمنێکی سەرسەختی خوێنمژ.

(دلارام) بەو جلە سوورانەوە لە تۆپەڵێك ئاگری جەهەنەم دەچوو، بەڵام روخسارێکی پڕ خەندەو ناسکۆڵە لەگەڵ (کامەرانی وەنەوشە) هەر چرپەیان دەکرد. دیار بوو زۆر شتی تریـان بـاس کردبـوو نزیکەی نیو کاتژمێر زیاتر دەستەکانیان بە دەستی یـەکترەوە نووسـابوون و لـە یـەك نـەدەترازان، هەڵبەتە من لەبەر ئاپۆڕای شایی کەران تەواو نەمدەتوانی هـەموو رسـتەکانیان لـە دوورەوە شـی بکەمەوە، بەڵام دواتر زانیم کە زۆر قسەیان کردووە، لە مەڕ دنیا.

پاش چاوترووکانێك تەماشام کرد هەریەك لە (کامەرانی وەنەوشـە) و (دلارام میهـرداد) دیـار نەمان زۆر چاوم گێڕا لە هیچ لایەکی هۆڵەکەدا نەدەبینران، شایی ئەوەندە گـەرموگوڕ بـوو کـەس چاودێری ئەوی تری نەدەکرد کەس کەسی لە یەك جیا نەدەکردەوە زۆر قەرەباڵخ بـوو بـە شـێوەیەك دەتگوت هەموو شار خرۆشاوەو هاتوون بۆ ئەم ئاهەنگە. دوور بـە دوور چـوومە دەرەوەی هۆڵەکـە تەماشای چەند لایەکم کرد ئەوانم نەبینییەوە گەڕامەوە بۆ هۆڵەکە مـن وەك پاسـەوانێکی تایبـەتم لێ هاتبوو، کە هەمیشە چاودێری (کامەرانی وەنەوشە)م لە ئەسـتۆدا بـوو نەمـدەتوانی لـە چـاو خافڵی بکەم، منیش دەستم کرد بە هەڵپەڕین و چەند سوورێك هەڵپەڕیم.

ئیدی هەڵپەڕین و شادی و ئاهەنگ بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك درێژەیان کێشا. من لـە هـیچ لایەك ئاسەواری (کامەران) و (دلارام)م نەدەبینی وام هەست دەکرد بە پەیژەیەکی وەهمیـدا بـەرەو ئاسمان سەرکەوتوون و بەرەو دنیایەکی دیکە کۆچیان کردووە. سەرچۆپی و گـۆرانی لـە سـەر یـەك نۆتە یارییان دەکردو کەس بە کەس بوو، ئەوەی کە نەدەبینرا لەو ئاهەنگەدا دەرکـەوت ئـەوەی لـە ژیانتدا لەگەڵی نەدوابووی لەو ئاهەنگەدا لە دەستتەوە هەڵدەپەڕی.

لە یەکێك لە ریزەکانی شایی کەراندا دەستم چووە دەستی کچێك سەرتاپا جلی سووری لەبەردا بوو، کە بە لای راستدا لێمڕوانی (مەندانە) بوو دەستە خوشکی (دلارام) سەرەتا شـەرمی دەکـرد، دواتر وتی: (کوا هاوڕێکەت ئەوەی کە هەمیشە گوڵێکی لە یەخەی داوە؟) لـە وەڵامـدا نـەمزانی چی بڵێم و وتم (ڕەنگە بۆ هەوا هەڵمژین چوبێتە دەرەوەی یانەکـە) دواتـر خـۆی پێناسـاندم. پـاش ماوەیەکی درێژ (کامەرانی وەنەوشە) بە تەنیا گەڕایەوە بۆ لام، رەنگـی هـەڵبزڕکابوو، بـەڵام رووی زۆر لەوە گەش و خۆشتر بوو کە بتوانم وەسفی بکەم و لەوەو بەر بەو چەشـنە نـەمبینی بـوو پـاش چەند خولەکێك (دلارام) هاتەوە ناو یانەکە من و (کامــەرانی وەنەوشـە) چـووین بـۆ لایـان تـاکو وێنەیەك پێکەوە بگرین. هەر لەویادا لەگەڵ (شابانوو) (گوڵبانوو) یەکترمان ناسی، ئەو رۆژە چـوار

لە جوانترین و ناودارترین کچەکانی کۆلێژمان ناسی، من تەنیا ئـارەزووم لـە زانینـی رووداوەکـانی دەوروبەرم بوو، هیچ گرنگییم بەوە نەدەدا رۆژێك لە رۆژان خۆشەویستی لەگەڵ کچێکدا بکەم.

لەو ماوەیەی کە کامەران بزر ببوو لـە شـاییەکەدا نـەمابوو. دەسـتی (دلآرام) ی گرتبـوو لـە تاریکی سەر لە ئێوارەدا لەو دەمەی، کە خۆر وەك رەنگی ئالتوون لەودیو چیاکانەوە مالئاوایی لـە زەمین دەکا چووبوونە پشت باخچەکە و لەنێوان چەند درەختێکدا کە وەك چـەتر هـەر چـوار دەوری تەنیبوو. لەوێدا ئاوێزانی یەکتری ببوون و یەکەمین گوشین و راموسان لەنێوانیاندا رووی دابوو. بـە بێ ئەوەی لەو کولتوورە بترسن کە شەرم و نەنگی سەپاندبوو بە سـەر کۆمـەڵگادا درێـژترین مـاچ لەنێوانیاندا رووی دابوو. هەر لەو یەکەمین ماچەوە روحیان ئاوێتەی یەکتری ببوو تـەواو تێکـەلآوی یەکتر ببوون. ئیتر ئەشق وەهایە بە ماچ دەست پێدەکات و بە ماچ کۆتایی پێـدێت. دەسـتەکانیان لە یەك ئالآندبوو لە چاویانەوە هەزاران کۆدی گەردوونی لە شێوەی شەپۆلدا چـووبووە نـاو زیکـر و هۆشیانەوە.

هەریەك لەو دوو ئادەمیزادە دوو رەگەز بوون گەردوونی بوون ئەوان تـەنیا بـە زەمینـەوە نەبەسترانەوە نیشانە گەلی سەیر لەواندا هەبوو کە لە کەسانی دیکەی دنیا نەدەچـوون. هـیچ کات کینە لە دڵەکانیاندا جێگای نەدەبۆوە. باوەڕی تەواویان بە ئەشـق هـەبوو، باوەڕیـان بـە مانەوەی ئەشق هەبوو، هەمیشە (کامەران) دەیگوت: (ئەشق وەك وزە وەهایە لە دۆخێکـەوە بۆ دۆخێکی دیکە دەگۆڕێت و لەناو ناچێت ئەو بۆ هەمیشە هەیە). بەستنەوەی وشەی ئەشـق وەك دیاردەیەك بە بیردۆزەکانی وزەوە لە لای من و خەڵکانی دیکە، کارێکی دژوار بوو، بەلآم (کامەرانی وەنەوشە) لەو بڕوایەدا بوو، کە دەبێت وەها بێت ئیدی کزەی ئەشق لەواندا سـەری هەڵدا، بۆ هەمیشە بەڵێنیان بە یەك دابوو کە خۆشەویستی بکەن هەریەك لەوان بـە قـەدەری خۆیان رازی بوون کە بگەن بە یەك هەریـەك لـەوان ئـالوودەی باخچـەکانی گـوڵ بـوون. لـە یەکەمین ماچدا (دلآرام) خاڵەکەی سەر ناوچاوانی تەواو مۆر هەڵگەڕابوو، لەگەڵ هەڵچـوون و داچوونی هەستەکانیدا رەنگەکان گۆڕابوون.

(کامەرانی وەنەوشە) لە گیرفانیدا دراوێکی کاغەزی دەرهێنا بـوو لەناوەڕاسـتدا کردبـووی بـە دوو پارچەوە پارچـەیەکی دابـوو بـە (دلآرام) پارچـەیەکی لـە لای خـۆی هـەڵگرتبوو. پاشـان بـە (دلآرام)ی وتبوو (ئەم دراوە پەیماننامەی نێوانمانە ژمارەکانی سەر ئەم دوو پارچە دراوە چوون یـەکن و لە ژمارەکانی هیچ پارچەیەکی دیکەی دراوی دنیا ناچـن. مـن و تـۆ دوو پارچـەی لـە یـەکتری دابڕاوین و دەبێت بۆ یەك ببین، جا لە هەر بستێکی دنیا گیرسـاینەوە. ئـەم پارچـە دراوە لـە یـاد

مەکە، چونکە پارچەکەی تر هەر بە منە). ئیدی یەکەمین پەیماننامەی نێوانیان لەوەوە سەرچاوەی گرت. ئەو دوو پارچە دراوە وەك تەلیسم و جادوو بە ناخیاندا چووە خوارەوەو بۆ هەمیشە ئالوودەی یەکدی بوون (دڵارام) ئەو دەستەسڕە پەمەییەی بە دیاری بە (کامەران) دابوو، شەوانە تا دەکەوتە خەون (کامەران) بۆنی دەستە سڕەکەی دەکرد.

ئاسەواری سووتانی دەستی (کامەران) وردە وردە سارێژ ببوو. زۆر زۆر بە کەمی دیار مابوو ئەو رۆژێك لە تاقیگە دەست و پشتی سووتا، بەڵام خۆشبەختانە نەنگدار نەبوو. بە موعجیزەی دەستەسڕەکە شەوانە لە دەستی دەئاڵاند شیفای بۆ هات لە دیدی منەوە وەها بوو.

(کامەرانی وەنەوشە) لە دێوەزمەی قەلەڕەشەکە رزگاری نەدەبوو زۆر شەوان دەهاتە خەونی فەزای چامەکەی (ئیدگارت ئالان پۆ) بە سەر ژیانیدا باڵی کێشا بوو، زنجیرەی خەونەکان بە دوای یەکدا دەهاتن وەك زنجیرەی دراما تەلەفزیۆنییەکان لە خەونی داهاتوودا (کامەرانی وەنەوشە). دەبێت کڵاوە رۆمانییەکەی پڕ بکات لە خوێنی مەیوی دارە رووتەڵەکە و لەگەڵ خۆی بە هەموو چینەکانی زەویدا بگەڕێت و لەناو زەوی بنێت تاکو بەرهەمی ژیان ببینێت.

هەروەها ئێمە گرووپەکەمان لە بازنەی پرۆژەکانی مامۆستا (کاوە میرخاس)دا بەشداریمان دەکرد، هەڵساین بە سڕینەوەی ئاسەواری کولتوورێکی نەشیاو لەناو کۆمەڵگادا، بەردەوام لە هەوڵی چاکسازی کۆمەڵگادا بووین. سەرەتا مامۆستا (کاوە) زنجیرەیەك سیمیناری لە سەر پاراستنی ژینگەی کوردستان پێشکەش کرد ئێمەی لە شێوەی تیمی گەڕۆکدا دەردەکرد، بۆ ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بۆ راپرسی و وەرگرتنی پلەی گەرمی و دیاردەی پیسکردنی ژینگەکان و سەرچاوە ئاوییەکان و سامانەکانی ماسی و پەلەوەر و گیانداران و رووەکی چیاکان، لە چەند خولێکی راهێناندا بەشداریمان کرد، کە مامۆستا (کاوە میرخاس) لەگەڵ چەندین کەسی پسپۆڕی ئەوروپییدا گرێبەستی کردبوو و بە دابینکردنی مووچەیەکی کەم لە لایەن حکومەتەوە کارەکانمان دەکرد، لە پاڵ ئەو پرۆژە زانستیانەدا چەند پرۆژەیەکی دیکەی مرۆڤایەتی لە ئەستۆمان بوو وەك کۆکردنەوەی ئامار لە سەر ژنانی کوژراو و بە زۆر بەشودراوانی ناوچەکانی کوردستان.

بەو پێیەی باوکی (دڵارام) واتە (میهرداد کاکەوەیس) کابرایەکی دەوڵەمەند بوو کە تەواوی ژیانی بۆ کاسبی و پارە پەیداکردن تەرخان کردبوو، ژیانی کچەکەی لە لا گرنگ بوو، ئۆتۆمبیلێکی بۆ کچە تاقانەکەی کڕی بوو. چەند جارێك شەوان (دڵارام) دەهات و (کامەران) لەگەڵی دەڕۆیشت. شەوێك (کامەران) دەچێتە ماڵی (دڵارام) و لەگەڵ (مەستی سوارۆ ئاغا) یەکتر دەناسن. ئەو زۆر بەو کوڕە خۆشحاڵ دەبێت و رێزێکی زۆری لێدەگرێت.

لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا وایە هەمیشە کەسانێك پەیدا دەبن، کە حەز بە خۆشی کەسانی دیکە ناکەن و لە هەوڵی تێکدانی ژیانی ئەوانەدا دەبن کە خەریکە دەکەونە خۆشییەوە ئەگەرچی باوکی (دلارام) کابرایەکی عەشایەر دەبێت تا رادەیەك حەز بەو شتانە ناکات، کە رەوشت و ئەخلاقی خانەوادەکەی لەکەدار بکەن، کەسانێك کە سەر بە دەسەلات دەبن دەکەونە دوژمنایەتیی (کامەران) بەو پێیەی کوڕی یەکێك لەبەرپرسەکان ئارەزووی نزیکبوونەوەی دەبێت لە (دلارام)، لە پلانگێڕاندا دەبن بۆ ئەوەی ژیانی تێك بدەن، بەلام کەسانی شارەزا دەبن لە ئاژاوەنانەوەدا و لە پڕ کارەکان ناکەن و وردە وردە کار دەکەن. بۆ تێکدانی ژیانی (کامەران) ئەم کارە نزیکەی دوو ساڵ و نیو دەخایەنێت لەو ماوەیەدا (دلارام) و (کامەرانی وەنەوشە) خۆشەویستییەکی بەهێز دروست دەکەن و زۆر جار لەناو کۆلێژدا پێکەوە پیاسە دەکەن و وێنە دەگرن. ئیدی ناوبانگی ئەو دوو ئاشقە لە تەواوی کۆلێژو بەشەکانی زانکۆدا بلاو دەبێتەوە. لەو ماوەیەدا بە هەزاران ماچی یەکتر دەکەن و سەدان راموسان و توانەوە لەناو یەکتردا ئەنجام دەدەن (کامەران) وەك هونەری دەستی چەندین تاجی گوڵینە بۆ (دلارام) دروست دەکاتی چەندین شیعرو پەخشان لە پێناوی ئەودا دەنووسێت و لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاوی دەکاتەوە. تەنانەت لە یەکێك لە کەناڵە ئاسمانییەکانی ئەو شارەوە بانگێشت دەکرێت و قەسیدەیەکی دوورودرێژ بۆ (دلارام) دەخوێنێتەوە و دەنگدانەوەیەکی سەیر لە پایتەختدا بلاو دەکاتەوە.

ئەو شەوەی (کامەران) شیعرەکەی پێشکەش کرد بۆ بەیانی لە لایەن خەڵکێکی زۆرەوە دەستخۆشی لێدەکرا دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو، خەڵك ئاماژەیان دەکرد ئەوە شاعیرەکەیە بە راستی دەنگی زۆر سەرنجڕاکێش بوو، هەموو خەڵکی ورووژاندبوو. یەکێك لەوانەی کە تەواو پەشۆکابوو (دلارام) بوو سەرسام ببوو. بەو موفاجەئەیەی (کامەران) پێشکەشی کردبوو. وشە گەلی زۆر سەیرو شاعیرانەی بۆ دلارام وتبوو هەر ئەوەش وای کردبوو (دلارام) لە پاداشتدا هیچی شك نەبردبوو پاداشتی (کامەران)ی پێ بداتەوە، لە خۆشییاندا لەبەردەم کامەراندا زۆر گریا بوو.

ئەشقێکی وەهایان دروست کرد کە لەسەر ئاستی کوردستان دەنگی دایەوە. ئەو رۆژە لە کۆلێژ هەموو هاوڕێیان وێنەیان لەگەڵ (کامەران) دەگرت و دەستخۆشییان لێدەکرد.

ژیانی وەهای لێهاتبوو زۆرینەی کاتەکانی تەرخان کردبوو بۆ (دلآرام) تـا دەهـات ئەو ئەشقە گەشەی دەکرد و لەوەبەدوا رۆژانە ژمارەی ئاشقەکان لـە زیادبوونـدا بـوو، هەر یەکە و لەگەڵ تاکەکەی خۆیـدا لـە بـن دار و درەخـت و باخچـە و سـێبەرەکاندا دادەنیشتن.

لەو رۆژگارەدا گوڵفرۆشـەکان لەبـەردەم کۆلێژەکانـدا فرۆشـێکی باشـیان هـەبوو، خەڵکانی زۆر چەپکە گوڵ و رێحانەو گوڵە باخیـان دەکـڕی و بـە دیـاری دەیانـدا بـە دڵخوازەکانیان.

خەڵك ئەوەندەی لە بیری گوڵ کڕیندا بوون ئەوەنـدە لـە بـیری نانکڕینـدا نـەبوون، بەڵام لە رۆژێکی مانگی فابرایەردا هەموو خۆشییەکان ئاوەژوو بوونـەوەو گـەورەترین دوو تەقینەوە لە شاردا روویان دا، کە بە سەدان کەس بوونە قوربانی و بـێ دەسـت و سەر و قاچ بوون، هێدی هێـدی تەقینـەوەکان لـە زیـادبوونێکی بـێ ژمـاردا بـوون و خۆشییەکانیان سەرەو ژێر دەکرد.

## ٢٠

بەڵێ ڕۆژگارێك هات هەموو دۆسیە گرنگەکانی (کامەرانی وەنەوشە) کەوتە بەر دەستی من. یەکەمین دانیشتنی لەگەڵ (کاوە میرخاس) بەر لەوەی من بزانم لە دەفتەرێکدا تۆمار کردبوو، دێڕ بە دێڕ هەموویانی نووسیبۆوە، بەڵام من توانیم دەسکاریان بکەم و لە رووی ڕێکخستنەوە چاکیان بکەم، بەڵام بە زمانی خۆی گێڕامەوە.

ئەو ڕۆژەی مامۆستا (کاوە میرخاس) بە کراس و پانتۆڵێکی قاوەییەوە هات و چەند پەڕەو نەخشەیەکی خستە بەردەستمان بۆ شەوەکەی کارمان لەسەر کرد و بۆ بەیانی لەناو کۆلێژ لە کتێبخانەی کۆلێژ کۆبوونەوەیەکی بچووکمان کرد. من و (کامەرانی وەنەوشە) و (ئاسمان خۆشناو) و (سەهەندی بایز ئاغا) و (سەردار بێخەو) (زەینەب سەیفەدین)و چەند هاوڕێیەکی دیکە بوون.

ئێمە کۆمەڵێك هاوڕێ بووین متمانەی تەواومان بە یەکتر هەبوو و متمانەشمان بە (کامەرانی وەنەوشە) هەبوو، چونکە زیرەك و بە تواناو خۆشەویست بوو. ئەو دەمە هێشتا کامەران ئاشقی (دڵارام) نەببوو یان بڵێین پەیوەندی نێوانیان دروست نەببوو، (کامەرانی وەنەوشە) بە هەموو هاوڕێیانی ڕاگەیاند کە لە لایەن مامۆستا (کاوە میرخاس) گرووپێك یان ڕێکخراوێك دروست بکەین. بۆ گەڕاندنەوەی متمانە بۆ ئەشق بۆ دروستکردنی پەیوەندیەکی تەندرووست کە تێیدا هەردوو ڕەگەز کار بکەن، پڕۆژەیەکی مرۆییەو خزمەت بە هەمووان دەکات.

(کامەران) بەو شێوەیە بەردەوام دەبوو لە قسەکردن و ئاخاوتن هەریەکە و بە جودا بیروبۆچوونی خۆیان دەوت، دواتر من پێم ڕاگەیاند، کەوا مامۆستا کاوە خانوویەکی گەورەی لەناو شارۆچکەی گاورەکان هەیە و دەتوانین سوود لەو شوێنە وەربگرین و وەك بارەگا بەکاری بهێنین و کۆڕ و کۆبوونەوەی تێدا ئەنجام بدەین.

ڕۆژێك من و (کامەران) لەگەڵ مامۆستا (کاوە) بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی چووین بۆ ڤێلاکەی کە لە شارۆچکەی گاورەکان دروست کرابوو لەناو باخچەیەك کەمێك دوور لە ئاوەدانی دیمەنی چەندین درەختی لوبنانی و نافورەکانی، زۆر سەرنجڕاکێش بوون، ڤێلایەك لە هەر چوار لاوە

پەنجەرەو باڵکۆن بە بەردی حەلان دروست کرابوو دیمەنی دەرگای چوونە ژوورەوەی کە بە دوو پایەی ئێرانی و ئەو هەموو قرمید و نەخش و نیگارە سەرسامی کردین. ئێمە دوو لە بەدبەختترین خوێنکارانی زانکۆ بووین لە بەشە ناوخۆییەکی پۆخڵدا دەژیاین، کە ژیان تێیدا زۆر دژوار بوو، بینی ئەو ڤێلایە سەرنجی راکێشاین مامۆستا چەندین جۆر تەیرو باڵندەی ناوازەی هەبوو لەناو باخچەکەدا دەژیان، باخەوانێك کاری بۆ دەکرد ئاوی گوڵ و درەختەکانی دەدا، چەندین جۆر گوڵی جودا لە باخچەکەیدا هەبوو، فەرمووی لێکردین تا بچینە ژوورەوە. سەرەتا هۆڵێکی گەورەو قادرمەی چەماوەیی و سووڕەیا و مۆبیلیاتی گرانبایی. هەڵبەتە مامۆستا بۆ خۆی توانای دارایی زۆر بەهێز ببوو، تا توانیبووی لە لایەن وەستاو ستافی شارەزای تورکییەوە ڤێلاکەی بۆ تەواو بکەن، بەڵام ئەو کۆشکە ناوازەیە خاڵی بوو لە دەنگی ژن لە دەنگی ئەشق. مامۆستا وتی: (کوڕینە ئەم ماڵە خاڵییە لە دەنگی ژن) لە وەڵامدا (کامەران) وتی (ڕاستە سەدای ژن ئەم ماڵە جوانتر دەکات) دانیشتین و پاش وچانێك مامۆستا گەڕایەوە ئاوی خواردنەوەی هێنا و فەرمووی لێکردین بیخۆینەوە.

وتی (کوڕینە ئێوەم هێنا تاکو شارەزای ماڵەکەم بن و ئەگەر هەرکات ویستتان دەتوانن بێن بۆ ئێرە لەمەو دوا من لەگەڵ ئێوە وەك هاوڕێ مامەڵە دەکەم نەك مامۆستا و خوێنکار، ئەوە بزانن باشە کوڕینە).

تا درەنگانی ئێوارە قسەمان لە سەر دنیاو پڕۆژەکان کرد. دواتر مامۆستا (کاوە میرخاس) تەلەفونی بۆ یەکێك لە گرانبایرین رێستۆرانتەکان کرد و چەندین جۆر خواردنی بەتامیان بۆ هێنایین دوای نانخواردن و پشوودانێکی کورت مامۆستا باسی ژیانی خۆی بۆ کردین وتی (من لە کاتێ کە تازە لە زانکۆ دەرچووبووم پەیوەندی خۆشەویستییم لەگەڵ کچێکدا هەبوو زۆر یەکترمان خۆش دەویست، بەڵام قەدەر کارێکی وەهای کرد کە بەیەك نەگەین ئەو بە دەرد و نەخۆشییەکی بێدەرمان کۆچی دوایی کرد، منیش بڕیارم دا لەدوای ئەو ئیدی ژن نەهێنم و هەروا بژیم).

من بە مامۆستام راگەیاند کەوا لە دوای مردنی ئازیزانت مەرج نییە دەرگاکان بە رووتا دابخرێت، ناکرێ هەرکەس ئازیزێکی لەدەست دا ئیتر ئەویش بەدوایدا بمرێت، ئەوە چارەسەر نییە لە ژیان رابگەی دەبێت مرۆڤ بەهێز بێت و بەرگەی هەموو هەوراز و نشێویەکان بگرێت، خۆ ناکرێت کۆتایی دنیا بێت.

ئەوان لە وتەکانم رازی بوون و بە راستییان دەزانیم، ئیدی ژیان وەهایە تا سەردەمانێکی درێژ ناتوانی لەگەڵ هەموو ئازیزەکانتدا بژیت.

مامۆستا (کاوه) کتێبخانەکەی خۆی پیشان داین، کە بێژمار کتێبی تێدا بوو لە چەندین جـۆر سەرچاوە زانستی، دەروونی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئەو خوێنەرێکی زۆر باش بوو، لە دوای ئەوەی بە مرازی خۆی نەگەیشتبوو خوی دابووە خوێندنەوەیـەکی تێروتەسـەل و دەیگـوت: (کوڕینـە مـن شەوان تا درەنگ ناخەوم قاوە دەخۆمەوەو دەخوێنمەوە، بەڵام حەز ناکەم بنووسم. هەر حەز دەکـەم دەرگای کتێبەکان بکەمەوە و بچمە نـاو دنیـا گـەلی جیـاواز)، لـە راسـتییدا دنیـای کتێـب زۆر دنیایەکی سەرنجڕاکێش بوو، لەو سەردەمەی ئەو کاتەدا خەڵك لە کتێب تۆرابوون، شـیعر زۆر ئـەو بایەخەی نەمابوو خەڵك ئەوەندەی لە بیری پارەدا بوون ئەوەندە لە بیری مەعریفەدا نەبوون.

ڕۆژانە لەسەر شەقامەکان بە سەدان و هەزاران کتێبم دەبینی کە دەسووتێنران و کەسێك نـەبوو داکۆکی بکات، من هەندێك رۆژ چەندین رۆمان و کتێبی شیعرو مێژوو. چەندانی دیکەم بـە نیـوە سووتاوی لەنێو ئاگردانەکاندا دەدۆزییەوە، زۆربەی جار لە چواردەوری ئاگرە بڵێسەدارەکاندا سـەدان منداڵ یاریان دەکردو پێدەکەنین و هاوارو زەنا زەنایان دەنایەوە، رۆژێك لە گۆڕەپانی ناوەندی شـاردا چەندین هەزار کتێب سووتێنرا لە لایەن یەکێك لەبەرپرسە باڵاکانی ئەو کاتەی حزبێکەوە، یەکەمین مەشخەڵی ئاگری لێدرا، ئاگرەکە هێندە بڵند بوو رێك لە ئەنـدازەی ئـاگری نـەمروودا بـوو، ئـەو ئاگرەی کە ئیبراهیم پێغەمبەری تێ فڕێ دراو نەسووتا.

بەو پەڕی کەیفەوە ئاگری لە کتێبەکان دا و ئاگر هێندەی باڵەخانەیەکی بڵند بەرز بووەوە. من بە هەزاران و ملیۆنان وشەم دەبینی بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان، ئەوپەڕی بێحورمـەتی بـە کتێب لەو سەردەمەدا کرا، وەك بە مێژوودا بـڕوانین لـە سـەردەمی عەباسـییەکاندا شـاڵاوی هێرشی مەغۆل و تەتەرەکان بە هەزاران کتێبیان لە کتێبخانـەکانی بەغـداد فـڕێ دایـە نـاو رووباری دیجلە وەك دەڵێن رەنگی ئاوەکە گۆڕا و بوو بـە مەرەکـەب، بـەڵام هـیچ کـات لـەو بڕوایەدا نین هێندەی ئەم جارە سووکایەتی بە وشـە کرابێـت، هەرچـۆنێك بێـت خـەڵکانێکی بێدەماخی زۆر چەپڵەیان بۆ بەرپرسە باڵاکە دەکێشاو هوتافیان دەکێشا، من هێنـدە رقـم لـە دڵدابوو وەخت بوو بچم و بە شەق لـە دەمـی بەرپرسـەکە بـدەم، بـەڵام نەمـدەتوانی چـونکە دەمودەست پاسەوانەکانیان بەر رێژنەی گوللەیان دەدام.

تا درەنگانی شەو گفتوگۆمان کرد و باسی دنیامان دەکرد، هێدی هێدی تاریکی تاوی دەسـەند لەو کاتەدا ئێمە داوای روخسەتی رۆیشتنمان دەکردو مامۆستا (کاوە میرخـاس) بـە ماشـێنەکەی خۆی ئێمەی تا بەردەم بەشی ناوخۆیی دەگەیاند.

مـــن لەگـــەڵ (کامـــەرانی وەنەوشـــە)دا دەدوام و دەمگـــوت: (بڕواناکـــەم مامۆســـتا هـــیچ بەرژەوەندییەکی لە هاوڕێیەتی ئێمەدا هەبێت، یان لەم پڕۆژانەی دەیەوێت ئەنجامی بدەین، چـونکە ئەو پێویستی بە مادەو داهات نییە) بـە پێکەنینـەوە (کامـەرانی وەنەوشـە) دەیگـوت: (ڕاسـت دەکەی من هیچ گومانم لە مامۆستا نییە) ئەوەی لە لای مامۆستا گرنگ بوو خزمەتکردن بوو بە مرۆڤەکانی ئەم وڵاتە، کە لە ژێر رەحمی قامچی گەورەکاندا دەیان ناڵانـد. یـەکێك لـە گـرنگترین کارەکانی ئێمە کە کردمان بە هاوکاری چەند رێکخراوێکی داکۆکی لە مافی ژنان داڵـدەدانی ئـەو ئافرەتانە بوو، کە بە تۆمەتی شتنەوەی ئابڕوو تاوانبار دەکران و لە لایەن باوك و بـراوە دەکـوژران، یەکەمین کار داڵدەدانی دوو ژن بوو کە هەڵهاتبوون و بە رێکەوت لە رێگەی یەکێك لـە کچـەکانی ناو گرووپەکەمانەوە بەیەك گەیشتبوون و ئەویش راستەوخۆ بۆ ماڵی مامۆسـتا (کـاوە میرخـاس) هاوڕێیەتی کردبوون. یەکێکیان لە دەست مێردێکی ناکەس بەچە هەڵاتبوو، کە بە تەمەن بیست و یەك ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو لە پاش ئەوەی لە خوێندا درابوو بەو پیاوە، ئـەویش بـە مەبەسـتی شتنەوەی خوێنی نێوانیان بە زۆر بە پارە کـاری سێکسـی پێکردبـوو. رۆژانـە بـە کۆمـەڵ پیـاوی شەهوەتبازی بۆ ژنەکەی دەبردەوە. ئەویش لە ترسی گیانی خۆی چـەند سـاڵێك بـوو بـەو حاڵەتـە راهاتبوو، تا رۆژێك هەلی بۆ رەخسابوو لەناوچە باکوورییەکانی وڵات رای کردبوو بەرەو شـارەکەی مامۆستا (کاوە میرخاس) هاتبوو، ئەو کاتەی من بۆ یەکەمجار ئەو ژنەم بینـی ژنێکـی ترسـاو تـا رادەی مەرگ ترسابوو.

وەك لە زمانی خۆیم بیست بە ترس و لەرزەوە وتی: ناوم (مەلەك کانەبی)ـیە، بـەڵام بـە راستی وەك مەلەکوتەکانی ئاسمان وەها بوو ئەو چەند ساڵەی بە هەزاران پیـاو چـووبوونە لای کارێکی وەهای لێنەکردبوو هەر بە هەمان ویقارو جوانی خۆیـەوە مـابوو، وەك بـە گریانـەوە باسی ژیانی خۆی دەکرد لەو مێردە دڕندەیەی دوو منداڵی هەبوو کە هەردووکیان دووکچ بوون تەمەنیان لەنێوان پێنج و شەش ساڵاندا بوو بەدەم گریانێکی ناکۆتاوە کە لە دەنکۆڵە بـارانی بەهار دەچوون دەیگوت: (چارەنووسی رەش بۆ منداڵەکانم دەبێت)، (خانمی کانەبی) راشکاوانە باسی زۆر شتی سەیری بۆ کردم لەبەر جوانی و لەش و لاری نایابی خـۆی لـە شارۆچـکەکەی خۆیانەوە بەرەو شارە گەورەکان هاتبوو تەنانەت مێردەکەی کاری سێکسی لە زۆربەی شـار و شارۆچکەکانی ناوچەکەدا پێ ئەنجام دابوو، باسی لەوە کرد کـە زۆرێـك لەبەرپرسـەکانی ئـەو سەردەمە زۆرێك لە کادیرەکانی حزب و پارەدارەکانی ئەو سەردەمە بە پارەی خەیاڵی شـەوان یاریان پێکردووە، دەیگوت: (قوماریان لەسەر دەکردم، کامیان بـراوە بووایـە شـەو لای ئـەو

دەبووم) من تووشی رامان و سەرسامی بووم ئەو کاتەی ئەو هەموو کارەسات و تراژیدیایەم گوێ لێدەبوو وەك خولیای مندالّی و دێرینەم هەموویم بە سیناریۆو وێنە دەهێنایە بەر چاوم، باسی کابرایەکی گەورەی بۆ کردم وتی (زیاترین جاران لەگەلّم خەوتووە) دەیگوت: (ئەگەر من لەم هەرێمەش گوێ لە داواکاریم نەگیرێت بەرەو هەندەران دەڕۆم و لەوێ لە دادگاکانی رۆژئاوا داوای دادگایی دەکەم) بە وتەی خۆی (محەڕەم هەلّۆ) گەورە بەرپرسێکی بالاّ بووە زیاترین جار کاری لەگەلّ کردووە ئەو دەیگوت: (تەنانەت لەگەلّ هەر کچێك یان ژنێك داوێنپیسی کردبێت پارچەیەك لە جلەکانی ژێرەوەی لەلای خۆی گل دەدایەوە) لە راستییدا من تەواو لە مرۆڤبوونی خۆم دەرباز ببووم، هێلّنجم دەهات و چەند جارێك بە هەر بیانوویەك بێ چووم رشامەوە.

هەلّبەتە من بۆ خۆم دواتر دەترسام لەوەی ئەو کەسانە یاخود مێردی (مەلەك کانەبی) کە کابرایەکی چیایی دواکەوتووبوو بە خۆیی و هێزێکی چەکدارەوە بێت و دنیامان بەسەردا بڕووخێنێت پێشبینییەکەم وەڕاست گەڕاو ئەوەی نەدەبوو رووبدا رووی دا.

ئەگەرچی مامۆستا (کاوە میرخاس) لە لایەن حکومەتەوە مۆلّەتی کردنەوەی ئەو رێکخراوەی هەبوو و ناوی لەنێو رێکخراوەکاندا تۆمار کرابوو، بەلاّم کارێك کرا کە نەدەبوو بکرێت.

لە دوای چەند رۆژێك (مەلەك کانەبی) جانتایەکی کۆنی خۆی دەرهێنا کە چەندین بەلّگەو دۆکۆمێنتی گرنگی تێدا بوو لە سەر ئەو بەرپرس و پارە دارانەی کاری لەگەلّ کردون جانتایەکی رەشی چەرم بوو، بەلّگەکان پێك هاتبوون لە کۆمەلّێك وێنەو سیدی و کاسێتی ریکۆردەرو چەندین بەلّگە وەك نووسراو و واژۆی هەندێك لەبەرپرسەکان لەسەر مامەلّەی زەوی و پارەو چەندین شتی لەو جۆرە، هەر زوو زانیم کە ئەم بەلّگانە رۆژێك دێت و دنیایەك کاردانەوەی لەسەر دەبێت و ئەو بەرپرسانەی بەو دۆسیەوە تێوە دەگلێن کاری زۆر دەکەن تا بەلّگەکان لەناو ببەن هەلّبەتە وێنەکان تووشی سەرسامیان کردم ئەو کەسانەی لە وێنەکەدا دەمبینین لە کاتی نەشیاو و حالّەتی سەیرو سەمەرەدا بوون، ئەو کەسانە بوون کە لە هەندێك ناوچەی ولاّتدا ناسراو و خاوەن دەسەلاّت بوون و لافی ئازادی و داوێن پاکیان بەسەر خەلّکدا دەکرد، بەلاّم پێچەوانەی ئەو هەموو وتانەی دەیاندا راست بوو وێنەکان لە کاتی ئاهەنگەکانی شەواندا گیرابوون لەسەر مێزی قومارو خواردنەوەی مەیی و هەوەس بازی و ئافرەت بازی بوون.

زۆرێك لە بەڵگەكان نووسرابوون و واژۆی بەرپرسەكانی پێوە بوو، كۆمەڵێك بەڵێن بوون بۆ پێدانی زەوی بە خاتوو (مەلەك كانەبی) هەڵبەتە بە زۆری مێردەكەی كە ئەم كارانەی پێ ئەنجام دابوو، بەڵام دواجار مایە پووچ ببوو، مێردەكەی ئۆتۆمبیل و پارەی خەیاڵی بەم پەیدا كردبوو.

من بەو پەڕی لێزانییەوە مامەڵەم لەگەڵ شتەكان و پێشهاتە سەیرەكاندا دەكردو چەندین دۆكۆمێنت و دۆسیەم كۆپی كرد و لەلای خۆم هەڵم گرتن، دواجار مامۆستا (كاوە) و (كامەران) لە هەوڵی ئەوەدا بوو كە كۆمەكی خاتوو(مەلەك كانەبی) بكەن، بەهەر هۆیەك بێت من چەند كۆپیە گرنگەكەم بردوو لە بەشە ناوخۆیی لە ژێر قەرەوێڵەكەم لەناو جانتایەك شاردەوەو چەند وێنەیەكی دیكەم لەبەر گرتنەوەو لە جێگایەكی دەرەوەی شار لە ژێر دارێكدا حەشارم دان هەڵبەتە بە شێوەیەكی زۆر لێزانانە بەرگم تێگرتن و حەشارم دان كە ئاوو باران زەرەریان پێ نەبا.

لەدوای ماوەیەك كەسانێك هەڵیان كوتا بووە سەر بەشە ناوخۆییەكەو ژوورەكەی (كامەرانی وەنەوشە) یان بەسەر یەكدا دابوو، لەو كاتەدا ئێمە هیچ كامان لەوێ نەبووین لەكاتی دەوامدا ئەم كارە كرابوو باڵەخانەكە چۆڵ ببوو.

زۆر شتی (كامەرانی وەنەوشە) برابوو، بەڵام ژوورەكەی من ئەمین بوو ئێمە نەماندەزانی كێ كاری وەهای كردووە، بەڵام گومانمان بۆ كەسانێك دەچوو كە لە كۆلێژ چاودێری كارەكانی ئێمەیان دەكرد سەر بە چەند حزبێكی دەسەڵات بوون و كۆمەڵێك ملهوڕ و كاسەلێس و چەورە بوون، ئێمە دەمانویست بەو بڕە پارەیەی (مەلەك كانەبی) لەگەڵ خۆی هێنابووی رەوانەی هەندەرانی بكەین، چونكە بە وتەی خۆی لە مەترسییەكی گەورەدا بوو.

لەو ماوەیەی (مەلەك كانەبی) لەگەڵ چەند ژنێكی دیكەی هەڵاتودا لەو ماڵەدا دەژیان تەواو راهاتبوون و مامۆستا (كاوە میرخاس) هەموو شتێكی بۆ تەرخان كردبوون، خۆی نەدەچووەوە بۆ ئەوێ و لە خانوویەكی دیكەدا دەژیا.

دوای نزیكەی مانگێك شەوێك كۆمەڵێك چەكدار بەدەست رێژی گوللە لە ماڵەكەی مامۆستا (كاوە) دەدەن ماڵەكە گوللەباران دەكەن دواجار بە بەرچاوی ئاسایش و پۆلیسەوە ماڵەكە ئاگردەدەن و دەیسووتێنن، بەهەزاران كتێب و نووسراو بەڵگەنامەی مامۆستا (كاوە) و هەموو پرۆژەكانی دەسووتێندرێت و دەبنە رەژوو، ئەو شەوە درەنگانێك من گوێم لە دەنگی ئۆتۆمبیلەكانی ئاگر كوژێنەو بوو، بەڵام هیچ كات لەو بڕوادا نەبووم ئەوەی نەدەبوو ببێ رووبدات، هەڵبەتە ئاگرەكە كاتێك كوژێندرابۆوە كە كار لە كار ترازابوو هەموو شتێكی گرنگی ئەو ماڵە سووتابوو.

بۆ بەیانی کە وەخەبەر هاتین، (کامەرانی وەنەوشە) لەسەر سەرم بوو رەنگی پەڕی بوو دەگریاو دەیگوت: ماڵی مامۆستا (کاوە) سووتاوەو هەموو ئەوانەی لەوێ بوون سووتاون و ڕەنگە مامۆستا (کاوە) ش مردبێت، تا ئەو دەمە من حەپەسابووم و بڕوام نەدەکرد ئەوەبوویێ، بەڵام لـە راسـتییدا ئەو کەسـەی هـەواڵی بـە (کامـەرانی وەنەوشـە) گەیانـدبوو هەواڵەکـەی بـە ناڕاسـتی گەیاندبوو، مامۆستا (کاوە میرخاس) نەمردبوو ئەو زیندوو بوو لە کـاتی نیـوەڕۆدا کـە چووین بۆ ماڵەکـەی ئاسـەواری سـووتاوی هـەموو ئـەو ناوچـەیەی داگیرکردبـوو تـەنیا بینایەکی رەق و تەق دیار بوو، مامۆستا (کاوە) دەگریاو هاواری دەکرد بۆ کتێبەکانی بۆ مرۆڤەکانی ناو ماڵەکە.

دوای ئەوەی پۆلیس و لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان ئاشکرا کرد کە پێنج ئافرەت مـردوون بە فیشەك و دواتر سووتاون هیچ ئاسەوارێکی (مەلەك کانەبی) دیارنەبوو، بـەڵام ئێمـە لەوە سەرمان سووڕما، چوون دەبێت (مەلەك) هەڵاتبێت لە راستییدا کەوتینە گومانێکی قووڵەوە، هەڵبەتە ئەو کۆمەڵە چەکدارە سەر بە (محەڕەم هەڵۆ) ببوون و بۆ ئەوە هاتبوون کە (مەلەك) و دۆسیەکانی بۆ هەتاهەتایە لە سەر زەوی بسڕنەوە نەیانزانی بوو دۆسیەکان کە وێنەی دیکەی لێ کۆپی کراوەو لە جێگایـەکی ئەمیندایـەو هـەر رۆژێـك بێـت وەك مینێکی ئامادە بەواندا دەتەقێتەوە بۆیە چەکدارەکان بە سەرووەرییەوە گەڕابوونەوە.

بەبەرچاوی دنیاوە رۆژانە خراپەکارییان ئەنجام دەداو لـە شاشـەکانەوە باسـی پـاك و خاوێنی دڵ و دەروونی خۆیـان دەکـرد، لـەو ماوەیـەدا ئەوەنـدە رووداوی ناخۆشـم چـاو پێکەوتبوو تووشی نەخۆشییەکی کوشندەو درێژخایەنی دەروونی و دڵ ببووم، هـەر بۆیـە نەمتوانی درێژە بە خوێندن بدەم و بەرگەی ئەو هەموو ئیهانەو سووکایەتی و لێدانانـەی پیاوانی سەر بە دەسەڵاتم نەدەگرت بە زەبری پارەیەکی بـاش کـە خـاڵم و بـاوکم بۆیـان ئامادە کردبووم بڕیاری سەفەری هەندەرانم دا، دەمویست ماڵئاوایی لە هەموو ئازیزان و خۆشەویستان و (کامەرانی وەنەوشـە) بکـەم دواجـار ئـەو بڕیـارەم داو هـەموو دۆسـیە گرنگـەکانی ژیـانی خـۆم و چـەندانی (کامـەرانی وەنەوشـە)م لەگـەڵ خـۆم کـۆکردەوە، (کامەران) دەیگوت: (دڵنیام تۆ دەژیت و دەبیتە سەرچاوەی گرنگی ژیانی من و هەموو هاوڕێکانت هەر بۆیە دەبێت ئەم کتێبە وەنەوشـەییە داخـراوە لـە لای خـۆت بپـارێزی) نەمدەزانی بۆچی (کامەران) وا دەڵێت ئەو بە شێوەیەك قسەی دەکرد کەوابێ ئەو بڕوات و من لە دنیادا بمێنمەوە، هەموو شتە گرنگـەکانی ژیـانی خـۆی بـە مـن سـپارد و بـە

گریانەوە باوەشی پیا کردم و پڕ بە دنیا هاواری دەکرد و دەیگوت: (ئاخ هاوڕێکەم، براکەم، تۆ زۆر گرنگ بووی بۆ من)

من لەبەر گریانێکی بەکوڵ نەمتوانی هەناسە بدەم گریام گریانێك لە ژیانمدا چەند جارێکی کەم بەو شێوەیە گریاوم، ئاخر بەجێ هێشتنی ئازیزان هێندە ئاسان نەبوو، (کامەران) لە براو کەسوکار گرنگ تر بوو بۆ من ئەو گرنگترین شتی خۆی دابە من.

ملوانکەیەکی پلێتی سەربازی و کتێبێکی وەنەوشەیی و ئینجانەیەك گوڵی وەنەوشەیی هەریەك لەم سێ شتە تەلیسماوی بوون و پڕ بوون لە گومان و نادڵنیایی، من لە لام پیرۆز بوون و بڕیاری پاراستنیانم دا، هەروەها لەگەڵ خۆمدا بەڵگە گرنگەکانی (مەلەك کانەبی)م برد، من بە مەبەستی چارەسەرکردن و مانەوەو پەناهەندەیی بۆ هەندەران کۆچم کرد.

ئەو دەمەی بۆ دواین جار (کامەرانی وەنەوشە)م بینی هاوارم بۆ کردو دەمگوت: (کامەران تۆ دەبێ ئەوەی تەواو نەبووە تەواوی بکەی) من لەبەر نەخۆشی و ترسی زۆرم لە پیاوەکانی (محەڕەم هەڵۆ) و چەند بەرپرسێکی دیکە بە رێگایەکی نهێنییدا سەفەرم کرد و چوومە دەرەوەی وڵات و لە ئەوروپا گیرسامەوە بە مەبەستی چارەسەرکردن کارو بارەکانم ئەنجام دا، بەڵام سالأنێك تێپەڕی و کاتێك بڕیار بوو بگەڕێمەوە زۆر شت گۆڕابوو، دنیا شێوەیەکی دیکە بوو ئەو دەمە من تەنیا بووم، چونکە دنیا گۆڕابوو زۆر زۆر گۆڕابوو.

# ٢١

## قەلەڕەشەکە

**کامەرانی وەنەوشە دەیگوت:**

من حەپەسابووم کە جلوبەرگێکی سەیرم لەو بەردا بوو تەنوورەیەکی لە چەرم دروست کراو زریێ و کاڵەی لە چەرم دروستکراو، کڵاوێکی زەردی پەڕەدار ڕێك لە جەنگاوەرە کۆنەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی ڕۆم و ئیمپراتۆریەتی کۆنی هادریانووس دەچووم تەماشای خۆم دەکرد بە چنگ لە قەدی دارە رووتەڵەکە کە خوێنی مەیووی شێوە قیری رەشی پێوە دەچۆڕایەوە لەناو کڵاوەکەم دەنا و بە وێنەی دەفر پڕی دەکەم و بەرەو مەنفا دوورەکانی دنیا هەنگاوی کوێرانە دەنێم، بۆ خۆم نازانم بەرەو کام پارچە زەمینی دنیا دەڕۆم دنیایەك تەواو جیاواز لەو دنیایە، تاریك و بێ رووناکی ڕێك لە هەسارە دوورەکانی کۆمەڵەی خۆر دەچوو لەو مانگە دەچوو کە بە دەوری هەسارەی ئۆرانۆس دا دەسووڕێتەوە بریسکەی ئاسمان دەهات و زەمین دەبریسکایەوە، من لەوە تۆقیو تر بووم کە درك بەبوونی شتەکان بکەم هەر بۆیە لەسەر ڕۆیشتنی نائاگایانەی خۆم بەردەوام بووم.

هەزاران هەورازو نشێوم بڕی و قیبلەنمایەك ڕێگایەك ڕێنیشاندەرێك نەبوو، خوێنی مەیوم لە سەدان زەوی دا فڕێ داو بە سەدان رۆژ یان تاریکە رۆژوو شەو چاوەڕوانم دەکرد و بەرهەمی گوڵ و سەوزایم بەدی نەدەکرد، لە هەندێ جێگادا نەسیمێکی عەبەسی سەیر مێشکی پڕ دەکردم و وەڕسی دەکردم ئاخر سەیر بوو زۆر سەیر بوو من لەناو ئاسەوارێکدا دەگەڕام تەنانەت مێرولەیەك، قالۆنچەیەك کرمێك زیندەوەرێك نەبوو دڵی پێ خۆش بکەم، ئیدی هاوارم دەکردو دەگریام، دەنگم وەك نەعرەتەی هەور دنیای تەی دەکرد و وەڵامێك نەبوو نەمدەزانی ئەم هەموو تاریکییە لە کوێی گەردوونەوە دێت.

هاوارم دەکردو بانگی قەلەڕەشەکەم دەکرد، وەڵام نەبوو ئەویش نەدەهات بە هاوارم لە ماوەیەکی زۆری کاتدا گەڕانی هەموو پارچەکانی دنیام تەواو دەکرد، دەگەیشتمە خاڵێك ئاسەواری

دوو چەقی گەورەی پێوە دیار بوو لە ئاسەوارێکی دێرینی دوو رووبار دەچوو سەدان زنجیرە چیام دەبینی لەو نێوانەدا خوێنی مەیوم بە زەویەوە دەکرد و بەو پێوەرەی کە خۆم لە لای خۆم ئەژمارم دەکرد چەندین مانگ تێدەپەڕی و سەوزایی چەکەرەی دەکرد و دیمەنی هەزاران جۆر گوڵی وەنەوشەیم دەبینی، لەو کاتەدا لە خۆشییەکی سەیردا دەبووم و باوەشم بە گوڵەکاندا دەکرد و ماچم دەکردن گوڵەکان ناسروشتی زیادیان دەکرد و دنیایان دەتەنی، قەلەڕەشەکە بە قیڕە قیڕ دەهات و دەیگوت: (ئەنجامت دا پیشەکەت ئەی پیاو، تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ هەسارەیەکی دیکە ئەی پیاو) وەخەبەر دەهاتم دەمبینی خەونە، من سەدان شەو لەم جۆرە خەونانەم دەبینی.

ئەوی لە سەرەوە نووسرابوو دەقی نووسینەکانی (کامەرانی وەنەوشە) بوون چەند پەرەگرافێکی کورت بوون لەو خەونە سەیرانەی شەوان دەیبینین کە ئاشنایەتی تەواوی لەگەڵ قەلەڕەشەکەدا پەیدا کردبوو، هەر ئەوەش وای لێکردبوو تەواو بە دنیا رەش بین بێت و چاوەڕوانی مەرگێکی کوشندە بکات بۆ گەڕانەوە بۆ رەگەزی گوڵە بۆنخۆش و سەیرەکان ئەو هەمیشە باسی خەونە سەیرو درێژەکانی بۆ دەکردم و دەیگوت: (شاپووری خەزان من تەواو لەو خەونانە بێزار بووم هەمیشە لە دنیایەکی چۆڵدا پیاسە دەکەم).

سەردەمانی ئەشق و ئەویینداری (کامەران) ماوەیەك درێژەی کێشا ئەو دەمە تەواو ئاوێزانی ئەشقی (دلارام) ببوو، لە سەرکێشی بەردەوام بوو، (دلارام) هەموو جار بە (کامەران) ی گوتبوو (من دەبێت خەونەکەی باوکم بەدی بهێنم) لە ئاکامدا (کامەرانی وەنەوشە) بەڵێنی هەموو جۆرە ئامادەییەکی پێدابوو.

بەلام لە بۆسەی کەسانی خراپی شار دەربازی نەببوو هەڵبەتە لە چەندین بۆسەو شەڕەوە تێوە دەگلا کەسانێکی خاوەن ماڵ و سامان دەیانویست بە زەبری پارە خۆشەویستی (دلارام میهرداد) بکڕنەوە، بەلام سەرکەوتوو نەدەبوون، سیحری ئەو خاڵە تەلیسماوییەی ناوچەوانی خەڵکانێکی زۆری بەرەو رووی خۆی پەلکێش دەکرد، ئەو دەمەی من توانای تەواوکردنی خوێندنم نەماو نەخۆشی ماندووی کردم و سەفەرم کردبوو بۆ هەندەران، دوای ئەوەی ماوەی ساڵێك بوو کارەساتەکەی ماڵی مامۆستا (کاوە) تەواو ببوو (کامەرانی وەنەوشە) لە رێگەی چەند هاوڕێیەکی پارێزەریەوە سەرکێشی ئەوەی کردبوو کە دوای دۆسیەی سووتاندنی ماڵەکەو کوژرانی چەند ژنەکەو بزربوونی (مەلەك کانەبی) بکەوێت، هەربۆیە تووشی دەیان کێشەو ئازاردان بووبۆوە، هەر لەو مەیدانەدا شەوێك کۆمەڵێك چەکداری دەمامك دار لە ئۆتۆمبیلێکی مۆدێل بەرزەوە دەست رێژی

گولله له (کامەرانی وەنەوشە) دەکەن و له یەکێك له شەقامەکانی شاردا لـه تـاریکی ئێوارەیەکی درەنگدا به سـەختی برینـداری دەکـەن، بـەڵام نـازانم بـه چـی شـێوەیەکی موعجیزەئاسا نامرێت و پاش ماوەیەکی درێژ له نەخۆشخانه دەمێنێتەوەو دواتر زیندوو دەبێت و دەژێتەوە، (کامەرانی وەنەوشە) زۆر لەوە کۆڵنەدەرو سەرسەختتر دەبێت که کۆڵ بدات و بەردەوامی به کارەکانی دەدات.

بەردەوام دەبێت له داکۆکی کـردن و گـەڕان بـه دوای دۆسـیه سـەیرو تەمومژاویەکانـدا ئـەو هەمیشه له شەوانی تاریك و نائاساییەکاندا به کۆڵانه کۆنەکانی شاردا پیاسـەی درێـژی کردبـوو، هەمیشەو بەردەوام کردبووی به پیشەو به تەنیایی له ژێر نووری گڵۆپێکی سەوزی بچووکدا شـەوان به دەنگی زوڵاڵ و پڕ له هەیبـەتی پیاوانـه شـیعری شـاعیره گـەورەکانی خوێنـدبۆوەو گریـا بـوو سەردەمێکی بەم شێوه بەڕێ کردبوو.

له دوای سارێژبوونی برینەکانی بۆ ماوەیەکی چەند مانگی به دار شـەق بـەڕێ کردبـوو لەبـەر سەختی برینەکانی و شکاندنی ئەژنۆی راستی به گولله، سەرسەختانه هەزاران جار به گەڕەکەکـەی ماڵی (دڵارام) دا گووزەری کردبوو، چەندین جار له باڵکۆنی پەنجەرەکەوه نیگای سـیحراوی بـەرەو (کامەرانی وەنەوشە) کردبوو، (کامەران) سەدان چەپکه گوڵی وەنەوشەیی بۆ هەڵدابوو، به وێنـەی ئاشقه کۆنەکان هەوڵی دابوو به لقـی ئـەو درەختـه سـەوزه گەورەیـەی بـەردەم مـاڵی (دڵارام) دا سەرکەوتبوو، تا شەوانێکی درەنگ راموسانی درێژخایەنیان ئەنجام دابوو چەندین یادگاری سـەیرو سەمەره لەنێوانیاندا رووی دابوو.

وەك ئاشقێکی سەر سەخت و مودمین به (دڵارام) خۆی له قەرەی سەرکەشی سـەخت و دژواردا بوو، ئای لەو دیمەن و وێنانەی که (کامەران) تێیدا بووه ساڵانێکی خایاندو ئەمان ئەشق و جـەنگ و ماچ و گوڵ و هۆنراوەیان به باڵای یەکتری دا چرپاندبوو سەردانی گۆڕسـتان و گـۆڕی (ئاسمـان) و (سەهەندی بایز ئاغا) یان کردبوو لەو ساڵانەدا بـه شـێوەیەکی بـێ شـوومار ژمـارەی گوڵـەکانی گۆڕستان زیادیان کردبوو، پانتاییەکی زۆریان داگیر کردبوو.

دۆسیەی (مەلەك کانەبی) دانەخرا ئەو رۆژەی که له یەکێك له رووپـەڕی رۆژنامـەکانی شـاردا وێنەی ئافرەتێکی کوژراوو شێوه شێوێنراو بڵاو کرابۆوە، هەر زوو (کامەران) بەدواداچوونی کردبـوو بەرەو ئەو ناوچەیه رۆیشتبوو که (مەلەك) ی تێدا کوژرابوو به وتەی ئەو شوانەی کـه گـەواهی دەر بوو، ژنه کوژراوەکه کەس نەیزانی بوو کێیه، بیست و یەك فیشەکی پێوه نرابوو، کاسەی سەری بـه

بەرد پان کرابۆوە خوایە دیمەنێکی وەها سەیر دەبێت ویژدانی مرۆڤ بخاتە کوێوە؟ ئایا دەبێ ئادەمی چۆن هەست بەو دیمەنە بکات؟

هەر زوو (کامەرانی وەنەوشە) بە بەرپرسانی ڕۆژنامە ئەهلیەکەی راگەیاندبوو کە ئەو بەڵگەی تەواوی هەیە بۆ ناساندنی ئەو ژنە کوژراوە، بەرپرسانی ڕۆژنامە لۆکاڵییەکە بەوە زۆر دڵخۆش ببوون و سەرسام ببوون بەوەی دەتوانن کێشەیەکی گەورە لە سەر ئاستی کوردستان و دەرەوە لەسەر ئەو دۆسیەیە بنێنەوە و فرۆش و ناوبانگی ڕۆژنامەکەشیان برەو پێ بدەن.

ژنە کوژراوەکە یان بڵێین (مەلەك کانەبی) لە پزیشکی دادوەری دانرابوو هەڵبەتە هیچ کەسێك نەبوو خۆی بکات بە خاوەنی، (کامەرانی وەنەوشە) بە گران توانیبووی بچیتە ژوورەوەو لەگەڵ وێنەگرێکی ڕۆژنامەکەدا چەند وێنەیەکیان گرتبوو هەڵبەتە وێنەگرەکە کامێرایەکی بچووکی پێ بوو لەناو شوێنێکی هەستیاری خۆیدا حەشاری دابوو، دوای ئەوەی چەند وێنەیەکیان گرتبوو بەراوردیان کردبوو بەو وێنەیەی لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو کرابۆوە هەمان شێوە ببوو.

لە راستییدا پیاوەکانی (محەڕەم هەڵۆ) و مێردە کۆنەکەی (مەلەك کانەبی) بۆ هەموو جێگایەك چاودێری توندی (کامەرانی وەنەوشە) یان کردبوو، وردو درشت هەموو کرداروو ڕەفتارەکانیان تۆمارکردبوو، بۆ کوێ دەچێ؟ چی دەکات؟ کرابوو بە راپۆرت و حەواڵەی (محەڕەم هەڵۆ) و گەورەکانی تریان کرابوو، (کامەرانی وەنەوشە) ببوو بە دێوەزمەیەکی گەورەو چووبووە گەردنی (محەڕەم) و پیاوەکانی، چەند ڕۆژێك دوای دۆزینەوەی تەرمی (مەلەك کانەبی) لە ڕێگەی ڕێکخراوێکی پاراستنی مافی مرۆڤ و ژنان دۆسیەیەك بۆ کوژرانی (مەلەك کانەبی) کرایەوە، هەر ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی (کامەرانی وەنەوشە) و چەند هاوڕێیەکی کار بۆ بە ئەنجام گەیاندنی دۆسیەکەو دۆزینەوەی بکوژەکانی بکەنەوە، لەو ماوەیەدا (کامەرانی وەنەوشە) چەند جارێك پەیوەندی بە منەوە کرد و چەندین بەڵگەو دۆکۆمێنتی پێویستم بە پۆستا بۆ ڕەوانەکرد بۆ دەوڵەمەند کردنی کەیسەکە، (کامەرانی وەنەوشە) بە هەموو نیشانەکاندا ئەوەی زانی بوو کە بێگومان ئەو کوژراوە (مەلەك کانەبی) یە، چونکە لەو وێنانەی کە من بۆم ڕەوانە کردبوو چەند نیشانەیەك بە جەستەی مەلەکەوە ببوو کە هەمان ئەو نیشانەو خاڵانەش لەسەر تەرمەکە هەبوو، چەند خاڵێکی کوتراو چەند تاتۆیەك لەسەر لاشەی هەبوو، چەناگەو لامل و دەستی هەمان ئەو نیشانانە بوون کە لە هەردوو وێنەکاندا هەبوون ئەم نیشانەو بەڵگانە وایان کرد بوو کە (کامەرانی وەنەوشە) بتوانێت راستی مەسەلەکان بسەلمێنن بۆ یەکەمین جار کە (مەلەك کانەبی) رایکردبوو و لە ماڵی مامۆستا کاوە داڵدە درابوو لە سەر ریکۆردەرێك ناو نیشان و هۆی راکردنەکەی بەیان

کردبوو، هەروەها لەسەر لیستی هاتووی ڕێکخراوەکەی مامۆستا کاوە ناوی خۆیی و هۆی هەڵاتنەکە و چەکدارەکانی تێدا تۆمار کردبوو خۆشبەختانە ناوو داتای تەواوی ئەو ژنانەی کە هاتبوونە ناو ماڵەکەی مامۆستا (کاوە) لە یەکێك لە ڕێکخراوەکانی دیکەی دۆستی مامۆستا (کاوە) تۆمارکرابوون و لەسەر دەفتەرێکی دیکەی ڕێکخراوەکەی مامۆستا (کاوە)ش تۆمارکرابوون کە ئەو دەفتەرە بەر لە دوو ڕۆژ لە سووتانی ماڵەکەی مامۆستا (کاوە) لە لای من پارێزرابوو من لە ڕۆیشتنم بۆ هەندەران ئەسپاردەی (کامەران)م کردبوو، بەهۆی ئەم هەموو دۆسیە گرنکانە (کامەران) و هاوڕێیەکی پارێزەری توانیبوویان دۆسیەیەکی گرنگ و کەیسێکی بەهێز پێشکەشی دادگا بکەن و ناوی تۆمەتبارەکان پێشکەش بە دادگا بکەن هەر ئەم هەموو کارە وایان کردبوو کە (محەڕەم هەڵۆ) و چەند بەرپرسێکی دیکەی تێوەگلاو بە کەیسەکە تووشی شۆك و تێڕامان ببن و پەنا بۆ چەندین کارتی فشاری جیاواز ببەن.

بە هەر هۆیەك بێت لە ڕێگەی نامەی ئاگادارکردنەوەو لە ڕێگەی چەندین جۆر پەیامەوە هەڕەشەی کشانەوەی کەیسەکەیان لە (کامەرانی وەنەوشە) کردبوو، ڕۆژێك لە ڕێگەی کچێکی گەنجەوە هەوڵی ئالوودەکردنی (کامەرانی وەنەوشە)یان دابوو، کیژەکە داوای لە کامەران کردبوو کە تووشی کێشەیەك بووەو دەیەوێت (کامەران) یارمەتی بدات و سیناریۆیەکی سەیریان دروست کردبوو هەر خۆیان لە دوورەوەڕا چاودێری (کامەران) یان کردبوو بە کامێرایەکی داپۆشراو وێنەی پێکەوە وەستانی کامەرانیان گرتبوو، بەو ئەزموونە درێژەی خۆیان لە کاری هەواڵگیری دا هەیان ببوو، هەوڵێکی نابەجێیان دابوو تاکو (کامەران) بخەنە ناو هەڵدێرێکی قووڵی هەزار بەهەزارەوە، هەرچۆنێك بێت کامەران بەوپەڕی دڵسافیەوە، گوێی بۆ کچە گەنجەکە گرتبوو، ئەو کچە تەمەنی لەنێوان بیست بۆ بیست و دوو ساڵاندا ببوو، بە جلوبەرگێکی تەواو مۆدێرنەوە لە ڕێگەی کۆلێژ داوای یارمەتی لە (کامەران) کردبوو، بەوەی کە ئەو یەکێکە لەو ئەندامانەی لە ڕێکخراوێك کاردەکات بۆ داکۆکی لە مافی ژنان، تاکو بتوانێت کۆمەکی بکات و گوێی بۆ بگرێت تاکو ڕازی دڵی خۆی بۆ باس بکات، ئەو بە گریانەوە بە (کامەرانی وەنەوشە) ی وتبوو کەوا ئەو بە هۆی کەسێکی دیکەوە هەڵخەڵەتێنراوەو لە لایەن کوڕی یەکێك لەبەرپرسە گەورەکانی ئەو کاتەی حزبێك دەستدرێژی سێکسی کردۆتە سەرو بەوەی کە پارچەیەك زەوی لە گەڕەکی سوڵتانە گەورەکان وەردەگرێت.

هەڵبەتە هەموو ئەم سیناریۆیە لە لایەن خۆیانەوە دروست کرابوو تاکو (کامەرانی وەنەوشە) بخەنە ناو هەڵدێرو وێنەی بگرن و هەڕەشەی ئەوەی لێبکەن کە ئەگەر بێتو واز لەم کەیسە نەهێنێت

ئەوا وێنەکان دەنێرن بۆ (دڵارام) و وای تێدەگەیەنن کەوا (کامەران) پەیوەندی لەگەڵ ئەم کچە گرتووەو ناپاکی لە (دڵارام) کردووە.

بە هەر هۆیەك بێت سەدان وێنەو گرتەیان تۆمارکردبوو، بەو پێیەی کە کچەکە خاوەنی ئۆتۆمبیل دەبێت و (کامەران) ی دڵپاك و دڵساف لەگەڵی سەردەکەوێت و کچەکەش بەهەر هۆیەك بێت (کامەران) بەرەو دەرەوەی شارو بۆ ناوچەیەکی کەمێك نزیك لە شار دەبات و لەوێ هەوڵی خۆ نزیککردنەوە دەدات لە کامەران و تەواوی ئەم سیناریۆیە تۆمار دەکرێت.

زۆر ئەستەمە تۆ نەتەوێت کارێك بکەی، بەڵام بە زۆر بتخەنە نێو خەرەندێکی تەم لەسەر نیشتووی هەزار بە هەزار، مرۆڤ روحلەبەرێکی سەرکێشە پەی بە هەموو کونج و کە لەبەرەکانی دنیا دەبات تەنیا ناتوانێت لە دیوە تاریکەکانی ناخی خۆی بگات.

ئەو دەمەی پیاو بیر لە مەرگی خۆی دەکاتەوە هەر ئەو کاتە حاشا لە رابردووی خۆی دەکات و وا نیشان دەدات کە بێگوناه و بێ تاوانە، هەڵبەتە (کامەرانی وەنەوشە) تەواو لەوە بێتاوان تر دەبێت کە کەسانێکی کاڵفام و گورگئاسا لە خشتەی بەرن ئەو وتبووی (خودایە، ئەی ئەو دروستکەرەی لە سەری سەرەوەی شتەکان دانیشتووی، ئەی ئەوەی بە ملیۆنەها دووربین و روانگەی بەرزت هەیەو لە مرۆڤەکانت دەڕوانی ئەوەی من دەمەوێت کردنی کاری وەها نییە، من بێبەریترین کەسێکم کە بمەوێت خیانەت لە ئازیزەکەم بکەم، من تەنیام تەنیاتر لە بیابانێکی زەرد، پیاوێکم وەك سەگی پێ سووتاو، هەزاران سەروکارم لەگەڵ مرۆڤە جیاوازو خاکە جیاوازەکاندا هەیە، رزگارم بکەو لە پلانی ناحەزانم نەجاتم بدە).

ئەو زۆر داماو تاساو هاواری بۆ ئاسمان کردبوو، ئاخر ئەو هەر خۆی نەبوو مێژوویەکی تاڵی لەگەڵ ئاسماندا هەبوو، سەردەمانێکی لەوەو بەر لە ئاسمانەوە مەرگ بۆ خۆشەویستەکانی هاتبوو بەناچاری چارەنووسێکی رەشی ئیبلیسی پەسەند کردبوو، رەوا بوو بۆ ئەو کە لەگەڵ خەمدا ئاشنابێت، سەردەمێکی درێژی بە ناسۆرو ئازارو زامی قووڵەوە بەرێ کردبوو هەر خۆی، خەمخۆری رابردووی بوو کەسێك نەببوو بزانێت شوناسی ئەم کوڕە بێکەسە کێیە.

ئەو بۆ ناکۆتا چنگە کرێی لەناو رابردووی خۆیدا کردبوو بە مشت هەزاران ئازاری رابردووی لەناو خەون و خەیاڵە نەبڕاوەکانیدا دەسکەنە کردبوو.

لەو جێیەی کە کچە گەنجەکە لەگەڵ (کامەران) دا دابەزن جگە لە کۆمەڵێك دارسنەوبەر و قەدپاڵی چیایەك هیچ بوونەوەرێکی دیکە دیار نییە، ئەو بە هەر هۆیەك بێ وای لە (کامەرانی وەنەوشە) گەیاندبوو کەوا دەیەوێت لە جێیەك رازەکانی خۆی بۆ ئەو بەیان بکات،

لەبەر ئەوەی لەناو قەرەباڵخی شارو کافتریاو باخچەکاندا ناکرێ رازو نیاز گەلاڵە بکات.

بەڵام لە پاڵ ئەوەشدا ئۆتۆمبیلێکی شاراوەی دیکە لە دوورڕا بە کامێرای تایبەتی کاری سیخوڕی کردبوو، وێنەکان هەڵگیرابوونەوە، بۆ چەند جارێك کچە گەنجەکە دەستی کامەرانی گرتبوو باوەشی پێدا کردبوو بەو پێیەی دەترسێت، بەڵام (کامەرانی وەنەوشە) لەوپەڕی دڵپاکی و دڵسافی خۆیەوە ئامێزی بۆ کردبۆوە، تەواوی ئەم چرکەساتانە بەلێزانینەوە تۆمار کرابوو.

ئای لەو کارەساتە ناخۆشەی لەدوای ئەم چرکەساتانە دروست دەبن، ئای خودایە لەو کارەی دەیکەیت و مەبەستت نییە، بەڵام بۆت دەبێ بە بەڵا، زۆر جاران لە کاتی ئاخاوتندا بە بێ هەستی وشەیەك یان دێڕێك لە دەمت دەردەچێ تا کۆتایی تەمەنت دەبیتە دیلی ئەو وشانەو باجەکەی لەسەرت ناڕوات، یان کارێك دەکەیت بە مەبەستی چاکەو دواتر بۆت دەبێ بە دێوەزمەو بۆ هەمیشە بەرۆکت بەرنادات، خودایە چەند ناخۆشە هەوڵبدەی بۆ ئازادی کەسانێك، بەڵام دواتر خۆت داوای ئازادی بۆ خۆت بکەیت.

لە یەکێك لە رۆژەکانی ساڵدا لەناو کۆلێژی ئەندازیاری کچێك دێت و زەرفێکی زەرد لەسەر مێزەکەی (دلارام) و هاوڕێکانی کە بە (گرووپی دەستەسڕ بەدەستەکان) ناسرابوون دادەنێت و دەڵێت ئەم زەرفە دیارییەکە بۆ (دلارام) زەردەخەنەیەك دەکات و سپاسی دەکات و دواتر نامەبەرەکە لە ئان و ساتدا بزر دەبێت وەك جنۆکە ئاسەواری دیارنامێنێت، هەر زوو سوار یەکێك لە ئۆتۆمبیلە گرانبەهاکانی بەرپرسێکی پایە بەرز دەبێت و لە چاو بزر دەبن.

هەر لەو ساتەدا کە (دلارام) زەرفەکە دەکاتەوە، یەکە بەیەکە وێنەکانی (کامەران) و کیژە گەنجەکە دەبینێت نزیکەی چواردە وێنە دەبێت لە زۆرێك لە وێنەکاندا (کامەرانی وەنەوشە) بە خۆیی و قاتێکی رەش و گوڵێکی وەنەوشەیی سەر سینگی پێدەکەنێت و لەگەڵ کچێکی جواندایەو لەنێوان دارستانێکدا ئاوێزانی یەکتر بوون، هەڵبەتە ئەوە چرکەساتێك بوو کە (دلارام) بە ناو دۆزەخدا دەبات و دنیای لەبەرچاو تاڵ دەکات و ئاسەواری بۆ کۆتاییەکان دەمێنێتەوەو ئاڕاستەی رووداوەکانی بەرەو جەمسەرێکی دیکەی دنیا برد.

(دڵارام) هاوار دەکات و دەقیژێنێت، سەدان هاوڕێی کۆلێژ گوێ بۆ هاوارەکانی رادەبیێرن، ئەو دەمە (کامەرانی وەنەوشە) لە کۆلێژ نەبووبە کارێك لە دەرەوەی کۆلێژ ببوو، هاوڕێکانی (دڵارام) کە (مەندانە) و (شابانوو) (گوڵ بانوو) دەبن، هەوڵی ئەوە دەدەن هێمنی بکەنەوە، بەڵام بێ سوود دەبێت و لە گریانی خۆی بەردەوام دەبێت، (دڵارام) بە رەگەزی هەموو کچانی دنیا حوکم بە سەر (کامەران) دا دەدات.

لە راستییدا هەموو کچانی دنیا هەمان بیرکردنەوەو حەزیان هەیەو ئەگەر بەو وێنەیەدا تێپەڕن هەمان هەڵوێستیان دەبێت، ئەو دەمەی خودای گەورە ئادەمی خەلق کرد و لە پەراسووی ئادەم حەوای خەلق کرد، بوونەوەرێك بوو تەواو وەك ئادەم نەبوو ئادەم خۆڕاگرو بەهێز حەوا لاوازو بێ توانا، هەموو ئافرەتانی دنیا راستە رەگەزێکی تەواوکەری ئادەمیزادن بە بێ ئەوان ژیان بەو شێوەیە پەرەناسێنێت، بەڵام لە دیدو بۆچووندا ئەوان هیچ کات وەك پیاوان بەتواناو خۆڕاگر نین و بەرانبەر نەهامەتییەکان زوو کۆڵ دەدەن و دەستەمۆ دەبن.

(کامەرانی وەنەوشە) هەمیشە دەیگوت:(بە تەنیا لەناو گەردوونێکی گەورەدا لەناو سەرزەمینێکی مەزندا، بۆ یەکەمین جار پیاوێك دەست دەکات بە ئیش کردن، دواجار ژن هاودەمی دەکات، یەکەمین ماچ یەکەمین چاڵ یەکەمین ئاگر، یەکەمین ئیش کردن پیاوان بوون، ئەوان سەرمەشقی ماندوویەتی دنیایان بۆ خۆیان برد، هەر ئەوان داهێنەری ئەم زەمینەو زەمینەکانی تر بوون) لە راستییدا مەبەستی (کامەران) تەنیا لەوە نەبوو کە ژنان پیرۆزو خۆشەویست نین ئەو لە رەنجدانی خۆیەوە دەیڕوانی، بەڵام کارو فرمانی ژنانی نزم نەنرخاندبوو، ئەو هەمیشە ئەوانی بە گەورەو مەزن ناوزەد کردووە.

بەڵام ژنان زوو بڕیاری بەپەلەو هەڵە دەدەن و هەندێك جار بڕیارگەلی نادروست دەدەن و پەرەی ژیان و دنیا رەش و ناچیز دەکەن، دەنگی گریانی بێ بڕانەوەیان نەنگی دەخاتە نێو پێکەنینە نۆتە ئاساییەکانی ژیان، ئەو کاتەی (دڵارام) گریا، (کامەرانی وەنەوشە) زوو گریابوو، ئەو گریا بوو بۆ ئەوەی کردارێك هەیە کە کراوەو ئەو نەیکردووە.

سەفەر کردن منی فێری سەبرو بەرگریەکی زۆرکردم، فێری کردم چۆن وەك بەرد لە سەرم بدەن و قسە نەکەم وەك شەقام بە سەرمدا بڕۆن و چرکە نەکەم فێری کردم وەك

چیا روحم دەربهێنن و نەگریم، غوربەت و تەنیایی فێری ئەوەیان کردم کە ئەو کەسە نەبم کە هەم لەو دووره دەستییه لە دنیایەك کە تەنیاو غەریب بووم و هاوڕێیەکم نەبوو باوەشم بە خەمدا کردبوو، بێ خەبەر بووم لەوەی چی لە چوار دەورم روودەدەن، ئەوانەی کە لە نیشتمان روویان دەدا من لێیان بێخەبەر بووم، رۆژانە خاك بەش دەکرا زەوی دەفرۆشرا هەزاران ڤێلاو باڵەخانە قوت دەبوونەوەو من لێیان بێخەبەر بووم، لەوێ هاوارو ناڵە ناڵی ئەزیزانم لێرەش هاوارو ناڵە ناڵی ناخم، من نەمدەزانی (کامەرانی وەنەوشە) ئەو کوڕەی لە سێبەریدا وەستام و بووم بە (شاپووری خەزان) بووم بە کرێکارێك بە گوورزە رووناکییم دەخواردوو لە پەنجەکانم رووناکی دەتکایە خوار، ئەو لەوێندەر زامداری دەستی پیاوانی سوڵتانەو منیش لێرە ئەسیری ئازارەکانی ناخم.

ئەو کاتەی (دلارام) بە دڵێکی شکاوەوە وێنەکانی خستە بەردەم (کامەرانی وەنەوشە) رۆژێکی دیکە بوو پڕ لە خەم و پەژارە بوو (کامەران) بەوپەڕی حەپەسانەوە خۆی لە وێنەکاندا دیتەوە پاشان پیاوانە گریا، چەندین هەوڵ و تەقالای داو (دلارام) رۆیشت و گوێی بۆ نەگرت، سەدان جار روونکردنەوەی بۆ (دلارام) داو سوودی نەبوو سوێندی بە خوداو هەموو شتێکی پیرۆز خوارد سوودی نەبوو، گریاو تکای کرد سوودی نەبوو.

بە (دلارام) ی گوت (کەوا پەرلەیەو پلانی ناحەزانە) بڕوای نەکرد.

بە هەزار شێوەو ئاواز گریا بوو بۆ رۆژانێك پەیمانی ئەبەدیان بە یەك دابوو رۆیشتنی (دلارام) خەموو پەژارەی بە هێندەی چیا بەرزەکانی کوردستان لە دڵی (کامەرانی وەنەوشە)دا قوت کردبۆوە، هاوارو ناڵە ناڵی شەوانی تەنیایی وەهایان کردبوو (کامەرانی وەنەوشە) پەنا بۆ خاڵی کردنەوەی شووشە شەڕابەکان بدات و وەك شێت لەسەر شەقامەکان بخەوێت و لەگەڵ بێ لانەو بێ نەواکاندا مقەباو دارو کاغەز بسووتێنن و تا شەوانی درەنگ بگرین و بکوڕوزێنەوە، ئای خودایە لەو ناخۆشییە، تۆ ببینە چۆن ئازار لە جەستەتدا سەوز دەبێت کاتێك خۆشەویستەکەت پارچەیەکی دۆزراوەی روحت لێت زوویر دەبێت.

لەگەڵ گریانی (کامەران) دا هەموو ئینجانە گوڵەکانی گریا بوون و ئاورنگی سووریان لەسەر گەڵاو گوڵەکانیان دەردابوو، هەموو خانووە قوڕینەکان کۆڵانە تەنگ و تاریکەکان گریابوون، شەمشەمەکوێرەکانی شەو پێکرا گریا بوون.

(کامەرانی وەنەوشە) لەبەر ئەوەی تەواو راستگۆو لەسەر حەق ببوو، هەرووەك خۆی چەندین جار دەیگوت:(من لە زۆر کاتدا لە ئاستی حەقی خۆم بێدەنگ دەبم سروشتی ژیانم وەهایە، بێدەنگی هەڵدەبژێرم، چونکە لە بێدەنگییدا بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕێم و بێ دەنگ دەبم لەناو ناخی خۆمدا بە ناو دنیایەکی دیکەدا دەگەڕێم).

ئەو لەو چەند دێڕو رستەیە زیاتر هیچی دیکەی بە (دلارام) نەووتبوو راستەو راست بەرەو باڵەخانەکەیان رۆشتبۆوە یەك تەختە لە سەر قەرەوێڵەیەکی کۆنی دارِزاو لەسەر پشت کەوتبوو لە بنمیچی ژوورەکەی روانیبوو گریابوو.

لە ژیانی ئەودا، سەدان گریان دووبارە بوونەوە، گریان ببوو بە کولتووری ژیانی ئەو، بۆ هەمیشە لە سەری رۆیشتبوو.

لە راستییدا (دلارام میهرداد) زۆر کوێرانە بریارێکی لەو جۆرەی دابوو سزایەکی وەهای بەسەر (کامەرانی وەنەوشە)دا سەپاندبوو کە (کامەران) بە وێنەی (ئارتۆر رامبۆ) بریاری دابوو سەفەر بەرەو بیابان بکات و لەوێ لەناو لمدا بخەوێت بمرێت، (کامەران) مەحکوم بوو بەوەی خیانەتێکی گەورەی کردووە لە (دلارام)، هەڵبەتە تا رادەیەکی زۆریش (دلارام میهرداد) ناحەقی نەکردبوو، چونکە هەموو رەگەزێکی مێینە هەموو ژنێك یان کچێك تووشی وەها خەیاڵییکی رەش دەبێت، ئەگەر بێت و خۆشەویستەکەی یان دلخوازەکەی ببینێ لە باوەشی کەسێکی دیکەدا، لە وێنەکاندا کچێك باوەشی بە (کامەرانی وەنەوشە) دا کردبوو، ئاخر ئەمانە کەم نەبوون لە لای (دلارام) زامێکی گەورە بوون لەسەر دڵ، زامێکی قووڵ بوون کە سارێژ بوونەوەیان سانا نەبوو، وەك درکێکی رەق وابوون هەڵچەقیبوونە بەری پێیەکان و نەش دەدۆزرانەوە ئازارێکی زۆر بە ئێش بوون.

(کامەرانی وەنەوشە) لە دوای چەند رۆژێك نەیتوانیبوو بڕواتەوە بۆ زانکۆو دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی قوفڵ کردبوو، کەوتبووە بیرکردنەوەیەکی قووڵ لە ژیان لە مرۆڤەکانی دەوروبەری.

ماوەیەك بوو دۆسیەکەی (مەلەك کانەبی) لە لایەن پارێزەرەکەوە برابووە پێشەوە، بەلام دادگا بڕیاری تەواوی نەدابوو، لە ئانووساتی خەڵوەتی (کامەرانی وەنەوشە) هەواڵ دێت و (کامەران) تووشی راچڵەکین و سڵەمینەوەیەکی دیکە دەبێت لە نیوەڕۆیەکی رۆژێکی ساڵدا لەو دەمەی زۆربەی خەڵك سەرقاڵی خواردنی نانن

کۆمەڵێك چەکدار دەسرێژی گوللە لە پارێزەرەکەی هاوڕێی (کامەرانی وەنەوشە) دەکەن و لەبەر سەختی برینەکانی دەمودەست پارێزەرەکە (کێوان دەشتی) گیان دەسپێرێت و بکوژەکانیش وەك پیشەی هەمیشەییان هەڵدێن و ناسنامەیەکیان لێ دەرناکەوێت و زامێکی تری ناسۆر ئامێز دەکەوێتە سەر دڵی(کامەرانی وەنەوشە).

ئەو کاتەی (کامەرانی وەنەوشە) بە تەواوی لەو تراژیدیایە دڵنیا دەبێت وەك شێت بە چاکەت و بیجامەیەکی سپییەوە بە کەمێك ریشی تەنك و قژێکی رەشی درێژەوە بە پێی پەتی بە قادرمەکانی باڵەخانەکەدا دێتە خواروو وەك شێتێك کە لە قەهری منداڵان هەڵدێت چەندین جار بە شەقام و کۆڵانەکاندا رادەکات و منداڵان هاوارو هولەی لێدەکەن و ئەویش هیچ ناڵێ جگە لە چەند وشەیەکی پچڕ پچڕی بێ مانا وەك (کوژرا، ئەو، بەچی؟، بۆچی؟) هەروەها هاواری کردبوو (مەرگ، هەڵاتن، راکردن، مەرگ، کوشتن، خوێن) شێتانە رایکردبوو، ئاخر ئازارەکانی جەستەی (کامەران) هێندە زۆر ببوون کە توانای بەرگە گرتنیان ئاسان نەبوو، هێدی هێدی جەستەو روحی (کامەران) وەك قەلەڕەشەکە رەش ببوو، دڵی کامەران ببوو بە قەقنەس ئاگرێکی بە بڵێسە لە ناخیدا سەری هەڵدابوو جەنگێکی دێرین بەرپا ببوو.

لە دوای ماندووبوونێکی زۆر لە راکردن لە سەر پارچە نایلۆنێك لە کونجێکی کۆڵانێکی تەنگەبەردا دانیشتبوو تێر تێر گریا بوو هاواری بۆ ئاسمان و خوداو فریشتەکان کردبوو، ئاخر ئەوە سەرەنجامی ژیانی لاوانی کوردستان بوو کە هەمیشە لە ئازاردا دەتلانەوە، (کامەرانی وەنەوشە) لە تاوی مەرگی هاوڕێ پارێزەرەکەی کە کوڕی ژن و پیاوێکی هەژار بوو، (دڵارام میهرداد) ی لەیاد کردبوو وەك چۆن (دڵارام) یش (کامەران)ی وەلانابوو لەناو خەم و ئازاردا نوقمی ئەسرین ببوو.

## ٢٢

هیچ کەس و لایەنێك نەیتوانی بکوژانی پارێزەرەکە (کێوان دەشتی) بسەلمێنێت مەرگی ئەویش وەك مەرگی هەزارانی دیکە پەردە پۆش کراو بوو بە ژێر گڵەوە، گلێکی بێوەفا، هەموو جەستەکان لەخۆی دەگرێت و دەیان رزێنێت.

ماوەی چەند مانگێك بوو پەیوەندی نێوان (دلارام میهرداد) و (کامەرانی وەنەوشە) ئالۆز ببوو، (کامەران) دەستی دابووە خوێندنەوەیەکی کوشندەو شەوو رۆژ بەیانی و ئێواران سەرقاڵی خوێندنەوە ببوو زۆربەی ئەو کتێبانەی لە ژێر قەرەوێڵە رزیوەکەیدا بوون چەند جارێك خوێندبوویەوە و چەندانی دیکە لەسەر شەقام و لە کەلاوەکاندا کە فڕێ درابوون هێنابوویو خوێندبوویەوە.

تەواو خۆی لە دنیای دەوروبەری دابڕی بوو، زۆر کات سەرقاڵی خواردنەوەیەکی زۆر ببوو، زۆر جاریش جگەرەکێشانی بێ بڕانەوە، ئەو لە سەرەتادا رقی لە هەموو جۆرە دووکەڵێك بوو، بەلام دواتر چێژی دنیای لە سووتاندا دەبینییەوە و وتبووی (دووکەڵ لە ناخم پەنگ دەخواتەوەو لە چاومدا ئاوا دەبێت) ژیانی بە سەدوهەشتا پلە گۆڕاو هەموو شتەکانی دەوروبەری لە بیرکرد و ماوەیەکی زۆر ئەوەی لەیاد چوو کە لە زانکۆ دەخوێنێت و بڕیاری دابوو نەڕواتەوە، زۆر جار لە لایەن هاوڕێکانییەوە ئاگادار کرابۆوە، بەلام سوودی نەببوو لەو ماوەیەشدا مامۆستا (کاوە میرخاس) سەفەری بەرەو کەنەدا کردبوو.

بە تەواوی لەو شارە خامۆشەدا پشت و پەناکانی لەدەست دابوون، هەر بۆیە وەك شێتێکی بلیمەت هەر لەو ماوەیەدا سەدان وتارو رەخنەی جۆراو جۆری لە رووپەڕی رۆژنامەکاندا بڵاو کردەوە.

لە لایەن چەند هاوڕێیەکی نووسەریەوە یەکەمین کۆمەڵە شیعری خۆی بە ناوی (مەرگی گوڵە ژاکاوەکان) بڵاوکردەوە.

لەو سەردەمەی کە کتێب هیچ بایەخێکی لە لای خەڵك نەمابوو، خەڵك سەرقاڵی کڕینی ئۆتۆمبیل و مۆنیکاو پاترۆلە علوجەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق بوون.

هەموو کتێبەکانی (کامەرانی وەنەوشە) کە هەزار کتێب بوون لە لایەن خوێنکارانی زانکۆو پەیمانگاکانەوە کڕدران ئەو قەسیدە شیعرییە درێژانەی باسیان لە بێئومێدی و بێ هودەیی ئادەمیزاد دەکرد هەموو تێکڕا کڕدران شیعرەکان شانیان لە شانی شیعری شاعیرە گەورە نوێخوازەکانی ئەو سەردەمە دەدا، بە خوێندنەوەی یەکێك لە قەسیدەکانی (کامەرانی وەنەوشە) هەزاران گەنج گریان و هاواریان کردو توانەوە، ئەو ڕۆژەی (کامەرانی وەنەوشە) کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەی لە یەکێك لە مەیدانەکانی شاردا ساز کرد بەر لەو ڕۆژە لە لایەن سەنتەرێکی ڕۆشنبیرییەوە ڕێکلامێکی باشی لە سەر ئاستی کۆلێژو پەیمانگاکان و بازاڕو شوێنە گشتییەکان بۆ کرابوو، ئەو ڕۆژە هەزاران کەس بە کوڵ گریان، (کامەرانی وەنەوشە) بە دەنگییکی زولاڵی نەی ئاسا گریا بوو شیعری بەسەر شاردا وەشاندبوو، لەناو گوێگراندا (دلارام میهرداد) و (مەندانە) و (شابانوو) و (گوڵبانوو) تەواوی هاوڕێیانی (کامەرانی وەنەوشە) ئامادە ببوون، ئەو ڕۆژە شەڕعیەت بۆ شیعر گەڕایەوە خەڵك ماچی کتێبیان کردەوەو باوەشیان بە وشەدا کردەوە، لەدووڕا (دلارام) بە کوڵ گریابوو، چاوە هەنگوینییەکانی پڕ ببوون لە خوێن، ئەو دەمە زانیبووی تەواوی ڕووداوەکان سیناریۆ ببوون، لە دوای کوژرانی (کێوان دەشتی) ڕاستییەکان لە لای (دلارام میهرداد) ئاشکرا ببوون هەر زوو زانیبووی تاوانێکی گەورەی بەرانبەر (کامەرانی وەنەوشە) ئەنجام داوە، ئەو ڕۆژە (کامەرانی وەنەوشە) قاتێکی ڕەش و گوڵێکی وەنەوشەیی و قژو ریشێکی درێژەوە بووە میوانی دڵی هەزاران کەس.

دەموچاوێکی فریشتەئاسا سەدایەکی نەبڕاوە کە لەنێوان مۆسیقاو دەنگی پەریەکاندا دەجوولایەوە ئاوێتەی ئێوارەیەکی پرتەقاڵی ببوون، لە باڵندەیەکی لانەوازی ڕەشپۆشەوە چەندان پەیامی برووسکە ئامێزی بە گوێی خەڵکیدا چرپاند، لەبەرزیەوە قەسیدەی بە سەر دڵە بێنازەکانی شاردا خوێندەوە، وەك پیاوێکی بە جەوهەرو شەهامەت دەرکەوتبوو، کەرنەڤاڵێکی بە ئێش و ئازاری چێ کردبوو لەناوەندی ئاپۆڕای جەماوەرێکی زۆردا پیاوەکانی سوڵتان و (محەڕەم هەڵۆ) بینرابوون وەك پڵنگی برسی وەك هەڵۆی چاو تیژ دەیانویست هەموو کەس ڕاو بکەن هەر لەو ماوەیەدا چەند پیاوێکی وەها لە شاردا دروست ببوون، کە هەوڵیان دەدا کیژە جوانەکانی شار بۆ پایە بەرزەکان ڕاو بکەن، لەنێوانیاندا پیاوێکی سەر ڕووتاوەی کەمێك ورگن هەبوو، کە بە وتەی زۆربەی خەڵك چەندان کاری بێئابرووی کردووە، لەگەڵ چەندین کچی جوان و ناسك و کاڵفامدا کە کەوتبوونە داوییەوە کاری خۆی کردبوو، کەسێکی بەسیاسەت و حەکیم بوو، هەر بۆ خۆی وانەی تایبەتی لە ئەهریمەن وەردەگرت و جادووی لە کچان دەکردو هەڵی دەخەڵەتاندن، هەر بەو چەشنە

لەناو شاردا وەك داڵەكەرخۆرە دەگەڕان و بێ هەست كردن بـە نـەنگی گـەوادیان بـۆ گـەورەكانیان دەكرد.

لە ئێوارە كۆڕەكەی (كامەرانی وەنەوشە)دا ئەم جۆرە پیاوانە هەبوون، هەر كـارو كردارێـك لـە شاردا بكرایە هەر كۆڕێك سینەمایەك شانۆیەك كۆبوونەوەیـەك بكرایـە ئـەم پیاوانـە دوورو نزیـك بەردەوام دەبوون و ئامادە دەبوون، ئیدی ئەم ئێوارە شیعرییەی (كامەرانی وەنەوشە) دوا پـەیامێك بوو چرپا بە گوێی خەڵك و دەسەڵاتدا، روونبوو كە ئەمە دوا پەیامێك بوو.

لەناوەرۆكی (كتێبە وەنەوشەییەكەدا) دەقی وەسێتنامەیەكی (وەنەوشە) ی تێـدا بـوو، كـە دوا وتە بوون بۆ (كامەرانی وەنەوشە) نووسرابوون لە دواجاردا زۆر كۆمەكی بە مـن كـردو سـەرەداوی زۆری بۆ كردمەوە.

ئازارو ناسۆرەكانی ناخی (كامەرانی وەنەوشە) هێندە زۆر بوون وەك ئۆقیانووس وەهـابوون ئـەو گەیشتبووە دوا وێستگەی ژیان، لەو ماوەیەدا ئەوەی لەیاد كردبوو كە كەسـێك هـەبوو پارچـەیەك بوو لە روحی، شتێك نەبوو لە ژیانیدا بـە نـاوی (دڵارام میهـرداد) لـە ناسـۆرو خەمـدا هەسـتی خۆشەویستی لەیاد كردبوو، مەرگ و هاڵاوی مەرگ ژیانیان تـەنی بـوو، لـەناو دەریایـەك تاوانـدا شەپۆلی نەبڕاوەی دابوو، بە زمانێك تێكـەڵ لـە شـیعرو فەلسـەفە لەگـەڵ هـەموو كـەس دەدوا، پەیامەكانی لەناو رۆژنامەكاندا ترسێنەر بوون، پیاوانی دەسـەڵاتیان وڕو كـاس دەكـرد، لەهـەموو هەفتەیەكدا وتارێكی رەخنە ئامێزی ئاڕاستەی سوڵتانەكان دەكرد.

هـەر ئەمـەش بـووە هـەوێنی ئاشـووبێكی دیكـەو لـە سـیناریۆیەكی دیكـەدا (كامـەرانی وەنەوشە)تووشی كێشەیەكی دیكە بوو ئەوە گیرۆدەی كرد و لە وەتەن هـەڵی كەنـد، ئـەو ئاشـووبە وای كرد (كامەران) بیر لە هەڵاتن بكاتەوە، ئـەو دەبـوو هـەڵبێت، دواجـار هـەڵاتن لەناوچـاوانی نووسرابوو، بەڵام چۆن؟ بە فەلاكەت و پڕوكانەوە، پیاوانی (مەحرەم هەڵۆ) لە دەرفـەتێكی ئـاڵتوونی خۆیاندا كردەوەیەكیان ئەنجام دا كە كارێكی وەهای كرد سەرلەبەری پڕۆژەكانی (كامـەران) سـەراو بن بكات.

ئەو ئێوارەیەی كە دەبوو ئەم رووداوە نەخوازراوە رووبدات تەمێكی رەش باڵی بـە سـەر شـاردا كێشا، ئێوارەیەك بوو بە گوتەی خەڵكی (هەموو ئیبلیسە گـەورەكان دابەزیبوونـە سـەر شـار لـە هەموو كووچەیەكدا خۆیان مەڵاس دابوو) جوانییەكانی شار سەراوبن ببوون، خەیاڵە پرتەقاڵییەكان سووڕ ببوون، ئێوارە وەنەوشەییەكان رەش ببوون نیگەرانی وەها لە شاردا دروست ببوو، كـە كـەس بە نیاز نەبوو بژی.

بە هەر شێوەیەکی سیخوڕی بووبێ توانیبوویان کلیلێك لە کلیلـەکانی ژوورەکـەی (کامــەران) کۆپی بکەن ئەویش رەنگە لە رێگەی چەورەو کاسە لێسێکی گەورەی خۆیان لە پاداشتی پارەیـەکی زۆردا، کەسێکیان لەناو باڵەخانەکـەدا راسـپاردە کردبـوو بـەوەی دەرگـای ژوورەکـەی (کامــەران) بکاتەوەو بە کراوەی پێوەی بدات لەو کاتەی کە (کامەرانی وەنەوشە) بەرەو یەکێك لـە گۆڤارەکـان رۆیشتبوو، تاکو وتارێك ببات بۆ بڵاوکردنەوە، پاشان لە سیناریۆیەکی دروسـت کـراوی شـەیتانیدا لەو کاتەی لە چاوەکانیدا هیچ فەڕو رۆزیەك بەدی ناکرێت لەو دەمەی گەمی تـاعوون لـە زەمینـە بەفەڕەکاندا تۆو دەکەن، دڵە خاوێنە بێ خەوشەکان راو دەکەن، دێن و لە پارچەیەك نایلۆنی رەشـی کەپس کراودا یەك کیلۆ گرام تریاك دەخەنە نێـو جانتایـەکی کـۆنی (کامــەرانی وەنەوشــە)لە ژێـر قەرەوێڵەکەیداو بە بێ ئەوەی پەنجە مۆرێك بە جێ بهێڵن بە ئەسپایی دەرگاکە دادەخەنەوە، لەدوای ئەوەی (کامەرانی وەنەوشە) دێتەوە لە شەوێکی درەنگی تاریکدا دەستەیەك لـە پیـاوانی ئاسـایش دێن و بە تۆمەتی هەبوونی ماددەی هۆشبەر لە باڵەخانەکەدا دەست دەکەن بە پشـکنین دواتـر لـە هەموو ژوورەکانی دیکەوە دەست پێدەکەن و بەو سیناریۆ جەهەنەمیەی خۆیان وا نیشان دەدەن کە بە بێ بەرنامە هاتوون، بەڵام (کامەرانی وەنەوشە) لەوە دڵپاکتر دەبێت کە گومانێکی وەهـا دروسـت بکات هەر بۆیە لە دوای پشکنین لە ژێر قەرەوێڵە شکاوەکەی (کامــەرانی وەنەوشــە)دا ئــەوەی بـە دوایدا وێڵ دەبن دەیبیننەوەو دەست بەجێ (کامەران) دەستگیر دەکەن، ئیدی (کامــەران) قـوڕگی لە قسەکردن دەکەوێ و تەنیا وشەیەکیش چییە بۆی نایەتە وتـن، هـەر بۆیـە ملکەچـی دەکـات و دەزانێ سیناریۆی پیاوەکانی (مەحەڕەم هەڵۆ)یە بۆیە پێدەکەنێ.

بە هەر هۆیـەك بێـت (کامــەرانی وەنەوشــە) بـە بیجامەیـەکی خـەت خـەت و تیشـێرتێکی پەمەییەوە بە چاو بەستراوی بە وێنەی پیـاوانی رژێمـی لەناوچـووی بـەعس سـواری ماشـێنێکی سەربازی دەکەن و بەرەو بەندیخانەیەکی نهێنی دەیبەن و بە هـەزاران قادرمـەی نهێنییـدا دەیبەنـە خوارەوە بەرەو ناوجەرگەی زەمین، ئای لەو ساتەی مرۆڤ تاوانێکی نەکردوەو راپێچی نـاو بەندیخانـە دەکرێت، لەوێ بە چاو و دەست بەستراوی لـە ژوورێکـی تاریـك و شـێداری دەخـەن و تـا مـاوەی چەندین مانگ دەرگای بە روودا ناکرێتەوە، کاتێـك (کامــەرانی وەنەوشــە) دوای چـەند مانگێـك یەکەمین قسەی لەگەڵدا دەکرێت، ئەو زەردو لاواز بوو ریشـێکی درێـژو قـژێکی درێـژ تـا ئاسـتی پشتی بە وێنەی درندەیەك یان مرۆڤێکی کێوی دەردەکەوێت.

ئاخر بێ دادی تا ئەو رادەیە ناعەدالەتی تا سەر ئێسقان وەهـا کارێـك دەکـەن کـە مرۆڤێـك پاشماوەیـەکی گرنگـی قوربانیـدان، بـەو چەشـنە سـووکایەتی پێبکرێـت کـەم نییـە، تاوانـەکانی

(کامەرانی وەنەوشە) تەنیا راستگۆیی و بوویری بوون، لە راستییدا پەیامێکی ترسێنەری لــە دڵــی پیاوەکانی سوڵتاندا چاندبوو، هەربۆیە دەیانویست بەو دەردەی ببەن کە نەدەبوو بچێ.

لەو ماوەیەی کە (کامەران) ونببوو لە دوورەوەڕا (دڵارام میهرداد)تووشی نەخۆشییەکی تونــدی دەروونی ببوو خەون گەلێکی ترسێنەر باڵیان بەسەردا کێشا بوو، کە ئــەویش توانــای تــەواوکردنی خوێندنی نەمابوو، هەموو شار ماتەم دایگرتبوو خەڵك ببوون بــە دوو بــەرە، بەرەیــەك دەیــانگوت کەوا (کامەران) کوڕی تریاکەو کۆمەڵەی دووەم دەیانگوت کەوا ئەو پاك و بێ تاوانە.

ئای خودایە چەند دژوارو ناخۆشە مرۆڤ لە تاریکییدا دیل بێت لە تاریکییدا چــەندین پــەیامی سەیر بۆ مرۆڤ دێن، بەڵام تەنیا سوودێکی تاریکی ئەوەیە داهێنــان دەکــات، زۆر جــار ئــەوەی لــە تاریکییدا مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە، هیچ کات لە تاریکییدا روونادات.

هەر لەو تاریکییەی ناخی زەمیندا لەو جێیــەی نزیــك بــوو لــە دڵــی ئەهریمەنــەکان، چــەندین بیرۆکەی سەیر دێن و دەچن (کامەرانی وەنەوشە) لە ناخی زەمیندا بیر لە هەڵاتن دەکاتەوە هــەڵاتن لە هەرێمی مردووەکان، ئەو وتبووی کەوا ئەم هەرێمە سەوز نابێت وەك بیابانێك وەهایە کــە پیــاو دەکوژێت، هەمیشە گوتبووی (هەرێمی مردووەکان، ئەو ئادەمیزادانــەی کــە لــەم وڵاتــەدا دەژیــن راستە هەموویان نەمردوون، بەڵام بە ریتمی مردووەکان دەڕۆن) لەو بڕوایەدا بوو کــە مــەرج نییــە ئەوەی بگووزەرێت و پایان بێت نەمردووە، هەمیشە کەسانی زوڵم لێکــراوی بــە مــردوو دەچــواند، بۆیە بیرۆکەی هەڵاتنی لە هزردا گەڵاڵە دەبێت، بەڵام هەڵاتن لە کوێ کاتێك تــۆ دیــل بیــت؟ خــۆ مرۆڤی یەخسیر تەنیا بیر لە مردن ناکاتەوە بەڵکە بیر لە هــەڵاتن و ئــازادیش دەکاتــەوە، دروســت نازانم چۆن ئەم بیرۆکەیە دێتە مێشــکی (کامــەرانی وەنەوشــە)، بــەڵام بــەو پێیــەی دواتــر چــەند زانیاریەکم دەست دەکەوێت دەمزانی کــە (حــەکیمی روونــاکی) ئــەوەی پەیامبــەرێکی نهێنییــەوە بەفریادی لێقەوماوان دەکەوێت دێت و دەروازەکــانی دنیایــەکی دیکــە بــۆ (کامــەرانی وەنەوشــە) دەکاتەوە، ئەو حەکیمەی بە درێژایی مێژوو لەگەڵ ئەم گەلە ئاشنا بوو دێت و گوورزەیەك روونــاکی لە ژێر سەردابەکانی بەندیدا بە (کامەرانی وەنەوشە) دەدات رووناکی دەخاتە نێو دڵی و لە تەنیایی دا ئامۆژگاری دەکات و دەبێتە هاودەمی، هەر لــە ژێــرەوەڕا لــەو جێیــەی لــە ژێــر پێــی هــەموو دنیاوەیت قەلەڕەشەکە دێت و خەونەکانی (کامــەرانی وەنەوشــە) داگــیر دەکاتــەوە، قەلەڕەشــێکی قەقنەسی پەیامهێنێکی دۆزەخــی دێــت و خۆشــییەکانی ژیــان ئاوەژوودەکاتــەوە، ئــەو هەمیشــە (کامەران) بەرەو مەرگ بانگ دەکات، بەڵام لە هەموو بســتێکی ئــەم دنیایــەدا شــەڕێکی ســەیر لەنێوان رەش و سپی دا هەیە، ئیدی نازانیت سپی دەیباتەوە یان رەش دروست نازانیــت لــە کوێــدا

براوەو دۆڕاوە دەردەکەوێت، چونکە هەمیشە بەدوای یەکدا دێن، قەلەڕەشێکی سەیرو ئەفسووناوی قەلەڕەشێکی جادوویی دێت و لەسەر شانی (کامەرانی وەنەوشە) دەنیشێتەوە.

لەو ژێر زەمینەوە چەندین پەیامی سەیر ئاڕاستەی دنیا دەکات هەر لەوێ را شەڕی نێوان رەش و سپی دەست پێدەکات رۆژێك نوور دێت و دەرگاکانی ئاسمان بە رووی (کامەرانی وەنەوشە)دا دەکاتەوە، پەیژەی کریستاڵی رێگای ئەڵماسی، رۆژێك تاریکی دێت و دەرگا نهێنییەکانی گەردوون بەرەو کونە رەشەکانی گەردوون بە رووی (کامەران) دا دەکاتەوە.

ئەو کونە رەشانەی هەموو تەوەرەکانی گەردوون بە دوای خۆیدا کێش دەکەن، لەم سەرو بەندی شەڕەدا (کامەران) تووشی پووکانەوەی جەستەو مێشك دەبێت و تووشی ترس دەبێت تووشی چەندین نەخۆشی سەیر و ناسۆر دەبێت.

ئای لەو نیگەرانییە سەیرەی لە کەناری ئاواتەکانی مرۆڤدا دروست دەبێت، چەند سەیرە بتەوێت بفڕیت و باڵەکانت گۆنەکەن و ببەسترێن بە رووی ئاسماندا، گیر بخۆی نەتوانی هەناسە بدەی، لەو تاریکییە دژوارەی ناخی زەمیندا (کامەران) بە نینۆك لەسەر داروبەردی شێداری ئەوێندەرێ چەندین دێڕی سەیرو ترسێنەر لە سەر دیوارەکان هەڵدەکۆڵێ هەمیشە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە ئەوەی لە زوودا بەسەر کەسانێکی دیکەدا هات دەبێت لێرە بەسەر (کامەرانی وەنەوشە) دا بێتەوە، ئیدی ئەم سەرزەمینە ئەم هەرێمە خاکی ئێمە نییە ئێمە بێبەرین لە هەموو بەردێکی چڵەدارێکی مشتە خۆڵێکی ئێمە قەرەچی گەڕیدەین هەر رۆژە لە کەناری وڵاتێکین هەر رۆژە لە دنیایەکی ترین ئەمە خاکی نیشتمان فرۆشەکانە خاکی ئەوانەیە برسین و تێر نابن خاکی ئێمە دوورگەیەکی دوورەدەستی دنیایە مەنفاو هەندەرانە، ئاسمانە، ئێمە دەفڕین ئەگەر باڵەکانیشمان ببەستن هەر دەڕۆین بەهەشتی دروست کراومان ناوێت دەفڕین بەرەو دوور بەرەو هەرێمێك مرۆڤەکان بە ریتمی مردوو نەڕۆن و بە نۆتەی مەرگ قسە نەکەن.

ئەو کاتەی لە دوای چەند مانگێك (کامەرانی وەنەوشە) هاتەدەرەوە یەکەمین قسەی لەگەڵ کرا لە (تۆم هانکس) دەچوو لە فیلمی (کاست ئەوەی) جلەکانی یەکپارچە قەوزەبوو، ریش و قژی لە ئەندازەی درێژیدا بوون، ئەو دەمەی رووناکی راستەقینەی دەبینی چاوەکانی دەنوقاندو هێندە زەلیل و کزۆڵ بوو دڵی وەك بەردی لەت دەکردو ئاسمانی دەگریاند، بە هەر هۆیەکی سەیر بێت ئەو لە لایەن باوکی (دڵارام) بەکەفالەت ئازادکرا، ئەو دەمەی نە ئەم (دڵارام) ی بەبیر مابوو نە (دڵارام) لە دۆخێکی جێگیردا بوو هەر بۆیە دەرگاکان بە روویدا کرانەوەو بڕیاری هەڵاتنی دا.

# ٢٣

## "هاوینی ساڵی ٢٠٠٦"

ئەو شەوەی لە ماڵی مامۆستا (شەرمین عەزیز) گەڕامەوە هەربەو کراس و پانتۆڵە رەشەوە یەك تەختە لەسەر سیسەمەکەم ڕاکشام و چاوم بریە بنمیچی ژوورەکەم زۆر تاساو دڵتەنگ نزیکەی یەك کاتژمێر گریام تەنیا بۆ وچانێکیش نەخەوتم شەوێکی گەرم بوو، لەو ماوەیەی سەفەری دەرەوەی ولآتم کردبوو ئەوەندە مێشکم جەنجاڵ ببوو زۆربەی شتەکانم تێکەڵاو دەکرد کە ناوی (محەڕەم هەڵۆ) م لە مامۆستا (شەرمین عەزیز) بیست دەمەودەست لەرز دایگرتم و بیرم هاتەوە کە ئەم پیاوە هەر ئەوەیە کە تراژیدیای دنیای لە ژیانماندا چاندووەوە، هەر ئەو بوو (مەلەك کانەبی) گوللەباران کرد هەر ئەو و پیاوەکانی بوون ماڵی مامۆستا (کاوە) یان سووتاند هەزاران کتێبیان سووتاندو (کامەرانی وەنەوشە) یان تووشی دەردە سەری دنیا کرد.

لەو دەمەی کە لە ماڵیان هاتمە دەر (پەریهان جەلال)م لەگەڵ ئەو کوڕە بینی هێندەی تر خەم داگیری کردم خۆ من هیچ کات بە نیازی خۆشەویستی نەبووم لەگەڵ (پەریهان جەلال)، بەڵام دەمزانی نزیك بوونەوەی لەو جۆرە کەسانە کارێکی نەشیاوو ترسناکە (پەنا کاروانی)ئەو کوڕەی بە خۆیی و مارسیدسە رەشە مۆدێل بەرزەکەیەوە هەوڵی راوکردنی کچانی شاری دەدا ئەو لە مشك بوو وتەیەك هەیە دەڵێت: (ئەوەی لەمشك بێت جەواڵ دەدڕێت) ئەویش کوڕی کابرایەکی وەها نەبوو کە خێری بۆ خەڵك هەبووبێ کوڕی پیاوێکی سەرمایەدار بوو کە برای (محەڕەم هەڵۆ) بوو واتە برازای (محەڕەم هەڵۆ) بوو ئەو پیاوە چاو تیژەی لە سەردەمی خەباتی شاخ وەك دووربین دوژمنی لە دووری چەندین کیلۆمەتر دەبینی، بەڵام هەنووکە ئەو چاوە تیژانەی بۆ راوکردنی موڵك و ماڵ و کچانی جوان بەکار دەهێنێت.

ئیتر لەو ئێوارەیەوە زانیم (پەنا کاروانی) وەك دوژمنێکی بێدەنگ وەك مین لە کێڵگەدا بۆم دەکەوێتە خەباتەوە ئەزموونێکی درێژم هەبوو لە خوێندنەوەی دەموچاوی کەسانی بەرانبەردا، بەڵام ترسم لەو نەبوو، بەڵکو بە بێ هیچ ترسێك کۆڵم نەداو بەردەوام بووم ئەو شەوە سەدان بیرو بۆچوون لە مێشکمدا گەڵاڵە بوون هەر بۆیە بڕیارمدا داوێك بۆ (محەڕەم هەڵۆ) و (پەنا کاروانی) بنێمەوە هەر بۆیە خۆم خزاندە ناو ئەو خانەوادانەوە و بڕیاری نزیك بوونەوەم لێیان دا.

بۆ بەیانی کە دایکم هاتە ژوورەکەم بەو چەشنە منی بینی زۆر ترسام مـن رەنگـم پـەڕی بـوو شڵەژاو ناسروشتی دەردەکەوتم وتی (کوڕی خۆم تۆ بۆ وا لە خۆت دەکـەیت ئـاخر تـۆ شـێتی یـان چی؟) بە پێکەنینەوە وەڵامم دایەوەو وتم (من کۆڵ بە کۆڵم گەڕیدەیەکی کەس نەناسـم) هەسـتام و دەموچاوم شت و کەوتمە بیرکردنەوە لە پلانێك بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو تاوان بارانە لـەو سـەردەمەدا تاوانبارەکان بە ئاشکرا بە گۆڕەپانی کوردستاندا دەگەڕان و پۆزیان بەسەر هەموو خەڵکدا لێ دەداو ئازادی و سەرفرازی و بایەعی و چی و چیان بە منەت بە خەڵك دەفرۆشـتەوە باسـی جـادەی قـیرو باڵەخانەو باخچەیان بۆ خەڵك دەکـرد باسـی ئـازادی و سەربەسـتیان دەکـرد خۆیـان بـە خـاوەنی کوردستان دەزانی خۆیان بە موڵك دارو کلیل داری خۆشبەختیەکانی کوردستان دەزانی.

من ئەوانم باش دەناسی هەر ئـەوان بـوون ژیـانی ئێمـەیان ئـاوەژووکرد مـن نـەمتوانی ببمـە ئەندازیارو (کامەرانی وەنەوشە) ش بەرەو هەندەران هەڵات و ئەوان ئەویان راوەدوو ناو بزریان کـرد ئەوان ئاسەواری ئێمەیان لەسەر تەختەی کوردستان سڕیەوە.

من دەبوو کارێك بکەم هەوڵم دا ناسنامەی خۆم بگۆڕم بۆ ماوەیەك خـۆم بێـدەنگ کـرد و لـە کووچەی ماڵەوە مامەوە، دواتر بە سـتایلێك و شـێوازێکی نوێـوە وەدەر کـەوتم ئیـدی مـن ئـەو (شاپوور سوبحان)ە یان ئەو (شاپووری خەزانە) نـەبووم کـە پێشـتر هـەبووم، لـە لایـەك سـەرقاڵی تۆمـارکردنی رووداوەکـانی مێـژوو بـووم، لـە لایـەك سـەرقاڵی تـەواوکاری بـووم لـە کتێبـە وەنەوشەییەکەدا، لە لایەك کاروبـاری سـینەمام رادەپەڕانـد، دەبـوو تۆڵـەش لـە (محەرەم هـەڵۆ) بکەمەوە، لەهەمان کاتدا لە کۆتایی کۆکردنەوەی چیرۆکەکەدا بووم رۆژێـك زەنگـم بـۆ (پـەریهان جەلال) لێ داو داوای یەکتربینینم لێ کرد ئەو لەو ماوەیەدا ئۆتۆمبیلێکی کڕی بوو هەر بۆیە هات بە دوامدا رۆژێکی گەرمی هاوین بوو کاتی خۆرئاوابوون نزیك بوو، هاتە بەردەم ماڵمان و پێکـەوە چووینە قەراغی شار لەوێ لە ژێر دار سـنەوبەرێکدا دابـەزین و پێکـەوە چـەند کـاتێکی خۆشمـان بەسەر برد وەك دوو هاوڕێ پێکەوە پێکەنین و گریان و باسی دنیامان کرد، من هیچ کات بە نیـازی حەرامەوە تەماشای (پەریهان) م نەدەکرد بەڵکو وەك هاوڕێییەکی نزیك مامەڵەم لەگەڵ دەکرد.

دەمویست هەندێك پرسیاری لەربارەی (پەنا کاروانی) لێبکەم سەرەتا ئەو دەیگـوت: (شـاپوور بۆ ماوەیەکە دیارنیت سەرقاڵی چیت؟) دەبوو من لە وەڵامدا درۆ بکەم نەدەبوو تـەواوی شـتەکانی بۆ باس بکەم لە ژێر نووری مەغریبێکی درەنگدا لەو کاتەی خۆر لـەو دیـو کـە لـەوە ماڵئـاوایی دەکات و دنیا سوورو پرتەقاڵی دەبێت دەبـوو شـێوازێکی دیکـە لـە قسـەکردن بـەکاربهێنم مـن

دەمگوت: (سەرقاڵی نووسینی سیناریۆکان بووم) هەستم دەکرد (پەریهان جەلال) زۆر بە من ئاسوودە دەبێت هەر بۆیە هەمیشە ئارەزووی بە نزیکبوونەوەو بینینم دەکرد.
(پەنا کاروانی) نەیدەزانی کە ناسراوی من لەگەڵ مامی دێرینییە دەنا هەر زوو لە چاڵی دەنام، من باسی ئەوم کردو بە (پەریهان)م گوت (ئەو کوڕە بە ناوی پەنا کاروانی پەیوەندی بە ئێوەوە چییە؟) بە پێکەنینەوە (پەریهان) دەیگوت:(ها ها ها ها شاپوور چییە هەست بە چی دەکەی؟ ئەو کوڕە ناسراومانەو هاوکاری کردوم بۆ دامەزراندم لە زانکۆ ئەوان لەناو دەسەڵاتدا دەست ڕۆیشتون) من دەمگوت: (ئەی ئەو شەوە بۆکام ئاهەنگ بانگێشتی کردبووی؟)، (پەریهان) دەیگوت: (هاهاهاها زۆر سەیرە، ئەو شەوە یادی لەدایکبوونی (پەنا کاروانی) بوو سەدان هاوڕێی خۆی بانگ کردبوو، هاهاهاها) دووبارە دەیگوت: (ئەو کوڕێکی زۆر دڵناسکە ئارەزوو دەکات کە هەمیشە بە خۆشی بژی و نابێ هیچ کەس بڕیارەکانی بشکێنێت، چونکە کوڕێکی نازدارەو خاوەن سامانە).

دەبوو وابێت کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندی شار بوو کە سەدان باڵەخانەو بارو مۆڵ و باخچەو ڤێلایان لە وڵاتدا هەبوو باوکی ناوی (ئەمیر کاروانی) بوو پیاوێکی خڕی باڵا کورت بوو کە هەمیشە بە رووی راگەیاندنەکاندا پێدەکەنی و واژۆی گرێبەستەکانی دەکرد.

بڕیاری دابووکە هەرچی خۆشی ژیانە بۆ کوڕەکەی دەستەبەر بکات، هەر بۆیە گەورەترین ئاهەنگی یادی لەدایکبوونی لە هۆتێلی "پەری دەریا" بۆ ساز کردبوو، ئەو هۆتێلەی کە لە دوای رووخانی رژێم لەسەر هۆڵ و باخچەیەك دروست کرابوو کە یەکەمین دانیشتنی (وەنەوشە) و (جیهانگیر سەرحەد) ی تێدا ئەنجام درابوو.

(پەریهان جەلال) کچی پیاوێکی تێکۆشەری وەك (جەلال کوێستانی) بوو کە تەرمەکەی بوو بە خەڵووز، ئەو کچە دەم بە پێکەنینە پڕ هەست و سۆزە هاوڕێی گورگێکی وەك (پەنا کاروانی) بوو کە هەمیشە وەك گێل و غەشیمێك خۆی لە قەڵەم دەدا، بەڵام دڕندەیەك لە ناخیدا خەوتبوو ئەو ڕێك لە کوڕە گەورەکەی دیکتاتۆر دەچوو هەمان هەناسەی ئەوی هەبوو، لە لایەن (پەریهان)ەوە زۆر شتی تایبەتیم لەربارەی ژیانی (پەنا کاروانی) زانی باسی ئەوەی کرد کە ئەو لەبەر دڵنەشکاندن لەگەڵی هاوڕێیە، دەنا هیچ هەستێکی بۆ کەسێکی وەها نییە دۆستایەتی نێوان

ماڵی (جەلال کوێستانی) و (محەرەم هەڵۆ) دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی شاخ ئەو دەمەی (شەرمین عەزیز) و کچەکەی (پەریهان جەلال) دەگەنە شاخ و بەرەو هەندەران رەوانەیان دەکەن.

لە ژیاندا (شەرمین عەزیز) و کچەکەی قەرزداری (محەرەم هەڵۆ) بوون بە ژیانیان ئیدی دەبوو بەو شێوەیە بن کە ئەوان دەخوازن هەربۆیە دەرگایان بە روویاندا کراوە بوو، چەند جارێك (محەرەم هەڵۆ) بەڵێنی ئەندام پەرلەمانی بە (شەرمین عەزیز) دابوو، بەلام ئەو ئەوەی رەت کردبۆوەکە بیەوێت بچیتە ناو دنیای سیاسەتەوە، چونکە بە وتەی خۆی هیچ خێرێکی لە سیاسەتدا نەدیبوو جگە لە ناسۆرو ئازار نەبێت.

ڕاست بوو لە سەردەمی رژێمدا (محەرەم هەڵۆ) سیاسەتی بە شێوەی راست کردبوو و خەباتی کردبوو، بەلام لە دوای راپەرین هێندە چاو برسی ببوو تفی لە رابردووی خۆی کردبوو شەقی لە خەباتی چیا هەڵدا بوو پشتی کردبووە خەڵك و رووی کردبۆ دنیاو پارەو سامان، هەر زوو چەندین جار خانەوادەی شەهیدانی لە خۆی نزیك کردبۆوەو ئەوەی کچ و ژنی جوانی هەبووایە بەڵێنی پێدەدان و بە هەر هۆیەك بووایە رازی دەکردن ئەوانەی بەشەرەف بوون ملیان بۆ نەدەداو ئەوانەی خۆیان دەدۆڕاند رامی دەکردن و دواتر جلەکانی ژێرەوەی لەلای خۆی گلدەدایەوە ئەو رۆژەی کە بە نهێنی ئەو رەفتارەم زانی تفم لە خۆم و ژیانم کرد و بڕیاری ئەوەم دا کە کارێك بکەم هەرگیز نەکرابێ، هەر بۆیە لە دوای دووەمین بینینەوەی (پەریهان جەلال کوێستانی) تەواو خۆم ئاشنای ئەو خانەوادانە کرد و بوومە یەکێکی باوەڕپێکراوی ئەوان.

هەستم دەکرد ئیتر خەریکە دەتوانم شتێك بکەم بۆ ئارامی روحی ئەوان، بۆیە پەیمانم بە روحی ئەوان دا کە لە پێناو شادکردنیان ئەوەی دەتوانم بیکەم ئەگەرچی دەمزانی زۆر دژوار و ترسناکە من لە گەرووی تیمساحدا کارم دەکرد نەمزانی چۆن چوومە ناو ئەو کارە پڕ مەترسییەوە، بەلام لەو کاتەدا تەواو لە ژیان وەڕس ببووم باکم بە مەرگ نەبوو دواجار خۆم وەك مردوو دەهاتە بەر چاو بە جلوبەرگی رەشەوە هەمیشە لە تەعزێبار دەچووم.

ڕۆژێك (پەریهان جەلال) لەگەڵ خۆی منی بردوو چووین بۆ ماڵی (پەنا کاروانی) ئەو هێشتا ژنی نەهێنابوو تەمەنی لەنێوان بیست و پێنج بۆ سی ساڵ دەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بێ بەش نەبوو لە رەگەزی مێینە هەمیشە نێچیری خۆی هەبوو.

کە گەیشتینە ئەوێ خزمەتکارەکەیان دەرگای لێ کردینەوەو چووینە هۆڵی میوانەکەیان کە زۆر گەورە بوو و بێشومار لەوحە و وێنەی هەمەجۆری دەست کردی تێدا هەڵواسرابوو چەندین جۆر مۆبیلیات و تحوفیاتی سەیرو سەمەرە کاتێك بۆ خۆی هات و بەخێر هاتنی کردین، قاتێکی

مارۆنی لەبەردا بوو لەگەڵ کراسێکی سپی و بۆینباخێکی مارۆنی و جوتی قۆندەرەی مارۆنی ڕێك لە ویقاردا بە سینەماکارو ئەستێرەکانی هۆلیود و سەرمایەدارو گەورەکان دەچوو بە پێکەنینەوە بەخێرهاتنی لێکردین وا دیار بوو منی لەیاد نەمابێ، بەڵام بە بینینی من لەگەڵ (پەریهان) زۆر شاد نەبوو، چونکە لەمێژ بوو دەیویست (پەریهان) بخوازێت و بەڵام ئەو ملی بۆ نەدابوو وای هەست دەکرد من لەگەڵ (پەریهان) پەیوەندیمان هەیە.

هەر زوو (پەریهان) منی بە (پەنا کاروانی) ناساند و وتی ئەمە هاوڕێمە و دۆستی دێرینمانە، بەو وشەیە کەمێك گەشایەوە و بزەیەکی کردو وتی (بە راستی خۆشحاڵم بە هاتنی دوو میوانی زۆر بەڕێز، بفەرمووون چی دەخۆنەوە؟)، من سەرەتا شەرمم دەکرد بۆیە (پەریهان) وتی (قاوە دەخۆینەوە) بانگی کرد تاکو قاوەمان بۆ بێت پاشان باس کرایەوەو (پەنا کاروانی) وتی (دەتوانم بزانم ئەم هاتنە کتوپڕەی ئەم میوانە بەڕێزەمان چییە؟) جا کەسانی دوو روو خیانەتکار چەندین کەسانی جیاواز لە ناخیاندا هەیەو زۆر بە باشی دەتوانن نواندن بکەن بە پێکەنینەوە خۆی خست بە پشتاو دەستییکی بە ریباتەکەیدا هێنا.

من زووتر بە (پەریهان) م وتبوو کە دەمەوێت لێرە کار بکەم بۆیە بەر لەوەی (پەریهان) هیچ بڵێ من وتم (لە راستییدا بەڕێز "پەنا کاروانی" من دەمەوێت کاربکەم) من خۆم پێویستم بە کار نەبوو بەشی ئەوەو زیادیش هەبوو کە بە خۆشی بژیم، بەڵام من مەبەستم لە نزیك بوونەوەو زانینی راستییەکانی ژیانی ئەو خانەوادانە هەبوو، و دەمزانی ئەوان خاوەنی چەندین کۆمپانیای گەورەن و بێگومان دەتوانێت کارێکم بداتێ بۆیە، ئەویش وتی (بە خۆشحاڵییەوە ئەگەر زمان بزانی مەبەستم زمانە بیانییەکانە ئەوا دەتوانم بتکەمە بەڕێوەبەر لە یەکێك لە کۆمپانیاکانم) لە وەڵامدا (پەریهان) وتی (چەند زمانێکی وەك ئینگلیزی و عەرەبی و فارسی دەزانێت) کە ئەمەی بیست وتی (کەواتە زۆر باشە، من دەتوانم ئەوەت بۆ بکەم) من لە روخساردا گەشامەوەو زۆر سپاسی ئەوم کرد و کەمێك بە شان و باڵیدا هەڵم داو توانیم بەو شێوەیەی دەمەوێت وەسفی بکەم هەر بۆیە توانیم نزیك ببمەوە لێیان و توانیم بڕوای ئەوان بەلای خۆمدا پەلکێش بکەم و کارێك بکەم سیقەم پێبکەن.

لە دوای خواردنی قاوەو نانخواردنێکی پاشایانە گەڕاینەوەو (پەریهان) منی گەیاندە ماڵی خۆمان.

بۆیە بۆ بەیانی خۆم ئامادە کرد و لەو کۆمپانیا نـاودارە ئامـادە بـووم و (پـەنا کـاروانی) بـە هەموو فەرمانبەرەکانی ناساندم وەك بەڕێوەبەری کارە گشتییەکان، ئیتر من نزیك بوومەوەو توانیم کەسێك بدۆزمەوەو بچمە ناو نهێنییەکانی ژیانی ئەوان هـەر زوو بـە حـوکمی سـەلیقەو زیـرەکیم توانیم سەرنجیان بە لای خۆمدا رابکێشم و سیقەم پێبکەن بۆیە بە هـەموو فایلـە تایبەتیەکانیانـدا رۆچووم، لەناو کۆمپیتەرەکانیاندا سەدان زانیـاری و شـوێنی گـرنگم دۆزیـەوە کـە کـاری سـەیرو سەمەرەی تێدا دەکەن ئەوەی نەدەبوو بیزانم زانیم و رۆژانە لەگەڵ کارکردندا چەند داتای گـرنگم لـە لای خۆم هەڵدەگرت و لەناو هاردی نهێنی خۆمدا تۆمارم دەکردن.

ماوەی مانگێك بوو کارم لەگەڵ کۆمپانیاکەی (پـەنا کـاروانی)دەکرد تـوانیم زاڵ بم بـە سـەر هەموو کەم و کورتیە زۆرەکانی ئەو کەسەی بەر لە من بەڕێوەبەر بووە، توانیم هـەموو هەڵـەکانی چاك بکەمەوە هەر بەم کارانەم زوو توانیم متمانەی خۆم سـەنگین بکـەم هـەر بۆیـە پاداشـتی زۆر گرانبەها کـرام و بوومـە ئەنـدامێکی گرنگـی دەسـتەی بـەڕێوەبردنی گرووپـی کۆمپانیاکانیـان، ئۆتۆمبیلێکی گرانبەها و شۆفێرێکم بۆ ئامادە کراو سەردانی چەندین جێگەی ناوچەکەم کرد کە بۆ کارکردن و دروست کردنی پرۆژە دەگونجان، هەموو رۆژە گەرمەکانی ساڵ بـەو شـێوەیە تێدەپـەڕین کە من دەمخواست، چەندین جار بۆ شەوە ئاهەنگە گەورەکان بانگێشـت دەکـرام، لـە رێگـەی ئـەو سەلیقە زۆرەی لە ئـەوروپا پەیـدام کردبـوو تـوانیم لـەنێو کۆمپیتەرەکانیانـدا بگـەڕێم و چـەندین نەخشەو تەندەرو پلانی گەورە کۆپی بکەم سەدان زانیـاری بەسـوودو پێگـەی گـرنگم لـە هـەموو پنتەکانی وڵاتدا دۆزیەوە کە موڵك و ماڵی ئەوان بوو، چەندین گەنجینەی نهێنی کە کاری بازرگانی مادە هۆشبەرەکانی تێدا دەکرا لە دەورووبەری شارو ئەو دیو چیا بەرزەکەی شارەوە کە ناوچـەیەکی گەشتوگوزاری بوو تازە خەریك بوو ئاوەدان دەبوویـەوەو زەوی و ڤـێلای گـەورەی تێـدا بـوو لـەوێ ئوتێلێکی گەورەیان بنیاد نابوو لە ئۆکرانیاوە کۆمەڵێك سۆزانیان هێنابوو شەوان سـەمایان دەکـرد و پیاوە دەوڵەمەندەکانی شار دەچوون لەوێ قوماریان لەسەر زەوی و ژن و کچ و خانوو ئۆتۆمبیل و ئەو جۆرە شتانە دەکرد تابەرەبەیان گرانبـەهاترین جـۆری مـەییان دەخـواردەوەو پێدەکـەنین و لـە نهۆمەکانی سەرەوە کاری سۆزانی بازیان ئەنجام دەدا، ئیتر تا دەهـات رقـم زیـاتر تـاوی دەسـەند، دەمزانی مادە هۆشبەرەکانی کە (کامەرانی وەنەوشە)ی لەسـەر بەنـدکرا هـەر کـاری ئـەمان بـوو دەمزانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە کوشندەکانی وەك ئایدزو چـی و چـی هـەر کـاری ئـەمان بـوو، دەمزانی زیادبوونی رێژەی ماددەی تریاك و حەشیش و هیرۆین هەر کاری ئەمانەیـە، تەنانـەت لـە

چەند پنتیکی جوگرافیا گەرمەکانی وڵات کێڵگەی نهێنییان هەبوو بۆ پەرەپێدانی رووەکی تریاك و باخەوان و شارەزای ئێرانی و ئەفغانیان هێنابوو بۆ پەرەپێدانی.

هەموو ئەو گرێبەستانەو پلان و ناوچانەم بە تەواوەتی وەرگرت تەنانەت بـە ئـامێری جـی پـی ئێس توانیم تانوپۆی ناوچەکان هەڵبگرمەوە، لە راستییدا ئەوەی من خـەریکی بـووم لـە کـارێکی هەواڵگری دەچوو کە نەمدەزانی بۆ کێ ئەنجامی دەدەم، بەڵام دەکرا زانیاری گرنگ بن بۆ داهـاتوو، تا بتوانم لە رێگەی کەناڵێکەوە بیانخەمە روو، هەر ئەوان خەریکی هەڵکەندنی چەندان بیرە نـەوتی نهێنی بوون.

کاری زۆر دژوارم بەئەنجام گەیاند زانیاری زۆر گرنگم کـۆکردەوەو لـە سـیدی و هـاردی نهێنـی خۆمدا تۆمارم کردن، لەگەڵ ئەوەشدا کاروباری کارگێڕی خۆم زۆر بە باشی ئەنجام دەداو دەمتـوانی تەواوی چیرۆکەکان کۆبکەمەوە، مووچەی مانگانەم بێشوومار زیـادی کـرد و هـەر بۆیـە دەچـووم لەسەر حسابی خۆم لە بانك دام دەدەنا، تاکو رۆژێك بێت سوودی لێوەربگرم.

لە دوای ئەوەی جێگای خۆم کردەوە شـەوێك بانگێشـت کرابـووم بـۆ ئاهـەنگێکی گـەورە لـە ئوتێلی (پەری دەریا) لەبـەرگی کابرایـەکی دەوڵەمەنـدی خـاوەن پـارەدا خـۆم گـۆڕی و ئامـادەی ئاهەنگەکە بووم، چاکەت و پانتۆڵێکی رەش و کراسێکی رەش و بۆینباخێکی مۆرم لەبـەر کردبـوو جوتی قۆندەرەی بریقەداری رەشم لە پێ کرد قژم بە کرێم چەور کرد و بـە ئۆتـۆمبیلێکی گرانبـەها کە تازە کڕیبووم چووم بۆ ئاهەنگەکە لە کاتی چوونە ژوورەوەمـدا چـەند دەفتـەرێك دۆلارم لەگـەڵ خۆم بردبوو وەك پاسپۆرتێك پێی چوومە ژوورەوە لەوێ زەنا زەنایەکی گەورە بـوو لەبـەر دووکـەڵی نێرگەلەو جگەرەو بۆنی شاتوو قۆخ و کاڵەك و پرتەقاڵ مێشك جام دەبوو دنیایەك بوو لە سـەرەوەی دنیای ئاسایی لە دەرەوە خەڵکانێك هەبوون بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان سواڵیان دەکرد، بەڵام لـەوێ قومار لەسەر پارەی خەیاڵی دەکـرا و زار هەڵـدەدراو زەوی دەدۆڕاو شـەڕاب و مـەی دەخورایـەوە ئافرەتی سۆزانی بە نیوە روتی دەهاتن و دەچوون هەر کەسەو لە لایەکـەوە پێدەکـەنی و سـەرقاڵی کارێك بوون منیش لە دوورڕا تەماشاکەر بووم و هیچی تر، دەمبینی چـەندین پیـاو رامووسـانیان لەگەڵ کچە سۆزانییەکاندا دەکردو کەس شەرمی لە کەسی تر نەدەکرد.

من بەر لەوەی بێم کامێرایەکم لەگەڵ خۆم هێناو لەو جێگایانـەی کـە دەرفـەتم بـۆ دەرەخسـا وێنەم دەگرت و لەگەڵ لێدانی روناکی دیسکۆلایتەکاندا فرسەتم دەهێنا وێنەی یەکە بەیەکەی پیاو و ژنـەکانم دەگـرت، وێنـەی (محـەڕەم هـەڵۆ) و (پـەنا کـاروانی) و (ئـەمیر کـاروانی) و چـەندین سەرمایەدارو پیاوی سیاسەت و گەورە پیاوانی دەسەڵاتم دەگـرت ئـەو شـەوە چـەندین کەسـایەتی

ناسراو و خاوەن پایەو و دەست روویشتوو دەوڵەمەند و بگرە کۆمەڵێك کادیری ناسـراوی حزبـەکان لەوێ میوان بوون وێنەی زۆربەیانم گرت و نەمهێشت هیچ کەسێك بەوە بزانێت هەیان بـوو دەسـتی لە ملی سۆزانییەکدا بوو، هەبوو دەستی بـۆ قـونی قەحبـەکان دەبـرد، هـەبوو مـەمکی دەگـرتن وێنەکان خۆیان گەواهیدەر بوون و راستییەکان دەسەلمێنن ئیدی زار هەڵدەدراو بە شەش دادەکـەوت بە دوو دادەکەوت بەیەکـدا دەکـەوتن و زەوی دەبرایـەوە زەوی دەدۆڕا، قەحبـە دەبرایـەوە قەحبـە دەدۆڕا، بە راستی سەیر بوو دیمەنی وەهام لە کوردستاندا نەبینیبوو، تەنیا لـە فیلمەکانـدا دیمـەنی وەهام چاو پێکەوتبوو وام دەزانی کوردستان و بەرپرسە گـەورەکانی ئـەم شـاروو وڵاتـە فریشـتەی خودان، بەڵام ئەو شەوە ئەو پیاوەم بینی کە لە تەلەفزیۆنەکانەوە خۆی وەك فریشتە نیشانی خـەڵك دەدا ئەو پیاوە درێژە سمێڵ ماش و برنجیە ئەوەی نیوەی سەری رووتاوەتەوەو هەمیشـە باسـی دنیـا بینی و خزمەتی کۆمەڵگا دەکات ئەو پیاوەی کە خۆی وەك نوێنەری خـەڵکی لێقـەوماو و ئـەنفال نیشان دەدات لەوێ قوماری دەکرد و دەسـتی بـۆ ناوگـەڵی ئافرەتـەکان دەبـردوو زاری هەڵـدەداو وەرەقەی کۆنکەنی رادەکێشا رێك فیلمی (ڕۆیـاڵ گـازینۆ)م بـەیاد دەهاتـەوە کـە (جـیمس بۆنـد) دەینوێنێت، لە خۆمەوە هەندێ جار پێکەنینم دەهات دوای ئەوەی زۆربەی کاری سـەخت و سـەیرو سەمەرەم تەواو کردو وەك وێنەگرتن و تۆمارکردنیان چوومە ناو خەڵکەکەوەو خۆم وەهـا نیشـان دا کە کوڕی کابرایەکی بەرپرسم و بەشداری ئاهەنگەکەم کردو جگەرەم کێشاو سەمام کردو باوەشم بـە سۆزانییەکدا کردو هەر لەبەر ئەوەی کەس گومانم پێ نەبات.

بەر لەوەی ئاهەنگەکە تەواو بێت بە بیانووی چوون بۆ دەستشۆڕ هاتمە دەرەوە لەو دۆزەخەی کە من دەمبینی و خەڵکی کوردستان نەیاندەبینی، ئەو دۆزەخەی لە لای ئەوان بەهەشت و خۆشی بوو من بە دەم لێخوڕینی ئۆتۆمبیلەکەمەوە دەستم کرد بە گریان و لە قەراغی شار لە کەنارێکـەوە لام داو پڕ بە قوڕگم گریام، دەگریام بۆ کەسـوکاری شـەهیدان بـۆ کەسـوکاری قوربانیـانی ئـەنفال بـۆ (بەهرۆز چاوڕەش) بۆ (کامەرانی وەنەوشە) بۆ (وەنەوشە) بۆ (شەڕمین عەزیز) بۆ (مەلەك کانـەبی) بۆ هەموو قوربانیانی دەستی پیاوە سەرخۆش و بێ باکەکانی وڵات وەك فلاش بـاکێکی خێـرا بـە نێو هەموو مێژوودا شۆڕبوومەوە بۆ ناو مێـژووی قیزەونـی ئـەوان دەرگـای دووەمـی مێـژووم بـە کلیلێکی وەهمی کـردەوە و چـوومە ئـەوێ لـەوێ هـەموو خائینـەکان هـەموو ناپاکـەکانم بینـی هەریەکەو دیلی دەستی کردەوەیەکی رەش و نەشیاوی خۆی بوو، بە ناو مێژوودا رۆیشتم و گووزەرم کرد شتی جوانم نەبینی هەموو شتەکان رەش و ناشرین بـوون هـەموو قیـزەون و دڕندەئاسـا بـوون نالەبارو بێ رووناکی و بێ هەست و سۆز بوون.

چەند کاتژمێرێك تێپەڕی و من هەر لە دنیایەکی نەشیاودا بووم تفم لە خـۆم دەکـرد کـە چوومە ناو ئەو ئوتێلە ئەو شوێنەی سەردەمانی زوو شـوێنی بەیـەك گەیشـتنی جـوانی بـوو شوێنی مرۆڤە پاکەکان بوو ئەمێستا دەسوتی بە ئاگری ناپـاکی، بۆگەنـە وەك تەویلـەو زبـڵ خانەکان، سەردەمێکی دیرۆك درەختێك لێرە دەشنایەوە بە عیشوەو نازەوە عەیارانە گەشـەی دەکرد، بەڵام هەنووکە قەحبەکان دەشنێنەوە زاری خیانەتی تێـدا هەڵـدەدرێت و چارەنووسـی خەڵکی رەش و روتی ئەم وڵاتەی تێدا لەگۆڕ دەنرێت.

نزیکی کاتژمێر دووی شەوێکی گەرمی هاوین بوو چاکەتەکەم لەبەرم داکەندوو فڕێم دایـە سەر کوشنەکەو ریباتەکەم کردەوەو قۆڵەکانم هەڵ کرد، بـن باڵـەکانم یەکپارچـە ئـارەق بـوون ئۆتۆمبیلەکەم باژوداو بەرەو ماڵە وێرانەکەم هاتمەوە.

شەو درەنگ بوو نەمزانی چۆن چوومە ژوورەوەو لە سەر سیسەمەکەم تەخت لێی کـەوتم و بە خەودا چووم کاتێك رۆژ بۆوە وەخەبەر هاتم و چووم خۆم شت و دەستییك جلی خاوێنم لەبەر کرد و بەرێ کەوتم بۆ کارەکەم، ئەوەندەی تر رقم لە دڵدا جێگا کردەوە، بەڵام لەوە بێدەسەڵات تر بووم بتوانم بەرانبەری ئەوانە بووەستم، هەموو دنیا لە چاومدا دیمەنی خـەمێکی قووڵیـان بەدی دەکرد، بەڵام خۆم تەنیا لە دڵمدا هەستم بە ئازار دەکرد، هەرچۆنێك بوو دەبـوو دان بـە خۆمدا بگرم و هیچ کاردانەوەیەك نەکەم، من پیاوێکی بکوژ نەبووم دەنا هەر زوو کارم دەکرد بۆ کوشتنی (محەڕەم هەڵۆ)، ئاخر من دڵم لە شووشـە ناسـکتر بـوو بـۆ پەپوولەیـەکی زەلیـل دەگریام کە دەمرد بۆ پاساریەکی سەر گوێسەبانەکان دەگریام کە لە سەرمادا رەق دەبۆوە بـۆ مەرگی گوڵ و گەڵاکانیش دەگریام، هەمیشە خۆم بە خەمخۆری مرۆڤەکان دەزانی مـن لەگـەڵ کەسێك ژیابووم کە یەك پارچە پاکی بوو یەك پارچە نوور بوو یەك پارچە جوانی بوو ئەو فێری کردم کە دنیاو مرۆڤەکانم خۆش بوویت، ئاخر (کامەرانی وەنەوشـە) مامۆسـتاو هاوڕێیـەکی گرنگم بوو رێ نیشاندەرێکی رێگا تاریکەکانی وجوودم بوو، ئەو فێری کردم کە کتێبم خـۆش بووێ و گۆرانی و گوڵ و ئینجانەکانم خۆش بووێ.

من هەمیشە رێزم لە دەوروبەرەکەم دەنا هیچ کات ئارەزووی خوێنم نەبوو هیچ کـات بـە رشتنی خوێن ئاسوودە نەدەبووم، ئەو کارەی من دەمکرد تەنیا بۆ ناو زڕاندنی (محەڕەم هـەڵۆ) و هاوشێوەکانی بوو کە لە داهاتوودا ئەنجام دا.

کاتێـك کـە گەڕامــەوە بـۆ ماڵــەوە عـەسـرێکی درەنگـی وەرزی هــاوین بــوو، ڕۆژێکـی پڕشنگداری سەیر بوو، بەر لەوە هەستم بە سەیریەکی نائاسایی دەکرد بە پڕتاو چـۆلەکەکانی ئاسمان لە سەر مـاڵی ئێمـە دەسـووڕانەوە، هــەزاران چۆلەکە لەســەر گوێســەبانەو ئینجانـە گوڵەکانی دایکم و سەر درەختەکانی حەوشــەکەمان نیشـتبوونەوەو دەیانجریواند، لـە دڵــەوە هەستم کرد کە هەواڵدەرێکی دوورن و لە هەرێم و وڵاتێکی ترەوە دێــن هــەروابوو هــەواڵ دەر بوون هەواڵ دەری سپی بوون، سپی تر لە بەفر هاتن و هەواڵێکی سەیریان بۆ هێنام.

# ٢٤

## (گەڕانەوەی جیهانگیر سەرحەد)

من لەسەر پلە قادرمەکانی حەوشەکە تەماشای ئەو هەموو هەزاران چۆلەکە سەیرانەم دەکرد کە بە یەك ئاواز دەیانجریواند، دەمزانی دیاردەیەکی سەیر روودەدات هەواڵێکی پێشوەختم بۆ دێنن دەمڕوانی و زەردەخەنەم دەکرد دەمێك بوو چاوەڕوانی هەواڵی لەو شێوەیە بووم، دەمێك بوو پەرۆشی چۆلەکەو بۆنی گوڵی وڵاتانی دوورم دەکرد، هەستم بە بۆنێکی خۆشی خاکی سنوورەکانی وڵات دەکرد، لە پڕێکدا لە خەیاڵدا بووم لە دەرگا درا سێ جار، کە چووم بە پڕتاو بەرەو دەرگاکە بۆنی خاکێکی تەڕ و بۆنی بارانێکی دوور دەهات و زیادی دەکرد دەرگام کردەوە لەو دیوەوە پیاوێك وەستا بوو یەکپارچە ڕۆشنایی بوو پیاوێکی سپیپۆش باڵا بەرز جلێکی سپی لەبەردا بوو کراسەکەی ملوانی نەبوو کۆتا قۆپچەی داخرابوو وەك ئێرانییەکان دەهاتە بەر چاوم، پیاوێکی ماندوو بوو پیاوێکی سەرو ریش سپی وەك بەفر پیاوێکی تا رادەیەك کامڵ دیمەنی حوزنێکی قووڵ لە سەر نیگای دیار بوو، پیاوێك وەك لە ئاسمان بەربووبێتەوە بە جانتایەکی قاوەییەوە لەسەر گۆچانێك وەستابوو، کە تەواو تێمڕوانی نەمزانی کێیەو چی دەوێ وتم (فەرمووو خاڵە گیان) بە دەنگییکی کز وتی (تۆ شاپوور سوبحان نیت؟) لە وەڵامدا وتم (بەڵێ ئەوم ئەی تۆ کێیت؟) سەری دانەواندو پاشان بەرزی کردەوەو وتی من (جیهانگیر سەرحەد)م باوکی (کامەران) لەگەڵ ئەوەم بیست تووشی شۆك بووم هەرگیز بڕوام نەدەکرد چونکە (کامەرانی وەنەوشە) لە مێژ بوو باسی ئەوەی کردبوو کە باوکی لە شەڕی نێوان عێراق و ئێران شەهید کراوە، لە لایەکی ترەوە لە دڵی خۆمدا دەمگوت: تۆ بڵێی سیخوڕی (محەڕەم هەڵۆ)و ئەوان نەبێت، بەڵام دواجار لە روخساریدا راست ئەوەم بۆ دەرکەوت کەئەم پیاوە دەموچاوێکی بێوەیی هەیەو هیچ لە پیاو خراپان ناچێت، هەر زوو چاوم پڕ بوو لە ئاو فەرمووم لێکرد و باوەشم پیاکرد و بۆنی غەریبایەتی لە تەواوی جەستەی دەهات، بۆنی جەنگی دێرین و هەرێمە دوورەکانی لێ دەهات، هەر کە هاتە ماڵەوە دەشەلی دواتر زانیم کە لە شەڕدا بریندار بووە ئەو پیاوێکی نووارنی بوو هەر زوو لەو ماندووبوونە زۆرەیەوە دەستی بۆ خودا بەرز دەکردەوە و نزای دەکردو وتی (من دەمەوێت نوێژ بکەم) چووم

بەرماڵم بۆ هێناو دەستنوێژی گرت و نوێژو نزای بۆ خوای گەورە کرد، باوکم و دایکم بە گەرمی بەخێرهاتنیان کرد.

ئەو پیاوێك بوو بەهرەمەند بوو دەستەکانی پڕ بوون لە بازنی ئاڵتوون، لەگەڵ ئەوەی پەیکەرتاشێکی شارەزای کاتی خۆی بوو کە لە (سەرحەد)ی باوکیەوە بۆی مابۆوە، بەڵام باوەڕدارێکی بێوێنە بوو ئەگەرچی بە وتەی زۆرێك لە شارەزایانی ئایین پەیکەرتاشین و ئایین یەك ناگرنەوە زۆر جار بە ئازەر بانگیان کردبوو واتە باوکی (ئیبراهیم پێغەمبەر) کە پەیکەرتاشی بتەکان بووە، بەڵام ئەو گوێی بەوە نەدابوو، لە دیدی خۆیدا بە دوای جوانی ناو ناخی بەردەکاندا گەڕابوو ئەو بڕوای بە نەرمی روحی بەردەکان ببوو.

ئیدی نەمزانی بیست و سێ ساڵ یەخسیری ئەم پیاوەی فێری چی کردووە، ئەو هەمیشە بە سەبرو ئارام گرییەوە دەردەکەوت لە سیمایدا دیمەنی دان بەخۆدا گرتنێکی گەورەم بەدی دەکرد پیاوێك بوو تا ئارەزووت بکردایە لە بینینی تێر نەدەبووی بیست و سێ ساڵ زیندانی لە وڵاتێکی دێرینی وەك ئێران و دووری لە رووناکی خۆر هەموو موەکانی جەستەیان سپی کردبوو، هەر کە لەگەڵی دانیشتم وادیار بوو برسی بوو، دوای ئەوەی دایکم خواردنێکی کوردەواریانەی ئامادەکرد زۆر بە پەرۆشەوە دەستی بە خواردنی کرد و زوو زوو دەیوت (ئەی خودایە چەند خۆشە دەمێکە چاوەڕوانی ئەم جۆرە خواردنانە دەکەم) من هەر تەماشام دەکردو دڵم قوولپی دەدا، دواجار تەمەنێك زیندانی لە پێناو هیچدا بێمانابوو چەندان کەس وەك ئەم پیاوە بەو چارەنووسە گەیشتبوون زوو زوو دەیگوت: (بیا بیا) دەمزانی بە فارسی بانگم دەکات، چونکە من فارسی زانێکی باش بووم، نزیك دەبوومەوەو دەیگوت: (دیلی دنیایەکی زۆر سەیرە فێری سەبرو تەحومولت دەکات، فێری ئەوەت دەکات چێژ لە تاریکی وەربگرێت) لە راستییدا هەریەکە لە ئێمە لەو وڵاتەدا لەم هەرێمەدا بە شێوەیەك لە شێوەکان دیلی دەستی کەسانێکی دیکە بووین خۆ دیلی تەنیا ئەوە نییە لەنێوان چوار دیواردا لە تاریکییدا بیت دیلی ئەو کاتە ناخۆشە کە لە ژێر نووری رۆژدا بیت و راستییەکان بە چاوی خۆت ببینیت، دوای بینینی ئەوەی کە ئارەزووی ناکەیت لە پێش چاوت بگوزەرێت ئەو لە زیندانێکی گەورەی بە ناوی "ئەوین" زیندان ببوو باسی ئەو هەموو قولەی پاسەوانییەی دەکرد کە هەمیشە لە چواردەوری بوون باسی ئەو هەموو هەزاران دیلەی دەکرد کە بە جلوبەرگی خەت خەتەوە بە گۆڕە پانەکاندا خۆیان دەدایە بەر رووناکی باسی خواردنی سلْقاوی قوڕاوی و پەتاتەی کوڵاوی بۆ دەکردم کە ژیانیان لەنێوانیاندا بزر ببوو، باسی

خواردنی نانی بیٚ خوێی بۆ دەکردم کە زیندانییەکان تووشی بۆگەن ببوون، من بە تاسەوە گـوێم بـۆ چیرۆکەکانی رادەگرت و چێژم لێوەردەگرت، چەندین رۆژو شەو باسی ئەو دنیایەی بۆ دەکردم.

باسی ئەو پنتەی دنیای بۆ دەکردم کە لە بەشەکانی تری دنیا دابڕابوو، من دەبوو بپرسـم کـەوا بۆچی دەشەلێت؟ هەر زوو بە کەمێك شەرمەوە دەمووت (بەڕێز ئاغای جیهانگیر سـەرحەد بۆچـی دەشەلیت؟) دەیگوت: (لە ساڵی ۱۹۸۳ دوای ئەوەی ئێمە تیمێکـی پـانزە کەسـی دەبـووین لـەو قۆڵەی کە شەڕ تێیدا پەرەی دەسەند تووشی شکست بووین و تـەواوی هـاوڕیٚ سـەربازەکانم بوونـە قوربانی تەنیا من و هاوڕێیەکی سەربازم زیندوو بووین من لە قاچی راستمدا پێکـرام قاچـم شـکاو نەمتوانی بجوولێم تەنیا ئەوەم دەویست کە ئەو هاوڕێیەم دەرباز ببێت، چونکە هەستی مەردایـەتی و دلێریم ئەوە بووە ئەو خاوەنی دوو منداڵی بچووك بوو هەربۆیـە مەدالیەکـەی ملـم کـە نـاو و تەمەن و ناونیشانی منی لەسەر نووسرابوو، مەدالیا سەربازیەکەم لە ملم داکەنـدو دامـە دەسـتی هاوڕێکەم و وتم رابکەو ئەمە بگەیەنەوە بە دەستی خانەوادەکەم، چونکە دەمزانـی کـە تـازە مـن دەکوژرێم و زیندوو نامێنم بۆیە ئەوەم کرد، ئەو رای کردو من لەناو سەربازگەکەدا بـەرگریم دەکـرد نەمدەزانی من لە چی جەنگێکدا دەجەنگم؟ نەمدەزانی لە پێناو چیدا شەڕ دەکـەم؟ تـا دوا گوللـە شەڕم کردو دواتر چەندین پاسداری ئێرانی هەڵیانکوتایە سەر مۆڵگەکەمان و بـە ناچـاری دەسـتی دیلم بڵند کرد و تەسلیم بووم، چەندین پاسداری ریشن کە هەموویان یەکی کلیلیکیان لە ملدا بوو، ئەوان ویستیان بمکوژن، بەڵام یەکێك لە ئەفسەرەکانیان سـەرهەنگێك بـوو روحـی مرۆڤایـەتی لـە دڵیدا جووڵاو نەیهێشت بمکوژن من خوێنم لێدەچۆڕاو بـە جامانەیـەك تونـد قاچـیان بـۆ بەسـتم و سواری ماشینێکی سەربازیان کردم و بەرەو ئەودیوی سنوورەکانی خۆیان منیان برد، لەویٚ هەزاران سەربازی دیلی دیکەم دەبینی) دەمبینی (جیهـانگیر سـەرحەد) بـەکوڵ دەگریـا دەگریـا دەگریـا، مرۆڤی ئەم رۆژهەڵاتە ئەم پارچەیەی گەردوون بە گریان فێر بوون هەر بۆیە بۆ هەمیشە گریـان لـە یەخەمان نەدەبۆیەوە، دەبوو منیش لەگەڵی بگریم زۆر بـە کەساسـی باسـی ئـەو سـەردەمەی بـۆ دەکردم رێك من بە سیناریۆ دەمهێنایە پێش چاوم و سامم دەکرد، ئـەو هـەموو رووداوەکـانی بـە باشی بیر مابوو، لە راستییدا من چەندان فیلمی ئەمریکیم بینیبوو کاتی شەڕی ڤێتنام، وەك ئـەوە دەهاتە بەرچاوم، دواجار هەر پیاوێك بەشداری لە جەنگی وەهادا بکـات کـابووس و دێوەزمـە لـە یەخەی نابێتەوە بۆ هەمیشە لە خەونەکانیدا رەنگ دەداتەوە، ئەویش بێبـەش نـەبوو لـەو خەونـە ترسناکانەو هەمیشە خەونەکانی باسی جەنگ بوون. چەند سەیرە مرۆڤێك بەهرەمەند بـیٚ دەبێـت ژیانی ببێتە جەنگ و شەڕە نەخوازراوەکان؟ هەر بۆیە لەو ماوەیـەی لـە لای مـن مایـەوە شـەوان

وڕێنەو بۆڵە بۆڵی دەکردو باسی زیندان و جەنگی دەکرد بەدەم خـەوەوە قسـەی سـەیرو سـەمەرەی دەکرد.

لەبەرانبەر ئەو هەموو دیلە عێراقیەی لە ئێران بوون چەندان و هەزاران دیلـی ئێرانـی هـەبوون هەموویان کلیلێکی کانزاییان لە ملدا بوو کە بە وتەی خۆیان ئەمانـە کلیلـی کردنـەوەی دەرگـای بەهەشت بوون و ئیمام خومەینی کردبوویە ملیان، لەملاشەوە وڵاتانی عەرەب بە (سەدام حوسێن) یان دەگوت (پارێزەری دەروازەی رۆژهەڵات) و بە (خالیدی کـوڕی وەلیـد) یـان دەچـواند و شـەڕی قادسیەیان پێ دووبارە دەکردەوە، ئەو هەموو دیلە ئێرانییە چەندانیان لە تاقیگە گەورەکانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی تاقیکردنەوەیان لەسـەر دەکـرا لـەبری مشـك و مـەیموون ئـا لـەو جـەنگ و کارەساتە سەیرانەی بەسەر ئەم وڵاتەدا هاتن، دایك و کوڕو باوك و خێزان و بـاوك و منـداڵیان لـە یەکتر جودا کردەوە، گەلێك ژنی جوان لە پێناو بـژێوی ژیـان و نەداریـدا لـە دوای جـەنگ بوونـە سۆزانی و لە عێراقدا بڵاو بوونەوە، کۆمەڵێك نەخۆشی سەیرو تاعوون و سـیل لـە تـەواوی وڵاتـدا گەشەیان کرد و دنیایان بۆگەن کرد.

مرۆڤ دڕندەترین و گەورەترین کێشەی سەر ئـەم زەمینـە بـوون و هـەرواش دەبـن تـا کۆتـایی مرۆڤایەتی، جەنگ لە یەخەی دنیا نابێتـەوە و شوناسـی مرۆڤـەکان دەنووسـێتەوە، جـەنگ ئـەو کەرەستەیەیە بەدەست مرۆڤەکانەوە دەبێت و دنیا هەرەس پـێ دەهێنێـت، بیرەکـان پـڕ دەکەنـەوە ئاوەکان وشك دەکەن هەوا بۆگەن دەکەن و دارستانەکان دەسووتێنن.

ئەم وڵاتەی ئێمە مێژوویەکی دێرینی هەیە لە خوێن رشتنداو بـۆ هەمیشـە خوێنڕێـژەکان لـەم رۆژهەڵاتەدا دێن و دەچن و تەواو نابن ناکۆتا دێن و تەواو نابن، بـەردەوام وانـەی جەهەنـەمی لـە شەیتان وەردەگرن و پلانی سەیرو قێزەونانە لەسەر ئەم گۆی زەویـە تاقیدەکەنـەوە، ئـەوە شوناسـی شەڕانگێزی مرۆڤە بۆ هەمیشە ناسنامەیەکی رەشەو لەبـەرۆکمان نابێتـەوە، جـوانی کوشـتن لـەم گەردوونەدا سروشتێکی دێرینی مرۆڤەو لە پێناوی مانەوەی ئەوەی تردا ئـەم دەکوژرێـت، هەشـت ساڵ شەڕو جەنگ و وەسـتان و خومپـارەو مووشـەك و چـەکی کیمیـایی، تەمـەنێکی درێـژە لـە کاتێکدا چاومدان بە دنیا کەوت جەنگ تەشەنەی سەندبوو هاتینە دنیایەکەوە جەنگ لەسـەرتاپای دەچۆڕا، خوێن جۆگەلەی بەستبوو بەسەر هەردوو چیاو بەردو شەقام و گوڵ و گیایەکانـدا شـەپۆلی دەدا نێرگزەکان بە خوێن سووڕ ببوون.

ئێمەی کورد لە هەمـوو جەنگەکانی ئەم ناوچەیەدا زەرەرەوەمەندی یەکەم بووین هەر لەو ماوەیەدا بوو بە هەزاران گوندی کوردستان کاول و خاپوور کرا ملیۆنەها رەزو باخ

و بەراوی جوان سووتێنران زۆرێك كانی و كارێز و بیری نازەنین كوێر كرانەوە، ئای لەو هەموو شانە هەنگە نەخشینانەی وێران كران، مەرگەساتێكی وەهایان خولقاند كەس نەیكردبێ، بەڵام تەنیا كەسێك ولاتێك، لەسەر ئەم هەموو دڕندەییە نەهاتە گۆ، هەموو بێدەنگییان هەڵبژاردبوو لە دوورەوە وەستان.

لەو ماوەی چەند رۆژەدا كە (جیهانگیر سەرحەد) ی پەیكەرتاش و دیل و زەلیلی دەستی زۆرداری لە لای من بوو زۆر بە ئەمەكەوە وەك باوكی خۆم خزمەتم كردو نەمتوانی وشەیەك چییە سەبارەت بە (كامەرانی وەنەوشە) و (وەنەوشە) باس بكەم شەو داهات و دنیا لە تاریكییدا تەژی دەبوو رۆژ دەهات و دنیا دەگەشایەوە، لەو بڕوایەدا بووم كە خۆی دەیزانی چارەنووسی كەسوكارو خانەوادەكەی بە كوێ گەیشتووە، كەم نەبوو خۆت بیست و سێ ساڵ لە پێناوی هیچدا دیل بوو بێت و خێزان و منداڵ و كەسەكانیشت لەدەست دابێ، من دەمزانی ئەوە چیرۆكێكی تراژیدییەو هەموو مرۆڤێكی خاوەن سۆز توانای وەرگرتنی نییە هەر بۆیە هەمیشە دەمگوت: (بەڕێز ئاغای جیهانگیر باسی سەردەمی دیلیت بكە زیندان چۆن بوو؟) ئەو لە وەڵامدا دەیگوت: (كوڕەكەم زیندان تاقیكردنەوەیەكی قورسەو هەموو مرۆڤێكی مەزن توانای درێژەپێدانی هەیە لە زیندان بمێنێتەوە، لە زیندان جگە لە ئازادی بیرت بۆ هیچ شتێكی دیكە ناچێ هەمیشە دەتەوێ لەو دیوارە بەرزانەوە هەڵبێیت و هاوار بكەی ئازادی و هەناسەی خۆشی هەڵمژیت) وا دیار بوو تامی ئازادی هێندە خۆش بوو ئازارەكانی دیلی دەسڕیەوە، ئەو باسی سڵقاوی قوڕاوی و پەتاتەی بێ خوێ و نانی بێ خوێی بۆ دەكردم و دەیگوت: (خواردنی ناخۆش ئێمە هەموومانی زەردوو لاواز كردبوو)، ئەو كاتەی باسی سەرەداوی شاری (سێوان)ی بۆ كردم من بە گرنگییەوە گوێم بۆ گرت و هەستم كرد دەبێت یارمەتی بدەم لە دۆزینەوەی ئەو كەرەستەو شتانەی لە لای ئەم گرنگن هەر بۆیە بە تاسەوە گوێم بۆ دەگرت، سەرەتا خۆی بە گریانێكی بێكۆتاییەوە دەیزانی خانەوادەكەی خاپوورو لەناوچوون ئەوەی مەراقی بوو نەبینینی كوڕە خۆشەویستەكەی بوو ئەو دەمەی (وەنەوشە) دووگیان ببوو (جیهانگیر) بە سەرباز گیرابوو رەوانەی بەرەكانی جەنگ كرابوو.

سەرەتا دەیگوت: (من دەزانم كە ژن و ماڵ و خوشك و دایك و كەسە نزیكەكانم لەدەست چوون هەر زوو ئەو هەوڵانەم بەدەست گەیشت لە ماوەی بیست و سێ ساڵ دیلیمدا هەمیشە بیرم لەو كارەساتە كردۆتەوە لە سووچێكی ئازادیدا بیرم لە ماڵ و خێزانەكەم كردۆتەوە) ئەو مەبەستی ئەوە بوو كە لەگەڵ بیركردنەوەی لە ئازادی دا لە دەرگاكانی ئازادییەوە بیری لە خێزانەكەی كردۆتەوە ئەو لە تەمەنیدا تەنیا خولیای ژیانێكی جوان و ئاشقانە بووە لەگەڵ

(وەنەوشە) دەنا ژیان لە لای ئەو مانای نەبوو، بیری لە درەختی ئەشق کردبۆوە هەر ئەو دارە رەش باوەی یەکەمین پەیمانیان تێدا بەستبوو، لەو سەردەمەی ئەشق و جوانی و پێکەنین یاساخ ببوون ئەوان پەیمانیان بە یەکدی دابوو بۆ هەمیشە بچنە ناو روحی یەکدییەوە خۆیان بە فیدای یەکدی بکەن، بەڵام رووداوە نەخوازراوەکان جەنگ و مەرگ و نەهامەتییەکانی مرۆڤ دەیخولقاندن رێگەی بەوە نەدابوو، هەر بۆیە وەك دوو شەتڵە گوڵی نازدار لە رەگەوە هەڵکەندران و هەریەکەیان فڕێ درایە خاکێکی جیاوازی ئەم دنیایە.

بە گریانێکی نەبڕاوەوە دەیگوت: (ئەوەی لە لام گرنگ بوو بزانم خێزانەکەم کوڕی دەبێت یان کچ، بەڵام لە ماوەی بیست و سێ ساڵی رابردوودا هەزاران وێنەم هێنایە بەر چاوی خۆم تاکو بزانم منداڵەکەم چی دەبێت؟ ئایا کوڕە؟ یان کچ؟ هەموو بیرم بەوەوە جەنجاڵ کردبوو، دەمبینی سەرو ریشم وەك بەفر سپی دەبوون و من هەر نەمزانی وێنەکان چۆن دەبن).

بە گریانەوە سەری دەخزاندە نێو هەردوو ئەژنۆی و هەنسکی دەدا، من بە پەرۆشەوە دەچووم و دەستم دەخستە سەر شانی و دەمویست دڵخۆشی بدەمەوە، دەیزانی کە ئەو منداڵەی ئەو بەجێی هێشت و لە سکی (وەنەوشە) دا بوو، کوڕێکی جوان و پیاوانەو زیرەك بوو هەر خۆی لەکاتی گەڕانەوەیدا لە (ڕاجۆ سەیوان) ی بیستبوو کەوا (کامەران) بەرەو هەندەران هەڵات و لە رێگەدا مرد لەلای (جیهانگیر سەرحەد)نامۆ بووە لە پڕێکدا چەندین رستەو وشەی سەیری بیستبوو کە لە لای ئەو نامۆ ببوون سەرەتا نەیزانی بوو باسی چی دەکەن، بەڵام (ڕاجۆ سەیوان)ی خوشکەزای بەو خاڵە دیلە لاوازەی وتبوو کە کارەساتەکان بەو چەشنە بوون لە کاتی رشتنی کیمیایی بەسەر شاری (سێوان) دا دایکی (ڕێحانە بارام) دەمرێت و خوشکەکەی تری (جوانا و سەرحەد) و خێزانەکەی لەناو دەچن، هەر لە وڵاتی ئێران، لەو وڵاتەی ئەو دیل بوو لێی (وەنەوشە) بەدەم ئازارەوە بەرەو ئاسمانەکان دەکشێتەوە.

(ڕاجۆ سەیوان) هەموو راستییەکانی بە (جیهانگیر سەرحەد) وتبوو ئەوان لە شارۆچکەیەکی نزیك لە شاری سێوان لەناوجەرگەی دەشتێکی بەرین و بەپیتی کوردستاندا دەژیان، خۆیان بە هەندێك کاری کشتوکاڵ و باخدارییەوە سەرقاڵ کردبوو، لە کاتی گەڕانەوەی (جیهانگیر سەرحەد) بەرەو شاری (سێوان) چوو بوو، بەو بەرگە سپییە ئێرانییەوە وەك مردوویەکی گەڕاوە سەرەتا بە ناو دارو پەردووی شاردا گەڕابوو شارێکی وێران کراو شارێك بە بۆنی سێو تەژی بوو، شارێك بە بۆنی ماددە کیمیاویەکانی وەك سیاندو ئەسیدو خەردەل و چی و چی تەژی بوو هێشتا شار لەو بۆنانە دەرباز نەببوو، ئەم بەم بەرگە سپییەوە بە جانتایەکی قاوەییەوە بە سەرو ریشێکی سپییەوە بە ناو

وێرانەدا گووزەری کردبوو دیمەنی چەندین ماڵ کە ئاوەدانیان کردبۆوە ئەوی دڵخۆش کردبـوو، بـەڵام چەندی کردبوو نەیتوانی بوو بە بیریدا بێتەوە کە ماڵەکەی خۆی لەنێو سەدان ماڵی خاپوورو وێراندا بدۆزێتەوە بە گریانەوە وەك فریشتەیەکی سپی بـە هـەموو کووچـەو کۆڵانـەکانی شـاردا پیاسـەی کردبوو قاچی لە چەندان بەردو بلۆکی شکاو هەڵکەوتبوو دەیان جار کـەوتبوو هەسـتابۆوە نزیکـەی نیوە ڕۆژێك ئەو هەر گەڕابوو زوبانی گۆی نەکردبوو تەنیا وشـەیەکیش بـدرکێنێت هـەر بۆیـە لـە دوایدا بە چەند کەسێکی وتبوو ئەوانیش ناونیشانی ماڵی (شاهۆ سەیوان)ی زاوایان بەو دابوو، کـە لە شارۆچکەیەکی دیکە دەژین هەر زوو ئەم بە تاسەوە بەرەو ئەوێ بـەڕێ کـەوتبوو، ئـەو کاتـەی دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ دەرگایان بە رودا کردبۆوە (ڕاجۆ سـەیوان) ئـەوی نەناسـی بـوو، بـەڵام خوشکەکەی بە روخساری تۆز لێ نیشتووی دا زانی بووی کە براکەیەتی و لـە مـەرگ گەڕاوەتـەوە هەر بۆیە بێهۆش ببوو، بەڵام بڕوای نەکردبوو کە برا تاقانەکەی لە مەرگ گەڕابێتەوە ئـەو وتبـووی کەوا پرسەیان بۆ داناوەو بە فەرمی بە مردوو دەستنیشان کراویـت، هـەر بۆیـە زوو زوو بـە منـی دەگوت (من مردووم وامەزانە زیندووم من ناسنامەیەکی زیندووم نییە و نازانم لە کـام سـەرزەمین دەژیم) لە راستییدا وابوو ئەو مردبوو، ئەومرۆڤێك بوو تەریك و دابڕاو لە دنیا، بـەڵام مردوویـەکی زیندوو بوو دەیتوانی قسە بکات و بگری و بخوات و پێبکەنێت، بەڵام لەسەر هەموو دەفتـەرەکانی وڵاتدا ناوی بە تەواوەتی سڕابۆوە.

مردوویەکی گەڕاوە رووداوێکی سەیری وڵات بوو، هەر زوو کە راگەیاندنەکان زانیان بە کۆمـەڵ و پۆل وەك رەوە ریشۆڵە کامێراو پەیامنێرەکانی تەلەفزیۆنە لۆکاڵی و ئاسمانییەکان دەهاتنە بـەردەم دەرگای ماڵی ئێمەو داوای لێدوان و دیداری تەلـەفزیۆنیان دەکـرد، بـەڵام (جیهـانگیر سـەرحەد)ی سپیپۆش ئامادەی ئەوەی نەدا کە لێدوان و دیدار بۆ هیچ کـەس و لایـەنێك بـدات ڕۆژێـك چـەند ئۆتۆمبیلێکی تازە مۆدێل لە دەرگای ماڵی ئێمەیان داو بەرەو ژوور بەڕێ کەوتن و بە پێکەنینـەوە باوەشـیان بـۆ (جیهـانگیر سـەرحەد) کـردەوەو هاواریـان کـرد (سـڵاو کاکـە جیهـانگیر سـڵاو بەخێربێیتەوە).

(جیهانگیر)ی حەپەساو داماو لە سووچێکی ژوورەکەی مندا سەری بە ئەژنۆیـدا نوشـتاندبۆوەو حەپەساو تەماشای دەکردن و نەیـدەزانی باسـی چـی دەکـەن هەریەکـەو ماچـی دەکـردو دەسـتی دەخستە سەر شانی و بەڵێنی سەیر سەیریان پێ دەدا گوێم لێبوو یەکێکیان پیاوێکی سەر مـاش و برنجی کەمێك لاواز بوو بە پێکەنینەوە چاوەکانی دەنوقاندو دەیگوت: (مـن هـەوڵ دەدەم بیکەمـە ئەندام پەرلەمان) یەکێکی تر دەیگوت: (دەیکـەم بـە بـاڵیۆز لـە وڵاتـی ئێـران) یـەکێکی تریـان

دەیگوت: (ئەم پیاوە زۆر ماندووبوونی چەشتووە نا وا باشە مووچەیەکی گەورەی بۆ ببڕینــەوە و لــە ماڵێکدا بۆ خۆی پشوو بدات) من لەولاوە پێکەنینم بە ئەقڵی ئەو پیاوانە دەهات کــە دەیانویســت پیاوێکی مردووی بێ ناونیشان و ناسنامەو نەخوێندەوار بکەنــە بــەرپرس و شــتی وەهــا، چــونکە دەمزانی (جیهانگیر سەرحەد)لەوە ژیر ترە بەو شتانە هەڵبخەڵەتێ و بڕوایان پێ بکات هەر بۆیە بە دەنگییکی لاواز هەموویانی دەرکرد و وتی (تکایە بــڕۆن مــن مانــدووم زۆر مانــدووم) هــەموویان بەدەرکەوتن و لە چاوترووکانێکدا بزربوون دەمبینی (جیهانگیر سەرحەد)ی داماو دەگریــا بــە کــوڵ دەگریاو هیچی پێنەدەکرا.

بە خودا سەیر بوو شەڕی کورسی و پلەو پایە لەنێوان کاربەدەستانی دەوڵەتــدا، هەمیشــە لــەم جۆرە شەڕو بەڵێن و پێکەنینانە دووبارە دەبوونەوە لە نیهانی خۆمــدا شــەپۆلم دەداو دەکەوتمــە ئــەو پەڕی وەهم و بە ناو جەنگەڵە تاریك و شێدارەکانی ناخمدا لە شەپۆلدان بەردەوام دەبــووم، وڕوکــاس دەبووم، دەمبینی لــە پرێکــدا (جیهــانگیر ســەرحەد) هەڵەســتاو هــاواری لێــدەکردم و دەیگــوت: (کوڕەکەم من عومرێکە لە غوربەتدا دیلم هەر بەو چەشنە ئاسوودەم ســەردەمێك بــوو دیــل بــووم خەونم بە ئازادیەوە دەبینی، بەڵام ئێستا ئەو دیلی و زیندانە گەورەیەم لەم ئازادیــە لــەلا خۆشــترە، منێك لە زیندانێکی گەورەی وەك ئەوین چ کارم بەم دنیایەوە هەبوو، خۆ لەوێ من لە حیلەی ئــەم پیاوانەم نەدەزانی، بەڵام ئێستا دەزانم چاکی ئــەم کــابرا زل و زەلامانــە بەرهــەمی خــەباتی ئێمــە دەخۆن من بە دیلی ڕاهاتووم، بەڵام ئەم دیلیەی ئێستام جیاوازە لەوەی ئەوێ) دەوەســتاو لــە زەوی ڕادەماو هاواری دەکردو دەیگوت: (ئەی هاوار بۆ خۆم کە خێرم لە خــۆم نــەبینی مــن لــە هــەڵاتن بەرەو مەرگ زیاتر هیچی تر بە خەیاڵمدا نایەت) من تەماشام دەکــردو دەمبینــی جیهــانگیر وەك شیعەکانی باشوور چۆن بۆ مەرگی دەست کوشتەی خۆیان (ئیمــام حوســێن) لــەخۆیان دەدەن، بــەو شێوەیە لەخۆی دەدات، نەمدەزانی چۆن دڵخۆشی بدەمەوە هەر بۆیە لە ئــازارو هەیــەجانی ڕوحمــدا باوەشم بەودا دەکردەوەو دەمگوت: (لە ئێستاوە تاکو مردن من هەر کــوڕی بەئەمــەکی تــۆم) لــە دوورڕا باوەشی بۆ دەکردمەوەو دەگریاو دەیگوت: (بۆنی کوڕە نەدیوەکەم لە تۆ دەکەم) بەو شــێوەیە چەند رۆژێکمان بەڕێ کردو هێدی هێدی (جیهانگیر سەرحەد) ی سپیپۆش هێمن دەبۆوە بڕیــاری دا کە بڕواتەوە بۆ شاری (ســێوان) و لــەوێ لــەناو دارو پــەردووی خــاپوورکراوی ماڵەکەیــدا بــەدوای کەرەستەو یادگاریە کۆنەکانیدا بگەڕێ، بڕیار بوو بەدوای پەیکەری (جینا)دا بگــەڕێ کــە بــەر لــە هەڵاتنیان لە شاری سێوان (وەنەوشە) و خوشکەکانی جوان بەرگیان لە نایلۆن و قایش گرتبــوو بــە

کۆمەکی گوریسێکی ئەستووری بەهێز شۆڕیان کردبۆوە بۆ ناو بیرەکەی نـاو حەوشـەکە کـە چـەند مەترێك قوولّ بوو و پاشان جوان و توند بەسترابۆوە.

من دەبوو لە کاروباری کۆمپانیاکانی (پەنا کاروانی)چەند رۆژێك مۆڵەت وەربگرم، من بۆ خۆم ئەوەندە تووڕەو دلّپڕ لە ئێش و ناسۆر بووم نەمدەتوانی دان بە خۆدا بگرم، چـونکە ئـەو راسـتییانە کە زانیمن لەو ماوەیەی رابردوودا وایان کرد کە بتوانم بیر لە ژیانی ئەم هەرێمە بکەمەوەو تـف لـە رابردوی خۆم بکەم.

ئەوەبوو مۆڵەتێکی چەند رۆژیم وەرگرت و خۆم ئامادە کرد لەگەلّ پیاوە سپیپۆشـەکە وەك دوو مەلی لانەواز بەرەو شاری (سێوان) گووزەر بکەین.

ئەو بەیانییەی وەك دوو پاشای رەش و سپی وەك دوو تاکی دژ بەیەك وەك دوو دیمەنی تـاریکی و رووناکی وەك دوو داشـی شـەترەنج، وەك دیمـەنێکی نـاوازە دوو کەسـی گەڕیـدەی رەشـپۆش و سپیپۆش سوار ماشینێکی گواسـتنەوەی نەفـەرات بـووین و بـە دوو جانتـای دەسـتییەوە بـەرەو شاری(سێوان) بەڕێکەوتین من کلاوێکی گەورەی رەش و قاتێك جلی رەشم لەبەردا بـوو، ئەگەرچـی کەشوهەوا گەرم بوو، (جیهانگیر) یش کراس و پانتۆلێکی سپی لەبەردابوو کە کراسەکەی ملـوانی نەبوو لە ئێرانییەکی خەلّکی تاران دەچوو بەڕێکەوتین و لە رێگادا چەندان باس و خواستمان لەگـەلّ یەکدا باس کردو شۆفێرەکەش چاوی دادەچەقاندو تێمان رادەماو گوێچکەکانی وەك گوێی مشك بۆ دەنگ هەلّدەخست و جارجار بەلای ئێمەدا سەری بادەداو بزەیەکی دەکرد، ئەو ماوەیەی کە دەبـوو بیبڕین نزیکەی کاتژمێرو نیوێك بوو بە هۆی خراپی رێگاو بان و زۆربوونی ژمارەی ئۆتۆمبیلی نویّ و کە لەو چەند سالآنەی دوایدا بەرەو کوردستان دەهێنران، رێگـا پـڕ بـوو لـەو چـالّ و چـۆلّیانەی دەگەڕایەوە بۆ سالآنی هەشتاکان و پاشماوەی جەنگی هەشت سالّەی نێوان عێراق و ئێران و تـا ئـەو دەمەش نۆژەن نەکرابوونەوە، هەر بۆیە بەو ماوەیەی کە خەملّێنرابوو گەیشـتینە شـاری (سـێوان) یەکسەر بە بیری دایکی (کامەرانی وەنەوشە)دا هاتم و تەماشای دیمەنی رووخاوی سـەدان خـانووی خاپوور کراوم دەبینی، دەمبینی خەلّکانێکی زۆر لەم شارەدا کـوێر بـوون و بـە گۆچـان دەڕۆیشـتن چەندین کەسم دەبینی پێدەکەنین لە خۆیانەوە قاقایان لێدەداو سەریان بەهەمـوو لایەکدا دەسـووڕاند ئەوانە کۆمەلّێکی زۆر کەسانی شێت بوون کـە بـەهۆی کاریگـەری چـەکی کیمیاویـەوە عـەقلّیان لەدەست دابوو، کۆمەلّێکی دیکە لە خەلّك هەموو پێستی لەشیان سووتابوو بە جوانی روخسـاریان دیاربوو وەك نایلۆن تواببوونەوە، لە یەکێك لەکۆلآنەکانی شاردا گابەردێکی گەورەم بینـی کچـێکی جوان لە سەری دانیشتبوو دەگریا لە یەکێکم پرسلی ئەو کچە بۆچی دەگری لە وەلآمـدا وتـی (بـۆ

کەسوکاری دەگری چەندین ساڵە دەگری) دیمەنێکی زۆر دڵتەزێن بوو یەك پارچە جەستەم دەکەوتە لەرزین بە ناو شاردا دەمڕوانی دیمەنی ئاوەدانی کەم بوو پارچەیەك وێرانە بوو وێرانە، لەو شارانە دەچوو کە لە فیلمە ئەمریکیەکاندا باسیان لە جەنگی جیهانی دووەم دەکرد.

شارێك وێرانتر لە شاری (لینینگراد) و وێرانتر لە شاری (وارشۆ) کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا نازیەکان خاپووریان کرد و دیواریان بەسەر دیوارەوە نەهێشت.

شارێکی تەماوی بوو خەمگین بۆنی هەژدە ساڵ لەوەو بەری لێدەهات لە هەندێك شوێندا هێشتا بۆنی سێو دەهات کانیاوەکانی کوێر ببوونەوە، راست بوو ئاوەدان بووبۆوە، بەڵام وەك جاران بۆنی ژیانی لێنەدەهات، هێشتا بۆنی مردوو مەرگی لێدەهات.

من بەو سفەتەی لە منداڵییەوە ئاسوودەی تەماشاکردنی دەوروبەر بووم بەو پەڕی پەرۆشییەوە لە هەموو شتێك رادەمام و ورد دەبوومەوە، (جیهانگیر سەرحەد) لە جێگایەکدا رادەوەستاو دەیگوت: (ئێرەیە ئێرە ماڵەکەم بوو) دەوەستاین دیمەنی داروو پەردووی رووخاو چاك نەکراوە قادرمەی رووخاو نیوە رووخاو دیواری کەوت و سەقفی داتەپیوو رووەکی سەیرو سەمەرەو گیای ناوازە یەکپارچە ئەو ناوچەیەیان تەنی بوو دیمەنی چەندان ئینجانەی تەنەکەی رزیو و کەوتوو، گوڵی وەنەوشەیی و مۆرو شین بەو ناوچەیەدا بڵاو ببوونەوە لە جێگایەکی کەمێك تەختدا کە کەمتر بلۆك و بەردی رووخاوی لەسەر بوو دیمەنی پارچە لەوحێکی گەورەی ئەستوور دیار بوو کە چەند ملیمێك ئەستوور بوو هەردووکمان لەسەری دەوەستاین و (جیهانگیر سەرحەد) دەیگوت: (ئێرە بیرەکە بوو بیرێکی قووڵی جوانی پڕ لە ئاوی سازگار) بە کۆمەکی هەردووکمان پارچە لەوحەکەمان لابردوو لەناو بیرەکەدا گوریسێکی گەورەمان دەبینی کە چەندان جۆر قەوزە دەوریان دابوو، بەڵام موعجیزە بوو ئەو نەڕزی بوو هەر بۆیە تاومان دەدایە گوریسەکەو بەرەو سەرەوە بە هەرەکەتی زۆر رامان کێشا وەك پیاوێکی ئاو هەڵکێش تاوتاو گوریسەکەمان بەرز دەکردەوە وردە وردە دیمەنی پەیکەرێکی بەردین بەدەردەکەوت وردە وردە رامان دەکێشایە سەرەوە هێدی هێدی بە ئەرکێکی زۆر دەرمان هێنایە دەرەوە یەکپارچە قەوزەو سەوزی ناو ئاوەکەی گرتبوو لە زۆر جێگادا کلس و بەڵخی لەسەر نیشتبوو، بەڵام هێشتا ناوازەو دەگمەن بوو من لە خوارەوەی پەیکەرەکە چەند حەرفێکم بەرچاو دەکەوت کە رەنگیان بەرەو سەوز گۆڕابوو ناوی (جینا)و(جیهانگیر) لە سەری نووسرابوو بە بینینی پەیکەرەکە تووشی سەرسامی و حەپەسان هاتم بە راستی سەیرو ناوازە بوو.

پەیکەرەکە لە هیچ لایەکەوە زیانی گەورەی پێنەگەشتبوو شکاوی و درزی پێوە دیار نەبوو بەردەکەی زۆر بەهێزو دەگمەن ببوو، بەڵام کچێکی جوان لە سەر ئەژنو بە لایەکدا کەوتبوو لە

ئەژنۆوە لاقەکانی بەرەو دواوە نوشتاندبۆوە بە لایەکدا خۆی چەماندبۆوەو دەستییکی دانابوو دەستەکەی تری خستبۆیە سەر رانی ملوانکەیەکی دەنك گەورەی لە ملدا بۆ دروست کردبوو بە دیمەنەکەیدا وا دیار بوو زەردەخەنەی کردبوو روومەتەکانی بەرەو لای راست و چەپ کرابوونەوە بە راستی جوان و دەگمەن بوو نیوەی جەستەی داپۆشرابوو نیوەی رووت بوو، هەر ئەو دەمە گەورەیی هونەرسازی لای (جیهانگیر سەرحەد)م بۆ ئاشکرا بوو، تێگەیشتم کە ئەم پیاوە زۆر مەزنە زۆر دەست رەنگینە، بە بینینەوەی پەیکەرەکەی زۆر شادو کەیف خۆش بوو، بە دەستەکانی دەیسرپییەوەو تەماشای منی دەکرد و دەیگوت:(ببینە، ببینە، بەلاتەوە چۆنە روحم شادە کە ئەم پەیکەرە نەفەوتاوە سپاسی گیانی پاکی خانەوادەکەم دەکەم) بەو پارچە قوماشە خامانەی کە هێنابوومان جوان پاکمان کردەوەو پێچامان و بە هاوکاری یەکترو چەند کەسێك خستمانە ناو ئۆتۆمبیلەکە کە بە کرێ گرتبوومان و بەرەو شار بەڕێکەوتینەوە لەبەر ئەوەی پەیکەرەکە زەرەری پێنەگات بە شۆفێرەکەمان وت کەوا لە تاسەو چاڵە زۆرەکانی سەر رێگامانەدا زۆر بە هێواشی بڕوات، ئێمە زۆر بە باشی پەیکەرەکەمان بەرگ گرتبوو بە شێوەیەك زۆر ترسی شکاندنیمان نەبوو دوای دوو کاتژمێر گەیشتینەوە شار بەرەو ماڵی ئێمە بەرێ کەوتین، بەڵام لەو ماوەیەی کە من مۆڵەتم وەرگرتبوو پیاوەکانی (محەرەم هەڵۆ) چاودێری توندیان لە سەر هەموو چالاکییەکانم دانابوو، هەر بۆیە وردو درشت دەیانزانی کە سەرقاڵی چیم و چی دەکەم، هەر بۆیە راپۆرتی سەیرم لەسەر نووسرابوو، بەڵام من زۆر لەوە زیاتر بێباك بووم لە هیچ کاردانەوەیەك بترسم.

هەر بۆیە گەیشتینە ماڵەوەمان و بە ئەسپایی و هێمنییەکی زۆرەوە پەیکەرەکەمان داگرت و بردمانە ژوورەوە لەسەر مێزێکی پتەوی بەهێز دامان ناو بە گیراوەیەکی تایبەت پاکمان کردەوەو هەموو کلس و پیسی و قەوزەکانمان لێ کردەوەو پاشان وشکمان کردەوەو لە دوورەوە رەونەقی دەدایەوە دەمبینی (جیهانگیر سەرحەد) زۆر شادو گەشاوە دەرکەوت زوو زوو سەیری پەیکەرەکەی دەکرد و پێدەکەنی و دەیگوت:(ساڵێك و نیو خەریکی دروست کردن و تەواو کردنی ئەم پەیکەرە بووم کە لە خەیاڵمدا دروست بوو، بەڵام بوو بە راست و کلیلی دەرگاکانی ژیانی بە رووداکردمەوەو خستمیە تاقیکردنەوەیەکی قورسەوە).

دیار بوو مەبەستی لە تاقیکردنەوەکانی ژیانی بوو، چونکە من دەمزانی باسی چی دەکات، دەمزانی ئەو پەیکەرە ژیانی بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا گۆڕیبوو، هەر بۆیە بێدەنگ دەبووم و گوێم بۆ دەگرت بە هێمنی و ویژدانەوە بۆم دەدوا، لەوکاتەدا لە بیری سەردەمی رابردوودا بووم و بیرم لەو پارچە پلێتە لاکێشەییە دەکردەوە کە ناوی (جیهانگیر) ی لەسەر نووسرابوو و بە زنجیرێك لە ملی

(کامەرانی وەنەوشەییدا بوو لە ساڵی ٢٠٠٣ دا بوو بۆ یەکەمین جار ئەو پلێتە سەربازیەم لە ملی دا بەدی کردو ئەو دەم نەمدەزانی ئەوە چییە، ئەو (کامەران)ەی مرۆڤێکی ئاسمانی بوو فریشتەیەکی خودایی بوو لە سەر زەوی و زوو بەرەو ئاسمانەکان گەڕایەوە خاکێك نەبوو بە هی خۆی بزانێت و لەسەری بسرەوێت.

لەسەر کورسییەکی دار دانیشتبووم تەماشای پەیکەرەکەم دەکردو (جیهانگیر سەرحەد)یش لەسەر کورسییەکی دیکە دانیشتبوو هەردووکمان بیرمان لە دنیای رابردوو دەکردەوە من بیرم لە رابردوویەکی نزیك دەکردەوەو ئەویش رابردوویەکی دوور هەردووکمان بەرەو رابردوو پەلمان کێشابوو.

دواجار رابردووی هەردووکمان تاڵ بوو وەك ژەهری مار، بەڵام رابردووی درێژتری (جیهانگیر سەرحەد) پڕ بوو لە کێشمە کێشی سەیرو نائومێدی و دیلی و حەسرەت و ئازار، رابردوویەك بوو پڕ بوو لە جەنگ و وێران کاری و کوشتن و مەرگ هەمیشە رابردوو وەك ئاوێنەیەك وەها بوو کە تەماشامان دەکرد و دیمەنی خۆمان لە ئاوێنەکەدا بەدی دەکردو ئیدی قبوولّ کردنی وێنەکە پێویستی بە ئاماژەو رەمزی سەیر بوو وەك نموونەی (لاکان و بیکێت) ئالۆز بوو تێکەیشتن لەو رەمزو سیستەمانەی ناو ئاوێنەکەو رابردوو دژوارو ناخۆش بوو.

من پێشنیازێکی سەیرو کتوپڕم بۆ (جیهانگیر) کرد بەوەی پەیکەرەکە بگوازینەوە بۆ ئەورووپا، لەوێ بە مۆزەخانەیەکی بسپێرین باشترە، بەڵام سەرەتا ئەو بەم داوایە رازی نەبوو دواتر رازی بوو، چونکە بە بڕوای ئەو سەلامەتترین جێگایەك بۆ پاراستنی هونەر ئەورووپا بوو، هەر بۆیە وتی (ئەگەر دەتوانیت بیبە بۆ ئەورووپا)بە شێوەیەك قسەی دەکرد کەوا خۆی لە دەرەوەی هاوکێشەو بازنەکان دەگرت، هەر بۆیە هەستم دەکرد ئەم پیاوە بێ ناسنامەیە لەم دنیایەدا لەم پنتەی زەویدا نابەسترێتەوە هەڵدێت، هەڵدێ بەرەو دنیا جیاوازەکان بەرەو کیشوەرە ونبووکان.

هاوین تا دەهات تینی دەسەند گەرما سەراپای وڵاتی داپۆشی بوو هەموو پوش و پاوان و دارستانە رووتەڵەکانی وڵات هێدی هێدی وشك دەبوون و دەسووتان ناوە ناوە ئاگر لەملاولا دەکەوتەوەو کوردستان دەسووتا، کرانەوەی کوردستان بە رووی جیهانی سەرمایەداری دا شتێکی کتو پڕ بوو هەزاران و ملیۆنان ئۆتۆمبیلی نوێ دەهاتنە کوردستان و جەنجاڵییەکی سەیر باڵی بەسەر شارەکاندا کێشابوو، خەڵك نائومێدو برسی بوون لەگەڵ ئەوەی دیکتاتۆر رووخا بوو، بەڵام هێشتا سەرکردە سیاسییەکانی وڵات لەسەر کورسییەکان پێکنەهاتبوون و شەڕو تەقینەوەکان لێرەو لەوێ بەردەوام دەبوون، رۆژانە گەلێك لاو و پیرو ژن و منداڵ لە تەقینەوەی دامەزراوەو

باڵەخانەو ناو بازاڕەکاندا دەبوونە قوربانی لەو ماوەیەدا دیاردەیەکی پیسی لەشفرۆشی لە وڵات و کوردستاندا بڵاو بووبۆوە.

ئۆتێلە چوارو پێنج ئەستێرەییەکانی کوردستان لەناویاندا ئوتێلەکەی (محەڕەم هەڵۆ) پێگەیەکی گەورەی سنگ و مەمکی کیژە عەرەبە خرپنەکان بوو، کە بە لێشاو لەوێ سەمایان دەکرد و دەهاتن و دەچوون، لاوانی وڵات لە بری بیرکردنەوەیان لە داهێنان و خوێندن و کاری جوان هەموو ئالوودەی کاری سێکسی و خواردنەوەو تلیاك کێشان ببوون، کوردستان ببوو بە مەیدانی ساخ کردنەوەی هەموو نەریتە قیزەون و ترسناکەکانی دنیا.

لەلایەکی ترەوە دیاردەی خۆکوشتن و مردن و خۆسووتاندنی ئافرەتان و لووت بڕین و سەر پان کردنەوە بڵاو بوو، هەموو شەوێ دەسەڵاتدارانی وڵات هاواریان دەکرد و باسی ئەزموونی سەرکەوتووی کوردستانیان بە گوێی دنیادا دەچپاند، بەڵام ئەفسووس وەها نەبوو، ئەوەی کە لە کەناڵە ئاسمانییەکانەوە دەخرایە روو تەنیا رووکەش بوو هیچی تر.

کوژرانی رۆژنامەنووسان و تیرۆرکردنی ئازادیخوازان و دەنگە جوداکان بەردەوامی هەبوو لەو سەرو بەندەدا لە لایەن ئاسایشەوە دەست گیرا بەسەر کۆمەڵێك قاچاخچی دا کە بازرگانیان بە ماددەی هۆشبەرەوە دەکردو لە سنوورەکانی ئێران و رۆژهەڵاتەوە دەهاتنە کوردستان، ئالوودەبوونی گەنجان بە شێوەیەك بوو لە سەر جادەو باخچەو گازینۆکان تەنانەت مەیدانی گەورەی شار دیمەنی شروب خۆرەکان بڵاو بووبۆوە.

هەریەکەو ئالوودەی دەردێکی کوشندەی ترسناك بوو کە هەڕەشەیان لە سەراپای کۆمەڵگا دەکرد، لەو ناوەندەدا من گیرم خواردبوو بە کۆمەڵێك کێشەی رابردوو کە دەبوو هەر زوو بە لایەکیدا بخەم.

شەوێکی درەنگ لەگەڵ (جیهانگیر سەرحەد) بڕیارمدا بڕۆین بۆ شوێنێك، بەڵام بەوم نەوت بۆ کوێ دەڕۆین هەر بۆیە، بەو پەڕی کەشخەییەوە خۆم گۆڕی و قاتێك جلی نوێشم بۆ (جیهانگیر سەرحەد)کڕی بوو لەو بڕە پارەیەی کە پاشەکەوتم کردبوو، هەروەها بەو ئۆتۆمبیلە مۆدێرنەی کە خۆم کڕی بووم رۆیشتین لەبەردەم ماڵێك دابەزین شەوێکی گەرمی هاوین بوو، (جیهانگیر سەرحەد)بە خۆیی و گۆچانە ساجیەکەیەوە لە تەنیشتمەوە وەستا بوو حەپەسا بوو، نەیدەزانی کە من بۆ کوێ هاتووم، پاش ئەوەی لە زەنگم دا (پەریهان جەلال)پاش وچانێك بەدەرکەوت و دەرگای بە رووماندا کردەوە، تەماشای کرد، من و پیاوێکی سەرو ریش سپی وەستاوین وتی (هاهاها، بەخێر بێن بە راستی دەمێکە چاوەڕێم بێیت، هەست دەکەم ماوەیەکە کەمتر یەکتر دەبینین) لە

وەڵامدا بە پێکەنینەوە دەمگوت: (سەرقاڵی زۆر کاروباری گرنگم، کاتم زۆر کەمە لەبەر ئەوە زۆر نەهاتووم) پاشان فەرمووی لێکردین و مـن لـە پێشـەوە (جیهـانگیر سـەرحەد)لە دوامـەوە بـە شەلەشەل بە قادرمەکاندا سەرکەوتین لە دەموچاو و روخسـاری (جیهـانگیر سـەرحەد)دا زۆر شـتم دەبینی دەمزانی پرسیار دەکات و دەڵێت ئێرە کوێیە، بەڵام بە بێدەنگی چـووینە هۆڵـە گەورەکـەو لەوێ دانیشتین (پەریهان جەلال) زۆر بە گەرم بەخێرهاتنی کردین و بە جلوبەرگێکی هاوینەوە خۆی گۆڕی بوو، بەڵام لەبەر جوانییە دەگمەنەکەی نەمدەتوانی سەرنجی جلوبەرگەکانی بـدەم کـە وادیـار بوو قاتێکی شەکەری بوو، دوای وچانێکی کـورت (شـەڕمین عـەزیز) بەدەرکـەوت و بـەخێرهاتنی کردین هەردووکمان لەبەری هەستاین سەرەتا بە گەرمی بەخێرهاتنی منی کـرد دواتـر کـە چـاوی چووە سەر (جیهانگیر سەرحەد) بۆ ئیستێك وەستاو چاوە گەورەکانی تەڕ تەڕ دەبینـران هیچـی بـۆ نەدەوترا، بەڵام هەر تەماشای (جیهانگیر سەرحەد) ی دەکرد، هەروەها (جیهـانگیر)یش بەهـەمان شێوە، ئەوان تاسا بوون و تەماشای یەکتریان دەکرد، دیمەنێکی هەسـت بزوێنـی نـاوازە بـوو دوای سەردەمانێکی درێژ لە مەرگ لە بۆنی مردن دوو کەس هیچ کات لە بـڕوای بەیـەك گەیشـتنەوەدا نەبن بەیەك بگەنەوە و یەکتر ببیننەوە، بـەڵام ئـەوە زۆر سـەیر بـوو، سـەیر تـر لـە هـەموو ئـەو دیاردانەی کە بە سەیر لەقەڵەم دەدران، من تەماشای هەردووکیانم دەکـرد و هیچـم نـەدەگوت بـۆ ماوەیەکی تا رادەیەك چەند خولەکی.

هەر لە یەکتریان دەڕوانی و وشەیەك چییە لەنێوانیاندا نەدەبزوا، بە ئەسپایی گوێم لـە دەنگـی گریان بوو لە چاوەکانی (شـەڕمین عـەزیز)ەوە و لێوەکـانی وردە وردە دەبزوانـد و دەیگـوت: (مـن دەتناسم، بەڵێ، وادەزانم دوێنێ بوو لەیادمە چاك دەتناسم تۆ (جیهانگیر سەرحەد)ی هـەر ئـەوەی نەمردووی، تۆ لە مەرگ ئازاتر بـووی، دەزانم ئـەویت، ئـەی خودایـە گیـان) لـە پـڕ (جیهـانگیر سەرحەد) دەیدایە پڕمەی گریان و دەیگوت: (بە دەنگتدا دەتناسمەوە تۆ (شەڕمین عەزیز) یت چـۆن ناتناسمەوە) ئیدی هەردووکیان ئامێزیان بۆ یەکتری دەکردەوەو بەسەر شـانی یەکـدا دەگریـان، ئـەم دیمەنە یەکێك لە هەرە دیمەنە پڕ گریاناویەکانی چیرۆکەکە بوو من بە حوکمی ئەوەی دڵم زۆر ناسـك بوو نەمتوانی نەگریم زۆرم هەوڵدا ئاسایی بم، بەڵام نەمتوانی. دواجار مرۆڤی خاوەن هەست و سۆز لەبەرانبەر گریانی کەسانی دەوروبـەری دا بــە چـۆکدا دێـت و دەگـری، گریـان هێزێکـی دەرەوەی مرۆڤەو بە بێ ویستی خۆت باڵ بە سەرتا دەکێشێ بە هەر هۆیەك بـوو منـیش زۆر گریـام تێکـڕا هەموو گریاین، پاش چەند خولەکێك لە گریان (جیهانگیر سەرحەد) دەستی لە گـەردنی (شـەڕمین عەزیز) ی کۆنە هاوڕێی خێزانەکەیی و خۆی کردەوەو پاشەو پاش بە شەلەشـەل چـەند هـەنگاوێك

هاته دواوەو لەسەر قەنەفەکە دانیشت و ئاخێکی قووڵی هەڵکێشاو وتی (ئای خودایە، ئێمە لەم دنیایە چی لە چارەمان نووسراوە من کەی چاوەڕوانی ڕۆژانێکی وام دەکرد) سەری دانەواندو (شەڕمین عەزیز) چاوەکانی بە هەردوو لەپی دەستەکانی دەسڕی و دەیگوت: (هەریەکەمان بەشی خۆی ناسۆری چەشتووە براکەم، ژیانی ئاوارەیی من زۆر لە ژیانی تۆ کەمتر نەبووە) (جیهانگیر سەرحەد) دەیگوت: (من بیست و سێ ساڵ لەمەو بەر لە شەڕێکی قورسدا بە بریندارى بە دیل گیرام، بەڵام کاتێك گەڕامەوە دووبارە بوومەوە بە دیلی دنیا، کاتێك ڕووناکی خۆی پیشاندام هەر زوو تاریکی دڵ و دەروونی داگیر کردمەوە، من لە مێژە شەڕ لەگەڵ تاریکی دەکەم ئەم شەڕەی نێوان تاریکی و ڕووناکی لە سەرەتای ژیانمەوە بەردەوامە، لە ڕووناکییدا تامی تاریکی دەکەم و لە تاریکییدا حەز بە ڕووناکی دەکەم، هەر لە دوای بیست و سێ ساڵ تاریکی لە ڕووناکییدا هەواڵی مەرگی کەسو کارم بیست کەسانێك زۆرم خۆشم دەویستن و قوربانیم بۆ خۆشەویستییان دا، بەڵام زوو ڕۆیشتن و بە جێیان هێشتم).

لەو کاتەدا (پەریهان جەلال) دەچوو چەند پەرداخێك ئاوی ساردی دەهێناو لە گەرمای شەوی هاویندا دەمانخواردەوە، ئیدی من لەو شەوەدا تەنیا وەك گوێگرێك وەها بووم زۆر کەم وتووێژم کرد، هەریەکە لە (جیهانگیر سەرحەد) و (شەڕمین عەزیز) باسی ژیانی ڕابردووی خۆیان دەکرد، هەریەکەیان لاپەڕە ڕەشەکانی ژیانی خۆی هەڵدایەوە من و (پەریهان) تەنیا تەماشای ئەوانمان دەکرد، (جیهانگیر سەرحەد) باسی یەکەمین یەکتر بینینی نێوان خۆیی و (وەنەوشە) و (شەڕمین عەزیز)ی دەکرد، وەك ئەوە وابوو تەنیا دوێنێ بووبێ ئەم ڕووداوە، ئەو هەموو وێنەکانی لەیاد مابوو.

(شەڕمین عەزیز) دەیگوت: (پەریهان یەکەمین کچم و دواهەمین کچمە کە لە باوکی ڕەحمەتی جەلال کوێستانی بۆم ماوەتەوە) (جیهانگیر سەرحەد) ڕووی بە لای (پەریهان) دا وەرگێڕاو زەردەخەنەیەکی بۆ دەکردو دەیگوت:(ڕووت سپی بێت، کچەکەم، سپاس بۆ خوا کە جوان و نازدارە) هەڵبەتە تەواوی بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ (جیهانگیر سەرحەد) گێڕایەوەو باسی زۆر شتی کرد ئاوارەیی ڕاکردن ماڵ سووتاندن و مەرگی مێردەکەی کە پیاوێکی شۆڕشگێڕ بوو باسی ڕزگاری ژیانی خۆیی و کچە تاقانەکەی کرد کە لە لایەن (محەڕەم هەڵۆ) و بەرەو شاخ براون و ڕزگاربوون، هەموو کات (شەڕمین عەزیز) دەیگوت: (من بەگیانم قەرزاری ئەو پیاوەم) هەر لەبەر ئەم قەرزاریە بوو نەیدەتوانی واز لە ئاشنایەتی بهێنێت، چونکە خۆی دەیزانی کە لە دوای ڕاپەڕین ئیدی تەماعکاری سەری لێشێواندووەو ئالوودەی زەوی و ماڵ و سامان بووە.

لەو شەوە هاوینەی ساڵی ٢٠٠٦ دا زۆر ڕووداوی دنیاو وڵات و ناوچەکە باس کران باسی زیندانی ئەوین و سڵقاو خواردن و پەتاتە خواردن و نانی بێخوێی خۆی بۆ (شەڕمین عەزیز) کرد لەوشەوەدا سەر لەبەری ڕووداوەکان باس کران.

من دەبوو ئەو شەوە بێدەنگ بم و هەموو شتە گرنگەکانی کە لە لام بوو باسیان نەکەم دەنا کار لەکار دەترازا زۆر زانیاری گرنگم لە لابوو دەیەها ملیۆن دۆلاری دەکرد، بەڵام بێدەنگییم هەڵبژارد تا ئەو کاتەش نە (شەڕمین عەزیز) نە (جیهانگیر سەرحەد) نەیاندەزانی هۆکاری مەرگی (کامەران وەنەوشە) (محەڕەم هەڵۆ) و پیاوەکانی بوون هەر بۆیە دەبوو هیچ نەڵێم.

تا درەنگانی شەو ئێمە دانیشتین و هەردووکیان باسی ڕابردوویان کردو من و (پەریهان) هەر گوێگر بووین، هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕابردوو سەیر بوو ژیان وەها بوو دەبوو بە ڕابردوودا بچیتەوە تاکو بزانی ئێستا چی دەکەیت، هیچ مرۆڤێك ناتوانێت تەماشای ئێستای خۆی بکات تاکو لە ڕابردووی خۆی نەڕوانێت، ئەو کەسانەی ڕابردوویان پڕە لە سەرکەشی و ئازارو ناسۆر ناتوانن کارێك بکەن ئێستای خۆیان پڕ بکەن لە خۆشبەختی، دوا جار ڕابردو و ئێستا و داهاتوو سێ ئەڵقەی لە یەك نەترازاون و هەر یەکەیان لە خاڵێکدا بەوی تر دەگاتەوە، ڕابردووی پڕ لە کێشمە کێشی ئەو دوو پاڵەوانە ئەوەندە تەمومژاوی بوو کاریگەری لەسەر ئەمڕۆیان دروست کردبوو، هەر بۆیە (شەڕمین عەزیز) بە چاوێکی دیکە بۆ دنیای دەڕوانی.

(جیهانگیر سەرحەد) دەیگوت: (لەو ماوەی بیست و سێ ساڵ زیندانییەم دا لەسەر دیوارەکانی ناو زیندان هەزاران تابلۆی سەیرو سەمەرەم بە بزمار هەڵکۆڵی کە هەموویان باسی خەبات و ئازادی مرۆڤی کوردی دەکرد چەندان خۆرو مانگ و ڕێگای ئەفسووناویم لە سەر تەختە بەردە گەورەکانی زیندان کێشا، دیوارەکان وەك ناواخنی هەرەمەکانی میسر وەهابوون چەندین نیگارو وێنەم لەسەر کردبوون).

باسی ئەو ئازادیەی دەکرد کە خەونی پێوە بینیبوو، بەڵام زۆر جار گوێم لێبوو دەیگوت: (زیندان لەم ئازادیە تاڵەی ئێستا خۆشترە) ئەو لە کاتی ئازاد کردنیدا نەیزانی بوو کە کاتێك ئەو دێتەوە هیچ ئاسەوارێکی ژیان لە جێگای خۆی نەماوە هەموو وێنەکان ئاوەژوو بوونەتەوە هەموو هاوکێشەکان ناهاوسەنگ بوون، وەك کیمیاگەرێکی پیر بیری لە سەدان جۆرە دەرمانی نەمری کردبۆیەوە، بەڵان بێ سوود ببوون، ژیانێکی ناخۆش ژیا بوو ئەو نەیدەزانی کە بەو هەموو دێوەزمەیەی یەخەی وڵاتی گرتبوو کوڕەکەی لەناو نەچووبوو، بەڵام بە کارو کردەوەی

پیاوانێکی کاسە لێس دڵی لەم وڵاتەو خۆشەویستەکەی هەڵکەندراو بەرەو کیشوەرەکانی تری دنیا گووزەری کرد و لەناوچوو، دەنا رەنگ بوو کارێك بکات کە من لە زیهنمدا دەمزانی، ئەو لە ژیان بێزار ببوو، هەر بۆیە گەر هۆکاری مەرگی کوڕە تاقانەکەی بزانیایە هەر زوو ئەو هۆکارەی لە سەرزەمین دەسڕیەوە.

لە نیوەشەوێکی درەنگدا هەردووکمان لە ماڵی (شەڕمین عەزیز) هاتینە دەرەوە بە ئۆتۆمبیلەکەم گەیشتمەوە ماڵەوە، شەوێکی گرنگ و مێژوویی بوو، لە یاد ناچێت هەر ئەو شەوە (جیهانگیر سەرحەد) دەستی کرد بە بیرکردنەوە، من لەگەڵ ئەودا چاوم لێك نەناو بۆ کاتژمێرێکیش چاوم نەچووە خەو (جیهانگیر سەرحەد) هەر ئەم دیوو ئەو دیوی دەکرد و نەدەخەوت، منیش بیرم لە چیرۆکەکانم دەکردەوە، لە لای خۆم دەمزانی هەموو رووداوەکان خەریکن بە کۆتایی دەگەن دەبوو کارێك بکەم بۆ کۆکردنەوەی هەموو رووداوو چیرۆکەکان هەر بۆیە (کتێبە وەنەوشەییەکەم) دەرهێناو دەمخوێندەوە ئەو کتێبە کۆنە بەرگ مۆرەی بە چەندین شێواز لە دەست و خەتی جیاواز یادگاری تێدا تۆمارکرابوو، دەمبینی (جیهانگیر سەرحەد) سەیرم دەکات، دواتر هەستاوە تەماشای دەستی دەکردم، دەیویست بزانێ چی دەکەم، کە نزیك بۆوە لە کتێبە دەستنووسە وەنەوشەییەکەی روانی، یەکسەر ناسیەوە لە دەستی وەرگرتم و تەماشای ئەم دیو و ئەو دیوی دەکرد پەڕە پەڕە لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوەو بۆنی پەڕەکانی دەکرد، بەڵام نەیدەزانی چی لە سەر نووسراوە، بەڵام دەیزانی میراتی پیرۆزی باوکی خێزانەکەیەتی هەر بۆیە نای بە سنگییەوەو تێر ماچی کرد و دەیووت (ئەم کتێبە بۆنی وەنەوشە و کامەرانی لێدێت بۆنێکی سەیری لێدێت بۆنی دنیایەکی دیکەی لێدێت کە منیش بەرەو ئەو دنیایە پەلکێش دەکەن) لە وەڵامدا من دەمگوت (یادگاری و ئەسپاردەی (کامەرانی وەنەوشە)یە لە لای من دەبێت تا کۆتای دەبێت بیپارێزم و هەڵی بگرم) لەناو ئەو کتێبە دەستنووسەدا زۆر رووداوی مێژوویی تێدا تۆمار کرابوو زانیاری گرنگ لە سەر خانەوادەی (شەلەنگ) و هەموو ئەوانەی بە دەوری ئەودا دەسووڕانەوە، هێدی هێدی گەورە دەبوو گەورەترو گەورە تر، من لەو سەرو بەندەدا دەبوو چیرۆکەکان کۆ بکەمەوەو بە هاوکاری هاوڕێیەکی سینەما سازم کە بە رەگەز ئێرانی بوو لە ئەوروپا دەژیاو بە کۆمەکی چەند دامەزراوەیەکی فیلم سازی دەبوو کارێك بکەم بۆ دروست کردنی فیلمەکە کە زۆر رووداوی ئەو سەردەمە لە خۆ بگرێت، هەر بۆیە کەوتبوومە خۆم و خۆم تۆکمە دەکرد دوا جار گەیشتبوومە سەرەنجامی زۆر باش، بەڵام هەندێك گۆڕانکاری ستوونی هەبوون هاتبوونە ناو

چیرۆکەکەو دەبوو کار بکەم بۆ بە ئەنجام گەیاندنیان هەرچی زوو بوو، من تەواوی دەستنووس و کاسێتە تۆمارکراوو زانیاریە نهێنییەکانم کۆکردەوەو لەناو جانتایەکی گەورەدا کۆم دەکردنەوە.

(جیهانگیر سەرحەد) بە حوزنێکی قووڵەوە دەیگوت: (کوڕەکەم شاپوور ئەم کتێبەو پەیکەرەکەو تەواوی ئەسپاردەکانی ئەم خانەوادەیە لە ئەستۆی تۆدان و ناپاکیان لەگەڵ نەکەی، من هیواو ئومێدی تەواوم بە تۆیە کوڕە شیرینەکەم) لەبەر وتەکانی (جیهانگیر سەرحەد) یش نەبووایە من هەر ئەوەم دەکرد، چونکە من بەڵێنی پاکم بە (کامەرانی وەنەوشە) دابوو کە بەئەمەك بم و بۆ هەمیشە ناپاکی لەگەڵ نەکەم، من لەو چەند ساڵە کەمەی ئەوم تێدا ناسی بوو فێری زۆر شت ببووم، دواجار رووبەڕووی چەندین رەفتارو کرداری نەخوازراوی پیاوانی سەردەم ببوومەوە و رەش و سپی دنیام بەرچاو کەوتبوو، هەر لەو ماوە زۆرانەدا چەند جارێك بە شێوەی تارمایی نەگیراو (حەکیمی رووناکی) دەهات و مژدەی سەرکەوتنی بۆ دەهێنام.

ئەوەی نەدەکراو لەیاد دەچووەوە تەنیا رەشییەکانی رابردوو نەبوو، بەڵکو زۆر شتی گەورەو بچووکم لە یاد چووبوو، چونکە ئەگەر مرۆڤ خاوەنی هێزی لەبیر چوونەوە نەبووایە ئەوا هەر چەند ساڵێکی کەم دەژیاو هیچی تر، بەڵام ئەو هێزە کۆمەڵێك داتای گرنگی ژیان وەلا دەنێت و دەیانخاتە ناو دەرگاکانی مێژووەوە، هەر بۆیە ئەوەی دەبوو بۆ هەمیشە لە ژیانماندا رەنگ بداتەوە ژیانی پڕ لە ئێش و ئازاری خانەوادەی (محۆل شەلەنگ) و (جیهانگیر سەرحەد) بێت.

ئەو شەوەی کە درێژترین شەوێك بوو من و (جیهانگیر سەرحەد) ی کۆکردەوە لە دوای ئەو شەوە ئیدی شەوی وەها دروست نەبۆوە تێیدا بئاخافێین، هەریەکەمان بەرەو مەنفایەك هەڵاتین، هاوکێشەکان وەها کارێکیان کرد کە سەرو بنی دنیایان لەلا وێران کردین، هەر بۆیە چەندین سەعات قسەمان کرد و باسی کتێبە وەنەوشەییەکەمان کرد کاتێك ئەستێرەکان لەو شەوە گەرمەدا بە ئاسمانەوە تەماشای سەرزەمین و مرۆڤە بێدارەکانیان دەکرد، ئێمە باوەشمان دەکرد بە تاریکییداو باسی ژیانمان دەکرد هەمیشە لەو ژیانەدا مەحکوم بووین بە مەرگ، مەرگ لە برژانگی چاو زیاتر نزیك بوو لێمانەوە، شەوانێکی هەمیشە زیندوو بوو بۆ کەسانێك پڕ بوو لە خۆشی و کەیف و شادی بۆ ئێمەش پڕ بوو لە ناسۆری درێژخایەن و دەردی کوشندە.

من دەبوو هەرچی زووە بڕۆم و داوای دەست لە کارکێشانەوە لە (پەنا کاروانی) بکەم ئەو کوڕە دڵناسکەی کە وەك گورگێك لە پێستی مەڕدا خۆی حەشاردابوو، بۆ هەمیشە لە بۆسەدا بوو بۆ کچانی جوانی شار، هەر بۆیە کە رۆژ بۆیەوە بە زوویی چووم و داوای دەست لەکارکێشانەوەم بەرز کردەوە، بەڵام سەرەتا واژۆی لەسەر نەکرا، دواتر چووم و داوام کرد کە رەزامەند بێت چونکە، من

نەخۆشم و دەبێت سەفەر بکەم بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام بەر لە واژۆکردنی داواکاریەکەم بانگێشتی کردم بۆ ئاهەنگێکی شەوانەی گەورە کە بە بۆنەی کردنەوەی باڵەخانەیەکی گەورەی بازرگانییەوە سازیان دابوو، نەدەکرا نەچم هەر بۆیە بیّ سیّ و دوو زمانم لە وتە کەوت و رەزامەندیم بە چوون نیشاندا، هەر بۆ دواتر گەڕامەوەو بۆ شەوی ئاهەنگەکە خۆم ئامادەکرد، زۆر لە لام گرنگ بوو کە (جیهانگیر سەرحەد) لەگەڵ خۆم ببەم بۆ ئاشنا بوون بەو ژیانەی لەناو ئەو خانەوادانەدا هەیە، بۆ شەوی ئاهەنگەکە خۆمان بە چاکی ئامادە کردبوو، لەگەڵ (جیهانگیر سەرحەد) چووین بۆ بازاڕ هەریەکەو قاتێکی جوان و جلی وەزیرانەمان کڕی.

ئەو شەوی کە چووین بۆ ئاهەنگەکە چووینە ناو هۆڵێکی ئوتێلەکەوە شەوێکی سەیر بوو زۆربەی کەسایەتییە ناسراو بەرپرسە گەورەکانی وڵات بانگێشتی کرابوون، بەڵام دوور لە چاوی کامێرا ئاهەنگەکەیان دەگێڕا و دەیانخواردەوە لە گرانبەهاترین جۆرەکانی مەیی و بادە.

من ئەو شەوە تەنیا کارم ئەوە بوو کە لە دوورەوە بەرپرسە گەورەکان بە(جیهانگیر سەرحەد) بناسێنم، هەر زوو زوو ئاماژەم بۆ کەسێك دەکردو دەموت ئەوە فلان کەس و ئەوە فیسار کەسە، ئاماژەم بە (محەڕەم هەڵۆ) دا کە لەنێوان چوار کچدا مەی دەنۆشی پێدەکەنی پیاوێکی جادووگەری چاو زەرد بوو، وەك هەڵۆ چاوی بە هەموو لایەکدا دەگێڕاو کەمێك سەری رووتابۆوە دەموچاوێکی کەمێك باریکی درێژ باڵایەکی مامناوەندی هەبوو قاتێك چاکەت و پانتۆڵی رەساسی لەبەردا بوو بۆینباخێکی سووری لە ملی توند کردبوو قاچی خستبوویە سەر قاچی و پێدەکەنی، (پەنا کاروانی) بە پیشەی هەمیشەیی چاکەت و پانتۆڵی مارۆنی لەبەر کردبوو، (ئەمیر کاروانی) لە لایەکی ترەوە قاتی نیلی لەبەر کردبوو قوماری دەکرد ئیتر ئاهەنگێکی گەورە بوو، کۆمەڵێك گۆرانیبێژی کاسەلێسی گیرفان خاڵیش ئاهەنگیان جۆش دابوو زەنا زەناو هاوار هاواریان بوو، (جیهانگیر سەرحەد) ی داماو تەماشای هەموویانی دەکرد و دەیگوت: (ئەمە چییە؟ ئێمەو کەسوکارمان یەکسان بووین بەمان؟) من بە پێکەنینەوە دەموت (بەڵێ بگرە کەمتریش بووین)، چەند جارێك ئاماژەم بە (جیهانگیر سەرحەد) دا کە جوان سەیری (محەڕەم هەڵۆ) بکات، بەو پەڕی وردیەوە تەماشای دەکرد و دەیووت (بۆچی؟ بۆچی؟) من لە وەڵامدا دەموت (سەیر بکەو جوان سەیر بکە) ئەو شەوە کاری (جیهانگیر سەرحەد) تەنیا سەیرکردنی (محەڕەم هەڵۆ) بوو منیش بە هەموو لایەکدا وەك رادار سەیری ئاپۆڕای خەڵکم دەکرد کە خانەوادەی بەرزی بەرپرسەکان هەموو ئاڵابوونە یەکترو دەیان خواردەوەو سەمایان دەکرد رێك وەك ئاهەنگە گەورەکانی فیلمەکانی

هۆلیود دەهاتە بەر چاوم، بە دەیان ئافرەتی سۆزانی عەرەبی سەمایان دەکرد و بە بەدەن و لەشی نیوە رووتەوە دەهاتن و دەچوون.

هەر چۆنێك بێت بەر لە بە کۆتا گەیشتنی ئاهەنگەکە من و (جیهانگیر سەرحەد) ی شەل هاتینە دەرەوەو گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، مەراقێکی گەورە لە دڵمدا بوو خەوم لێ نەدەکەوت هەر ئەم دیو ئەو دیوم دەکرد، لەولاوە(جیهانگیر سەرحەد) دەیوت (کوڕی خۆم چییە دەتەوێت شتێ بڵێیت چییە؟) من دەبوو هەندێك شت بڵێم دەنا ویژدانم ئازاری دەدام هەستم دەکرد مەنجەڵێکی گەورە لەناو دڵمدا دەکوڵاو دەیسووتاندم وەك بوورکانێك لە لێواری تەقینەوەدا بووم ئازار سەراپای گیانی داگیر کردبووم بۆیە بە ناچاری هاوارم کرد و وتم (ئەی پیاوە پیرەکە ئەی بەریێترین مرۆڤی ئەم سەرزەمینە (محەڕەم هەڵۆ) دەناسیتەوە؟) لە وەڵامدا بەو پەڕی پەرێشانییەوە هاتە لام وتی (دە ساڵی تر بیبینمەوە باش دەیناسمەوە) دواجار وتم (ئەو پیاوە بووە هۆی مەرگی (کامەرانی وەنەوشە)، ئەو بوو (کامەران)ی لە کونجی زیندان توند کرد، ئەو بوو هاوڕێکانمانی کوشت ئەو بوو نەیهێشت بە مراد بگەین ئەو بوو (مەلەك کانەبی) و (کێوان دەشتی) و (کامەرانی وەنەوشە) و چەندانی دیکەیان کوشت، ئەو بوو (کامەران)ی بەرەو هەڵاتن راوەدوونا بەرەو مەنفا).

(جیهانگیر سەرحەد) حەپەساو تاساو پەشۆکاو من باسی چی دەکەم من تێ هەڵچوومەوەو بە گریانەوە وتم((کامەران) ژیانی لێرە خۆش دەویست کچێکی تا رادەی پەرستن خۆش دەویست بەناوی (دڵارام میهرداد)، بەڵام کردەوەکانی (محەڕەم هەڵۆ) ئەویان بەرەو هەندەران هەڵنا ئەویان راوەدوو ناو وایان لێکرد تف لەم هەرێمەش بکات) ئیدی تەواوی بەسەرهاتەکانم لە نووکەوە تابەیانی بۆ(جیهانگیر سەرحەد) گێڕایەوە دێڕ بە دێڕ وشە بە وشە هەموو رووداوەکانی ئەو چەند ساڵەی رابردووم بۆ بەیان کرد و ئەم خستە ناو دنیایەکی خەیاڵی و خەم و پەژارەوە دەبوو بۆی باس بکەم من تاوانبار نەبووم مەحکوم نەبووم، بەڵام راستییەکان دوا جار هەر دەبێ ئاشکرا بن.

لەگەڵ ئەم رووداوانە لە دەمم هاتەدەر (جیهانگیر سەرحەد) هەراسانی لەبەر هەڵگیراو هەر بەم لاو ئەو لادا پیاسەی دەکرد دەشەلی بەدەم خۆیەوە هاواری دەکردو دەیگوت: (خوایە گیان من پیاو کوژ نیم، لێم خۆش بە) ئاخر پیاوێك کە تەنیا ژیانی بەرد تاشین بووبێ پیاوێك ژیانی لە زیندان سەرف کردبێ هیچ کات لە زیندان سڵ ناکاتەوە، هیچ کات بیر لە مەرگی کەس ناکاتەوە لە پەپوولەیەکی سپی دەچوو کە ئازادی دەوێت و ئازاری کەس نادات، تاوانکار نەبوو، بەڵام کۆمەڵێك رووداو هاتنە پێشەوە کە دەبوو بەرەنگاریان ببێتەوە، من لە دوا جاردا پەشیمان بووم کە ئەم راستییانەم ئاشکرا کرد، بەڵام ئەگەر بەوم نەوتایە دەبوو بۆ هەمیشە ئازاری ویژدان بچێژم، ئەو

هەمیشە لەبارەی (کامەرانی وەنەوشە) پرسیاری لێدەکردم، دەبوو پێی بڵێیم نەدەکرا خۆم لەو راستییانە بەدوور بگرم و خۆم بدزمەوە.

نەمانزانی چۆن رۆژ بوویەوە، بەڵام (جیهانگیر سەرحەد) بۆ ماوەی یەك هەفتە لەو ژوورەی مندا مایەوە و نەهاتەدەر، تەنیا بیری دەکردەوە خۆی کزۆڵ دەکردو دەگریا، لە سووچێکدا تەنیا دەگریاو هیچی نەدەووت، بەڵام کاتێك لەو خەڵوەتە هەستایەوە کارێکی سەیر روویدا زۆر دژوار زۆر دژوار.

سەرەتای وەرزی پایزی ساڵی ٢٠٠٦ بوو، من چەند جارێك چووم بۆ دیداری (پەریهان جەلال) لەو ماوەیەدا (پەنا کاروانی) سێ جار داخوازی ئەوی کردبوو هەموو جارێك رەت کرابۆوە، بەو پێیەی هیچ هەست و سۆزێکی نەببوو بۆ(پەنا کاروانی)، بەڵام هەر جارێك من دەچووم بۆ لای لە لایەن چەند بە کرێ گیراوێکەوە چاودێری کرابووم، ئەگەرچی من و ئەو لە دوو هاوڕێ زیاتر نەبووین، بەڵام لە لای (پەنا کاروانی) یاساخ و حەرام کراو بوو، لەو ماوەیەدا (پەریهان جەلال) داوای ئەوەی لە من دەکرد کەوا لەو فیلمەی بە نیازم لە سەر ژیانی (کامەرانی وەنەوشە) و خانەوادەکەی بەشداری پێبکەم و لەگەڵ خۆم سەفەری پێبکەم بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام من سەرەتا دەبوو هەموو رێگاکان لێکبدەمەوەو پاشان کاری لەسەر بکەم، و سەرەتا چەند ناوچەیەکی کوردستانمان هەڵبژارد بۆ پێگەی وێنەگرتن لە سەرەتای پرۆژەکەدا بووین من دەمزانی (پەنا کاروانی) هیچ خۆشی لەم کارەی من نایەت و بەوە نائاسوودەیە کە (پەریهان جەلال) لەگەڵ من کار بکات، هەر بۆیە لە چەند رێگەیەکی جیاوازەوە تەنگەژەو کۆسپییان خستە سەر رێگام بۆ نەکردنی کارەکانم، هەر بۆیە من بۆ ماوەیەکی کاتی تێکڕای کارەکانم وەستاند، بەڵام (پەریهان جەلال) سەردانی دەکردم و هەوڵی نزیك بوونەوەی دەدام و چەندین جار هەواڵی ئەوەی دامێ کەوا (پەنا کاروانی) ژیانی پێ هەراسان کردووەو وازناهێنێت، بۆیە بێزاری کردبوو حەوسەڵەی ئەوەی نەماوە لەم وڵاتە بژی.

دژایەتیکردنی من لەلایەن ئەوانەوە نەوەستاو بەردەوامی هەبوو، من بۆ خۆم لەو شێوە ژیانە بێزار بووم دەمزانی کە لەم پنتەی سەرزەمین ژیان زۆر ناخۆشە، دوا جار کەسێك هاوڕێیەکی وەهام نەمابوو لەگەڵی بژیم، هەر لەو چەند رۆژەی دوایدا کە (جیهانگیر سەرحەد) هەموو راستییەکانی بۆ ئاشکرا بوو، بۆ بەیانییەکەی کە خەریك بوو هەوری پایز کەم کەم ئاسمانیان دەتەنی خۆی کۆکردەوەو بە منی راگەیاند کەوا سەفەر دەکات بۆ شاری منداڵی بۆ ناو دار و پەردووی رووخاوی وەتەنەکەی جانتاو جلوبەرگی خۆی کۆکردەوەو رۆیشت ئیدی ئەوە دوایین جار بوو من (جیهانگیر

سەرحەد) ببینمەوە بەر لەوەی بڕوات کۆمەڵێك ئەرکی دژواری خستە ئەستۆی من کە مـن لـە لام دژوار نەبوو لەبەر هاوڕێیەتی پتەوی (کامـەرانی وەنەوشـە) و خۆشەویسـتییم بـۆ خانەوادەکـەیان هەموو کارێکم لە پێناویاندا دەکرد، ئەو بە دەنگییکی نزم پڕ لە حـوزن و ماتـەمینی بـە مینگـە مینگێکی سەیر دەیگوت: (کوڕەکەم شاپوور ئەمانەتی تۆو پەیکەرەکـەو کتێبـە وەنەوشـەییەکە، ئەوانە دوو شتی زۆر گرنگ و خۆشەویستی خانەوادەکەی ئێمەن تۆ دەبێت بە باشی بیـان پارێزیـت ئەرکی تۆ ئەوەیە بۆ کۆتایی هەموو ڕووداوەکانی ئەم سەردەمە لەناو ئەو کتێبەدا جێگە بکەیتـەوە ئەو کتێبە وەنەوشەییە دەبێت گەورە بێت و هەموو کەسەکانی ئەم هەرێمە بیخوێننەوە، هەوڵ بـدە وەك چاوەکانت بیان پارێزیت ئەوە پیرۆزترین درەختی ئەم خانەوادەیەی ئێمەیە کە لـە ژێـر دەسـتی تۆدا گەورە دەبێت و چڵ و پۆپ بەرەو ئاسمان دەهاوێژێت، من ئـەزموونی چـەندین سـاڵ زینـدانی فێری تێڕامانی کردم لە تاریکی و لە تەنیایی، ڕەنگە ڕۆژێکی دیکە نەیەت بـۆ ئـەوەی مـن و تـۆ پێکەوە قسە بکەین، ئەمە وەسیەتنامەی کۆتایی منە ڕەنگە من سەفەرێکی ئەبەدی بکەم بـەرەو قووڵای ئاسمانەکان بەرەو هەردە دوورو درێژەکانی مەنفا بەرەو گەرووی تاریکی دنیا، پەیکەرەکەش با لە ئەستۆی تۆدا بێت و بەرەو کوێ دەیبەیت بیبە، گرنگ ئەوەیـە پـارێزراو بێـت، ئـەوە دوایـن شاکاری هونەری منەو لەمە بەدوا پەنجەکانم کاری دیکە دەکەن، جگە لەبەرد تاشـین کـاری دیکـە دەکەن) بەم شێوەیە چەند جارێك وشەکانی کۆتـایی دووبـارە دەکـردەوە، مـن زۆر خـەمبار بـووم، چونکە لەو ماوەیەی لەگەڵ مندا بوو تەواو هۆگری یەکتر ببووین هەستم بە ئارامی دەکرد، ئەویش وەك کوڕی خۆی مامەڵـەی لەگـەڵ مـن دەکـرد، بـەو بەیانییـە کـەمێك کـەوەرۆژە بـە خـۆی و جلوبەرگێکی سپییەوە کە هەموو قۆپچەی کراسەکەی داخستبوو بە گۆچانە ساجیەکەیەوە باوەشـی بۆ کردمەوەو لە ئامێزی گرتم و ماڵئاوایی لێکردم، بەدەرکەوت و هێدی هێدی بـزر بـوو، مـن لـە سەر وەسێتنامەکەی ئەو دەبوو ئەو ئەمانەتانە بپارێزم هەر بۆیە بەڵێنم بە خۆمدا کـە تـا کۆتـایی ژیان ئەوانە بپارێزم من تەواو جەنجاڵ بووم کۆمەڵێك ئەرك و کارو بەرپرسیارێتی لە ئەستۆمدا بوون سەری خۆمم پێ نەدەخورا، هەمیشە زۆر سەرقاڵی کارکردن بـووم، دەبـوو چـیرۆکەکە بەشـێوەیەك ئامادە بکەم کە کاریگەری زۆر بەهێزی لە سەر هەست و ئەندێشەی ئەوروپاییـەکان هـەبێ، بـەڵام ئەم فیلمەی من دەمخوازی بە هاوکـاری چـەند دەرهێنـەرێك بەرهـەمی بهێـنم تـەکنیکی بـەرزی دەویست کە لە کوردستان لە توانای هیچ دامەزراوەو کۆمپانیایەکدا نەبوو، بۆیە دەبوو ئەنجامدانی کارەکان بە ئەوروپییەکان بسپێرم، هەرچـۆنێك بێـت دەبـوو ئـەوە بکـەم، هـەموو ئـەو کاسـێتە دەنگییانەی کە لە دانیشتنەکاندا تۆمـارم کردبـوون هـەموو وێنـەکان، دەستنووسـەکان دەفتـەری

یادگاریەکانم کۆکردبوویەوە، وەك دایکم هەمیشە دەیگوت:(لە کۆڵ بە کۆڵ و شـێت و گەڕیدەیـەك دەچووم) وەك سەگێکی وێڵگەرد پێیەکم لەمبەری دنیاو پێکەی دیکەم لەو بەری دنیا بوو.

وەك خوونەرتێکی کۆن و دێرینەم ئارەزووم بە کۆکردنەوەی زانیاری و نهێنییەکانی خەڵك بـوو، لەو ماوە کەمەی لە کۆمپانیاکانی (ئەمیر کاروانی) و خانەوادەکەی کارم کردبوو گەلێك زانیاری و داتای گرنگم لەسەریان کۆکردبۆوە، هـەموو دامـەزراوە نهێنییـەکانیانم بـە نەخشـەوە لـە لابـوو، تەنانەت هەمووتان و پۆیەکانم لە لای خۆم تۆمار کردبـوو وەك پیـاوێکی هـەواڵگرو سـیخوڕ وەك (جەیمس بۆند) لە فیلمە سەرنجراکێشەکانیدا هەموو پێگەکانم دەزانی تەنانەت کێڵگە نهێنییـەکانی رواندنی رووەکی تریاك و مادە هۆشـبەرەکان کۆگـا نهێنییـەکانی ژێـر زەوی باڵەخانـە گـەورەکانماڵەکانی سۆزانی بازی کە لە لایەن (محەڕەم هەڵۆ) و (پەنا کاروانی) یەوە داڵدەدرابوون هەموو ئـەم نهێنییانەم لەسەر سی دی و هاردی نهێنی تۆمارکردبوو بە وێنەو نەخشـەو داتـای تـەواوەوە، مـن خۆم نەدەترسام، بەڵام هەندێك جار دەمگوت: (ئەگەر بێت و ئەم هەموو نهێنییە دژوارانە لە لایەن پیاوانی (محەڕەم هەڵۆ)وە ئاشکرا ببێت زۆر زەحمەتە من جارێکی دیکە رۆشنایی بە چاوەکانم ببیـنم بەڵکە لەناو تەنوورە گەرمەکانی ئەواندا وەك کۆتر دەمبرژێنێت، هەر بۆیە هـەموویانم کـۆکردەوەو کۆپیەکیشم لە سەر سیدیەك لەبەر گرتنەوە و نەدەکرا ئەم هەموو وێنەو زانیاریە گرنگانـەم هـەروا بە فیڕۆ بڕوات، هەر بۆیە گەڕام بە دوای ئەو کەسە بەرپرسە گەورانەی کـە لـە بازنەکـەی دیکـەی ئەولا بوون و لە دژی (محەڕەم هەڵۆ) هەمیشە لە بۆسەدا بوون، هەر بۆیە لە بیری ئـەوەدا بـووم کـە دار کرمی لە خۆی بۆ دروست بکەم و بە مقاشێکی درێژ پشکۆکان بگرم و خۆم لـە قـەرەی کـاری ترسناکی وەها نەدەم، ئەو کەسەی کە لە لام گرنگ بوو زۆر بە زوویی پەیدا ببوو، ئـەوەی دەمێـك بوو چاوەڕێم دەکرد کردم و ئەو کارە گرنگەم بە ئەنجام گەیاند، بەڵام شەوێکی وەرزی پایز کە نمە نمە باران دەباری لە نزیك کاتژمێر دەی شەودا بوو زەنگی تەلەفونم بۆ هات و هەواڵێکی سەیرم بیست کە بڕوام نەکرد شتی لەو جۆرە روبدات.

ئـەو شـەوەی کـە (محـەڕەم هـەڵۆ) کـوژرا دوو رۆژ بـوو (جیهـانگیر سـەرحەد) مـاڵی منـی بەجێهێشتبوو لەو تەلەفۆنەدا کە بۆم کراو بە گریانەوە (پەریهان جەلال) دەیگوت: (شاپوور دەزانـی ئەم شەو هەواڵمان بۆ هات کەوا (محەڕەم هەڵۆ) کوژراوە، زۆر دەترسم، زۆر دەترسم) لە دوای ئەوەی (پەریهان جەلال) تەلەفۆنی داخستەوە و من دەمودەسـت دەمزانـی ئـەم کـارە کـاری (جیهـانگیر سەرحەد) ە هەر بۆیە دەبوو منیش هەڵبێم دەنا پریشکی ئـەو ئـاگرەی کـە هەڵدەگیرسـا منیشـی دەسووتاند هەر ئەو شەوە بە ئۆتۆمبیلێکی تایبەت پەیکەرەکەی (جیهانگیر سەرحەد)م گواسـتەوە

بۆ ماڵی مامۆستا (شەڕمین عەزیز) و هەموو کەلوپەل و دەستنووس و کاسێتەکانم لە دوو جانتادا کۆکردەوەو ماڵئاوایم لەدایك و باوك و (شەڕمین عەزیز) و (پەریهان) کرد، ئەوان سەیریان لەوە دەهات کە من بۆ بەم شەوە سەفەر دەکەم، شار خرۆشا بوو هەموو شار دەنگی زەنا زەناو هاوارو هاژەی خەڵك بوو، دایکە پیرەکەم بە گریانەوە ماڵئاوایی لێکردم و ئەوەی دەمێك بوو هەوڵم بۆ دەدا و ئەو تەونەی دەمێك بوو دەمچنی بوووەوە بە خوری، بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆم هەر بەو شەوە بەرەو شاری دەشت و شاری قەڵا گووزەرم کرد، (پەریهان جەلال) بە گریانەوە دەیگوت: (ئاگاداری خۆت بە توخوا ئاگاداری خۆت بە) من بە ئاگادارییەوە خۆم دایە دەستی قەدەرو بەرەو شاری دەشت چووم، ئەو کاتەی گەیشتمە ئەوێ نیوەی شەو بوو، لەوێ لە ئوتێلێکی کۆنی خراپ مامەوە، هەر زوو ئەو سیدیەی کۆپیم کردبوو هەموو زانیارییەکانی تێدا بوو لە رێگەی دەلیلێکەوە بە ئەمانەت گەیاندمە دەست پیاوە نەیارەکەی (محەرەم هەڵۆ)، و بە زوویی بەرەو فڕۆکەخانە رۆیشتم و تکتێکی ئەوروپام بە زەحمەت بڕی بوو پاش سێ کاتژمێر چاوەڕوانی فڕۆکەکەمان لە زەمین بەرز بۆوەو بەرەو ئەوروپا کۆچم کرد، ئەوە دوایین جار بوو بۆنی خاك و هەواو ژینگەی کوردستان بکەم، لەوپەڕی بەرزی ئاسمانەکاندا هەستێکی سەیر داگیری کردبووم، لە لایەك خۆشحاڵ بووم بە لەناوچوونی پیاوێکی ناپاك و بێ ئابڕووی وەك (محەرەم هەڵۆ)و لە لایەکی دیکە نائاسوودە بووم بە بەجێ هێشتنی ئازیزان و خاکم بەو چەشنە، بەو هەڵاتنە سەیرەی لە هەرێمی مردووەکان کە رۆژانە بۆنی مەرگ لە هەموو کۆڵان و باخچەو بازاڕەکانی دەهات، من هەڵاتم وەك سەربازێکی دۆڕاو هەڵاتم، رام کرد و ئاوڕم لە رابردووی خۆم نەدایەوە، هەڵاتم، هەڵاتم، هەڵاتم.

## ٢٥

ئەو رۆژەی (کامەرانی وەنەوشە) بە بیجامەیەکی خەت خەت و تیشێرتێکی پەمەییەوە لەناو قووڵاییەکانی زیندان هێنرایە دەرەوە رەنگی جلەکانی گۆڕابوو، زەردو رزی بوون لاوازو لانەوازو داماو بە قژو ریشێکی ئاڵۆزاوی درێژی زەردباوەوە وەك رەنگی قورو خۆڵ هاتەدەرەوە بەرەو رووناکی نەیدەتوانی چاوەکانی بکاتەوە ئەو دەمە لەناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٤) دا بووین، هەر بۆیە دەستی دەگرت بە چاوەکانییەوە و دەگریا، ئەوەی پیاوەکانی سوڵتان و (محەرەم هەڵۆ) ویستیان تەمبێ کردنی (کامەران) بوو، بەڵام ئەوان بەو کارە نەك نەیانتوانی بە ئەنجام بگەن بەڵکو دەرگای دۆزەخیان بە رووی خۆیاندا کردەوە.

لەبەرانبەریدا (میهرداد کاکەوەیس) بە کزۆڵی وەستابوو بە کامەرانی وتبوو(کوڕم ئەوا من بە کەفالەت تۆم ئازاد کرد، ئەمن دەزانم کە تۆ کاری وەهات نەکردووە، بەڵام ئەمن لەبەر خاتری کچە تاقانەکەم ئەم کارەم بە ئەنجام گەیاندووە، ئەو نەخۆش و ناتەواوە، لە دۆخێکی ترسناکدایە، بە خودا ئەوم لەدەست بچێ یەکسەر دڵم لە لێدان دەکەوێ) بە گریانەوە باوەشی بۆ (کامەرانی وەنەوشە) کردبۆوە، بەڵام (کامەرانی وەنەوشە) حەپەساو داماو نەیزانی بوو کە کێیە قسەی لەگەڵ دەکات، ئەو بە وێنەی مرۆڤی کۆنی چاخەکانی بەستوی لێهاتبوو لە مرۆڤی نیاندەرتاڵ چوو بوو، هەر بۆیە بەو پەڕی نەزانینەوە لەگەڵ (میهرداد کاکەوەیس) باوکی (دڵارام) سواری ماشێنێکی تایبەت ببوون و بەرەو ماڵی (میهرداد) بەڕێ کەوتبوون دوای چەند کاتژمێر لە رۆیشتن گەیشتبووینەوە شاری مێژوو لە دووررا لە قەڵایەکی گەورەیان روانی بوو، (کامەران) هێدی هێدی چاوەکانی کرابوونەوەو رووناکی و چیاو کۆترو پاساری و درەختی رووتەڵەی بەدی کردبوو، ئیدی گەیشتبووە ئەو راستییەی کە ژیانی لەم هەرێمە پێ تەواو ناکرێ و دەبێت سەفەر بکات یان هەڵبێت چونکە دەیزانی سیناریۆکان هەمیشە بەرێوەن تا ئەو کاتەی دەمرێت، بەو پەڕی نائومێدیەوە چووبووە ناو ماڵی (میهرداد کاکەوەیس) بەو پەڕی لاوازی و نەخۆشییەوە (دڵارام) ی بەدی کردبوو کە ئەویش لە دۆخێکی خراپی دەروونی دا ببوو، هەر بە بینینی (کامەرانی وەنەوشە) وەك گوڵێکی سیسی ژاکاو ژیابۆوەو روخساری لە حوزن و ماتەمەوە بەرەو رووناکی و

کرانەوە کرابـۆوە، بـە کـوڵ بەسـەر یەکـدا گریـا بـوون لـەو دەمـەی شـەرم نـەمابوو (میهـرداد کاکەوەیس)لەبەر خاتری کچەکەی ئامادەیی دەربڕی بوو هەموو کارێك بکات.

(کامەرانی وەنەوشە)لە ئازارو ناسۆرو لاوازی و نەخۆشییدا لە هۆش خۆی چوو بوو، بووراب‌ـۆوە هەر بۆیە هەر زوو بەرەو نەخۆشخانەیەك برابوو پاش دوو رۆژ لە وەهم و بێ هۆشی، لـەوێ مـاوەی یەك هەفتە مابۆوە و چارەسەری پزیشکی بۆ کرابوو، هێدی هێـدی بـە هۆشـدا هـاتبووەوەو بـاری تەندروستی بەرەو جێگیر بوون چوو بوو، بۆیە لـە دوای دە رۆژ مانـەوەی لـە نەخۆشـخانە، دواتـر توانیبووی دەربچێت و بە پێیەکانی بڕوات و بگەڕێتەوە بۆ لای (دلارام میهرداد).

ئـەو کاتـەی (کامـەرانی وەنەوشـە)بە قـاتێکی رەش و کراسـێکی رەش و گـوڵێکی وەنەوشەییەوە گەڕایەوە بۆ لای (دلارام میهرداد) باوەشی بە (دلارام) دا کردووەو (دلارام میهرداد)ئاوێزانی (کامەران) بووە جوانترین دیمەنێکی سەرسـووڕهێنەر بـوون. دوا جـار گەڕانەوە خۆشییەکی سەیر دروست دەکات، لەو دەمەدا کەس هەستی بەوە نەکردبوو کە (کامەرانی وەنەوشە) رۆژێك دێت و لەم وڵاتە هەڵدێت، هەموو وایان زانی دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆیی و درێژە بە خوێندن دەدات، بەڵام بە پێچەوانەی هەموو بیرۆکـەکان (کامەرانی وەنەوشە) دنیایەکی دیکەی بۆ ژیان و مەرگ هەڵبژاردوو، هەر بۆیە لە دوای چاك بوونەوەی (کامەران) و باش بوونی باری دەروونی (دلارام میهرداد) بـۆ ماوەیـەکی کورت (دلارام میهرداد) و (کامەرانی وەنەوشە) بـە یەکـەوە مابوونـەوە، بـەڵام ترسـی دووبارە بوونەوەی سیناریۆکانی پیاوانی (محەرەم هەڵۆ) وایان کردبوو (کامەرانی وەنەوشە) لەناوەڕاستی ژیانی زانکۆیدا واز لە خوێندن بهێنێت و بـەرەو هەنـدەران بـەرەو دوورگـە وەنەوشەییەکان هەڵبێت. هەمیشە هەڵاتن لە ژیانی ئێمەدا دووبارە دەبێتەوە، بە درێژایی مێـژوو کـورد هـەڵاتوو بـووەو لـە چەرمەسـەریدا بـووە، بـەڵام ئـەمجارە (کامـەرانی وەنەوشە)بەرەو دنیایەکی دیکە هەڵاتبوو، بە بڕوای ئەو ژیانی لە پنتێکـی دیکـەی ئـەم سەر هەسارەیەدا دەدۆزێتەوە.

لەو ماوە کورتەی دوای زیندانی دا هەموو رۆژێك بە چەپکە گوڵەوە چووبوو بـۆ لای (دلارام میهرداد) و لەوێ لە یەکتریان پرسی بوو، ئاوێزانی یەکدی ببوون، باوکی (دلارام) لە چاوەکانی (کامەرانی وەنەوشە) دا دیمەنێکی سەیرو خەیاڵی بەدی کردبوو کە هەر لـە منداڵییەوە لە چاوانی (دلارام) دا بەدی کردبوو دیمەنی خاڵە مۆرەکەی ناوچاوانی (دلارام) هەر رۆژەو بە رەنگێك گۆڕابوو لەو ماوەیەدا ناسروشتی خاڵەکە رەش ببـوو وەك ئـەوەی

پەیامێکی سەیر هاتبێت و لە دڵیدا چێنرابێت، (میهرداد کاکەوەیس) بە (کامەرانی وەنەوشە)ی وتبوو (من بەڵێنت پێدەدەم بە بێ هیچ مەرجێك کیژە تاقانەکەی خۆمت پێبدەم، بەڵام تەنیای مەکە و هەمیشە لەگەڵی ببە) بەم وتانەی (میهرداد کاکەوەیس) (کامەران) زۆر خۆشحاڵ ببوو، بەڵام (کامەران) هەمیشە لەو ژیانە ترسابوو لەم هەرێمە ترسابوو لە بیری خۆیدا لەوە ترسابوو ئەگەر ئەمان هاوسەرداری بکەن و نوتفەی منداڵ لە رەحمی (دڵارام) دا جێگیر ببێت ئەو دەمە ژیانیان دژوارتر دەبێت و مەترسییەکان لەسەر ژیانی دەبنە سێ هێندە هەر بۆیە بڕیاری دابوو لە سەرەتادا بە تەنها بەرەو کیشوەرە دوورەکانی دونیا بچێت بۆیە رۆژێك هاتبوو، ماڵئاوایی لە (دڵارام میهرداد) کردبوو، بەوی وتبوو کەوا سەفەرێکی کورت دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە، لە ڕاستی دا (کامەرانی وەنەوشە) هەرگیز لە بیری ئەوەدا نەبوو کە (دڵارام میهرداد) لە میشك و دڵی دەربێنێت چونکە عەشقەی ئەوان ئەزەلی و نەبڕاوە بوو، بەڵام دەیویست دەرگای دونیایەکی دیکە بۆ هەردووکیان بکاتەوە و سەرەتا خۆی لەگەڵ دەرگاوەنەکانی دونیا نوێ یەکاندا ئاشنا بێت ،ئەو نەیدەویست سەرکەشی بکات و (دلارام) بەو ئەزموونە قورسەی سەفەر کردن بناسێنێت، لە رێگەی رێبەرێکەوە مامەڵەی سەفەرکردن بەرەو هەندەران دەکات لەدوای خۆی چەند ئینجانەیەك گوڵی وەنەوشەیی بە دیاری دەدات بە (دڵارام میهرداد).

بەڵێنی گەڕانەوە بە (دڵارام میهرداد) دەدات، هەر بە زوویی لە ترسی قامچی و زوڵمی پیاوانی (محەڕەم هەڵۆ) لە رێگەیەکی نایاساییەوە بەرەو سنوورەکانی وڵاتی تورکییا گوزەر دەکات، بە خێراییەکی زۆر هەڵدێن، لە دوای خۆی ئەوەی خەمی بۆ خواردبوو تەنیا (دڵارام) بوو، لەو ماوەیەی لە زیندان ببوو لە لایەن کەسێکی راسپێردراوەوە چەند جارێك هەڕەشەی مەرگی لێکرابوو لە دوا ساتی ئازادبوونیدا لە نامەیەکی دەنگی دا هەڕەشەی مەرگی (دڵارام) ی لێکرابوو ئەگەر بێت و لەم هەرێمە بمێنێتەوە، هەر بۆیە پێیان راگەیاندبوو کە زوو ئەم وڵاتە بەجێ بهێڵێت و لێرە نەمێنێت، ئەویش لە پێناوی مانەوەی (دڵارام) و خانەوادەکەیی و لە ترسی ژیانی خۆی بۆیە بڕیاری هەڵاتنی داو ئەم هەرێمەی لەلا تاڵ ببوو، هەرێمێك کە ژیانی منداڵی تێدا بەسەربردووە، بە زووی بڕیاری داو بەجێی هێشت، لەو چەند ساڵەی رابردوودا ئەوەندە ئازارو ناسۆری چەشتبوو وڵاتی لەبەر چاو کەوتبوو هەر بۆیە لە پلانیدا ببوو بڕوات و لە دواتردا (دڵارام میهرداد) بەرەو لای خۆی کێش بکات، لە دوای هەڵاتنی (کامەران) بەرەو هەندەران (دڵارام میهرداد)دۆخی دەروونی زۆر خراپتر ببوو، هەر بۆیە گۆشەگیری و کزۆڵی

هەڵبژاردبوو، لەو دەمەی (کامەرانی وەنەوشە) لە تورکییاوە بەرەو سنوورەکانی وڵاتی یۆنان دەڕۆن، بە بەلەمێکی کۆنی شەق و شڕ مل دەنێن بەرەو دەریای گەورەی ئیجەو ناوەڕاست و شەڕ لەگەڵ هەزاران شەپۆلی دەریا دەکەن و هەزاران جار دەکەونە لێوارەکانی مەرگەوە، دواجار (کامەرانی وەنەوشە) بیرۆکەی راکردن لەو هەرێمە لە زانینیدا لە مێشکیدا چەکەرەی کردبوو، هەر بۆیە بڕیاری دابوو ئەو کارە بکات و پەشیمان نەبێتەوە بۆیە دەبوو ئەو کارە بکات، چونکە ژیانی لە ژێر ترس و دڵەڕاوکێدا بوو، پیاوەکانی (محەڕەم هەڵۆ) هەمیشە لە بۆسەدا بوون بۆی هەمیشە سووکایەتی و بێئەدەبیان بەرانبەر کردبوو ، ئەو دڵی لەم وڵاتە هەڵکەندرا بوو بڕیاری دابوو سەفەر بکات لە سەرەتادا لەبەر نەخۆشی (دڵارام میهرداد) و نالەباری تەندروستی نەیتوانی بوو لەگەڵ خۆی بیبات، و باوکی (دڵارام میهرداد) هیچ کات بە بیرۆکەی هەڵاتن بەرەو هەندەران رازی نەببوو، بۆیە (کامەرانی وەنەوشە) نەیتوانی بوو (میهرداد کاکەوەیس)لەوە ئاگاداربکاتەوە، بەڵام ئەو پەیامە سەیرەی لە ژێرزەمینەکانی زینداندا بۆی هاتبوو (کامەران) یان بەرەو هەندەران پەلکێش کردبوو، ئەو هەر دەبوو لەم هەرێمە هەڵبێت دواجار پەیامێك بوو لە دەرەوەی دەستی ئادەمیزادەکان پەیامێك بوو وایان کردبوو کە سەفەرکردنی لەلا گەڵاڵە بکەن، بۆیە لەبەرە بەیانێکی زوودا لەگەڵ رێبەرێك و چەند کەسێکی دیکە رەویان کرد و رێگا ترسناکەکانیان هەڵبژاردبوو، ئەو بەڵێنی گەڕانەوەی بە (دڵارام میهرداد) دابوو بڕیاری دابوو لە پاش ماوەیەك بگەڕێتەوە، بەڵام نەگەڕایەوە بۆ هەمیشە بزر بوو.

خەونی بە ژیانێکی دیکەوە بینی بوو، لەو ماوەیەی ئەو بیری لە هەڵاتن کردبۆوە، من لە ئەوروپا لە ژێر نەشتەگەری گەورەی دڵدا بووم، هەرگیز نەمتوانی بوو کۆمەکی بەو بکەم، من زۆر بەر لە (کامەرانی وەنەوشە) هەڵاتم، بەڵام من لەبەر نەخۆشی نەمتوانی درێژە بە خوێندن بدەم و نەشمتوانی بوو لە بارودۆخی خراپی (کامەرانی وەنەوشە) بپرسم، ئەو خەونی بەوەوە دەبینی بگات بە من و بە ژیانی بەهەشتئاسای ئەوروپا، من ماوەیەکی درێژ لە ژێر چاودێری پزیشکیدا بووم بە هەموو شێوەیەك لە دنیا دابڕابووم، لەسەرەمەرگدا ببووم، کە هیوای هەستانەوەم نەبوو، خاڵم کە سەردەمانێکی درێژ بوو لە هەندەران دەژیا لە نەخۆشخانە هاوەڵم بوو بە تەواوی دەستی لێ داشتبووم.

لەو سەروبەندەدا (کامەرانی وەنەوشە) بە خۆیی و بەکۆڵە پشتێکی گەورەی پڕ کەلوپەل و کتێبێك و چەند پارچە نانێك و دوو دەبە ئاوو ئینجانەیەکی بچووك لە گوڵی وەنەوشەیی، بڕیاری

سەفەرکردنی دابوو هەر زوو لەو دۆزەخەی هەرێم هەڵاتبوون کە لە لای زۆرێك لەبەرپرسە گەورەکانی دەوڵەت بەهەشت بوو، بەڵام زۆرێك لەوان بەدۆزەخیان چواندبوو، ئیدی خاڵی سفری سەفەرەکەی (کامەرانی وەنەوشە) لە هەرێم بوو، بەڵام خاڵی کۆتایی دیار نەبوو تەمومژاوی بوو، ئەو بە هەزاران کوێرەوەری و دەردەسەری بە کۆمەکی چەند هاورێیەکی کەمێك پارەی بەقەرز وەرگرتبوو بۆ سەفەرەکەی و بەڵێنی گەڕاندنەوەیانی دابوو، بە روحێکی جەسوورانەوە خۆی ئامادەکردبوو بۆ شەپۆلە نەبڕاوەکانی دەریای ناوەڕاستی گۆی زەوی، ئەو دەریا گەورەیەی دەکەوێتە نێوان سێ کیشوەرەوە، ئەو دەمە ئەو بە جلوبەرگێکی کۆماندۆئاسا و بە پانتۆڵێکی کاوبۆو جووتێك کاڵەی گەورەی بن زبروو قەمسەڵەیەکی چەرمی بچووك و کڵاوێکی خوری و جووتێك دەست کێشەوە لە پایزی ساڵی ٢٠٠٤ داسەفەری خۆی دەست پێکرد و لەگەڵ ڕێبەرێك و کۆمەڵێك کۆچەری سەرگەردانی دیکەدا ڕوویان بە رووی دنیایەکی دیکەدا کردەوە، لە شەو و ڕۆژە تەماویەکاندا بە سەرماو کرێوەی وڵاتاندا رەویان کرد بە شەو لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبوون و ڕۆژ لە بن بەردەڵان و ئەشکەوت و دارستانەکاندا پشوویان دەدا، ئیدی بەو چەشنە لە وڵاتی تورکییا پەڕینەوە، ژیانێکی ناخۆش ژیابوون، بە لاوازی و کەمخەوی و کەمخۆری لەڕەو بەردەوام بوون، وەك کۆمەڵێك کەسی قەرەچی بێ ناسنامە، وەك کۆمەڵێك کەسی لانەوازی تەریك لە دنیا تەنیا تەماشای ئەستێرەو ئاسمانیان کردبوو، بۆ هەمیشە لەو دنیا دابڕابوون، لە خەوندا بوون بۆ نیشتمانی گوڵەکان، (کامەرانی وەنەوشە) خزمەتی ئینجانەکەی کردبوو، لە هەموو سەرزەمینە جیاوازەکان چلێك گوڵی وەنەوشەی ئەفسووناوی چاندبوو.

بەڵام هەرگیز ئەو ئینجانەیە کەمی نەکردبوو، بە چەندین خاکی بەیارو و خاکی سەوزو شێدارو ئاوداردا رەت ببوون، بۆنی هەزاران گیاو گوڵی دارستانی دنیایان کردبوو بۆنی دەریاو نەهەنگ و قرشیان کردبوو، بۆنی بەردی کەنارەکان و هاژەی ئاویان کردبوو، چەند کەس لە رۆڵەکانی ئەم وڵاتە ببوون بێ سەرۆك و بێ خاوەن و بێ دایك و باوك شەقیان لەبەردو خۆڵی چەندین دۆڵ و نشێوو دا بوو، هەزاران کیلۆمەتر ڕێگای ئاسی یان بڕی بوو بە قەراغی زۆر چیای سەرکەشدا رەت ببوون لە هەر جێیەك کامەران گوڵێکی وەنەوشەی رواندبوو، ئێستاش هەزاران جۆر گوڵی وەنەوشەیی جوان سنوورەکانی ئەو وڵاتانەیان نەخشاندووە وەك زنجیرەیەك بەو هەرێمانەدا بڵاو بوونەتەوە.

لەو دەمەی لە کەناری دەریای ئیجە لەنگەر دەگرن و لە شەوێکی باراناوی پایزدا یەکە یەکە خۆیان خزاندبووە ناو یەختێکی شەق و شڕی دارماوو خۆیان دابووە دەست قەدەرێکی رەشی شووم، لەو شەوەدا (کامەرانی وەنەوشە) لە یادی دڵخوازەکەیدا تێر بە دەنگییکی نزم گریابوو، ئیدی

نزیکەی سی کەس سەرنشینی یەختێکی تایبەت بە راوە ماسی بوون، کە خۆی توانای هەڵگرتنی پێنج کەسی هەببوو، لەسەر یەختەکە ژمارەیەکی تایبەت نووسرابوو، کاپتنی یەختەکە کابرایەکی ریوەڵەی بێ مووی تورك ببوو، پیاوێکی کڵاو بەسەر کە هێڵەکێکی چەرمی لەبەردا ببوو، بە هەموویانی وتبوو کەوا ئەم شەو دەگەنە دوورگە نزیکەکانی یۆنان بەو شەوە باران و رەهێڵەیە خۆیان بۆ شەپۆلە گەورەکانی دەریا ئامادە کردبوو، سنگیان بە رووی دەریادا واڵا کردبوو، هەر بۆیە بەو خێراییە سنووردارەی بەلەمەکە هەی ببوو بە ئاودا دەستییان بە جووڵە کردبوو، بەرەو ئەو بەری دنیای رۆژئاوا، ئیدی بە هۆی کونبوون و تێچوونی ئاوەوە بەلەمەکە کێشەی تێدا دروست ببوو، ئاوی بێ رەحم وەك چۆن ئاگر بێ رەحمە بەلەمەکەی نوقمی دەریا کردبوو، لەو کاتەی کە هیچ کام لە سەرنشینەکان مەلە نازانن، جگە لە یەکێکیان مەلەوان نەببوون، لە شەوێکی تاریکدا لە ژێر رەحمی بارانی ئاسمان و شەپۆلە گەورەکانی دەریادا یەك بەیەك نقوم ببوون، بەڵام کاپتنەکەو سەرنشینێك بە فەلاکەت لە رێگەی پارچە تەختەیەکەوە سەر ئاو کەوتبوون، بەڵام تەواوی سەرنشینەکانی دیکە مردن و خنکان و تەرمەکانیان دۆزرایەوە جگە لە (کامەرانی وەنەوشە)کە هیچ ئاسەوارێکی دیار نەمابوو وەك نەهەنگەکانی دەریا قوتیان دابێ بە تەواوی بزر ببوو.

نەدۆزرایەوە لە دوای رۆژ بوونەوە لەبەرەبەیانێکی تا رادەیەك رووناکدا لە لایەن چەند کەشتییوانێکی کەناراوەکانی یۆنان تەواوی خنکاوەکان دەرهێنرانەوە هەموویان خرانە کیسەوەو لە رێگەی دەریاوە رادەستی کەشتییەکانی تورکییا کرانەوە و لە رووپەڕی رۆژنامەکاندا هەواڵی کارەساتەکە بڵاو کرایەوە بە ناوی تەواوی خنکاوەکانەوە، هەروەها لە سایتەکانی ئینتەرنێت و رۆژنامەکانی کوردستانیش هەموو هەواڵەکان بڵاو کرابوونەوە، تەرمەکان لە رێگەی حکومەتی تورکییاوە رادەستی حکومەتی کوردستان کرانەوە، ئەو رۆژە لە سەرتاپای کوردستان کرابوو بە رۆژی ماتەمینی، چونکە بیستو هەشت کۆچەری کوردستان لەناوچووبوون دنیا هەمووی سەرتاپا رەشیان پۆشی بوو، بەڵام یەك کۆچەری لەو شەپۆلانەدا دەرباز ببوو، بە نائومێدی و نیوە خنکاوی گەڕابۆوە بۆ زێدی خۆی، ئیدی (کامەرانی وەنەوشە) لە دەریادا ونبوو، بۆ هەمیشە بە خۆیی و ئینجانەیەك گوڵەوە نەدۆزرایەوە، لەو دەمەی هەواڵی خنکانی (کامەرانی وەنەوشە) بڵاو بوویەوە، ماتەمینی سەراپای کۆلێژو زانکۆو شارەکانی گرتەوە بە هەزاران هاندەرو هاوڕێ و دڵسۆزی (کامەران) رژابوونە سەر شەقامەکان و لە چەندانە مزگەوت و کۆلێژ و دامەزراوەکاندا پرسەی تایبەتی بۆ گیرابوو، ئەگەرچی ئەو کوڕی ئاسمانەکان بوو، بەڵام لە دەریادا بزر بوو، دروست نەزانرا چی بەسەر هات رەنگە بەرز بوویێتەوە بۆ ئاسمان، یاخود لە یەکێك لە دوورگە دوورەکاندا لەنگەری

گرتبێ و تۆوی گوڵە وەنەوشەییەکان بکات،یان وەك (ڕۆبنسۆن کـرۆزو) چـەندین سـاڵ لـە دوورگـە ونبووەکاندا بە تەنها بووبێت یان لەناو ناخی دەریادا بـۆ ئەبـەدی راکشـابێت، لەوکاتـەی هـەواڵی مەرگی (کامەرانی وەنەوشە) لە لای (دلاَرام میهـرداد) ئاشـکرا بـوو هـەر زوو هەراسـانی لەبـەر هەڵگیراو، بـەڵێنی دابـوو کـە لـە دوای ئـەو نـەژی بۆیـە بـە نائومێـدی و نیـوە شـێتی بەسـەر شەقامەکاندا بە گریان و قیژانەوە رای کردبوو، چیرۆکی شـێتبوونی (دلاَرام میهـرداد) لـە تـەواوی شاردا لەسەر زمانی خەڵك دەوترایەوە تا ئەو دەمەی بە مردوویی لە یەکێك لە کەلاوەکانی شـاردا دۆزرایەوە، بە ئازارو ناسۆرەوە گیانی سپاردو بـۆ هەمیشـە ئـەو دوو ئاشـق و مەعشـوقە بەیـەك نەگەیشتن، تەنیا کچێکی ئاسمانی لەگەڵ کوڕێکی ئاسمـانی ئاسـەواریان لەسـەرزەمین سـڕایەوە لـە دنیاکانی دیکەدا بەیەك گەیشتنەوە، هەردوو روحی ئازاو پیرۆزیان بەرەو ئاسمانەکان هەڵکشـانەوە، دوو کەس لە جنسی فریشتەکان دوو روحی جوان و سەربڵند کۆچیان کـرد بـەرەو دنیاکـانی دیکـە بەرەو هەورەکان هەڵکشان.

هیچ دەریاوانێك و ئامێرێکی ژێر دەریایی نـەیتوانی تـەرمی کامـەرانی وەنەوشـە بدۆزێتـەوە بۆیە، ئەو کاتەی راستی ئەم رووداوانەم بیست من بە گومـان بـووم، لـەدوای چـەند مانگێـك لـە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ دا دوای هۆش هاتنەوەو بڕانەوەی غـەیبووبەم وچاك بوونەوەم کاتێك هەواڵی مەرگی (کامەرانی وەنەوشە)م بیست یەکسەر موچڕکێکی کارەبائاسا بە جەستەمدا گووزەری کرد، وەخت بوو دڵم لە لێدان بکەوێت کە خۆی لەوپەڕی لاوازیدا بوو، من بە کـوڵ گریـام و دکتۆرەکـانم قەدەغەی گریانیان لێ کردم و دەیانووت کەوانابێت ئازار بچێژم و خەم بخۆم، بەلاَم هەرچـیم دەکـرد نەمدەتوانی نەگریم بۆ هاوڕێی ئازیزم، ئەو دەمەی ئەو هەواڵەم بیست من لە شـوقەکەی خۆمـەوە لە باڵکۆنە بەرزەکانی باڵەخانەکەوە سەیری دیمەنی دنیام دەکـرد و دەگریـام و رووداوەکـانی ژیـانی خۆم و (کامـەرانی وەنەوشە)م بە بیر خۆم دەهێنایەوە بیری ئەو هەموو مەرگ و خوێنەم دەکەوتـەوە هەر بۆیە دەچووم کتێبە وەنەوشەییەکەم لە جانتاکەمدا دەردەهێناو بۆ یەکـەمین جـار دەمکـردەوە دەمخوێندەوە، لەگەڵ هـەر دێڕێکـدا تێـی رادەمـام و دەگریـام دەگریـام، دەگریـام، یادگاریـەکان و نووسراوەکانم ئەم دیو ئەو دیو دەکرد، هەزاران راستی و دروستی لە کتێبەکـەدا دەردەکـەوتن و لـە لام گەلاَڵە دەبوون، بۆیە بیرۆکەی کۆکردنەوەی چیرۆکی ژیانیان لـە هزمـدا چـەکەرەی دەکـرد، بـە کاوەخۆ هەندێ لە رووداوەکانم بۆ ریکۆردەر دەگێڕایەوە نەبادا لە یادم بچن و بسڕێنەوە و هەنـدێکم دەنووسی، شەوێکی ناخۆش بوو کە رەشترین شەوە لە ژیانمداو لە یادی ناکەم دوای چـەند مانگێـك لە مەرگی (کامەرانی وەنەوشە) من تازە ئەو هەولاَنەم بەر گوێ دەکەوت، بۆیـە لـەو شـەوەدا بـە

چەرخێکی ئاگری پەنجەکانی خۆم داخ کرد و بڕیارم دا بۆ هەمیشە ئەم شەوە لە یاد نەکەم، دنیام لەبەرچاو تاریك و تەنگ ببوو، گەلاڵەی چیرۆکی ژیانی (کامەران) لە سەرمدا چرۆی کردبوو، بۆیە دەمخواست زوو بتوانم سەفەر بکەم و بگەڕێمەوە بۆ کوردستان تاکو تەواوی راستییەکان بزانم، نەمدەزانی هۆکاری مردن و شێوازی مەرگی (کامەران) چییە، هەندێك راستی لە کتێبە دەستنووسە وەنەوشەییەکەدا هەبوو کە لەلام دژوارو تەماوی بوو لێیان تێ بگەم، دەبوو ئەو کرمە لە مێشکمدا بکوژم، ئەو شەوە شەوێك بوو درێژترین و ناخۆشترین شەوی تەمەنم بوو، بۆیە بە رەژوو لە ژیانمدا نەخشاندم.

شەوێك بوو ناوم نا شەوی بێهوودەیی و مەرگ خودایە لەو شەوە رەشە من هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبووم من بژیم و (کامەرانی وەنەوشە)بمرێت.

بۆیە ئەو ماوەیەو بۆ هەمیشە بڕیارم دا بەرگی رەش لەبەرم دانەکەنم، بۆ هەمیشە ماتەمگێڕی مەرگی خۆشەویسترین هاوڕێم بم، ئەو لە ژیانیدا رێنموونی زۆری کردم، رێنیشاندەرو دەلیلی خێری ژیانی من بوو، من خۆشترین کاتەکانی تەمەنم کاتە بەفەرەکانم لەگەڵ ئەو بەرێ کرد، نەدەکرا لەیادی بکەم، هەر پاش مەرگی ئەو مەرگی (دلارام میهرداد) ئەوەندەی دیکە ژیانی هەراسان کردم و لە پەلو پۆی خستم زۆر موعجیزە بوو من نەمردم، هەواڵی ناخۆش لەسەر هەواڵی ناخۆش بەرۆکیان پێ دەگرتم، لەلای هەندێ کەس وابوو کە من لە ژیانی پڕ لە خەونی ئەوروپا دەژیم، بەلام دژوارترین و رەشترین کاتەکانم لەوێ بەسەر دەبرد.

گەلاڵەی فیلمی ژیانی (کامەرانی وەنەوشە)لە لام دروست ببوو، دەبوو کارێك بکەم کە لە منداڵییەوە ئارەزووی دنیای فیلمی رۆژئاوام دەکرد، پاش چاکبوونەوەو ساڕێژبوونی برینەکانی جەستەم جگە لە برینەکانی روحم کە بۆ هەمیشە سارێژ نابێت لە رێگای چەند دۆستێکەوە بڕیاری ئەو کارەم دا و ئەوانیش بەڵێنی کۆمەکیان پێدام، بەلام دەبوو هەموو چیرۆکەکان کۆبکەمەوە لە راستی دا لە ژیانی خانەوادەی (کامەرانی وەنەوشە)دا ئەوەندە چیرۆکی تراژیدی هەبوون کە بەشی چەندین فیلمیان دەکرد، بە خۆماندووکردنم بۆ ماوەیەك دە متوانی ئەو کارە بکەم، بۆیە بە ئازارێکی زۆرەوە بڕیاری گەڕانەوەمدا بۆ ولات، لەو کاتەی من بە کۆمەکی زۆری خاڵم مافی پەناهەندەیم وەرگرتبوو لە ئەوروپا.

گەڕامەوەو بۆنی خاك و چیاو گیا و داروبەردی ولاتم بۆ جارێکی دیکە هەڵمژیەوە ئەوەی دەبوو لەسەری کار بکەم چیرۆکی یەکترناسینی دایك و باوکی (کامەرانی وەنەوشە) بوو کە لەنێو کتێبە

وەنەوشەییە مێژووییەکەدا بوون، بۆیە دەبوو سۆراخی دروستی هاوڕێیەکی (وەنەوشە) بکەم کە ناوی (شەرمین عەزیز) بوو.

دوای ئەوەی لە شەوێکی درەنگی کۆتایی ساڵی ٢٠٠٥ دا گەڕامەوە بۆ کوردستان بەوپەڕی ماندوویەتیەوە خۆم گەیاندە ماڵەوە، ئەو کاتە خاڵم هاوسەفەرم بوو دایکم بە کوڵ باوەشی بۆ کردمەوەو بە سەرمدا گریا، ئەوان چاوەڕوان نەبوون کە من بژیم، بەڵام بە موعجیزە نەمردم و جارێکی دیکە باوەشم بە دنیادا کردەوە.

دوای ماوەیەك لە پشوودانم پاش ئەوەی تەواو هەستم بە چاك بوونەوە دەکرد رۆژێکی بارانـاوی بە خۆم و جانتایەکی رەش و ریکۆتێکی رەساسی و چەترێکەوە بە سۆراخێکی زۆر مامۆستا (شەرمین عەزیز)م لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاردا دۆزیەوە کە هاوڕێی دێرینەی (وەنەوشەی مەحموود شەلەنگ) بوو، دوای بیست و حەوت ساڵ پەڕەکانی رابردووم بە روویدا کردەوە ئیدی دوای چەند جارێك لە سەردان کردنم و دوای ئەوەی چەند مانگێك چاوەڕێم کردو لە دەرەوەی وڵات گەڕایەوە پاش ئەوەی بۆ نەشتەگەری سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردبوو، دواتر بووم بە ئاشنایان و تەواوی چیرۆکەکانم لە لایەن (شەرمین عەزیز) ەوە چنگ کەوت و لەو ماوەیەی لە کوردستان سەرقاڵی کاروباری پرۆژەکە بووم چەندین رووداوی سەیر روویان دا.

هەر لەو ماوەیەدا (پەریهان جەلال کوێستانی) کە کچی تاقانەی (شەرمین عەزیز) بوو، بوو بە هاوڕێی نزیکم و لە چەندین پرۆژەو کاردا هاوکاری و کۆمەکی پێکردم دواتر بکوژانی (کامەرانی وەنەوشە)م دۆزیەوەو هەموو کارو چالاکییەکانم لەلای خۆم هەڵسەنگاندو توانیم بزانم چی دەکەن و چی ناکەن، تەواوی ئیشە قێزەونەکانیانم زانی و لە لای خۆم لە کۆمپیوتەرەکەمدا تۆمارم کردن پرۆژەی بە فیلم کردنی چیرۆکەکانی ژیانی (کامەرانی وەنەوشە) و خانەوادەکەی و تەواوی رووداوە زەمەنییەکانی ئەو سەردەمەم لەلای خۆم کۆکردەوە، هەروەها توانیم کاری زۆر گرنگ بکەم و بە تەواوی کوردستان و ناوچە چیاییەکانی شارباژێڕدا بە ناو گوندو باخەکانی خانەوادەی (محموود شەلەنگ) بگەڕێم و لە تەواوی جۆرەکانی گوڵ و گیاو رووەك رابمێنم.

لەگەڵ ئەوەشدا توانیم (محەرەم هەڵۆ) و (پەنا کاروانی) و (ئەمیر کاروانی) باوکی باش بناسم و پێگەیان لە گەندەڵیکردن و بۆگەنکردنی کوردستاندا بدۆزمەوە ئەو دەمەی کە باوکی (کامەرانی وەنەوشە) (جیهانگیر سەرحەد) لە دوای بیست و سێ ساڵ لە دیلی و یەخسیری گەڕایەوە زۆر کاتێکی گونجاو بوو بۆ تۆڵەسەندنەوە، دیاردەیەکی ناوەزە بوو مرۆڤێك بە ناسنامەی مەرگەوە بگەڕێتەوە و سەربووردەی پەیکەری (جینا) دووبارە سەر هەڵبداتەوە گەڕایەوە بە کۆمەڵێك ئازارو

داخەوە، بەڵام دواتر دووبارە بزر بوو بۆ هەمیشە نەمبینییەوە، دوای ئەوەی (محەڕەم هەڵۆ) لە شەوێکی درەنگدا کوژرا، شەوێکی پایز بوو نمە نمە باران دەباری ئەو کاتە لەساڵی ٢٠٠٦ دا بووین، بەڵام بکوژەکە نادیاربوو، لەلای خەڵك ئاشکرا نەکرا، من دەمزانی بکوژەکە جگە لە (جیهانگیر سەرحەد) کەسێکی دیکە نییە ئەگەرچی ئەو پیاوە هێندە ناپاکی کردبوو دوور نەبوو دوژمنێکی دیکە لە پارێزدا خۆی بۆ ئامادە و پڕ چەك کردبێت و ئەوی کوشتبێ من دەبوو هەرچی زووترە سەفەری دەرەوەی وڵات بکەم، چونکە ئەرکەکانم لەم هەرێمە بەکۆتا گەیشتبوون و تەواوی زانیاری و چیرۆکە گرنگەکانم لەلای خۆم بە دەستنووس و کاسێتی دەنگی تۆمار کردبوو، هەر لە دوای مەرگی (محەڕەم هەڵۆ) من بە یەکجاری دڵم لەم هەرێمە هەڵکەندراو بەرەو هەندەران هەڵاتم ئیدی ئاسەواری (جیهانگیر سەرحەد) بۆ جارێکی دیکە دیار نەماو هیچ کات و زەمەنێکی دیکە ئەوم نەبینییەوەو هەواڵم لەربارەی نەزانی ئەو دەمەی بە تۆمەتی بڵاوبوونەوەی زانیاری سەبارەت بە ژیان و کارو پیشەی (محەڕەم هەڵۆ) و خانەوادەکەی ئاگری شەڕێکی خێڵەکی و ناوخۆیی خەریك بوو لە کوردستان هەڵدەگیرسا هەر دوای ئەوەی من تەواوی زانیاری و داتاکانم لە چەند (سی دی) یەکدا گەیاندە دەستی دووەمی کابرای نەیاری (محەڕەم هەڵۆ) ئەو توانیبووی ناوبانگی (محەڕەم هەڵۆ) بزڕێنێت، هەر بۆیە بۆ یەکەمین جار من بوومە هۆی دوژمنایەتیەکی گەورە لەنێوان ئەو دوو خانەوادەیەدا و توانیم تۆڵەی گیانی سەدان کەس و ژن و هاولاتی لەوان بسەنمەوە کە بێتاوان لەناوچوون و ئابروویان برا، ئەو پیاوەی ببوو بە خۆرەی گیانی کۆمەڵگا لەناوچوو ناوی چووە ناو زبڵدانی مێژووەوە و دەرگای دووەمی مێژووی بە روودا کرایەوە کە پڕە لە ناپاکان و نیشتمان فرۆشان، مەرگی (کامەرانی وەنەوشە) و بێسەرو شوێنبوونی (جیهانگیر سەرحەد) هەروا بە کراوەیی مایەوەو هەرگیز دەرگاکانیان بە روودا دانەخرا، لەو دەمەی من هەڵاتم و بەرەو ئەوروپا گەڕامەوەو بۆ هەمیشە ئاڕاستەی گەڕانەوەم بەرەو کوردستان و دایك و ئازیزانم بە داخراوی هێشتەوەو گەلاڵەی بە فیلم کردنی چیرۆکەکانیشم بە هەڵپەسێراوی مانەوە، هەر بۆیە بە زوویی لەم هەرێمە هەڵاتم، هەڵاتم لە هەرێمی مردووەکان، ئیدی دەبوو پێی بووترێت هەرێمی مردووەکان، چونکە دواجار مردووەکان گەلێك زۆر بوون، منیش هەڵاتم بۆ هەمیشە لەم هەرێمە هەڵاتم.